# تویشووی ڕێبوار



## لە زیکر و یادی پەروەردگار



وەرگێڕاوی

# الأذكار


تأليف:
الإمَام الحَافِظ المحَدِّث الفَقِيه أَبي زَكَرِيَّا
يَحيَ بن شَرَف النَّوَوِي
(٦٣١ - ٦٧٦ هـ)

وەرگێڕ:
مامۆستا مەلا ئەمجەد موحەممەد خۆراسانی

سرشناسه : نووی، یحیی‌بن شرف، ۶۳۱ - ۶۷۶ق. Nawawi

عنوان قراردادی : الاذکارالمنتخبة من کلام سیدالابرار .کردی

عنوان و نام پدیدآور : توشه‌ی ریبوار وه‌رگیراوی الاذکاری ئیمام نه‌وه‌وی/ وه‌رگیراوی امجد محمد خوراسانی.

مشخصات نشر سنندج : کردستان ، ۱۳۹۶.

مشخصات ظاهری ۲ج.

شابک :ج۱. ۲-۳۱٤-۹۸۰-۹٦٤-۹۷۸ ؛ ـ ج۲: ۹-۳۱۵-۹۸۰-۹٦٤-۹۷۸ ؛ :دوره ٦-۳۱٦-۹۸۰-۹٦٤-۹۷۸:

وضعیت فهرست نویسی : فیپا

یادداشت : کردی.

موضوع : ذکر

موضوع : Islamic meditations

موضوع : ذکر -- احادیث

موضوع Islamic meditations -- Hadiths

شناسه افزوده محمدخوراسانی، امجد، ۱۹۶۱ -، مترجم

رده بندی کنگره BP۲۶۶/۴۵/الف۹ن۴۰۴۷ ۱۳۹۶

رده بندی دیویی : ۲۹۷/۷۷

شماره کتابشناسی ملی : ۴۷۵۳۷۸۸

# تویشووی ڕێبوار

## له زیکر و یادی پەروەردگار

وەرگێڕاوی:

# «الأذكار»ی

## ئیمامی نەوەوی

وەرگێڕ:

ئەمجەد موحەممەد زاهید شێخ موحەممەد خۆراسانی

(بەرگی دووەم)



انتشارات كردستان

سنه






# توێشووی ڕێبوار


| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | توێشووی ڕێبوار |
| ✓ وەرگێڕان (ترجمە): | ئەمجەد موحەممەد زاهیدشیخ موحەممەد خوراسانی |
| ✓ کەڕەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول) ١٣٩٧ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ٥٠٠ بەرگ (دورە) |
| ✓ ژمارەی لاپەڕە و قەوارە (تعداد صفحات): | ١٢٧٥ لاپەڕە (صفحەی وزیری) |
| ✓ بڵاوکەرەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کردستان) |
| ✓ شابک: | ج١: ٢ - ٣١٤ - ٩٨٠ - ٩٦٤ - ٩٧٨ ؛ـ ج٢: ٩ - ٣١٥ - ٩٨٠ - ٩٦٤ - ٩٧٨<br>دورە: ٦ - ٣١٦ - ٩٨٠ - ٩٦٤ - ٩٧٨ |

✓ نرخ (قیمت): ٢٣،٠٠٠ دینار





سنندج ـ چهارراه شهدا ـ پاساژ عزتی ـ انتشارات کُردستان ـ تلفن: ٠٨٧٣٣١٦٥٣٨٢

سنە ـ پاساژی عیزەتی ـ بڵاوکردنەوەی کوردستان ـ تەلەفوون: +٩٨ ٨٧ ٣٣١٦٥٣٨٢

سەبارەت بە زیکرەکانی سەفەری جیهادو گەڕانەوە لێی، ئەوە ئەگەر خوای گەورە بیەوێت، لەمەولا لە ((**کتێبی زیکرەکانی سەفەر**))دا باسیان دەکەین. سەبارەت بەوەش کە تایبەتە بە جیهادەوە، ئەوە ئێستە بە کورتی ئەوەندەی لێ باس دەکەین، کە لەم کاتەدا لەبیرماندا ئامادەیە.

## سونەتە داوای پلەی شەهیدی بکرێت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ــەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە جارێك پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، تەشریفی برد بۆ ماڵی ژنەهاوەڵی خۆشەویست (أُمُّ حَرَام) (خوای لێ ڕازی بێت)، جا لەوێ خەوت‌و، پاشان کە خەبەری بوویەوە، دەستی کرد بە پێکەنین. جا (أُمُّ حَرَام) عەرزی کرد: ئەوە بەچی پێدەکەنیت ئەی پێغەمبەری خوا؟ ئەویش فەرمووی: «نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي عُرِضُوا عَلَيَّ غُزَاةً فِيْ سَبِيْلِ اللهِ يَرْكَبُونَ ثَبَجَ هَذَا الْبَحْرِ مُلُوكاً عَلَى الْأَسِرَّةِ أَوْ مِثْلَ الْمُلُوْكِ». واتە: "خەڵکێك لە ئومەتەکەمم پیشان درا، کە لەڕێگەی خوادا غەزایان دەکردو، سواری ئەم دەریایە دەبوون، هەر وەکو پاشاکان چۆن بەسەر تەخت‌و کورسیەکانیانەوە دادەنیشن". (أُمُّ حَرَام)یش عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، لەخوا بپاڕێرەوە، کە منیش بکات بە یەکێك لەو کەسانە. پێغەمبەری خواش (درودی خوای لەسەر بێت) دوعای بۆ کرد.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لــە (سُنَن)ی (أَبُوْ دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَــائِيّ)و (ابْــنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (مُعَاذ)ی کوڕی (جَبَل)ــەوە (خوای لێ ڕازی بێــت)، کە ئەو لە پێغەمبەری خوای بیستوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ سَــأَلَ اللّهَ الْقَتْلَ مِنْ نَفْسِهِ صَادِقاً، ثُمَّ مَاتَ أَوْ قُتِلَ، فَإِنَّ لَهُ أَجْرَ شَهِيْدٍ». واتە: "ئەو کەسەی

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٠٢٧ / بە ژمارە: ٢٦٣٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٥١٨ / بە ژمارە: ١٩١٢.

به ڕاستگۆیی داوای شـەهیدبوون لـەخوای گـەورە بکـاتو، پاشـان بمرێـت، یـان بکوژرێت، ئەوا پاداشتی شەهیدی دەست دەکەوێت".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، فەرموویەتی: «مَنْ طَلَبَ الشَّهادَةَ صَادِقاً، أُعْطِيْهَا، وَلَوْ لَمْ تُصِبْهُ».[2] واتە: "ئەو کەسەی بەڕاستگۆیی داوای شەهیدبوون لەخوای گەورە بکات، پاداشتی شەهیدبوونی دەدرێتێ، باوەکو شەهیدبوونیشی تووش نەبێت".

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَهْل)ی کوڕی (حُنَيْف)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، فەرموویەتی: «مَنْ سَأَلَ اللَّهَ تَعَالَى الشَّهَادَةَ بِصِدْقٍ، بَلَّغَهُ اللَّهُ مَنَازِلَ الشُّهَدَاءِ، وَإِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ».[3] واتە: "ئەو کەسەی بەڕاستگۆیی داوای شەهیدبوون لەخوای گەورە بکات، خوای گەورە دەیگەیەنێتە پایەی شەهیدان، ئیتر باوەکو لەسەر جێگەی خەویش بمرێت".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٢٥ / بە ژمارە: ٢٥٤١، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ١٨٣ / بە ژمارە: ١٦٥٤، وسُنَنُ النَّسَائِيّ / ٦ / ٢٥ / بە ژمارە: ٣١٤١، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ٩٣٥ / بە ژمارە: ٢٧٩٧.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٥١٧ / بە ژمارە: ١٩٠٨.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٥١٧ / بە ژمارە: ١٩٠٩.

## باسی هاندانی پێشەوای موسوڵمانان بۆ فەرماندەی پۆلێك چەكدار لەسەر ترسان لەخوای گەورەو، فێركردنی ئەوەی كە پێویستی پێیەتی لەبارەی شەڕو ڕێككەوتن و شتی تر لەگەڵ دوژمندا

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (بُرَيْدَةَ)ی كوڕی (حُصَيْب)ی (أَسْلَمِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، كەسێكی بكردایەتە فەرماندەی سوپایەك یان پۆلە چەكدارێك، وەسیەتی بۆ دەكرد، كە لەخوا بترسێت سەبارەت بەخۆیو بەو موسوڵمانانەش كە لەگەڵیدانو، باش بێت لەگەڵیاندا، پاشان دەیفەرموو: «اغْزُوا بِاسْمِ اللَّهِ، فِي سَبِيلِ اللَّهِ، قَاتِلُوا مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ، اغْزُوا، وَلاَ تَغُلُّوا، وَلاَ تَغْدِرُوا، وَلاَ تَمْثُلُوا، وَلاَ تَقْتُلُوا وَلِيدًا، وَإِذَا لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، فَادْعُهُمْ إِلَى ثَلاَثِ خِصَالٍ.......». واتە: "بەناوی خواوە بجەنگنو، لەڕێگەی خوادا بجەنگنو، شەڕ لەگەڵ ئەو كەسانەدا بكەن، كە باوەڕیان بەخوا نیە. بڕۆن بجەنگنو، خیانەت مەكەن لە دەستكەوتەكانی جەنگو، غەدرو پەیمان شكێنی مەكەنو، لاشەو ڕوخساری مردوەكانی دوژمنان مەشێوێننو سوكایەتیان پێ مەكەنو، منداڵی بچووك مەكوژنو، ئەگەر گەیشتیشن بە دوژمنەكانتان لە موشریكەكان، بانگیان بكەن بۆ پابەندبوون بەم سێ خاڵەوە"........ ئیتر حەدیسەكەی بەدرێژی هێنا.[1]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٣٥٧ / بە ژمارە: ١٧٣١.

## سونەتە بۆ پێشەوای موسوڵمانان و بۆ فەرماندەی پۆلێکیش، ئەگەر ویستی بڕوات بۆ غەزایەك، باسی غەزایەکی تر بکات

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (كَعْب)ی کوڕی (مَالِك)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، بیویستایە بچێت بۆ غەزایەك، باسی غەزایەکی تری دەکرد.[1]

## باسی دوعا کردنی ڕووبەڕوو بۆ ئەو کەسەی کە شەڕ دەکات، یان کارێك دەکات، کە یارمەتی شەڕەکەی تێدایە و، باسی ئەوەی کە شەڕکەرەکان چالاك دەکات و هەڵیان دەنێت لەسەر شەڕکردن

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ﴾ [الأنفال: ٦٥]. واتە: {ئەی پێغەمبەری خۆشەویست، باوەڕداران هەڵبنێ لەسەر جەنگو شەڕکردن}.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَحَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ [النساء: ٨٤].

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، تەشریفی هێنا بۆلای خەندەقەکەو، بینی وا کۆچەبەرەکانو پشتیوانان لە سبەینیانێکی زۆر ساردا چاڵ هەڵدەکەنن، جا کە بینی وا ماندوو بوونو برسیانە، فەرمووی: «اللَّهُمَّ، إنَّ العَيْشَ عَيْشُ الْآخِرَةِ، فَاغْفِرْ لِلْأَنْصَارِ

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيِّ / ٣ / ١٠٧٨ / بە ژمارە: ٢٧٨٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢١٢٨ / بە ژمارە: ٢٧٦٩.

وَالْمُهَاجِرَةِ». [1] واته: "خوایه، بەڕاستی ژیان بریتیه لە ژیانی دوارۆژ، دەی تۆش لە پشتیوانانو کۆچبەرەکان خۆشبە".

## باسی دوعا کردنو ملکەچی پیشاندانو، (اللهُ أكْبَر) کردنو، داوا کردن لەخوای گەورە، کە ئەو بەڵێنی سەرخستنەی داوێتی بە ئیماندارانی بیهێنێتە دی

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُوا وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيراً لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ * وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ وَاصْبِرُوا إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ * وَلا تَكُونُوا كَالَّذِينَ خَرَجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ بَطَراً وَرِئَاءَ النَّاسِ وَيَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ وَاللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ﴾ [الأنفال: ٤٥ - ٤٧]. واته: {ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە، ئەگەر گەیشتن بە کۆمەڵێك لەو کافرانەی دەیانەوێت شەڕتان لەگەڵدا بکەن، ئەوا خۆڕاگربنو، زیکری خواش زۆر بکەن، بەهیوای ئەوەی سەرکەوتوو بن. گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بنو، با یەکدەنگ بنو ناکۆکیو ڕاجیاییتان نەبێت، چونکە ئەگەر وابن دەیدۆڕێنو سەرکەوتوو نابنو، هێزو ناوبانگیشتان نامێنێت. بەصەبرو خۆڕاگر بن، چونکە خوای گەورە پشتیوانیو هاوکاری کەسانی بەصەبرو خۆڕاگر دەکات. وەکو ئەو بێباوەڕو هاوەڵدانەرانەش مەبن، کە بە لەخۆباییبوونو لوتبەرزیو ڕیابازیەوە لە ماڵو خانوەکانی خۆیان هاتوونەتە دەرەوەو، دەیانەوێت ڕێگریو بەربەست درووست بکەن بۆ خەڵکی، تا نەیەنە سەر ڕێگەی ڕاستی ئیسلامو، موسوڵمان نەبن، خوای گەورەش ئاگای لە کردەوەکانیانە}.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٠٤٣ / بە ژمارە: ٢٦٧٩، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٤٣١ / بە ژمارە: ١٨٠٥.

هەندێك لە زانایـان فەرموویانـە: ئـەم ئایەتـە پـیرۆزە گشـتگیرترین دەقـە، کـە سەبارەت بە ئادابەکانی جەنگ هاتبێت.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (ابْنُ عَبَّـاس)ـەوە (خـوا لـە هـەردووکیان ڕازی بێـت)، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت)، لـەناو خێوەتەکـەی خۆیـدا فـەرمووی: «اللَّهُمَّ، إِنِّي أَنْشُدُكَ عَهْدَكَ وَوَعْدَكَ. اللَّهُمَّ، إِنْ شِئْتَ لَمْ تُعْبَدْ بَعْـدَ اليَـوْمِ». واتـە: "خوایە من داوای بەدیهێنانو جێبەجێ کردنی پەیمانو بەڵێنەکەت لێ دەکەم. خوایـە ئەگەر بتەوێت نەپەرسترێیت، یان ئیسلام سەرنەکەوێت، یان موسوڵمانان بفـەوتێنو تیابچن، ئەوا لـەمڕۆ بەدواوە بەندایەتیت بۆ ناکرێت". جا ئیمـامی (أَبو بَكْر) (خـوای لێ ڕازی بێت) دەستی پێغەمبەری گرتو، عـەرزی کـرد: بەسـە ئـەی پێغەمبـەری خـوا، بەڕاستی زۆر پێداگریت کرد لـەسـەر پـەروەردگارت. ئـیتر پێغەمبـەری خـواش لـە خێوەتەکەی هاتە دەرەوەو، فەرمووی: ﴿سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ * بَلِ السَّـاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَالسَّاعَةُ أَدْهَى وَأَمَرُّ﴾ [القمر: ٤٥ - ٤٦]. واتـە: {لـەمـەولا کۆمـەڵی کـافرو بێباوەڕەکـان دەدۆڕێـنو، پشـت هەڵدەکـەنو ڕادەکـەن. بـەڵکو وادەی پاداشـتی تاوانەکانیان ڕۆژی قیامەتە، کە ڕۆژێکی زۆر ناڕەحەتترو تاڵترە بۆیان}.[١]

جا لـە یەکێك لـە ڕیوایەتەکاندا هاتوە، کە ئەم ڕووداوە لـە ڕۆژی غەزای (بَدْر)دا بوەو، ئەمەش دەقی ڕیوایەتەکەی ئیمامی بوخاریە.

سەبارەت بە دەقی حەدیسەکەش لای ئیمـامی موسـلیم، ئـەوە (ابْـنُ عَبَّـاس) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ڕووی کـردە قیبلـەو، پاشـان دەستەکانی بەرز کردەوەو، بە دەنگی بەرز دەپاڕایـەوەو، دەیفـەرموو: «اللَّهُمَّ، أَنْجِزْ لِيْ مَا وَعَدْتَنِي. اللَّهُمَّ، آتِنِيْ مَا وَعَدْتَنِي. اللَّهُمَّ، إِنْ تَهْلِكْ هَذِهِ الْعِصَـابَةُ مِـنْ أَهْـلِ الْإِسْلَامِ، لا تُعْبَدْ فِي الْأَرْضِ». واتە: "خوایە ئەو بەڵێنەم بۆ بهێنەدی کە پێت دابووم.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيِّ / ٣ / ١٠٦٧ / بە ژمارە: ٢٧٥٨.

خوایە ئەوەم بدەرێ کە بەڵێنت پێدابووم. خوایـە ئەگـەر ئـەم کۆمەڵـە موسـوڵمانە لــەناو ببــەیت‌و بیانفــەوتێنیت، ئـیتر لەسـەر زەویـدا بەندایـەتیت بـۆ ناکرێـت‌و، ناپەرسترێیت ". ئیتر هەر بەدەنگی بـەرز داوای دەکـردو دەپاڕایـەوەو، دەسـتەکانی بەرز دەکردەوە، هەتا عاباکەی کەوتە خوارەوە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (أبِيْ أوْفَــى)وە (خـوا لـە هـەردووکیان ڕازی بێت)، کـە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، لـە هەنـدێك لــەو ڕۆژانــەی کـە تێیـدا بـە دوژمن گەیشتوە، چاوەڕێی کردوە، تاوەکو خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان لایداوە، پاشان هەستاوە لـەناو خەڵکەکەداو، فەرموویەتی: «أيُّها النَّاسُ، لا تَتَمَنَّوْا لِقَاءَ الْعَدُوِّ، وَسَلُوا اللّهَ الْعافِيَةَ، فَإذَا لَقِيْتُمُوْهُمْ فَاصْبِرُوا، وَاعْلَمُوا أنَّ الْجَنَّةَ تَحْتَ ظِلالِ السُّيُوفِ». واتـە: "ئەی خەڵکینە، ئاوات مـەخوازن بگـەن بـە دوژمـن‌و، داوای سـەلامەتی‌و بێـوەیی لـەخوا بکەن، جا ئەگەر گەیشتن بە دوژمنان، ئیتر ئارامگرو خۆڕاگربن، بشزانن کـە بەهەشت لـەژێر سێبەری شمشێرەکاندایە". پاشان فەرموویەتی: «اللَّهُمَّ، مُنْزِلَ الْكِتَابِ، وَمُجْرِيَ السَّحَابِ، وَهَازِمَ الْأحْزَابِ، اهْزِمْهُمْ، وَانْصُرْنَا عَلَـيْهِمْ».[2] واتـە: "خوایـە، ئـەی دابەزێنـەری قورئـانی پـیرۆز، ئـەی جوڵێنــەرو بەڕێکـەری هـەورەکان، ئـەی تێکشکێنەری دەستەو تاقمەکان، تێکیان بشکێنەو، سەرمان بخە بەسەریاندا".

لـە ڕیوایەتێکیشدا هاتوە: «اللَّهُمَّ، مُنْزِلَ الْكِتَابِ، سَرِيعَ الْحِسَابِ، اهْزِمِ الْأحْزَابِ. اللَّهُمَّ، اهْزِمْهُمْ، وَزَلْزِلْهُمْ».[3] واتە: "خوایە، ئەی دابەزێنەری قورئـانی پـیرۆز، ئـەی

---

(١) بروانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٣٨٣ / بە ژمارە: ١٧٦٣.

(٢) بروانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١١٠١ / بە ژمارە: ٢٨٦١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٣٦٢ / بە ژمارە: ١٧٤٢.

(٣) بروانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٠٧٢ / بە ژمارە: ٢٧٧٥، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٣٦٣ / بە ژمارە: ١٧٤٢.

خاوەنی لێپرسینەوەی خێرا، دەستەو تاقمەکان بشکێنەو بیانڕووخێنە. خوایە بیانشکێنەو، بیانخە لەرزەو پەرتو بڵاویان بکە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنس)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، بەیانیەك زوو هێرشی کردە سەر خەیبەرو، خەڵکەکەش کە چاویان پێی کەوت، وتیان: موحەممەدو سوپاکەی هاتن. ئیتر پەنایان برد بۆ قەڵاکەو، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) دەستی بەرز کردەوەو، فەرمووی: «اللَّهُ أَكْبَرُ، خَرِبَتْ خَيْبَرُ، إِنَّا إِذَا نَزَلْنا بِساحَةِ قَوْمٍ فَساءَ صَباحُ الْمُنْذَرِينَ».[1] واتە: "خوا لە هەموان گەورەترە، خوایە قەڵای خەیبەر داهەڕوژێتو وێران ببێت (یان قەڵای خەیبەر دادەهەڕوژێتو وێران دەبێتو موسوڵمانان دەیگرن)، ئێمەی ئیماندارانیش (یان ئێمەی پێغەمبەران) ئەگەر دابەزینە گۆڕەپانی جەنگی هەر تاقمێکی بێباوەڕەوە، ئەوە ئیتر بەیانیەکی زۆر خراپو ناڕەحەت دێت بەسەریاندا".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)دا، بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَهْل)ی کوڕی (سَعْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «ثِنْتَانِ لا تُرَدَّانِ – أَوْ قَلَّما تُرَدَّانِ–: الدُّعَاءُ عِنْدَ النِّدَاءِ، وَعِنْدَ الْبَأْسِ حِيْنَ يُلْجِمُ بَعْضُهُمْ بَعْضاً».[2] واتە: "دوو نزاو پاڕانەوە ڕەد ناکرێنەوە –یان بەکەمی ڕەد دەکرێنەوە–: نزاو پاڕانەوە لەکاتی بانگداو، نزاو پاڕانەوە لەکاتی جەنگدا، ئەو کاتەی سەربازانی هەردوو سوپاکە بەناویەکترا دەچنو تێڕژان درووست دەبێت".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٠٩٠ / بە ژمارە: ٢٨٢٩، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ١٠٤٥ / بە ژمارە: ١٣٦٥.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٢٥ / بە ژمارە: ٢٥٤٠.

منيش دەڵێم: لە هەندێك لە نوسخە متمانەدارەكاندا بە (يُلْجِمُ) هاتووە، لە هەندێكیشیاندا بە (يُلْجِمُ). هەردووكیشیان ماناكانیان ئاشكرایە. (كە بریتین لە: تێڕژانو بەناویەكداچوون).

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، تەشریفی ببردایە بۆ غەزا، دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، أَنْتَ عَضُدِي وَنَصِيْرِي، بِكَ أَحُولُ، وَبِكَ أَصُولُ، وَبِكَ أُقَاتِلُ». واتە: "خوایە تۆ پشتیوانو یارمەتیدەری منی، بە هاوكاری تۆ لەڕووی فێڵی دوژمناندا دەوەستمەوەو، بە پشتیوانی تۆش پەلاماریان دەدەمو، بە یارمەتی تۆش شەڕیان لەگەڵدا دەكەم".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێكی (حَسَن)ـە.[1]

شێخی (خَطَّابِيّ) فەرموویەتی: وشەی (أَحُولُ) بەمانای (أَحْتَالُ) دێت. واتە: تەنها بەیارمەتی تۆ لەڕووی فێڵو پیلانی دوژمناندا دەوەستمەوە.

هەروەها فەرموویەتی: مانایەكی تریشی تێدا دروستە، ئەویش بریتیە لە: ڕێگری لێ كردنو لەكۆڵ كردنەوە.

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و (نَسَائِيّ)دا، بە ڕشتەیەكی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو مُوْسَى)ی (أَشْعَرِيّ)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) ترسی لە خەڵكێك هەبوایە،

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٤٨ / بە ژمارە: ٢٦٢٣، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٧٢ / بە ژمارە: ٣٥٨٤، وسُنَنُ النَّسَائِيّ الْكُبْرَى / ٥ / ١٨٨ / بە ژمارە: ٨٦٣٠. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێكی (صَحِيْح)ـە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ٦٠.

دەیفـەرموو: «اللَّهُمَّ، إِنَّا نَجْعَلُكَ فِي نُحُورِهِمْ، وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شُرُورِهِمْ».[1] واتـە: "خوایە ئێمە هێزو دەسەلاٌتی تۆ دەدەین بەگژیانداو، پەناش بەتۆ دەگـرین لـە شـەڕو خراپەیان".

بۆشمان ڕیوایـەت کـراوە لـە کتێبەکـەی ئیمـامی (تِرْمِذِيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (عُمَارَة)ی کـوڕی (زَعْكَرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە فەرموویـەتی: بیستومە لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: خوای گـەورە فەرموویەتی: «إِنَّ عَبْدِي كُلَّ عَبْدِي، الَّذِيْ يَذْكُرُنِي وَهُوَ مُلاقٍ قِرْنَهُ». واتە: "بەنـدەی دڵسۆزو ڕاساڵی مـن ئـەو کەسـەیە، کـە لـەکاتی ڕووبـەڕوو بوونـەوەی دوژمنـی هاوئاستو هاوتای خۆیدا منی لەبیرەو یادی من دەکات". مەبەستی کاتی شەڕە.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: ڕشتەکەی بەهێز نیە.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکـەی شـێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (جَـابِر)ی کـوڕی (عَبْدُاللهِ)ەوە (خـوا لـە هـەردووکیان ڕازی بێـت)، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، لە ڕۆژی غەزای حونەینـدا[3] فەرموویەتی: «لا تَتَمَنَّوْا لِقَاءَ الْعَدُوِّ، فَإِنَّكُمْ لا تَدْرُونَ مَا تُبْتَلَوْنَ بِهِ مِنْهُمْ، فَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ، فَقُولُوا: اللَّهُمَّ، أَنْتَ رَبُّنا وَرَبُّهُمْ، وَقُلُوبُنا وَقُلُوبُهُمْ بِيَدِكَ، وإِنَّمَا يَغْلِبُهُمْ

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٨٠ / بە ژمـارە: ١٥٣٧، وسُنَنُ النَّسَائِيّ الْكُبْرَى / ٥ / ١٨٨ / بە ژمارە: ٨٦٣١.

(٢) بڕوانـە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٧٠ / بـە ژمـارە: ٣٥٨٠. بـەڵام شـێخی عەسـقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ٦٢ – ٦٣.

(٣) ئیمامی (سُيُوْطِيّ)و شێخی (ابْنُ عَلاّن) فەرموویانە: شێخی عەسـقەلانی فەرموویـەتی: ڕاسـتە لە نوسخەی کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا وا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا لە ڕۆژی غەزای حونەیندا وای فـەرموە، بـەڵام ئـەوە هەڵەیـەو، ڕاسـتەکەی ئەوەیـە کـە لـە ڕۆژی غـەزای خەیبەردا وای فەرموە. بڕوانە: تُحْفَةُ الْأَبْرَار / ٩٩ – ١٠٠، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ٦٣.

(تَغْلِبُهُمْ) أنْتَ».[1] واته: "ئاواتی ئەوە مەخوازن کە بگەن بە دوژمنانو ڕووبەڕوویان ببنەوە، چونکە ئێوە نازانن لەوانەوە دووچاری چی دەبن. جا ئەگەر پێیان گەیشتن، ئەوا بڵێن: (خوایە تۆ پەروەردگاری ئێمەو ئەوانیشی، دڵی ئێمەو ئەوانیش بەدەستی تۆیەو، تەنها تۆش بەسەریاندا زاڵ دەبیت)".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لەو حەدیسەی کە پێشتر لە کتێبەکەی شێخی (ابْـنُ السُّنِّيّ)دا هێنامان، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَـس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرمووبووی: لە غەزایەکدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بووین (دروودی خوای لەسەر بێت)، جا کە گەیشت بە دوژمن، گوێم لێبوو دەیفەرموو: «يَا مَالِكَ يَوْمِ الدِّيْنِ، إِيَّاكَ نَعْبُدُ، وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ». جا بەڕاستی کۆمەڵە پیاوێکم لە کافرەکان دەبینی، کە بەردەبوونەوەو دەمردن، فریشتە لەپێشەوەو لەدواوە لێیان دەدان.[2]

ئیمامی (شَافِعِيّ) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە کتێبی (الْأُمّ)دا بە ڕشتەیەکی (مُرْسَـل) ڕیوایەتی کردوە لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «اطْلُبُوا اسْتِجَابَةَ الدُّعَاءِ عِنْدَ الْتِقَاءِ الْجُيُوْشِ، وَإِقَامَةِ الصَّلَاةِ، وَنُزُوْلِ الْغَيْثِ».[3] واته: "بەشوێن گیرابوونی نزاو پاڕانەوەدا بگەڕێن لەکاتی بەیەك گەیشتنو ڕووبەڕوو بوونەوەی سوپای موسوڵمانانو کافرانو، لەکاتی نوێژدابەستنو، لەکاتی باران بارینددا".

منیش دەڵێم: هەروەها زۆر سونەتە کە چەندە بتوانێت قورئان بخوێنێتو، ئەو دوعایەش بکات، کە پێشتر باسمان کردو، بۆ کاتی بێ تاقەتیو خەم خەفەت بەکار

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣١٤ - ٣١٥ / بە ژمارە: ٦٦٨. ڕشتەکەی لاوازە، بەڵام لەبەرئەوەی لە چەند ڕێگەیەکی تریشەوە ڕیوایەت کراوە، بۆیە پلەی بەرز دەبێتەوە بۆ پلەی حەدیسی (حَسَن). بڕوانە: عُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّي / ٧٦٠ - ٧٦١.
(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٦٢ / بە ژمارە: ٣٣٤.
(٣) بڕوانە: الْأُمّ / ٢ / ٥٥٤.

دەهێنراو، لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا هاتبوو: «لا إلهَ إلاَّ اللهُ الْعَظِيْمُ الْحَلِيْمُ، لا إِلهَ إلاَّ اللهُ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيْم، لا إِلهَ إلاَّ اللهُ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَرَبُّ الْأَرْضِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيْمِ».[1]

هەروەها ئەو زیکرەش بکات، کە لەویٚ لە حەدیسەکەی تردا هێنامان: «لا إلهَ إلاَّ اللهُ الْحَلِيْمُ الْكَرِيْمُ، سُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ السَّمَوَاتِ السَّبْعِ وَرَبِّ الْعَرْشِ الْعَظِيْم، لا إلهَ إلاَّ أنْتَ، عَزَّ جَارُكَ، وَجَلَّ ثَنَاؤُكَ».

هەروەها ئەوەش بلێت، کە لەویٚ لە حەدیسەکەی تردا هێنامان: «حَسْبُنا اللَّهُ، وَنِعْمَ الوَكِيلُ».

هەروەها بلێت: «لا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إلاَّ بِاللَّهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيْمِ، مَا شَاءَ اللَّهُ لا قُوَّةَ إلاَّ بِاللهِ، اعْتَصَمْنا بِاللهِ، اسْتَعَنَّا بِاللهِ، تَوَكَّلْنا عَلَى اللهِ».

هەروەها بلێت: «حَصَّنْتَنا كُلَّنا أجْمَعِينَ بِالْحَيِّ القَيُّومِ الَّذِيْ لا يَمُوتُ أَبَداً، وَدَفَعْتَ عَنَّا السُّوءَ بِلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إلاَّ بِاللَّهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيْمِ». واتە: "هەموومانت پەرژین کردوە بە هێزو لوتفی ئەو خوایەی، کە زیندوەو، ڕاپەڕێنەری کاروباری بوونەوەرانەو، هەرگیز نامرێتو، خراپەشت لیٚ لاداوین بە فەرمایشتی (لا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إلاَّ بِاللَّهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيْمِ)".

هەروەها بلێت: «يَا قَدِيْمَ الْإحْسانِ، يَا مَنْ إحْسانُهُ فَوْقَ كُلِّ إحْسانٍ، يَا مَالِكَ الدُّنْيا وَالْآخِرَةِ، يَا حَيُّ يَا قَيُّومُ، يَا ذَا الْجَلالِ وَالْإكْرَام، يَا مَنْ لا يُعْجِزُهُ شَيْءٌ، وَلا يَتَعَاظَمُهُ شَيْءٌ، انْصُرْنا عَلَى أعْدَائِنا هَؤُلاءِ وَغَيْرِهِمْ، وَأظْهِرْنا عَلَيْهِمْ فِي عَافِيَةٍ وَسَلامَةٍ عَامَّةٍ عَاجِلاً». واتە: "ئەی ئەو کەسەی سیفەتی چاکەکاریو بەخشندەییت بیٚ سەرەتاو بیٚ کۆتایە، ئەی ئەو کەسەی چاکەکاری تۆ لە سەرووی هەموو

(١) بروانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٣٦ / بە ژمارە: ٥٩٨٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٩٢ / بە ژمارە: ٢٧٣٠.

چاکەکاریەکەوەیە. ئەی خاوەنی دنیاو دوارۆژ، ئەی زیندوو، ئەی راپەڕێنەری کاروباری بوونەوەران، ئەی دەسەڵاتداری بەخشندە، ئەی ئەو کەسەی هیچ شتێك دەستەوەستانت ناکات و، هیچ شتێکیشت لەلا گەورەو گران نیە، بەسەر ئەم دوژمنانەو غەیری ئەمانەشدا سەرمان بخەو، بەم زوانەش زاڵمان بکە بەسەریانداو، هەمووشمان بپوەی و سەلامەت بکە".

جا هەموو ئەمانە هاندانی دوپاتکراوەیان لەبارەوە هاتوەو، هەمووشیان تەجروبە کراون.

## نەهی کراوە لە بەرزکردنەوەی دەنگ لەکاتی جەنگدا بەبێ پێویست

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُـنَن)ی (أَبُـو دَاوُد) دا، لە یەکێك لە شوێنکەوتوانەوە، بەناوی (قَیْس)ی کوڕی (عُبَـاد)ەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، کە فەرموویەتی: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) پێیان ناخۆش بوو لە کاتی جەنگدا دەنگ بەرز بکرێتەوە.[1]

## دروستە کەسێك لەکاتی جەنگدا بۆ ترساندنی دوژمنەکەی بڵێت: من فڵانە کەسم

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، لە ڕۆژی غەزای حونەیندا فەرموویەتی:

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٥٦ / بە ژمارە: ٢٦٥٦. حەدیسێکی (حَسَـن)ە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ٦٧.

«أَنَا النَّبِيُّ لا كَذِب، أَنَا ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِب».[1] واته: "من پێغەمبەرم‌و درۆی تێدا نیەو، من کوڕی (عَبْدُ الْمُطَّلِب)م".

بۆشمان ڕیوایەت کراوه له هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، له هاوەڵی خۆشەویست (سَلَمَة)ی کوڕی (أَكْوَع)ـەوه (خوای لێ ڕازی بێت)، که ئیمامی (عَلِيّ) (خوای لێ ڕازی بێت) کاتێك له غەزای خەیبەردا چوه مەیدان بۆ (مَرْحَب)، فەرمووی: (أَنَا الَّذِيْ سَمَّتْنِي أُمِّيْ حَيْدَرَه).[2] واته: (من ئەو کەسەم دایکم ناوی ناوم: شێر).

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوه له هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، له هاوەڵی خۆشەویست (سَلَمَة)وه، که لەکاتی پەلاماردانی ئەو کەسانەی، که دابوویان بەسەر حوشترە ئاوسەکانی پێغەمبەری خواداو، دزیبوونیان، ئەو فەرموویەتی: (أَنَا ابْنُ الأَكْوَعِ، وَالْيَوْمُ يَوْمُ الرُّضَّعِ).[3] واته: (من "سَلَمَة"ی کوڕی "أَكْوَع"م‌و، ئەمڕۆش ڕۆژی تیاچوون‌و لەناوچوونی کەسانی ناڕەسەنی ناپاکه).

---

(١) بڕوانه: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٠٥١ / به ژماره: ٢٧٠٩، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٤٠٠ / به ژماره: ١٧٧٦.

(٢) بڕوانه: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٤٣٣ / به ژماره: ١٨٠٧. ئەم حەدیسه تەنها له صەحیحی موسلیمدا هاتوەو، له صەحیحی بوخاریدا نەهاتوه. جا سەیره که ئیمامی نەوەوی فەرموویەتی: له هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا هاتوه!!!

(٣) بڕوانه: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١١٠٦ / به ژماره: ٢٨٧٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٤٣٢ / به ژماره: ١٨٠٦.

# سوننەتە هۆنراوەی (رَجَز)[1] بەکار بهێنرێت لەکاتی زۆرانبازیو ڕوویەڕوبوونەوەدا

سەبارەت بەم باسەش هەمان ئەو حەدیسانە هاتون، کە لەباسەکەی پێش ئەم باسەدا هێنران.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (بَرَاء)ی کوڕی (عَازِب)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پیاوێک لێی پرسیوە: ئایا ڕۆژی غەزای حونەین ئێوە ڕاتان کردو، پێغەمبەری خواتان بەجێهێشت؟!! (بَرَاء)یش فەرمووی: بەلاَم پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) ڕای نەکرد. من چاوم پێی کەوت کە بەسەر ئەسپە سپیەکەی خۆیەوە بوو، {(أَبُو سُفْيَان)ی کوڕی (حَارِث)ی کوڕی (عَبْدُ الْمُطَّلِب)}یش ڕەشۆکەی گرتبوو، پێغەمبەری خواش (درودی خوای لەسەر بێت) دەیفەرموو: «أَنَا النَّبِيُّ لا كَذِب، أَنَا ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِب».[2]

لە ڕیوایەتێکیشدا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا لە ئەسپەکەی دابەزیو، دەستی کرد بە پاڕانەوەو، داوای لەخوای گەورە کرد کە سەریان بخات.[3]

هەروەها بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (بَرَاء)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوام بینی (درودی خوای لەسەر بێت)، کە لە ڕۆژی غەزای ئەحزابدا لەگەڵ ئێمەدا خۆڵی

---

(١) (رَجَز) یەکێکە لە بەحرەکانی هۆندنەوەی شیعرو، لە شەش جار (مُسْتَفْعِلُن) پێکهاتوە. بەلاَم هەندێك پێیان وایە: هۆنراوە نیە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ٧١.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٠٥١ / بە ژمارە: ٢٧٠٩، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٤٠٠ / بە ژمارە: ١٧٧٦.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٠٧١ / بە ژمارە: ٢٧٧٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٤٠١ / بە ژمارە: ١٧٧٦.

دەگواستەوەو، تۆزو خۆڵ سپایی بندەستی داپۆشیبوو، لەو کاتەشدا دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ لَوْلا أَنْتَ مَا اهْتَدَيْنا، وَلا تَصَدَّقْنا وَلا صَلَّيْنا، فَأَنْزِلَنْ سَكِينَةً عَلَيْنا، وَثَبِّتِ الْأَقْدَامَ إِنْ لاقَيْنا، إِنَّ الْأُلَى قَدْ بَغَوْا عَلَيْنا، إِذَا أَرَادُوا فِتْنَةً أَبَيْنَا».[1] واتە: "خوایە، ئەگەر فەزڵو لوتفی تۆ نەبوایە ڕێگەی ڕاستمان نەدەبینیەوەو، خەیرو صەدەقەمان نەدەکردو، نوێژیشمان نەدەکرد، دەی تۆش سەکینەو ئارامی دابەزێنەرە سەر دڵەکانمانو، ئەگەر گەیشتیشین بە دوژمنەکانمان، قاچەکانمان چەسپاوو ڕاگیراو بکە، بەڕاستی ئەم بێباوەڕانە زوڵمو ستەمیان لێکردووین، چونکە کاتێك ویستوویانە بمانگێڕنەوە بۆ گومڕاییو کوشتو بڕی، ئێمە ڕازی نەبووین".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: کۆچبەرەکانو پشتیوانان خەندەقەکەیان هەڵدەکەندو، بەکۆڵی خۆیان خۆڵەکەیان دەگواستەوەو، دەیانفەرموو: (نَحْنُ الَّذِينَ بايَعُوا مُحَمَّداً عَلَى الْإِسْلامِ -لە ڕیوایەتێکیشدا نوسراوە "عَلَى الْجِهَادِ"- مَا بَقِيْنَا أَبَداً). واتە: (ئێمە ئەو کەسانەین کە لەسەر ئیسلامەتی، یان لەسەر جیهادو جەنگ بەیعەتمان بە پێغەمبەری خوا داوە)و، پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) وەڵامی دەدانەوەو، دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، إِنَّهُ لا خَيْرَ إِلاَّ خَيْرُ الْآخِرَةِ، فَبَارِكْ فِي الْأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرَةِ».[2] واتە: "خوایە، هیچ خەیرێك نیە بێجگە لە خەیری دوارۆژ، دەی تۆش بەرەکەت بخەرە ناو پشتیوانانو کۆچبەرانەوە ".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٠٤٣ / بە ژمارە: ٢٦٨٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٤٣٠ / بە ژمارە: ١٨٠٣.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٠٤٣ / بە ژمارە: ٢٦٨٠. هەروەها ئیمامی موسلیمیش هێناویەتی. بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٤٣٢ / بە ژمارە: ١٨٠٥.

## سونەتە دەوروبەری کەسی بریندارکراو وای پێشان بدەن کە بەئارامو بەهێزن‌و، مژدەشی بدەنێ کە ئەو لەڕێگەی خوادا بریندار بووەو، بەرەو شەهیدبوون دەچێت‌و، پێشانیشی بدەن کە ئەوان بەم حاڵەتە خۆشحاڵن‌و، پێیان ناخۆش نیە، بەڵکو ئەوانیش هەر ئەوەیان دەوێت‌و، هەر ئەوەش ئەوپەڕی خواست‌و ئاواتیانە

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتاً بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ * فَرِحِينَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِالَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا بِهِمْ مِنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلا هُمْ يَحْزَنُونَ * يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ وَأَنَّ اللَّهَ لا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُؤْمِنِينَ * الَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِلَّهِ وَالرَّسُولِ مِنْ بَعْدِ مَا أَصَابَهُمُ الْقَرْحُ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا مِنْهُمْ وَاتَّقَوْا أَجْرٌ عَظِيمٌ * الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَاناً وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ * فَانْقَلَبُوا بِنِعْمَةٍ مِنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ لَمْ يَمْسَسْهُمْ سُوءٌ وَاتَّبَعُوا رِضْوَانَ اللَّهِ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ﴾ [آل عِمـران: ١٦٩ - ١٧٤]. واتە: {گومانت وا نەبێت ئەوانەی لەڕێگەی خوادا کوژراون‌و شەهید کراون هەستیان نەبێت‌و مردبن، بەڵکو زیندوون‌و لای پەروەردگاریان ڕزق‌و ڕۆزیان دەدرێتێ. دڵ خۆشن بەو خەڵاتەی خوای گەورە پێیداون‌و، مژدەش دەدەن بەو کەسانەی لەدوای خۆیان بەجێیان هێشتوون‌و، هێشتا شەهید نەبوون، کە با ترسی قیامەت‌و دوای مردنیان نەبێت‌و، خەم‌و خەفەتی بەجێهێشتنی دنیاشیان نەبێت. مژدەی ئەو هەموو نازو نیعمەتانە دەدەن، کە خوای گەورە بە لوتفی خۆی پێی بەخشیون‌و، خوای گەورەش پاداشتی باوەڕداران ون ناکات. ئەوانەی هاتن بەدەم بانگەوازی خواو پێغەمبەرەکەیەوە، دوای ئەوەی تووشی ئازارو برینداری بوون، جا پاداشتێکی گەورە هەیە بۆ چاکەکارو لەخواترسەکانیان. ئەوانەی، کە کەسانێك لە هاوەڵدانەران پێیان دەوتن: "بەڕاستی خەڵکانێکی زۆر کۆبوونەتەوەو دێن بۆ لەناوبردنتان، جا لێیان بترسن‌و خۆتانیان لێ لادەن"، کەچی ئەو قسەیە ئیمان‌و باوەڕەکەی زیاتر کردن‌و، فەرموویان: "ئێمە

خوامان بەسەو، خواش باشترین کارپێسپێردراوە". ئیتر ئەوانە بە پاداشتو خەڵاتێکی زۆری خوای پەروەردگارو، بەسەرکەوتوویی‌و بە سەلامەتیەوە گەڕانەوە جێگەی خۆیانو، بەم گوێڕایەڵیەشیان شوێنی ڕەزامەندی خوا کەوتن، خوای گەورەش خاوەنی بەخششو خەڵاتی زۆر گەورەیە}.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، لە حەدیسی باسی قورئانخوێنەکاندا – ئەوانەی بیری مەعونە–، کە کافرەکان ناپاکیان لەگەڵدا کردنو، شەهیدیان کردن: هاتوە کە پیاوێك ڕمێکی کرد بە پشتی خاڵۆی (أَنَس)دا، کە بریتی بوو لە (حَرَام)ی کوڕی (مِلْحَان)و، سەری ڕمەکە لە پێشەوە دەرچوو، (حَرَام)یش فەرمووی: (اللّٰهُ أَكْبَرُ، فُزْتُ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ). واتە: "خوا لە هەموو کەس گەورەترەو، سوێند بە پەروەردگاری کەعبە بردمەوە"، ئیتر بەربوویەوەو کەوت.[1]

لە ڕیوایەتەکەی ئیمامی موسلیمدا (اللّٰهُ أَكْبَر)ەکەی تێدا نیە.

## ئەگەر موسوڵمانان سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا مرۆڤی موسوڵمان چی بڵێت؟

دەبێت مرۆڤی موسوڵمان لەو کاتەدا سوپاسو ستایشی خوای گەورە زۆر بکاتو، دان بەوەدا بنێت، کە ئەو سەرکەوتنە بە لوتفو فەزڵی خوای گەورە بوە، نەوەك بەهێزو توانای خۆیان.

هەروەها نابێت سەرسامبن بە زۆریتی ژمارەی خۆیان. چونکە ئەو سەرسامبوونە مەترسی نەتوانکاریو دەستەوەستانی لێ دەکرێت، وەکو خوای گەورە فەرموویەتی:

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٥٠١ / بە ژمارە: ٣٨٦٤، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٥١١ / بە ژمارە: ٦٧٧.

﴿وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنْكُمْ شَيْئاً وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُمْ مُدْبِرِينَ﴾ [التَّوبَة: ٢٥] واته: {له ڕۆژی غەزای حونەیندا ئێوه سەرسامبوون بە زۆری ژمارەی خۆتانو، ئەو زۆریەش هیچ سوودێکی نەبوو بۆتانو فریاتان نەکەوتو، زەویتان لێ تەسکبوویەوە، بەو هەموو فراوانیەی کە هەیبوو، پاشان پشتتان هەڵکردوو هەڵاتن}.

## ئەگەر مرۆڤی موسوڵمان چاوی بە شکستو دۆڕانی موسوڵمانان کەوت - پەنا بەخوا- چی بڵێت؟

ئەگەر مرۆڤی موسوڵمان چاوی بە شکستو دۆڕانی موسوڵمانان کەوت با پەنا بباتە بەر زیکری خواو داوای لێخۆشبوونی لێ بکاتو، لێی بپاڕێتەوە، کە ئەو بەڵێنەیان بۆ بهێنێتەدی، کە داوێتی بۆ پشتیوانی کردنی ئیماندارانو سەرخستنی ئاینەکەی.

هەروەها ئەو زیکرەش بکات، کە پێشتر هێنامان بۆ بێتاقەتیو خەمو خەفەت: (لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ العَظِيمُ الْحَلِيْمُ، لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ رَبُّ العَرْشِ العَظِيمِ، لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَرَبُّ الْأَرْضِ رَبُّ العَرْشِ الْكَرِيمِ).

هەروەها سونەتە بێجگە لەمە ئەو دوعایانەی تریش بکات کە پێشتر باسمان کردنو، ئەوانەش کە لەمەولا باسیان دەکەین، بۆ ئەو جێگایانەی، کە مەترسیدارنو ئەگەری لەناوچوونیان هەیە.

جا لەباسەکەی پێشووتریشدا (باسی: رَجَز) ئەوەمان وت، کە کاتێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، چاوی بە شکستو ڕاکردنی موسوڵمانان کەوت، لە ئەسپەکەی خۆی دابەزیو، دەستی کرد بە پاڕانەوەو داوای سەرخستن لە خوای پەروەردگار. ئەوەبوو سەرەنجام خوای گەورە سەری خستن. ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي

رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ [الْأَحْزَاب: ٢١] واته: {له فەرمایشتو کردەوەو هەڵسوکەوتەکانی پێغەمبەری خواوە پێشەنگیو ڕابەرایەتیەکی جوان هەیە بۆ ئێوە}.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: کاتێك غەزای ئوحود ڕوویداو، موسوڵمانان پەرتوبڵاو بوون، مامم -کە (أَنَس)ی کوڕی (نَضْر)ە- فەرمووی: خوایە من داوای لێبوردنت لێ دەکەم لەسەر ئەو کارەی کە ئەوانە کردیان (مەبەستی هاوەڵان بوو). خۆیشم بە بەریو بێتاوان دەزانم لەوەی کە ئەوانە کردیان (مەبەستی بێباوەڕەکان بوو). پاشان چوە پێشەوەو، دەستی کردەوە بە شەڕکردن، هەتا شەهید بوو. جا دواتر کە بینیمانەوە، سەیرمان کرد لاشە پیرۆزەکەی هەشتاو ئەوەندە جێگەی لێدانی شمشێر یان ڕم یان تیری پێوە بوو.[1]

## باسی وەسفو ستایشی پێشەوای موسوڵمانان بۆ ئەو کەسەی لە شەڕدا لێهاتوو بوە

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَلَمَة)ی کوڕی (أَكْوَع)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، لەو حەدیسەی درێژەی، کە سەبارەت بە چیرۆکی هێرش کردنی کافرەکان هاتوە بۆسەر ماڵاتو حوشترەکانی شاری مەدینەی پیرۆزو، دزینو بردنی حوشترە شیردەرە تازە زاوەکانو، ڕۆیشتنی (سَلَمَة)و (أَبُو قَتَادَة) بەشوێنیاندا، ئیتر حەدیسەکەی بەدرێژی باس کرد، هەتا گەیشتە ئەوەی کە فەرمووی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٠٣٢ / بە ژمارە: ٢٦٥١.

بێت) فەرمووی: «كَانَ خَيْرَ فُرْسَانِنا الْيَوْمَ أَبُو قَتادَةَ، وَخَيْرَ رَجَّالَتِنا سَــلَمَةَ».[1] واتــە: "ئەمڕۆ باشترین سوارچاکمان بریتی بوو لـە (أَبُو قَتَادَةَ)و، باشـترین پیادەشمـان بریتـی بوو لـە (سَلَمَة)".

## ئەگەر كەسێك لە غەزا گەڕایەوە چی بڵێت؟

چەند حەدیسێك سەبارەت بەم باسە هاتوە، کە ئەگەر خوای گەورە بیەوێت، لـە ((**کتێبی زیکرەکانی سەفەر کردن**))دا دەیانهێنین. تەوفیقیش تەنها بەدەستی خوایە.

* * * * *　　* * * * *　　* * * * *

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٤٣٣ / بە ژمارە: ١٨٠٧. ئەصڵی حەدیسەکە لای ئیمـامی بوخاریش هەیە، بەڵام ئەمە دەقی ڕیوایەتەکەی ئیمامی موسلیمەو، تەنها لەمیشدا پێغەمبـەری خوا ستایشی (أَبُو قَتَادَة)و (سَلَمَة)ی کردوە.

بزانە کە ئـەو زیکرانـەی پێشـتر باسمـان کـردن، لـە شـەوو ڕۆژو لـە حاڵەتـە جیاوازەکاندا سونەتبوون بۆ کەسێك کە لە سەفەردا نـەبێت، بـە هـەمان شـێوە بـۆ کەسی سەفەرکەریش هەر سونەتن. سەرەڕای ئەوەی کە کەسـی سـەفەرکەر چـەند زیکرێکی زیاتریشی هەیە، کە ئەمانەیان مەبەستی سەرەکی ئەم باسەیە.

جا ئەو زیکرانەش گەلێك زۆرو پەرت‌وبڵاون. منـیش –ئەگـەر خـوای گـەورە بیەوێت– زیکرە گرنگەکانیان بە کـورتی دەهێـنم‌و، بـە پشـتیوانی خـوا لـە چـەند باسێکی گونجاودا دەیانخەمە ڕوو.

## باسی داوای خەیرتیابوون و ڕاوێژ کردن (الِاسْتِخَارَةُ وَالِاسْتِشَارَةَ)

بزانە کە ئەو کەسەی خەیاڵی سـەفەرکردن هـاتوە بەمێشـکیدا، سـونەتە ڕاوێـژ بکات بەو کەسەی کە دەزانێت دڵسۆزو بەسۆزو لێزانەو، متمانەشی بە دینـداری‌و شارەزاییەکەی هەیە. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ﴾ [آل عِمْـرَان: ١٥٩].

جا بەڵگەکانی ئەم ڕاوێژ کردنە گەلێك زۆرن.(١)

ئەوجا ئەگەر ڕاوێژی کردو، دەرکەوت کە سـەفەرەکەی بەرژەوەنـدی تێدایـە، ئەوا با بۆ ئەو مەبەستە لەخوای گەورە بپاڕێتەوە کە سەفەرەکەی خەیری تێدا بێت.

---

(١) هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ) فەرموویەتی: هیچ کەسێکم نەبینیوە لـە پێغەمبـەری خـوا زیاتر ڕاوێژ بە هاوەڵەکانی بکات. بڕوانە: مُسْنَدُ الْإِمَامِ الشَّـافِعِيِّ / ٢ / ١٧٧ / بـە ژمـارە: ٦٢٤، ومُسْنَدُ الْإِمَامِ أَحْمَد / ٣١ / ٢٤٣ – ٢٤٤ / بە ژمارە: ١٨٩٢٨، وصَـحِيْحُ ابْـنِ حِبَّان / ١١ / ٢١٦ / بە ژمـارە: ٤٨٧٢، وسُنَنُ الْبَيْهَقِيِّ الْكُبْـرَى / ٧ / ٤٥ / بـە ژمـارە: ١٣٠٨٢.

بەوەی کە دوو ڕکات نوێژی سونەت بکاتو، ئەو دوعایـەی (اسْتِخَارَة) بخوێنێـت، کە پێشتر لە باسەکەی خۆیدا هێنامان.

بەڵگەی (اسْتِخَارَة) کردنیش بریتی بوو لەو حەدیسەی پێشوو، کە لە صەحیحی بوخاریدا هاتبوو. جا هەر لەوێش ئادابەکانی ئەم دوعایەیو، چۆنێتی ئـەم نوێـژەمان باس کرد. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## باسی زیکرەکانی سەفەرکردن دوای بڕیاردان لەسەر کردنی سەفەرەکە

ئەگەر کەسێك بڕیاریدا سەفەر بکات، با هەوڵ بـدات چـەند شـتێك دەسـتەبەر بکات:

با وەسێت بکات بۆ هەر شتێك، کە پێویستی بە وەسێت بـۆ کـردن هەیـەو، بـا شایەتیش لەسەر وەسێتەکەی بگرێتو، گەردنی خۆیشی ئازاد بکات بە هەموو ئـەو کەسانەی، کە مامەڵەیەك یان ڕەفاقەتێکی لەگەڵیانـدا هەیـەو، هـەوڵی ڕەزامەنـدی دایکیو باوکیو، مامۆستاکانیو، ئەو کەسانەش بـدات، کـە پێویسـتی بـە چـاکەو سۆزی ئەوان هەیـەو، بـا تەوبـەش بکـاتو، داوای لێخۆشـبوونی هـەموو تـاوانو سەرپێچیەکانی لـەخوای گـەورە بکـاتو، لێشـی بپاڕێتـەوە کـە یارمـەتی بـداتو پشتیوانی بکات بۆ سەفەرەکەی.

هەروەها با هەوڵی فێربوونی ئەو شتانە بدات، کـە لـە سـەفەرەکەیدا پێویسـتی پێیانە:

جا ئەگەر بۆ غەزا دەچوو، با هەموو ئەو شتانە فێر ببێت، کە کەسی جـەنگاوەر پێویستی پێیانە، لە چۆنێتی شەڕکردنو، نزاو پاڕانەوەکانی کاتی جەنگو، مەسـەلەی دەستکەوتەکانی جەنگو، بەگەورەیی تەماشاکردنی حەرامێتی شکستو دۆڕان لـە جەنگداو...... هەندێك شتی تریش.

هەروەها ئەگەر بۆ حەج یان بۆ عومرە دەچوو، با پایەو ئەرکەکانی حەجکردن فێر ببێت، یان کتێبێك لەوبارەوە لەگەڵ خۆیدا ببات. خۆ ئەگەر فێریان ببێتو کتێبەکەشی پێبێت، ئەوە باشترە.

بەهەمان شێوە کەسی جەنگاوەرو، کەسانی تریش هەر سونەتە کتێبێکی وایان پێبێت، کە ئەوەی پێویستیان پێیەتی تێیدا بێت.

هەروەها ئەگەر کەسێکی بازرگان بوو، با فێری ئەوە ببێت، کە پێویستی پێیەتی لەبارەی کڕینو فرۆشتنەوە، کام مامەڵە دروستەو، کامە نادروستە، کامە حەڵاڵەو، کامە حەرامەو، کامە سونەتەو، کامەش ناپەسەندەو، کامەش ڕەوایەو، کامەش لەکامە باشترو لەپێشترە؟

هەروەها ئەگەر کەسێکی خواپەرستی گەشتکەری کەنارگیربوو، ئەوا با فێری ئەو بابەتە ئاینیانە ببێت، کە پێویستی پێیانە. چونکە ئەوانە گرنگترین شتن کە بەشوێن دەستخستنیاندا بگەڕێت.

هەروەها ئەگەر کەسێکی ڕاوچی بوو، ئەوا با فێری ئەو شتانە ببێت، کە ڕاوچیەکان پێویستیان پێیەتیو، با بشزانێت کام گیانلەبەرە حەڵاڵەو، کامەش حەرامەو، کام ئامرازە حەڵاڵە ڕاوی پێ بکرێتو، کامەش حەرامەو، کام گیانلەبەرە بەمەرجگیراوە سەربڕدرێتو، کامەش هەر ئەوەندە بەسە کە سەگ یان تیر یان شتی تر بیکوژێت.

هەروەها ئەگەر شوانو گاوان بوو، ئەوا با ئەو شتانە فێر ببێت، کە پێویستی پێیانە، لەوانەی کە باسمان کرد بۆ ئەو کەسەی کە کەنارگیری دەکات لە خەڵکی. هەروەها با فێری ئەوەش ببێت، کە نەرمونیانو بەبەزەیی بێت بەرامبەر ئاژەڵانو، دڵسۆز بێت بۆ ئاژەڵەکانو بۆخاوەنەکانیشیانو، بە وردیو بە وریاییەوە چاودێریان بکاتو بیانپارێزێت. هەروەها با داوای مۆڵەت بکات لە خاوەنەکانیان، بۆ

سەربڕینی ئەو ئاژەڵانەی لە هەندێك كاتدا لەبەر پێشهاتێك پێویستیان بە سەربڕین هەیەو...... هەندێك شتی تریش.

هەروەها ئەگەر نیردراوی فەرمانڕەوایەك بوو بۆلای فەرمانڕەوایەكی تر، یان كەسێكی لەو جۆرە بوو، ئەوا با بایەخ بدات بە فێربوونی ئەوەی پێویستی پێیەتی، لە چۆنێتی قسە كردن لەگەڵ پیاوە گەورەكانداو، وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی لەكاتی گفتوگۆدا بۆی دێنەپێش. هەروەها با بایەخ بەوە بدات كە چی جۆرە میوانداریو بەخششێكی بۆ حەڵاڵەو، چی جۆرێكیشی بۆ حەڵاڵ نیە. هەروەها پێویستە دڵسۆز بێتو، ئەوەی لەناخیدایە بیخاتەدەرو، ناپاكیو فێڵو درۆ نەكاتو، خۆشی لەوە بپارێزێت، كە ببێتە هۆكار بۆ سەرەتای دەركەوتنی ناپاكیو ئەو شتانەی كە حەرامنو...... هەندێك شتی تریش.

هەروەها ئەگەر بریكاری كەسێك بوو، یان بە قازانج بەشەراكەت كاری دەكرد، یان كەسێكی لەو جۆرە بوو، ئەوا با فێری ئەو شتانە ببێت، كە پێویستی پێیانە، وەكو ئەوەی كە چی شتێك دروستە بكڕێتو، چی شتێك دروست نیەو، شت بەچی بفرۆشێتو بەچی نەیفرۆشێتو، تەصەڕوف لە چیدا بكاتو، لە چیدا نەیكات، شایەت گرتن لە چی مامەڵەیەكدا مەرجەو پێویستە، لە چیشدا مەرج نیەو پێویست نیەو، چی جۆرە سەفەرێكی بۆ دروستەو، چی جۆرێكی بۆ دروست نیە.

جا هەموو ئەم كەسانەی باسمان كردن، ئەگەر ویستیان گەشتی دەریایی بكەن، پێویستە بزانن لە چی كاتێكو لە چی بارودۆخێكدا گەشتی دەریایی دەكرێتو، لە چی كاتێكیشدا نابێت بكرێت.

ئەوجا هەموو ئەمانە لە كتێبە فیقهیەكاندا باس كراونو، لەم كتێبەدا ناكرێت بەدرێژی باس بكرێنو، مەبەستی منیش لێرەدا تایبەت باسی زیكرەكانیانە.

جا فێربوونی ئەو شتانە بەشێکە لە زیکرەکان، وەکو لە سـەرەتای ئـەم کتێبـەدا باسم کردو، داوای تەوفیقو عاقیبەت خەیری لـەخوای گـەورە دەکـەم بـۆ خـۆمو خۆشەویستەکانمو موسوڵمانانیش بەتێکڕا.

## باسی ئەو زیکرانەی کەسی سەفەرکەر دەیانکات، کاتێك دەیەوێت لەماڵ بچێتە دەرەوە

کاتێك کەسێك دەیەوێت لـەماڵ بچێتە دەرەوە، سونەتە دوو ڕکات نوێژ بکـات. لـەبەر ئەو حەدیسـەی (مُقَطَّم)ی کوڕی (مِقْدَام)ی (صَحَابِيّ) (خوای لێ ڕازی بێـت)، کـە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، فەرموویەتی: «ما خَلَّفَ أحَدٌ عِنْدَ أَهْلِهِ أفْضَلَ منْ رَكْعَتَيْنِ يَرْكَعُهُما عنْدَهُمْ حِيْنَ يُرِيدُ سَفَراً». واتە: "هیچ کەسێك لـەو دوو ڕکـات نوێـژە باشـتری بەجێنەهێشـتوە لای مـاڵو منـداڵو خێزانەکـەی، کـە لای ئـەوان کردوونی، کاتێك ویستوویەتی سەفەر بکات". ئیمامی (طَبَرانِيّ) ڕیوایەتی کردوە.[1]

---

(١) شێخی عەسقەلانی فەرمودیەتی: لـەم فەرمایشتەی ئیمامی نەوەویدا چەند تێبینیەك هەیە:

- یەکەم: ئەو لـە ناوی ڕاویەکەدا نوسیوێتی (مُقَطَّم). بـەلاّم ئـەوە هەڵـەیـەو، ڕاسـتەکەی بریتیە لـە (مُطْعِم).
- دوەم: نوسیوێتی ئەم ڕاویە (صَحَابِيّ)ـە. واتە یەکێکە لـە هـاوەڵان. بـەلاّم ڕاسـتەکەی
دوەم: نوسیوێتی ئەم ڕاویە (صَحَابِيّ)ـە. واتە یەکێکە لـە هـاوەڵان. بـەلاّم ڕاسـتەکەی ئەوەیە، کە ئەو (صَنْعَانِيّ)ـەو، نیسبەت دراوە بۆلای (صَنْعَاء)ی دیمەشق، وتراویشە:
ئەوەیە، کە ئەو (صَنْعَانِيّ)ـەو، نیسبەت دراوە بـۆلای (صَنْعَاء)ی دیمەشـق، وتراویشـە: نیسبەت دراوە بۆلای (صَنْعَاء)ی یەمەن، کە لە ئەصڵدا خەڵکی ئـەوێ بـوەو، دواتـر هاتوە بۆ وڵاتی شام. جا ئەم کەسە لـە سەردەمی شوێنکەوتواندا ژیاوەو، سابتیش نـەبوە کـە حەدیسـی لــە هاوەڵانــەوە بیسـتبێت. بـەڵکو زۆربـەی ڕیوایەتـەکانی هـەر لــە شوێنکەوتوانەوەیە.

هەندێك لە هاوەڵانمان فەرموویانە: سونەتە لە ڕکاتی یەکەمی نوێژەکەدا سورەتی ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾ بخوێنێت و، لە ڕکاتی دوەمیشدا سورەتی ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ بخوێنێت.(١)

هەندێکیشیان فەرموویانە: لە ڕکاتی یەکەمدا لەدوای سورەتی (الْفَاتِحَــة)وە سورەتی ﴿قُلْ أعُوذُ بِرَبّ الفَلَقِ﴾ بخوێنێت و، لە ڕکاتی دوەمیشدا ﴿قُلْ أعُوذُ بِرَبّ النَّاسِ﴾.

جا کە سڵاوی دایەوە، با (آيَةُ الْكُرْسِيّ) بخوێنێت. چونکە هاتوە، کە هەر کەسێك پێش دەرچوونی لەماڵ (آيَةُ الْكُرْسِيّ) بخوێنێت، هەتا دەگەڕێتەوە شتێکی توش نابێت کە پێی ناخۆش بێت.(٢)

---

- سێیەم: کە فەرموویەتی: (ئیمامی (طَبَرانِــيّ) ڕیوایەتی کردوە)، لەگەڵ ئەوەدا کە فەرموویەتی: (صَحَابِيّ)ـە. زیاتر وای لێوەردەگیرێت، کە ئەم حەدیسە لە (الْمُعْجَـمُ الْكَبِيْـر)دا بێت، کە حەدیسی هاوەڵانی تێدایە. کەچی حەدیسەکە لە کتێبی (الْمَنَاسِك)ی ئیمامی (طَبَرانِيّ)دایە. بڕوانە: تُحْفَةُ الْأبْرَار / ١٠٠ – ١٠١، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ١٠٥.

(١) شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ئیمامی (حَاكِم) لە کتێبی (تَأْرِيْخُ نَيْسَابُوْر)دا حەدیسێکی لە هاوەڵی خۆشەویست (أنَس)ـەوە ڕیوایەت کردوە، کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: با لە هەر ڕکاتێکدا سورەتی ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ بخوێنێت. پاشان فەرموویەتی: ڕەنگە ئیمامی نەوەوی بەخزمەتی ئەم حەدیسە نەگەیشتبێت و، ئەم دوو ڕکاتە نوێژەشی قیاس کردبێتە سەر دوو ڕکاتە نوێژە سونەتەکەی پێش نوێژی بەیانی. بڕوانە: تُحْفَةُ الْأبْرَار / ١٠٢، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ١٠٧.

(٢) شێخی عەسقەلانی و ئیمامی (سَخَاوِيّ) فەرموویانە: ئەم حەدیسەمان بەم دەقە نەبینیوە. بڕوانە: تُحْفَةُ الْأبْرَار / ١٠٢، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ١٠٨.

سونەتیشە سورەتی ﴿لِإِيلافِ قُرَيْشٍ﴾ بخوێنێت. چونکە پێشەوای پایەبەرز (أَبو الْحَسَن)ی (قَزْوِيْنِيّ)، کە یەکێکە لە شەرعزانە ناودارەکانی مەزهەبی ئیمامی (شَافِعِيّ)و، خاوەنی چەندین کەرامەتی ئاشکراو، ئەحوالّی درەوشاوەیە، ئەو فەرموویەتی: ئەو سورەتە پارێزەرە لە هەموو خراپەو ناخۆشیەك.

زانای پایەبەرز (أَبو طَاهِر)ی کوڕی (جَحْشَوَيْه) فەرموویەتی: دەمویست سەفەرێك بکەمو، لێیشی دەترسام. بۆیە چووم بۆ خزمەتی شێخی (قَزْوِيْنِيّ)، تا داوای دوعای خەیری لێ بکەم. ئەویش -بەر لەوەی من هیچ بڵێم- فەرمووی: هەر کەسێك ویستی سەفەر بکاتو، لە دوژمن یان لە دڕندە دەترسا، با سورەتی ﴿لِإِيلافِ قُرَيْشٍ﴾ بخوێنێت. چونکە ئەو سورەتە پارێزەرە لە هەموو خراپەو ناخۆشیەك. ئیتر منیش ئەو سورەتەم خوێندو، هەتا ئێستەش تووشی هیچ شتێك نەبوم.

ئەوجا ئەگەر لە خوێندنەوەی سورەتەکە بوویەوە، سونەتە بە ئیخلاصو بەدڵنەرمیەوە بپاڕێتەوەو دوعا بکات.

جا باشترین شتێك کە بیڵێت بریتیە لە: (اللَّهُمَّ، بِكَ أَسْتَعِينُ، وَعَلَيْكَ أَتَوَكَّلُ. اللَّهُمَّ، ذَلِّلْ لِي صُعُوبَةَ أَمْرِي، وَسَهِّلْ عَلَيَّ مَشَقَّةَ سَفَرِي، وَارْزُقْنِي مِنَ الْخَيْرِ أَكْثَرَ مِمَّا أَطْلُبُ، وَاصْرِفْ عَنِّي كُلَّ شَرٍّ، رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي، وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي. اللَّهُمَّ، إِنِّي أَسْتَحْفِظُكَ وَأَسْتَوْدِعُكَ نَفْسِي وَدِيْنِي وَأَهْلِي وَأَقَارِبِي وَكُلَّ مَا أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَيْهِمْ بِهِ مِنْ آخِرَةٍ وَدُنْيا، فَاحْفَظْنَا أَجْمَعَيْنَ مِنْ كُلِّ سُوْءٍ يَا كَرِيْمُ). واتە: (خوایە من تەنها داوای کۆمەکیو پشتیوانی لەتۆ دەکەمو، پشتیش هەر بەتۆ دەبەستم. خوایە ناڕەحەتیو زەحمەتی ئەم کارو سەفەرەم بۆ ئاسان بکەو، لەوەش زیاتر ڕزقی خەیرم بدە، کە خۆم داوای دەکەمو، هەموو شەڕو خراپەیەکیشم لێ لادە. ئەی پەروەردگار، دڵو سینەم گوشادو ڕۆشن بکەرەوەو، کاروبارم بۆ ئاسان بکە. خوایە داوای پاراستنو ئاگا لێبوونی ڕۆحو گیانو ئاینو خێزانو منداڵەکانمو خزمەکانمو،

هەموو ئەو خەیرو بێرانەی دنیاو دوارۆژیشت لێ دەکەم، کە بە خۆمو بە ئەوانیشت بەخشیوە، تۆش هەموومان لە گشت خراپەیەك بپارێزە، ئەی خوای بەخشندە).

هەروەها با لە سەرەتاو لە کۆتایی نزاو پاڕانەوەکەیدا سوپاس و ستایشی خوای پەروەردگار بکات و، درودو سڵاو بنێرێت بۆسەر ڕۆحی پیرۆزی پێغەمبەری خوا (درووودی خوای لەسەر بێت).

پاشان کە لە جێگەی خۆی هەستا، با ئەوە بڵێت، کە لە هاوەڵی خۆشەویست (أنس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت) بۆمان ڕیوایەت کراوە، کە پێغەمبەری خوا (درووودی خوای لەسەر بێت)، هەر کەی بیویستایە سەفەرێك بکات، لەکاتی هەستانیدا دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، إِلَيْكَ تَوَجَّهْتُ، وَبِكَ اعْتَصَمْتُ. اللَّهُمَّ، اكْفِنِي مَا هَمَّنِي، وَمَا لا أَهْتَمُّ لَهُ. اللَّهُمَّ، زَوِّدْنِي التَّقْوَى، وَاغْفِرْ لِي ذَنْبِي، وَوَجِّهْنِي لِلْخَيْرِ أَيْنَمَا تَوَجَّهْتُ».[1] واتە: "خوایە تەنها ڕوو لە لوتفی تۆ دەکەم و، پشتیش بەتۆ دەبەستم. خوایە خۆت ئەو کارانەم بۆ جێبەجێ بکە، کە گرنگن بەلامەوەو، ئەوانەش کە گرنگ نین بەلامەوە. خوایە ترسی خۆت بخەرە دڵمەوەو، لە تاوانم خۆشبەو، بۆ هەرکوێش ڕۆیشتم، بەرەو خێرو چاکە ئاراستەم بکە".

## باسی زیکرەکانی سەفەرکردن ئەگەر کەسەکە لەماڵ چوە دەرەوە

لە سەرەتای ئەم کتێبەوە ئەوەمان باس کرد، کە ئەو کەسەی لەماڵ دەردەچێت چی دەڵێت. جا ئەو زیکرە بۆ کەسی سەفەرکەریش هەر سونەتەو، سونەتیشە زۆری بکات و، سونەتیشە خواحافیزی و ماڵاوایی لە خێزان و خزم و کەس و کارو هاوڕێ و دراوسێکانی بکات و، داوای دوعای خەیریان لێ بکات و، دوعاشیان بۆ بکات.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ الْبَيْهَقِيِّ الْكُبْرَى / ٥ / ٢٥٠ / بە ژمارە: ١٠٠٨٦، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيِّ) / ٢٣٣ / بە ژمارە: ٤٩٥، والدُّعَاء لِلطَّبَرَانِيّ / ٢٥٥ / بە ژمارە: ٨٠٥. حەدیسێکی لاوازە. بڕوانە: الْفُتُوحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ١١١ - ١١٢.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (مُسْنَد)ی ئیمامی (أَحْمَد)ی کوڕی (حَنْبَل)و لە غەیری ئەویشدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «إِنَّ اللهَ تَعَالَى إِذَا اسْتُودِعَ شَيْئاً، حَفِظَهُ».[1] واتە: "بەڕاستی خوای گەورە ئەگەر شتێکی پێ سپێردرا، دەیپارێزێت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)و لە غەیری ئەویشدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ أَرَادَ أَنْ يُسافِرَ، فَلْيَقُلْ لِمَنْ يُخَلِّفُ: أَسْتَوْدِعُكُمُ اللَّهَ الَّذِي لا تَضِيعُ وَدَائِعُهُ».[2] واتە: "ئەو کەسەی دەیەوێت سەفەرێك بکات، با بەو کەسانە بڵێت، کە بەجێیان دەهێڵێت: (بەو خوایەتان دەسپێرم، کە پێسپێردراوەکانی نافەوتێن)".

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «إِذَا أَرَادَ أَحَدُكُمْ سَفَراً، فَلْيُوَدِّعْ إِخْوَانَهُ، فَإِنَّ اللهَ تَعَالَى جَاعِلٌ فِيْ دُعَائِهِمْ خَيْرًا».[3]

---

(١) بڕوانە: مُسْنَدُ الْإِمَامِ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَل / ٩ / ٤٣٠ / بە ژمارە: ٥٦٠٥، وسُنَنُ النَّسَائِيّ الْكُبْرَى / ٦ / ١٣١ / بە ژمارە: ١٠٣٤٣. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ١١٣.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٣٨ / بە ژمارە: ٥٠٥. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ١١٤.

(٣) ئیمامی نەوەوی نەیفەرموە ئەم حەدیسەی لە کوێوە بۆ ڕیوایەت کراوە! بەڵام بڕوانە: مُسْنَدُ أَبِيْ يَعْلَى / ١٢ / ٤٢ / بە ژمارە: ٦٦٨٦، والْمُعْجَمُ الْأَوْسَط / ٣ / ١٧٥ / بە ژمارە: ٢٨٤٢. هەروەها حەدیسەکەش زۆر لاوازە. بڕوانە: مَجْمَعُ الزَّوَائِد / ٣ / ٢١٠ / بە ژمارە: ٥٢٨٤، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ١١٥ - ١١٦.

واته: "ئەگەر یەکێك لە ئێوە ویستی سەفەرێك بکات، با ماڵاوایی‌و خواحافیزی لـە براکانی بکات. چونکە خوای گەورە خەیر دەخاتە دوعاکانیانەوە".

سونەتە ئەو کەسەی خواحافیزی لێ دەکات، ئەوەی پێ بڵێت، کـە لـە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)دا، لـە شوێنکەوتووی پایەبەرز (قَزَعَة یان قَزْعَة)ی کوڕی (يَحْيَى)وە بۆمان ڕیوایەت کراوە، کە فەرموویەتی: هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر) (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، پێی فەرمووم: وەرە با بەو جۆرە خواحافیزیت لێ بکەم کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) خواحافیزی لێ کردم‌و، فـەرمووی: «أَسْتَوْدِعُ اللَّـهَ دِيْنَـكَ وَأَمَانَتَـكَ وَخَـوَاتِيمَ عَمَلِـكَ».[1] واتـە: "ئاینەکـەت‌و ئەمانەتەکـەت‌و دوایینـی کردەوەکانت بەخوا دەسپێرم".

ئیمامی (خَطَّابِيّ) فەرموویـەتی: ئەمانـەت لێـرەدا بریتیـە لـە خێزانەکـەی‌و ئـەو کەسانەی بەجێیان دەهێڵێت‌و، ئەو ماڵەش کە لەلای کەسێکی متمانەدار دایناوە.

هەروەها فەرموویەتی: بۆیـە لێـرەدا باسـی ئاینیشـی کـردوە، چـونکە زۆرجـار سەفەرکردن ماندوبوون‌و ناڕەحەتی تێدایە، کـە ڕەنگـە هەنـدێك جـار ببێتـە هـۆی فەرامۆشکردن‌و پشتگوێخستنی هەندێك کاروباری ئاینی.

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە (نَافِع)ـەوە، ئەویش لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَـر)ەوە (خـوا لـە هـەردووکیان ڕازی بێـت)، کـە ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، خواحافیزی لـە کەسێك بکردایـە، دەستی دەگرت‌و، بەری نەدەدا، تاوەکو ئەو دەسـتی ئـەمی بەرنەدایـە، ئـەوجا پێـی دەفەرموو: «أَسْتَوْدِعُ اللَّهَ دِيْنَكَ وَأَمَانَتَكَ وَآخِرَ عَمَلِكَ».[2]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٣٩ / بە ژمـارە: ٢٦٠٠. شـێخی عەسـقەلانی فەرموویـەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ١١٦.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٩٩ / بە ژمارە: ٣٤٤٢.

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە (سَالِم)ـەوە، کە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَـــر) (خـوا لـە هـەردووکیان ڕازی بێـت)، بـەو کەسـەی دەفەرموو، کە دەیویست سەفەر بکـات: وەرە نزیـك بـەرەوە لـێم، تـا بـەو جـۆرە خواحافیزیت لێ بکەم، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، خواحـافیزی لـە ئێمە دەکرد: «أَسْتَوْدِعُ اللَّهَ دِيْنَكَ وَأَمَانَتَكَ وَخَوَاتِيمَ عَمَلِكَ».

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُـــنَن)ی (أَبُــو دَاوُد)و لــە غـەیری ئەویشـدا، بـە ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (عَبْـدُالله)ی کـوڕی (يَزِيْــد)ی (خَطْمِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویـەتی: ئەگـەر پێغەمبـەری خـوا (دروودی خوای لەسەر بێـت)، بیویستایە خواحافیزی لە سوپای موسوڵمانان بکـات، دەیفـەرموو: «أَسْتَوْدِعُ اللَّهَ دِيْنَكُمْ وَأَمَانَتَكُمْ وَخَوَاتِيمَ أَعْمَالِكُمْ».[2]

بۆشـان ڕیوایـەت کـراوە لـە کتێبەکـەی ئیمـامی (تِرْمِـــذِيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، کـە فەرموویـەتی: پیاوێـك هـات بـۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)و، عـەرزی کـرد: ئـەی پێغەمبـەری خوا، دەمەوێت سەفەرێك بکەم، بۆیە هەنـدێك زانیـاریم فێـر بکـە وەکـو توێشـوو پێمبێت. ئەویش فەرمووی: «زَوَّدَكَ اللَّهُ التَّقْوَى» واتە: "خوای گەورە تـەقوا بکـات بە توێشوو بۆت". پیاوەکەش عەرزی کردەوە: قوربان بۆم زیـاد بکـە. پێغەمبـەریش فەرمووی: «وَغَفَرَ ذَنْبَكَ» واتە: "لە تاوانیشت خـۆش ببێـت". پیاوەکـەش عـەرزی کردەوە: قوربان بۆم زیاد بکە. پێغەمبەریش فـەرمووی: «وَيَسَّرَ لَكَ الْخَيْـرَ حَيْثُمَـا كُنْتَ» واتە: "لە هەرکوێ بیت، خوا کاری خەیرت بۆ ئاسان بکات".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٩٩ / بە ژمارە: ٣٤٤٣.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٣٩ / بە ژمارە: ٢٦٠١.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٠٠ / بە ژمارە: ٣٤٤٤.

## سونەتە کەسی ڕێبوار داوای ئامۆژگاری لە کەسانی چاکەکار بکات

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پیاوێك عەرزی پێغەمبەری خوای کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، دەمەوێت سەفەر بکەم، جا ئامۆژگاریم بکە. ئەویش فەرمووی: «عَلَيْكَ بِتَقْوَى اللَّهِ تَعَالَى، وَالتَّكْبِيرِ عَلَى كُلِّ شَرَفٍ». واتە: "لەخوای گەورە بترسەو، لەسەر هەموو جێگەیەکی بەرزیشدا (اللهُ أَكْبَر) بکە". جا کە پیاوەکە پشتی هەڵکردو ڕۆیشت، پێغەمبەر فەرمووی: «اللَّهُمَّ، اطْوِ لَهُ الْبَعِيدَ، وَهَوِّنْ عَلَيْهِ السَّفَرَ». واتە: "خوایە ڕێگەی دووری بۆ بپێچەرەوەو کورتی بکەرەوە، زەحمەتو نارەحەتی سەفەرەکەشی لەسەر ئاسان بکە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

## سونەتە کەسی دانیشتوو وەسێت بۆ کەسی ڕێبوار بکات، کە لە جێگە چاکەکاندا دوعای خەیری بۆ بکات، باوەکو کەسە دانیشتوەکەش لە کەسە ڕێبوارەکە باشتر بێت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و لە غەیری ئەوانیشدا، لە ئیمامی (عُمَر)ی کوڕی (خَطَّاب)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: داوام کرد لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە ڕێگەم پێ بدات عومرە بکەم، ئەویش ڕێگەی پێدامو، فەرمووی: «لا تَنْسَنا يَا أُخَيَّ مِن دُعائِكَ». جا شتێکی فەرموو، ئەوەندەم پێی خۆشە، کە بەهەموو دنیای ناگۆڕمەوە.

---

(١) ئەمە دەقی ڕیوایەتەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)ـەو، لە نوسخە بەچاپگەیەنراوەکانیشدا بەم جۆرە هاتوە: «اللَّهُمَّ اطْوِ لَهُ الأَرْضَ».بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٠٠ / بە ژمارە: ٣٤٤٥، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ٩٢٦ / بە ژمارە: ٢٧٧١.

لە ڕیوایەتێکیشدا هاتوە، کە پێغەمبەر فەرموویەتی: «أَشْـرِكْنا يَـا أخِـيْ فِـيْ دُعَائِكَ». واتە: " براله، یان برا، لە نزاو پاڕانەوەی خۆت فـەرامۆشمان مەکـە، یـان بەشدارمان بکە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[1]

## ئەگەر کەسی سەفەرکەر سواری ولاخ بوو چی بلێت؟

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلَ لَكُمْ مِنَ الْفُلْكِ وَالْأَنْعَامِ مَا تَرْكَبُونَ * لِتَسْتَوُوا عَلَى ظُهُورِهِ ثُمَّ تَذْكُرُوا نِعْمَةَ رَبِّكُمْ إِذَا اسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ وَتَقُولُوا سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَـا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ * وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُونَ﴾ [الزُخرُف: ١٢ - ١٤] واتـە: {خـوای گەورە لـە کەشتیو لــە چـوارپێو ولاخـیش هۆکـاری سـواریو گواسـتنەوەی بـۆ فەراهەم کردوون. تا بەڕێکی لەسەر پشـتیان جـێگیربنو دانیشـنو، پاشـان ئەگـەر ڕێکبوونەوەو دانیشتن بیری نازو نیعمەتی پـەروەردگارتان بکەنـەوەو، بڵـێن: پـاكو بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە ئەم هۆکارەی بۆ ڕام کردینو، ئەگـەر لـوتفی ئـەویش نەبوایە ئێمە توانای سواربوونیمان نەبوو. بەڕاسـتی ئێمـەش بـۆلای پـەروەردگارمان دەگەڕێینەوە}.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکانی ئیمامی (أَبوْ دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ)دا، بە چەند ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە زانای پایەبەرزی شوێنکەوتوان (عَلِـيّ)ی کـوڕی (رَبِيْعَة)وە، کە فەرموویەتی: جارێك بینیم کە ولاخێکیان هێنا بـۆ ئیمـامی (عَلِـيّ)ی کوڕی (أَبِيْ طَالِب) (خوای لێ ڕازی بێت)، بۆئەوەی سواری ببێت. جا کە پێی کردە نـاو پێزینەکەیدا، فەرمووی: (بِسْمِ اللهِ). ئەوجا کە سواری بوو، فەرمووی: (الْحَمْدُ لِلّهِ).

---

(١) بروانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٧٠ / بە ژمـارە: ١٤٩٨، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٥٩ / بـە ژمارە: ٣٥٦٢.

پاشان فەرمووی: (سُبْحانَ الَّذي سَخَّرَ لَنا هَذَا، وَما كُنَّا لَهُ مُقْـرِنِيْنَ، وَإِنَّـا إِلى رَبِّنَـا لَمُنْقَلِبُونَ). واتە: (پاكو بێگەردی بـۆ ئـەو خوایـەی كـە ئەمـەی بـۆ ڕام كـردینو، پێشتریش تواناو دەسەڵاتمان نەبوو بەسەریداو، بەڕاستی لـە كۆتاییشـدا هـەر بـۆلای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە). ئەوجا سێ جار فەرمووی (الْحَمْدُ لِلَّهِ)و، سێ جاریش فەرمووی: (اللَّهُ أَكْبَرُ)و، پاشان فەرمووی: (سُبْحانَكَ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي، فَاغْفِرْ لِـي، إِنَّهُ لا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ). واتـە: (پـاكو بێگـەردی بـۆ تـۆ ئـەی پـەروەردگار، بەڕاستی من ستەمم لەخۆم كردوە، تۆش لێم خۆشبە، چونكە بێجگە لە تـۆ، كـەس لـە تاوانەكان خۆش نابێت). ئەوجا پێكـەنی. جـا پرسـیاری لێكـرا: ئـەی پێشـەوای باوەڕداران، بەچی پێدەكەنیت؟ ئەویش فـەرمووی: پێغەمبـەری خـوام بینـی (دروودی خوای لەسەر بێت)، وەهای كرد كە من كردمو، پاشان پێكەنی. منیش عەرزم كرد: ئەی پێغەمبەری خوا، بەچی پێدەكەنیت؟ ئەویش فـەرمووی: «إِنَّ رَبَّكَ سُبْحَانَهُ يَعْجَبُ مِنْ عَبْدِهِ إِذَا قالَ: "اغْفِرْ لِي ذُنُوْبِي" يَعْلَمُ أَنَّهُ لا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ غَيْرِي». واتـە: "بەڕاسـتی پەروەردگارت ئەو قسەی بەندەكـەی زۆر پـێ خۆشـە، كـە دەڵێـت: (خوایـە لـێم خۆشبە). كە دەزانێت بێجگە لـە من كەسی تر لـە تاوانەكان خۆش نابێت".

جا ئەمە دەقی ڕیوایەتەكەی ئیمامی (أَبُوْ دَاوُد)ە.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێكی (حَسَن)ـە.

لـە هەندێك نوسخەشدا فەرموویەتی: حەدیسێكی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لـە صەحیحی موسلیمدا، لـە (كِتَابُ الْمَنَاسِك)دا، لـە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللهِ)ی كوڕی ئیمامی (عُمَر)ەوە (خوا لە هەردوكیان ڕازی بێت)، كە ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، سواری حوشترەكەی بوایەو تەشریفی ببردایە بۆ سەفەر، سێ جار (اللَّهُ أَكْبَر)ی دەكردو، پاشان دەیفەرموو:

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٤٠ / بە ژمارە: ٢٦٠٢، وسُنَنُ التِّرْمِـذِيّ / ٥ / ٥٠١ / بـە ژمارە: ٣٤٤٦، وسُنَنُ النَّسَائِيّ الْكُبْرَى / ٥ / ٢٤٧ / بە ژمارە: ٨٧٩٩.

«سُبْحانَ الَّذي سَخَّرَ لَنا هَذَا، وَما كُنَّا لَهُ مُقْرِنِيْنَ، وَإِنَّا إِلَى رَبِّنا لَمُنْقَلِبُونَ. اللَّهُمَّ، إِنَّا نَسأَلُكَ فِي سفَرِنَا هَذَا البِرَّ وَالتَّقْوَى، وَمِنَ العَمَلِ مَا تَرْضَى. اللَّهُمَّ، هَوِّنْ عَلَيْنا سَفَرَنَا هَذَا، وَاطْوِ عَنَّا بُعْدَهُ. اللَّهُمَّ، أَنْتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ، وَالْخَلِيفَةُ فِي الْأَهْلِ. اللَّهُمَّ، إِنِّي أَعُوْذُ بِكَ مِنْ وَعْثاءِ السَّفَرِ، وَكَآبَةِ الْمَنْظَرِ، وَسُوءِ الْمُنْقَلَبِ فِي الْمَالِ وَالْأَهْلِ». واته: " پاكو بێگەردی بۆ ئەو خوایەی ئەمەی بۆ ڕام كردین‌و، پێشتریش تواناو دەسەلاتمان نەبوو بەسەریداو، بەڕاستی لە كۆتاییشدا هەر بۆلای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە. خوایە ئێمە لەم سەفەرەماندا داوای خەیرو چاكەو لەخواترسانت لێ دەكەین‌و، داوای ئەو كردەوەشت لێ دەكەین، كە خۆت پێی ڕازیت. خوایە ناڕەحەتیەكانی ئەم سەفەرەمان لەسەر سووكو ئاسان بكەو، دووریەكەیمان بۆ بپێچەرەوەو نزیكی بخەرەوە بۆمان. خوایە تۆ هاوڕێی ڕاستەقینەی ئەم سەفەرەیت‌و، تۆش جێگەنشینی ئێمەو چاودێری ماڵو منداڵو كەس‌وكارمانی. خوایە من پەنا بەتۆ دەگرم لە ناڕەحەتی‌و زەحمەتی ئەم سەفەرەو، لە بینینی دیمەنی دڵتەنگكەرو خەمناكو، لە هاتنەوە بەسەر ناڕەحەتی‌و خراپەی ماڵو منالو كەس‌وكاردا". هەروەها ئەگەر بشگەڕایەتەوە، هەمان فەرمایشتی دەكردو، ئەمەشی بۆ زیاد دەكرد: «آيِبُونَ تَائِبُوْنَ عَابِدُوْنَ لِرَبِّنَا حَامِدُوْنَ».[1] واته: "وا دەگەڕێینەوە بۆ ناو ماڵو منداڵو، تەوبەو پەشیمانی دەردەبڕین لە تاوانەكانمان‌و، بەندایەتی هەر بۆ پەروەردگارمان دەكەین‌و، سوپاس‌و ستایشی ئەویش دەكەین ".

جا ئەمە دەقی ڕیوایەتەكەی ئیمامی موسلیمە.

ئیمامی (أَبُوْ دَاوُد)یش لە ڕیوایەتەكەی خۆیدا ئەمەی بۆ زیاد كردوە: ئەگەر پێغەمبەری خواو سوپاكەی بەسەر تەپۆڵكەو گردێكدا سەربكەوتنایە، (اللهُ أَكْبَر)یان دەكردو، ئەگەر داشبەزینایە تەسبیحاتیان دەكرد.[2]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٩٧٨ / بە ژمارە: ١٣٤٢.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٣٩ / بە ژمارە: ٢٥٩٩.

هەروەها لەڕێگەی کۆمەڵە هاوەڵێکی تریشەوە مانای ئەم حەدیسەمان بۆ ڕیوایەت کراوەو، حەدیسەکەشیان داوەتە پاڵ پێغەمبەری خوا (درووودی خوای لەسەر بێت).

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللهِ)ی کوڕی (سَرْجِس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (درووودی خوای لەسەر بێت)، تەشریفی ببردایە بۆ سەفەر، پەنای بەخوای گەورە دەگرت لە نارەحەتیو زەحمەتەکانی سەفەرەکەو، لە بێتاقەتیو دڵتەنگی کاتی گەڕانەوەو، لە گەڕانەوە لە باشیەوە بەرەو خراپیو، لە دوعای کەسی ستەملێکراوو، لە بینینەوەی کەس‌وکارو ماڵ بەشێوەیەکی خراپو ناخۆش.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و کتێبەکەی ئیمامی (نَسَائِيّ)و کتێبەکەی ئیمامی (ابْنُ مَاجَه)دا، بە چەند ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللهِ)ی کوڕی (سَرْجِس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درووودی خوای لەسەر بێت)، ئەگەر سەفەری بکردایە، دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، أنْتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ، وَالْخَلِيْفَةُ فِي الْأهْلِ. اللَّهُمَّ، إنِّي أعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثاءِ السَّفَرِ، وَكَآبَةِ الْمُنْقَلَبِ، وَمِنَ الْحَوْرِ بَعْدَ الْكَوْنِ، وَمِنْ دَعْوَةِ الْمَظْلُومِ، وَمِنْ سُوءِ الْمَنْظَرِ فِي الْأهْلِ وَالْمَالِ».

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[2]

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: هەروەها بە (الْحَوْرِ بَعْدَ الْكَوْرِ)یش ڕیوایەت کراوە. مەبەستی ئەوەیە، کە بە (الْكَوْن)و بە (الْكَوْر)یش ڕیوایەت کراوە.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٩٧٩ / بە ژمارە: ١٣٤٣.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٩٩ / بە ژمارە: ٣٤٣٩، وسُنَنُ النَّسَائِيّ الْكُبْرَى / ٥ / ٢٤٨ / بە ژمارە: ٨٨٠١، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٢٧٩ / بە ژمارە: ٣٨٨٨.

**هەروەها فەرموویەتی: هەردووکیان لەڕوویماناوە دەگونجێن. دیسان فەرموویەتی: دەوترێت: ماناکەیان بریتیە لە گەڕانەوە لە باوەڕداریەوە بۆ کافربوون، یان لە گوێڕایەڵیەوە بۆ یاخیبوون. واتە: گەڕانەوەیە لە شتێکەوە بۆ شتێکی خراپ. جا ئەمە ئەمە فەرمایشتی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)ــە.**

**زانایانی تریش فەرموویانە: مانای هەردوو وشەکە (واتە: الْكَوْن و الْكَوْر) بریتیە لە گەڕانەوە لە هاوسەنگی، یان زیادبوونەوە بەرەو کەمکردن.**

**دیسان فەرموویانە: ڕیوایەتی (الْكَوْر) لە پێچانەوەو لول کردنو کۆکردنەوەی مێزەرەو جامانیەوە هاتوەو، ڕیوایەتی (الْكَوْن)یش لە چاوگی (كَانَ يَكُوْنُ كَوْناً) وەرگیراوە، کە بەمانای بوونو جێگیربوون دێت.**

**منیش دەڵێم: ڕیوایەتی (الْكَوْن) لە ڕیوایەتی (الْكَوْر) زیاترەو، لە زۆربەی نوسخە ئەصڵیەکانی صەحیحی موسلیمیشدا هەر ئەو هاتوەو، بەڵکو هەر ئەویش مەشهورە.**

## ئەگەر كەسی سەفەرکەر سواری کەشتی بوو چی بلێت؟

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَقَالَ ارْكَبُوا فِيهَا بِسْمِ اللَّهِ مَجْرَاهَا وَمُرْسَاهَا﴾ [هُوْد: ٤١] واتە: {حەزرەتی (نُوْح) بە شوێنکەوتوەکانی فەرموو: سواری کەشتیەکە بن،و، بۆ ڕۆیشتن،و بۆ ڕاوەستانی ناوی خوا بهێنن}.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلَ لَكُمْ مِنَ الْفُلْكِ وَالْأَنْعَامِ مَا تَرْكَبُونَ﴾ [الزُخرُف: ١٢].

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە (حُسَيْن)ی کوڕی ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «أَمَانٌ لِأُمَّتِي مِنَ الْغَرَقِ إِذَا رَكِبُوا أَنْ يَقُولُوا: ﴿بِسْمِ اللَّهِ مَجْرَاهَا وَمُرْسَاهَا إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ [هُوْد: ٤١] ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعاً قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ [الزُمَر: ٦٧]» [1] واتە: "ئەگەر ئومەتەکەم لەکاتی سواربووندا ئەم دوو ئایەتە بخوێنن، ئەوا لە غەرقبوون سەلامەت،و پارێزراو دەبن: ﴿بِسْمِ اللَّهِ مَجْرَاهَا وَمُرْسَاهَا إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ ﴿وَمَا قَدَرُوا اللهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعاً قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾" {واتە: ئەو بێباوەڕانە وەکو پێویست ڕێزی خوایان نەگرتوە، کە لە ڕۆژی قیامەتدا تەواوی زەوی لەناو دەستی هێزو توانای ئەودایەو، ئاسمانەکانیش لولکراون،و پێچراوەنەتەوە

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٣٦ / بە ژمارە: ٥٠٠. شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ) ئەم حەدیسەی لە ڕێگەی زانای پایەبەرز (أَبُو يَعْلَى)وە ڕیوایەت کردوەو، ئەویش لە (جُبَارَة)ی کوڕی (مُغَلِّس)ـەوە. جا شێخ (نُورُ الدِّيْن)ی (هَيْثَمِيّ) فەرموویەتی: (جُبَارَة) کەسێکی لاوازە. بڕوانە: مَجْمَعُ الزَّوَائِد / ١٠ / ١٣٢ / بە ژمارە: ١٧١٠١. هەروەها ئیمامی (طَبَرَانِيّ)ش ئەم حەدیسەی لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە ڕیوایەت کردوەو، شێخی (هَيْثَمِيّ)ش فەرموویەتی: ڕشتەکەی ئەویش کەسێکی (مَتْرُوْك)ی تێدایە.

لە دەستی ڕاستیدا، ئەو خوایە پاکو بێگـەردو بـاڵاترە لـەوەی ئـەوان هـاوەڵی بـۆ دادەنێن}.

لە هەموو نوسخەکاندا بەم جۆرە هاتوە: (إِذَا رَكِبُوا). ئیتر باسی کەشتی نەکردوە.[1]

## سونەتە لە سەفەردا دوعا بکرێت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکانی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «ثَلاثُ دَعَوَاتٍ مُسْتَجَابَاتٌ لا شَكَّ فِيْهِنَّ: دَعْوَةُ الْمَظْلُومِ، وَدَعْوَةُ الْمُسَافِرِ، وَدَعْوَةُ الوَالِدِ عَلَى وَلَدِهِ». واتە: "سێ نزاو پاڕانەوە هەن، هیچ گومانیان تێدا نیە کە گیرا دەبن: نزاو پاڕانەوەی کەسی ستەملێکراوو، نزاو پاڕانەوەی کەسی سەفەرکەرو، نزاو پاڕانەوەی باوکو دایک لە منداڵی خۆیان".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـەو، لە ڕیوایەتەکەی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)یشدا بڕگەی (عَلَى وَلَدِهِ) تێدا نیە.[2]

---

(١) بەڵام لە نوسخە بەچاپگەیەنراوەکاندا بەم جۆرە هاتوە: (إِذَا رَكِبُوا السَّفِيْنَةَ).

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٨٠ / بە ژمارە: ١٥٣٦، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٠٢ / بە ژمارە: ٣٤٤٨، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٢٧٠ / بە ژمارە: ٣٨٦٢.

## سونەتە كەسی ڕێبوار لەكاتی سەركەوتنیدا بەسەر تەپۆڵكەو بەرزاییدا (اللّٰهُ أَكْبَر) بكاتو، لەكاتی دابەزینیشی بۆ دۆڵو شیوێك تەسبیحات بكات

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ی كوڕی (عَبْدُاللّٰه)ـەوە (خوای لیّ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: ئێمە ئەگەر (بەرەو بەرزاییەك) سەربكەوتینایە، (اللّٰهُ أَكْبَر)مان دەكردو، ئەگەر داشبەزینایە، تەسبیحاتمان دەكرد.[1]

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)دا، لەو حەدیسە (صَحِيْح)ـەی، كە پێشتر هێنامان لە باسی (**ئەگەر كەسی سەفەركەر سواری وڵاخ بوو چی بڵێت؟**)، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووكیان ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خواو سوپاكەی بەسەر تەپۆڵكەو گردێكدا سەركەوتنایە، (اللّٰهُ أَكْبَر)یان دەكردو، ئەگەر داشبەزینایە تەسبیحاتیان دەكرد.

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووكیان ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا لە حەجكردن یان لە عومرەكردن بگەڕایەتەوە -ڕاویەكە دەڵێت: وا ئەزانم لە غەزای فەرموو-، جا هەر كەی بەسەر تەپۆڵكەیەك یان زەویەكی هەورازدا سەربكەوتایە، سێ جار (اللّٰهُ أَكْبَر)ی دەكردو، پاشان دەیفەرموو: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَحْدَهُ، لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. آيِبُوْنَ تَائِبُوْنَ عَابِدُوْنَ سَاجِدُوْنَ لِرَبِّنَا حَامِدُوْنَ. صَدَقَ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ».[2]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٠٩١ / بە ژمارە: ٢٨٣١.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٠٩١ / بە ژمارە: ٢٨٣٣، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٩٨٠ / بە ژمارە: ١٣٤٤.

جا ئەمە دەقی ڕیوایەتەکەی ئیمامی بوخاریەو، ڕیوایەتەکەی ئیمامی موسلیمیش هەر وەکو ئەوە، بەڵام ئەم بڕگەیەی تێدا نیە (وا ئەزانم لە غەزای فەرموو). بەڵام ئەمەی تێدایە: (ئەگەر لەگەڵ سوپا یان کۆمەڵە چەکدارێکدا تەشریفی بهێنایەتەوە، یان لە حەجکردن، یان لە عومرەکردن بگەڕایەتەوە).[1]

(ئەوجا لەبەر ئەوەی لە فەرمایشتەکەی (ابْنُ عُمَر)دا وشەی (فَدْفَد) هاتوە. بۆیە ئیمامی نەوەوی فەرموویەتی): (فَدْفَد) بریتیە لە زەوی هەورازو سەخت. وتراویشە: بریتیە لەو دەشتە چۆڵەی، کە هیچی تێدا نیە. وتراویشە: بریتیە لە زەویەکی ڕەقی بەردەڵان. وتراویشە: بریتیە لە زەویەکی ڕەق لە بەرزاییەکدا.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ مُوْسَى)ی (أَشْعَرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: جارێك لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (دروودی خوای لەسەر بێت) ڕێمان دەکرد، جا کە دەمانڕوانی بەسەر دۆڵو شیوێکدا، بە دەنگی بەرز (لا إِلَهَ إِلاّ الله)و، (اللهُ أَكْبَر)مان دەکرد. پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) پێمانی فەرموو: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ، ارْبَعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ، فَإِنَّكُمْ لا تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلا غائِباً، إِنَّهُ مَعَكُمْ، إِنَّه سَمِيْعٌ قَرِيْبٌ». واتە: "هۆ خەڵکینە، بەزەییتان بەخۆتاندا بێتەوەو لەسەرخۆبن، چونکە ئێوە بانگی کەسی گوێگران‌و غائب ناکەن! ئەو کەسەی ئێوە بانگی دەکەن لەگەڵتاندایەو، کەسێکی بیسەری نزیکە".[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لەو حەدیسەی پێشتر هێنامان لە باسی (**سونەتە کەسی ڕێبوار داوای ئامۆژگاری لە کەسانی چاکەکار بکات**)، کە پێغەمبەری خوا فەرمووی: «عَلَيْكَ بِتَقْوَى اللَّهِ تَعَالَى، وَالتَّكْبِيرِ عَلَى كُلِّ

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٩٨٠ / بە ژمارە: ١٣٤٤.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٠٩١ / بە ژمارە: ٢٨٣٠، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٧٦ / بە ژمارە: ٢٧٠٤.

شَرَفٍ». واته: "لەخوای گەورە بترسەو، لەسەر هەموو جێگەیەکی بەرزیشدا (اللهُ أَكْبَر) بکە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيِّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) بەسەر زەویەکی بەرزدا سەربکەوتایە، دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، لَكَ الشَّرَفُ عَلَى كُلِّ شَرَفٍ، وَلَكَ الْحَمْدُ عَلَى كُلِّ حَالٍ».[1] واتە: "خوایە تۆ لە هەموو بەرزیەك بەرزو بالآتریت، سوپاسو ستایشیش هەر شایستەی تۆیە لە هەموو حاڵەتێکدا".

## نەهی کراوە لەوەی کە لەکاتی (اللهُ أَكْبَر) کردن و زیکری تردا دەنگ زۆر بەرز بکرێتەوە

سەبارەت بەم باسەش ئەو حەدیسەی هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ مُوْسَى)ی (أَشْعَرِيّ) هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە لە باسەکەی پێشتردا هێنرا. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٤٦ / بە ژمارە: ٥٢٢. حەدیسێکی لاوازە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ١٤٥.

## سونەتە گۆرانی بۆ حوشتر بوترێت، تاوەکو خێرا بڕواتو، چالاك بێتو، ئارام بێتو، ئاسان ڕێ بکات

ئەم باسەش چەندین حەدیسی مەشهوری لەبارەوە هاتوە.[1]

## ئەگەر وڵاخەکەی لەدەست بەربوو چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْـدُاللهِ)ی کوڕی (مَسْـعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «إِذَا انْفَلَتَتْ دَابَّةُ أَحَدِكُمْ بأَرْضِ فَلاةٍ، فَلْيُنادِ: "يَا عِبادَ الله احْبِسُوا. يَا عِبادَ اللَّهِ احْبِسُوا"، فَإِنَّ لِلَّهِ -عَزَّ وَجَلَّ- فِيْ الْأَرْضِ حَاصِراً (حَاضِراً)، سَيَحْبِسُهُ».[2] واتە: "ئەگەر وڵاخو ئاژەڵی یەکێك لە

(١) یەکێك لەو حەدیسانە بریتیە لەو حەدیسەی، کە ئیمامی بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردوە لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (أَنس)ی کوڕی (مَالِك)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: جارێك پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) لە سەفەرێکدا بوو، کۆیلەیەکی ڕەش پێستی لەخزمەتدابوو بەناوی (أَنْجَشَـة)وە، شیعرو گۆرانی دەوت بۆ حوشترەکانی، پێغەمبەریش پێی فەرموو: «رُوَيْدَكَ يَا أَنْجَشَةُ، سَـوْقَكَ بِـالْقَوَارِيرِ». بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٩٤ / بە ژمارە: ٥٨٥٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٨١١ / بە ژمارە: ٢٣٢٣.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٣٩ - ٢٤٠ / بە ژمارە: ٥٠٨. حەدیسێکی لاوازە. بەڵام پاڵپشت کراوە بە حەدیسێکی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە، کە فەرموویەتی: «إِنَّ لِلَّهِ مَلَائِكَةً فِي الْأَرْضِ سِوَى الْحَفَظَةِ، يَكْتُبُونَ مَا يَسْقُطُ مِنْ وَرَقِ الشَّجَرِ، فَإِذَا أَصَابَ أَحَدَكُمْ عَرْجَةٌ بِأَرْضِ فَلَاةٍ، فَلْيُنَادِ: أَعِينُوا عِبَادَ اللَّـهِ». ئیمامی (بَزَّار) ڕیوایەتی کردوەو، شێخ (نُوْرُ الـدِّيْن)ی (هَيْثَمِـيّ) فەرموویەتی: کەسەکانی ڕشتەی گێڕانەوەکەی متمانەدارن. شێخی عەسقەلانیش فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: مُسْنَدُ الْبَزَّار (الْبَحْرُ الزَّخَّار) / ١١ / ١٨١ / بە ژمارە: ٤٩٢٢، مَجْمَعُ الزَّوَائِد / ١٠ / ١٣٢ / بە ژمارەکانی: ١٧١٠٣ - ١٧١٠٥، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ١٥٠ - ١٥١.

ئێوە لە زەویەکی چۆڵەوانیدا بەربوو، با دوو جار بانگ بکاتو بڵێت: (ئەی بەندەکانی خوا، بیگرن). چونکە بەڕاستی خوای گەورە لە سەر زەویدا بەندەی تایبەتی هەیە، وڵاخەکەی بۆ دەگرێتو ناهێڵێت بڕوات".

منیش دەڵێم: یەکێك لە مامۆستا گەورەکانمان گێڕایەوە، کە وڵاخێکی لەدەست بەربوو -وا بزانم قاتر بوە-، جا ئاگای لەم حەدیسە هەبوە، بۆیە ئەوەی فەرموە، کە لە حەدیسەکەدا هاتوە. دەست بەجێ خوای گەورە وڵاخەکەی بۆ ڕاگرتوە.

هەروەها منیش جارێك لەگەڵ کۆمەڵێکدا بوومو، ئاژەڵێکیان لەدەست بەربوو، نەیانتوانی بیگرنەوەو، منیش ئەوەی ناو حەدیسەکەم وت، ئیتر دەست بەجێ ئاژەڵەکە ڕاوەستا، بەبێ هیچ هۆکارێك، بێجگە لەو قسەیەی کە من کردم.

## ئەگەر سواری وڵاخێکی لاسارو ناڕەحەت بوو چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە زانای بەناوبانگی شوێنکەوتوان (أَبو عَبْدِالله يُونُس)ی کوڕی (عُبَيْد)ی کوڕی (دِيْنَار)ی بەصرەیی، کە زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کەسێکی مەزنی بیرتیژی دینداری پارێزکاری خاوێنی لێهاتوە، جا ئەو فەرموویەتی: هەر پیاوێك لەسەر وڵاخێکی ناڕەحەت بێتو، ئەم ئایەتە بخوێنێت بەگوێیدا: ﴿أَفَغَيْرَ دِينِ اللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴾ [آل عِمْرَان: ٨٣] واتە: {ئایا ئەوانە ئاینێکی تریان دەوێت، بێجگە لە ئاینەکەی خوای گەورە، لەکاتێکدا ئەوەی لە ئاسمانەکانو زەویدایە، بە ویستو ئارەزوو یان بەزۆرو ناچاری تەسلیمی فەرمانو

بەرنامەکـەی خـوای گـەورە بـوون‌و، سـەرەنجام هەمووشـیان هـەر بـۆلای ئـەو دەگەڕێنەوە}، ئیتر بە ئیزنی خوای گەورە ولاخەکە ڕادەوەستێت.[1]

## ئەگەر چاوی بە لادێ‌و ئاوەدانیەك بكەوێت‌و، بیەوێت بچێتە ناویەوە چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لـە (سُنَن)ی (نَسَـائِيّ)و لـە کتێبەکـەی شـێخی (ابْـنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (صُهَيْب)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە هەر کاتێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، چاوی بـە لادێـیەك بكەوتایـەو، بیویستایە تەشریف بباتە ناویەوە، دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، رَبَّ السَّمَاوَاتِ السَّـبْعِ وَمَـا أظْلَلْـنَ، وَالْأَرَضِيْنَ السَّبْعِ وَمَا أقْلَلْنَ، وَرَبَّ الشَّيَاطِيْنِ وَمَا أضْلَلْنَ، وَرَبَّ الرِّيَاحِ وَمَـا ذَرَيْـنَ، أسْألُكَ خَيْرَ هَذِهِ الْقَرْيَةِ وَخَيْرَ أهْلِها وَخَيْرَ مَا فِيْهَا، وَنَعُوْذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ أهْلِهَـا وَشَرِّ مَا فِيْهَا».[2] واتە: "خوایە، ئەی پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکەو ئەوەش ئەوان سێبەریان لەسەری کردوە (واتە ئەوەی لەژێریاندایە)و، ئەی پەروەردگاری حـەوت زەویەکەو، ئەوەش ئەوان هەڵیان گرتوەو، ئەی پەروەردگاری شەیتانەکان‌و ئـەوەش ئەوان گومڕایان کردوەو، ئەی پەروەردگاری باو، ئەوەش ئەو هەڵی گرتـوە، داوای خەیرو چاکەی ئەم لادێیەت لێ دەکـەم‌و، خـەیرو چـاکەی خەڵکەکـەی‌و، خـەیرو

(١) بڕوانـە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٤٠ - ٢٤١ / بـە ژمـارە: ٥١٠. حەدیسـێکی (مَقْطُوْع)ی لاوازە. چونکە کەسێکی نەناسراو لـە ڕشـتەکەیدا هەیـە. بڕوانـە: الْفُتُوْحَـاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ١٥٢.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ النَّسَائِيّ الْكُبْرَى / ٥ / ٢٥٦ / بە ژمـارە: ٨٨٢٦، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْـنُ السُّنِّيّ) / ٢٤٧ / بە ژمارە: ٥٢٤. ئیمامی (حَاكِم) فەرموویەتی: ڕشـتەکەی (صَحِيْح)ـەو، شێخی عەسقەلانیش فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٦١٤ / بە ژمارە: ١٦٣٤، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ١٥٤.

چاکەی ئەوەش کە لەناویدایە، پەناشت پێ دەگرم لە شەڕو خراپەی ئـەم لادێیـەو، شەڕو خراپەی خەڵکەکەی و، شەڕو خراپەی ئەوەش کە لەناویدایە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّـنِّيّ)دا، لـە (عَائِشَـةَ)ی دایکی ئیمانداارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە فەرموویـەتی: ئەگـەر پێغەمبـەری خـوا (دروودی خوای لەسەر بێت) تەشریفی ببردایەتە جێگەیەك و، بیویسـتایە لـەوێ بمێنێتـەوە، دەیفـەرموو: «اللَّهُمَّ، إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ هَذِهِ، وَخَيْرِ مَا جَمَعْتَ فِيْهَا؛ وَأَعُوْذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ مَا جَمَعْتَ فِيْها. اللَّهُمَّ، ارْزُقْنَا حَيَاهَا، وَأَعِذْنَا مِنْ وَبَاهَا، وَحَبِّبْنا إِلَى أَهْلِهَا، وَحَبِّبْ صَالِحِي أَهْلِهَا إِلَيْنَا».[1] واتە: "خوایە من داوای خەیرو خۆشی ئەم جێگەیەت لێ دەکەم و، خەیرو خۆشی ئەوەش تێیدا کۆتکردۆتەوە، پەناشت پێ دەگرم لە شەڕو ناخۆشی ئەم جێگەیەو، ئەوەش تێیدا کۆتکردۆتەوە. خوایە شـتێکمان لـەم جێگەیـە بەنصیب بکەیت، کە هۆکاری ژیان بێـت و، لـە پـەتاو نەخۆشـی ناویشـی پـەنامان بـدەیت و بمانپارێزیـت و، لای خەڵکەکەشـی خۆشەویسـتمان بکـەیت و، خەڵکـە باشەکەشی خۆشەویست بکەیت لامان".

## ئەگەر لە کۆمەڵە کەسێك یان لە خەڵکانێکی تر بترسێت چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لـە (سُنَن)ی (أَبـو دَاوُد)و (نَسَـائِيّ)دا، بـە ڕشـتەیەکی (صَحِيْح)، لەو حەدیسەی پێشتری هاوەڵی خۆشەویسـت (أَبُوْ مُوْسَى)ی (أَشْـعَرِيّ) (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، لە خـەڵکێك

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّـنِّيّ) / ٢٤٨ / بـە ژمـارە: ٥٢٧. شـێخی عەسـقەلانی فەرموویەتی: ڕشتەکەی لاوازی تێدایە، بەڵام لـە ڕێگـەی تـرەوە پاڵپشـت کـراوە. بڕوانـە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ١٥٨.

بترسـایه، دەیفـەرموو: «اللَّهُمَّ، إِنَّا نَجْعَلُكَ فِيْ نُحُوْرِهِمْ، وَنَعُوْذُ بِكَ مِنْ شُرُوْرِهِمْ».[1] واتە: "خوایە ئێمە هێزو دەسەڵاتی تۆ دەدەین بەگژیانداو، پەناش بـەتۆ دەگـرین لــە شەڕو خراپەیان".

سونەتیشە لەگەڵیدا دوعای خەفەتو بێتاقەتیو ئەو دوعایانـەی تـریش بکـات، کە لەگەڵیدا باسمان کردن.

## ئەگەر جنۆکەو شەیتان لەشێوەی تایبەتیدا خۆیان پیشانی کەسێکی ڕێبواردا، چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لــە کتێبەکـەی شـێخی (ابْــنُ السُّــنِّيّ)دا، لــە هـاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا (إِنْ) تَغَوَّلَتْ لَكُمُ (بِكُمُ) الْغِيْلانُ، فَنَادُوا بِالْــأَذَانِ».[2] واتـە: "ئەگـەر جنۆکـەو شـەیتانە جادووگـەرەکان لــە شـێوازێکی تایبەتیـدا خۆیـان بـۆ دەرخستن، ئێوە بانگ بدەن".

منیش دەڵــێم: (غِيْلان) بریتیـە لــە جنۆکـەو شـەیتانە جادووگـەرەکان. وشـەی (تَغَوَّلَتْ)یش، واتە: لە شێوەی تایبەتیدا خۆیان پیشانداو بەدەرکەوتن.

جا مەبەستی فەرمایشتەکە ئەوەیـە، کـە لـەڕێگـەی بانگدانــەوە شـەڕو خراپـەی ئەوانە لەکۆڵی خۆتان بکەنەوە. چونکە شەیتان ئەگەر گوێی لە بانگەوە بوو، پشت هەڵدەکاتو دەڕوات.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٨٠ / بە ژمـارە: ١٥٣٧، وسُنَنُ النَّسَـائِيّ الْكُبْـرَى / ٥ / ١٨٨ / بە ژمارە: ٨٦٣١.

(٢) بڕوانـە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٤٦ - ٢٤٧ / بـە ژمـارە: ٥٢٣. حەدیسـێکی لاوازە. چونکە بچڕان لە ڕشتەکەیدا هەیە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ١٦١.

ئەوجا پێشتریش شتێکمان باس کرد، کە لەمە دەچوو، لە باسی (**ئەگەر شەیتانێك خۆی پیشاندا، یان لە شەیتان ترسا چی بڵێت؟**)، لە سەرەتای ((**کتێبی زیکرو پاڕانەوەکان بۆ کارە پێشهاتەکان**))دا. جا لەوێ باسمان کرد، کە باشتر وایە خۆی بە خوێندنەوەی ئەو ئایەتانەی قورئانی پیرۆزەوە خەریك بکات، کە لەوبارەوە هاتون.

## ئەگەر لە جێگەیەکدا لایدا بۆ مانەوە چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی ئیمامی موسلیم‌و (مُوَطَّأ)ی ئیمامی (مَالِك)و کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و لە غەیری ئەوانیشدا، لە ژنەهاوەڵی خۆشەویست (خَوْلَة)ی کچی (حَكِيْم)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: لە پێغەمبەری خوام بیستوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ نَزَلَ مَنْزِلاً، ثُمَّ قَالَ: "أَعُوْذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ"، لَم يَضُرُّهُ شَيْءٌ، حَتَّى يَرْتَحِلَ مِنْ مَنْزِلِهِ ذَلِكَ».[1] واتە: "ئەو کەسەی بچێتە جێگەیەك‌و، پاشان بڵێت: (أَعُوْذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ)، هیچ شتێك زیانی پێ ناگەیەنێت، تا ئەو جێگەیە بەجێ دەهێڵێت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)و لە غەیری ئەویشدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالله)ی کوڕی ئیمامی (عُمَر)ی کوڕی (خَطَّاب)ـەوە (خوا لە خۆی‌و باوکیشی ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) سەفەری بکردایەو، شەوی بەسەردا بهاتایە، دەیفەرموو: «يَا أَرْضُ، رَبِّي وَرَبُّكِ اللَّهُ، أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّكِ، وَشَرِّ مَا فِيْكِ، وَشَرِّ مَا خُلِقَ فِيْكِ، وَشَرِّ مَا يَدُبُّ عَلَيْكِ، أَعُوذُ

---

(١) بروانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٨٠ / ٢٧٠٨، ومُوَطَّأ الْإِمَامِ مَالِك (رِوَايَةُ يَحْيَى اللَّيْثِيّ) / ٢ / ٩٧٨ / بە ژمارە: ١٧٦٣، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٩٦ / بە ژمارە: ٣٤٣٧.

بِكَ مِنْ أَسَدٍ وَأَسْوَدَ، وَمِنَ الْحَيَّةِ وَالْعَقْرَبِ، وَمِنْ سَاكِنِ الْبَلَدِ، وَمِنْ وَالِدٍ وَما وَلَدَ».[1]
واتە: "ئەی زەوی، پەروەردگاری منو تۆش خوایە، پەنا بەخوا دەگرم لە شەڕو زیانی تۆو، لە شەڕی ئەوەی لەناو تۆدایەو، لە شەڕی ئەوەی لەناو تۆدا دروستکراوەو، لە شەڕی ئەوەی بەسەر تۆدا دەڕواتو دەگەڕێت. پەنا بەخوا دەگرم لە شێرو لە ئادەمیزادو، لە مارو دووپشكو، لە جنۆكەو، لە باوكو ڕۆڵەی شەیتانەكان".

شێخی (خَطَّابِيّ) فەرموویەتی: (سَاكِنُ الْبَلَد) بریتین لە جنۆكەی نیشتەجێی سەر زەوی. (بَلَد)یش بریتیە لەو زەویو شوێنەی كە دەبێتە جێگەی مانەوەو حەوانەوەی گیانلەبەران، ئیتر باوەكو خانووماڵیش نەبێت.

هەروەها فەرموویەتی: دەگونجێت مەبەست بە (وَالِد) ئیبلیس بێتو، مەبەستیش بە (مَا وَلَد) شەیتانەكان بێت.

جا ئەمە فەرمایشتەكەی شێخی (خَطَّابِيّ) بوو.

(أَسْوَد)یش واتە: كەس. چونكە بە هەموو كەسێك دەوترێت: (أَسْوَد).

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٤٠ / بە ژمارە: ٢٦٠٣، وسُنَنُ النَّسَائِيّ الْكُبْرَى / ٤ / ٤٤٣ / بە ژمارە: ٧٨٦٢، وسُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٥ / ٢٥٣ / بە ژمارە: ١٠١٠١. ئیمامی (حَاكِم) فەرموویەتی: ڕشتەكەی (صَحِيْح)ـەو، شێخی عەسقەلانیش فەرموویەتی: حەدیسێكی (حَسَن)ـە. بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ٢ / ١١٠ / بە ژمارە: ٢٤٨٧، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ١٦٤.

## ئەگەر لە سەفەرەکەی گەڕایەوە چی بڵێت؟

سونەتە ئەوە بڵێت، کە پێشتر لە حەدیسەکەی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)دا هێنامان، لە (باسی (اللّهُ أكْبَر) كردنی کەسی ڕێبوار، ئەگەر سەرکەوت بەسەر تەپۆڵکەیەکدا).

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: من و (أبُو طَلْحَة) لەخزمەتی پێغەمبەری خوادا دەهاتینەوەو، (صَفِيَّة)ی دایکی ئیماندارانیش لەپاشکۆی پێغەمبەردا بوو لەسەر حوشترەکە، جا کە گەیشتینە نزیك شاری مەدینەی پیرۆز، پێغەمبەری خوا فەرمووی: «آيِبُونَ تَائِبُوْنَ عَابِدُوْنَ سَاجِدُوْنَ لِرَبِّنَا حَامِدُوْنَ». ئیتر هەر ئەوەی دەفەرموو، هەتا گەیشتینە شاری مەدینەی پیرۆز.[1]

## ئەوەی کەسی ڕێبوار لەدوای نوێژی بەیانیەوە دەیڵێت

بزانە کە کەسی ڕێبواریش هەر سونەتە ئەو شتە بڵێت، کە کەسانی تر لەدوای نوێژی بەیانی دەیڵێن، وەکو پێشتر باسمان کرد.

سونەتە لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە بڵێت، کە بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أبُو بَرْزَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) نوێژی بەیانی بکردایە – ڕاویەکە فەرموویەتی: وا دەزانم فەرمووی: لە سەفەردا– دەنگی بەرز دەکردەوە، تا هاوەڵەکانیشی گوێیان لێی بێت و، دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، أَصْلِحْ لِيْ دِيْنِي الَّذِيْ جَعَلْتَهُ عِصْمَةَ أَمْرِي. اللَّهُمَّ، أَصْلِحْ لِي دُنْيَايَ الَّتِي جَعَلْتَ فِيْهَا مَعَاشِيْ –ثَلاثَ مَرَّاتٍ– . اللَّهُمَّ، أَصْلِحْ لِيْ آخِرَتِيْ الَّتِي جَعَلْتَ إِلَيْها مَرْجِعِيْ –ثَلاثَ مَرَّاتٍ–. اللَّهُمَّ، أَعُوذُ

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٩٨٠ / بە ژمارە: ١٣٤٥.

بِرِضَاكَ مِنْ سُخْطِكَ. اللَّهُمَّ، أعُوْذُ بِكَ مِنْكَ -ثَلاثَ مَرَّاتٍ-، لا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ».[1] واته: "خوایه ئاینه‌كه‌مم بۆ سازو سه‌لامه‌ت بكه، كه خۆت كردووته به پارێزه‌ری هه‌موو كاروبارێكم، دنیاكه‌شـم بـۆ سازو رێك‌وپێك بكه، كه بژێوی ژیانمت تێدا داناوه -سێ جار ئه‌مه‌ی ده‌فـه‌رموو-، دوارۆژیشم بۆ سازو سه‌لامه‌ت بكه، كه بڕیارت داوه بۆ ئـه‌وێ بگه‌ڕێمـه‌وه -سـێ جار ئه‌مه‌ی ده‌فه‌رموو-. خوایه، په‌نا ده‌گرم به ڕازیبوونت له تووڕه‌ییت. خوایه پـه‌نا ده‌گرم به سۆزو میهرت له غه‌زه‌ب‌و خه‌شمت -سێ جار ئه‌مه‌ی ده‌فـه‌رموو-، هـیچ ڕێگرێك نیه له‌وه‌ی تۆ ده‌یبه‌خشیت‌و، هیچ به‌خشه‌رێكیش نیه بۆ ئه‌وه‌ی تۆ ڕێگریت لێ كردوه، ده‌وڵه‌مه‌ندی‌و هه‌بوون‌و به‌خت‌و ده‌سـه‌ڵاتیش سـوود بـه خاوه‌نه‌كـه‌یان ناگه‌یه‌نن له‌لای تۆ، (به‌ڵكو ئه‌وه‌ی كه سوودی هه‌یه، ته‌نها بریتیه لـه لـوتفی تـۆو، له كرده‌وه‌ی چاكی كه‌سه‌كه خۆی)".

## ئه‌گه‌ر چاوی به شاره‌كه‌ی خۆی كه‌وت چی بڵێت؟

سونه‌ته ئه‌وه بڵێت، كه له باسه‌كه‌ی پێشووتردا باسمان كرد، لـه حه‌دیسـه‌كه‌ی هاوه‌ڵی خۆشه‌ویست (أَنَس)دا (خوای لێ ڕازی بێت).

سونه‌ته ئه‌وه‌ش بڵێت، كه له (**باسی ئه‌وه‌ی ده‌یڵێت، ئه‌گه‌ر چاوی بـه لادێیـه‌ك كه‌وت**)دا هێنامان.

---

(١) بڕوانه: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٦٦ - ٦٧ / به ژماره: ١٢٧. ده‌قی ئـه‌م زیكـرو پاڕانه‌وه‌یه به‌م جۆره ده‌قێكی لاوازه، كه به‌سـترابێته‌وه بـه كـاتی سـه‌فه‌ره‌وه‌و، هه‌ندێكیشـی سێباره بكرێته‌وه. به‌ڵام به ڕه‌هایی له صه‌حیحی موسلیمدا هاتوه. بڕوانـه: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٨٧ / به ژماره: ٢٧٢٠، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ١٦٩.

سونەتە بشڵێت: (اللّهُمَّ، اجْعَلْ لَنا بِهَا قراراً، وَرِزْقاً حَسَناً).[1] واتە: (خوایە بڕیار بفەرموو کە ئەم شارە ببێتە نشینگەو ئارامگا بۆمانو، بشببێتە جێگەی بژێویو ڕۆزی پاكو جوان بۆمان). خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## ئەگەر لە سەفەرەکەی گەڕایەوەو، چووە ماڵی خۆیەوە چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لە سەفەر بگەڕایەتەوەو، تەشریفی ببردایەتە ژوورەوە بۆ لای خێزانەکانی، دەیفەرموو: «تَوْباً تَوْباً، لِرَبِّنا أوْباً، لا يُغادِرُ حَوْباً».[2] واتە: خوایە تەوبەو پەشیمانیمان لێ وەرگرە (یان داوای تەوبەو پەشیمانیت لێ دەکەین)و، بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوەو، لێی دەپاڕێینەوە، کە هیچ تاوانێکمان بەجێ نەهێڵێت (واتە: لە هەمووی خۆش ببێت).

## باسی ئەوەی بەو کەسە دەوترێت، کە لە سەفەر دەگەڕێتەوە

سونەتە بوترێت: سوپاس بۆ ئەو خوایەی، کە سەلامەتی کردیت. یان سوپاس بۆ ئەو خوایەی، کە کۆیکردینەوەو بەیەکی گەیاندینەوە. یان قسەیەکی لەو جۆرە.

---

(١) ئەگەرچی ئیمامی نەوەوی نەیفەرموە ئەم حەدیسەی لە کوێوە هێناوە. بەڵام بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (النَّسَائِيّ) / ٣٧٢ – ٣٧٣ / بە ژمارە: ٥٥٣، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٤٧ – ٢٤٨ / بە ژمارە: ٥٢٥، والدُّعَاء لِلطَّبَرَانِيّ / ٢٦٤ / بە ژمارە: ٨٣٧. شێخی عەسقەلانیش فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: الْفُتُوحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ١٧١.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٥٠ / بە ژمارە: ٥٣١. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: الْفُتُوحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ١٧١ – ١٧٢.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَئِنْ شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ﴾ [إبْرَاهِيْم: ٧] واتـە: {ئەگـەر شوکرو سوپاسی من بکەن، منیش نازو نیعمەتتان بۆ زیاد دەکەم}.

هەروەها سەبارەت بەم باسە، ئەو حەدیسەی دایکـە (عَائِشَةَ)ش هـاتوە، کـە لــە باسەکەی دواتردا دەهێنرێت.

## باسی ئەوەی بەو کەسە دەوترێت، کە لە غەزا دەگەڕێتەوە

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە (عَائِشَةَ)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: جارێـك پێغەمبـەری خـوا (دروودی خوای لەسەر بێـت)، لە غەزا بوو، جا کە تەشریفی هێنایەوە ماڵەوە، منـیش هەسـتامەوە پێشوازیم لێ کردو، دەستیم گرتو، وتم: (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي نَصَرَكَ وَأَعَزَّكَ وَأَكْرَمَكَ) واتە: (سوپاس بۆ ئەو خوایەی، کە سەری خستیتو، بەهێزی کردیـتو، ڕێـزی لێ گرتیت).[١]

## باسی ئەوەی بەو کەسە دەوترێت، کە لە حەج گەڕاوەتەوەو، ئەوەش ئەو کەسە دەیلێت بە خەڵکی

بۆمان ڕیوایەت کراوە لــە کتێبەکـەی شـێخی (ابْــنُ السُّــنِّيّ)دا، لــە هـاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کـە فەرموویـەتی: گـەنجێك

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٥٠ – ٢٥١ / بە ژمارە: ٥٣٢. شـێخی (ابْــنُ حِبَّان)یش لـە صـەحیحەکەی خۆیـدا ڕیوایـەتی کـردوەو، شـێخ (شُـعَيْب الأرْنَــؤُوْط)یـش فەرموویەتی: ڕشـتەکەی (صَحِيْحَ)ــە. هـەروەها شـێخ (سَــلِيْم الْهِلالِــيّ)ش لــە تـەخریجی حەدیسەکانی کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا هەمان شتی فەرموە. بڕوانە: صَحِيْحُ ابْنِ حِبَّان / ١٢ / ٢٨١ – ٢٨٢ / بە ژمارە: ٥٤٦٨، وعُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّيّ / ٦٠٣.

هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)و، وتی: دەمەوێت حەج بکەم. پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) (چەند هەنگاوێك) لەگەڵیدا ڕۆیشتو، پێی فەرموو: «يَا غُلامُ، زَوَّدَكَ اللَّهُ التَّقْوَى، وَوَجَّهَكَ فِي الْخَيْرِ، وَكَفَاكَ الْهَمَّ». واتە: "ئەی گەنجەکە، خوا ترسی خۆی بخاتە دڵتەوەو، بەرەو خەیرت ئاراستە بکاتو، لە خەمو پەژارەش بەدوورت بگرێت". پاشان کە گەنجەکە گەڕایەوە، سڵاوی لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) کردو، پێغەمبەریش فەرمووی: «يَا غُلامُ، قَبِلَ اللَّهُ حَجَّكَ، وَغَفَرَ ذَنْبَكَ، وأخْلَفَ نَفَقَتَكَ». واتە: "ئەی گەنجەکە، خوا حەجەکەت لێ وەربگرێتو، لە تاوانیشت خۆش ببێتو، جێگەی خەرجیەکەشت بۆ پڕبکاتەوە".[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (بَيْهَقِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أبُو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «اللَّهُمَّ، اغْفِرْ لِلْحاجِّ، وَلِمَنِ اسْتَغْفَرَ لَهُ الْحَاجُّ». واتە: "خوایە، لە حاجی خۆشبەو، لەو کەسەش، حاجی داوای لێخۆشبوونی بۆ کردوە".[2]

ئیمامی (حَاكِم) فەرموویەتی: ئەم حەدیسە (صَحِيْح)ـە لەسەر مەرجی ئیمامی موسلیم.[3]

* * * * *　　* * * * *　　* * * * *

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٥١ / بە ژمارە: ٥٣٣. حەدیسێکی لاوازە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ١٧٥ - ١٧٦.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٥ / ٢٦١ / بە ژمارە: ١٠١٦١.

(٣) بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٦٠٩ / بە ژمارە: ١٦١٢. بەڵام شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن). بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ١٧٧.

## باسی ئەوەی ئەو کەسە دەیلێت، کە خواردنی خراوەتە بەردەست

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (عَمْرو)ی کوڕی (عَاص)ـەوە (خوا لە خۆیو باوکیشی ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە ئەگەر خواردنی بخرایەتە بەردەست، دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، بَارِكْ لَنَا فِيْمَا رَزَقْتَنا، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ، بِسْمِ اللهِ».[1] واتە: "خوایە بەرەکەت بخەرە ئەو ڕزقو ڕۆزیەی کە پێتداوینو، لە ئاگری دۆزەخیش بمانپارێزە، بەناوی خواوە".

## سونەتە خاوەنی خواردن لەکاتی خستنەبەردەستی خواردنەکە بۆ میوانەکانی، بڵێت: بخۆن، یان قسەیەکی لەو جۆرە بکات

بزانە کە سونەتە خاوەنی خواردن لەکاتی خستنەبەردەستی خواردن بۆ میواینەکانی، بڵێت: (بِسْمِ اللهِ)، یان بڵێت (بخۆن)، یان صەلاواتێك بدات، یان هەر عیبارەتێکی ڕاشکاوانە، کە مانای ڕێگە پێدان بە دەست کردن بە خواردن بگەیەنێت.

جا ئەم قسە کردنە واجب نیە، بەڵکو هەر ئەوەندە بەسە کە خواردنەکە بخرێتە بەردەستیانو، ئیتر ئەوانیش هەر بەوەندە بۆیان هەیە دەست بە خواردن بکەنو، مەرجیش نیە بە زارەکی فەرموویان لێ بکرێت.

هەندێکیش لە هاوەڵانمان فەرموویانە: پێویستە بە زارەکی فەرموویان لێ بکرێت.

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢١٦ - ٢١٧ / بە ژمارە: ٤٥٧. حەدیسێکی زۆر لاوازە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ١٧٨.

جا ڕاستەکە ئەوەی یەکەمیانەو، ئەو حەدیسە (صَــحِيْح)انـەش، کـە دەربـارەی ڕێگەپێدانی زارەکی هاتون، هەموویان وا لێکدەدرێتەوە، کە ئەو کارە سونەتە.

## باسی (بِسْمِ اللهِ) کردن لەکاتی خواردن و خواردنەوەدا

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (عُمَر)ی کـوڕی (أَبُو سَلَمَة)ــەوە (خوا لـە هـەردووکیان ڕازی بێـت)، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، پێی فەرمووم: «سَمِّ اللَّهَ، وَكُلْ بِيَمِينِكَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيْكَ». [1] واتە: "نـاوی خـوا ببـەو، بـە دەسـتی ڕاسـتت بخـۆو، لەبەردەمی خۆتەوە بخۆ".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە (سُنَن)ی (أَبُوْ دَاوُد)و (تِرْمِــذِيّ)دا، لـە (عَائِشَــة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویـەتی: «إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ، فَلْيَذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ تَعَالَى فِيْ أَوَّلِهِ. فَإِنْ نَسِيَ أَنْ يَذْكُر اسْمَ اللَّهِ تَعَالَى فِيْ أَوَّلِهِ، فَلْيَقُلْ: بِسْمِ اللَّهِ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ». واتە: "ئەگـەر یەکێك لـە ئێوە شتێکی خوارد، با لـە سەرەتاکەیەوە ناوی خوا ببات. خۆ ئەگـەر لــە سەرەتاکەیەوە لەبیری چوو ناوی خوا ببات، با بڵێت: بە ناوی خواوە لــە سـەرەتاو لە کۆتاییەکەیەوە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە. [2]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٠٥٦ / بە ژمارە: ٥٠٦١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٥٩٩ / بە ژمارە: ٢٠٢٢.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٣٧٤ / بە ژمارە: ٣٧٦٧، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٢٨٨ / بـە ژمارە: ١٨٥٨.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە صـەحیحی موسـلیمدا، لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (جَابِر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: لە پێغەمبەری خـوام بیسـتوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «إِذَا دَخَلَ الرَّجُلُ بَيْتَهُ، فَذَكَرَ اللَّهَ عِنْدَ دُخُولِهِ وَعِنْدَ طَعَامِهِ، قَالَ الشَّيْطَانُ: "لَا مَبِيتَ لَكُمْ، وَلَا عَشَاءَ". وَإِذَا دَخَلَ، فَلَمْ يَذْكُرْ اللَّـهَ عِنْـدَ دُخُولِهِ، قَالَ الشَّيْطَانُ: "أَدْرَكْتُمْ الْمَبِيتَ". وَإِذَا لَمْ يَذْكُرْ اللَّهَ عِنْـدَ طَعَامِـهِ، قَـالَ: "أَدْرَكْتُمْ الْمَبِيتَ وَالْعَشَاءَ"».[1] واتە: "ئەگەر پیاوێك بچێتە ماڵی خۆیەوەو، لـەکاتی چـوونەژوورەوەو، لـەکاتی نانخواردنـدا نـاوی خـوای بهێنێـت، شـەیتان بـە دەستوپەیوەندەکەی خۆی دەڵێت: نە جێگەی مانەوەی شەوتان دەستکەوت‌و، نـە خواردنیش. بەڵام ئەگەر بچێتە ژوورەوەو، ناوی خـوا نـەهێنێت، شـەیتان دەڵێـت: جێگەی مانەوەی شەوتان دەستکەوت. خۆ ئەگەر لەکاتی نانخواردنیشدا نـاوی خـوا نەهێنێت، شەیتان دەڵێت: جێگەی مانەوەی شەوو خواردنیشتان دەستکەوت".

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لەو حەدیسەی هـاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە داگرەوەیـە بەسـەر یـەکێك لـە موعجیزە ئاشکراو دیارەکانی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسـەر بێت)، کاتێـك کـە هەردوو هاوەڵی خۆشەویست (أَبو طَلْحَة)و (وأُمُّ سُلَيْم) دەعوەتیان کرد بۆ خواردن. (أَنَس) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: "ڕێگە بدە بە دە کەس با بێن". ئەویش ڕێگەی پێدان‌و، ئـەوانیش هاتنـە ژوورەوەو، پێغەمبـەریش پێی فەرموون: "(بِسْمِ اللَّهِ) بکەن‌و، دەست بکەن بە خواردن". ئەوجا ئەوانیش وایان کرد. ئیتر هەشتا پیاو بەم جۆرە هاتن‌و نانیان خوارد.[2]

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (حُذَيْفَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر لە خزمەتی پێغەمبەری خـوادا

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٥٩٨ / بە ژمارە: ٢٠١٨.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦١٣ / بە ژمارە: ٢٠٤٠.

بهاتینایەتە سەر خواردنێك، دەستمان پێ نەدەکرد، تا پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، دەستی پێ دەکرد. جارێکیش لەخزمەتیدا ئامادەی خواردنێك بووین‌و، کچێکی مندالْ هات‌و، وەکو بڵێیت، پاڵی پێوە دەنرا، ئیتر چوو تا دەستی بخاتە خواردنەکەوە، پێغەمبەری خواش دەستی گرت. پاشان عەرەبێکی دەشتەکی هات‌و، وەکو بڵێیت، پاڵی پێوە دەنرا، پێغەمبەر دەستی ئەویشی گرت‌و، فەرمووی: «إِنَّ الشَّيْطَانَ يَسْتَحِلُّ الطَّعَامَ أَنْ لاَ يُذْكَرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ. وَإِنَّهُ جَاءَ بِهَذِهِ الْجَارِيَةِ، لِيَسْتَحِلَّ بِهَا، فَأَخَذْتُ بِيَدِهَا. فَجَاءَ بِهَذَا الْأَعْرَابِيِّ، لِيَسْتَحِلَّ بِهِ، فَأَخَذْتُ بِيَدِهِ. وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّ يَدَهُ فِي يَدِيْ مَعَ يَدِهِمَا». واتە: "بەڕاستی شەیتان ئەو خواردنە بە حەلاڵ‌و ڕەوا دەزانێت بۆ خۆی، کە ناوی خوای لەسەر نەبرێت، جا ئەم کچە بچووکەی هێنا، تا بەهۆی ئەوەوە حەلاڵی بکات. بۆیە منیش دەستیم گرت. ئەوجا ئەم عەرەبە دەشتەکیەشی هێنا، تا بەهۆی ئەوەوە حەلاڵی بکات. بۆیە منیش دەستیم گرت. جا سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، دەستی شەیتان لەگەڵ دەستی کچ‌و عەرەبەکەدا لەناو دەستمدایە"، ئەوجا پێغەمبەر (بِسْمِ اللَّهِ) کردو، دەستی بە خواردن کرد.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُوْ دَاوُد)و (نَسَائِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أُمَيَّة)ی کوڕی (مَخْشِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: جارێك پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) دانیشتبوو، پیاوێکیش خواردنی دەخواردو، (بِسْمِ اللَّهِ) نەکرد، هەتا یەك پاروو لە خواردنەکەی مایەوە. جا کە ئەویشی بەرز کردەوە بۆ دەمی، وتی: (بِسْمِ اللَّهِ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ)، پێغەمبەریش دەستی کرد بە پێکەنین‌و، ئەوجا فەرمووی: «مَا زَالَ الشَّيْطَانُ يَأْكُلُ مَعَهُ، فَلَمَّا ذَكَرَ اسْمَ اللَّهِ،

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٥٩٧ / بە ژمارە: ٢٠١٧.

اسْتَقَاءَ مَا فِيْ بَطْنِهِ».[1] واته: "بەردەوام شەیتان لەگەڵیدا دەیخوارد، جا کە ناوی خوای برد، ئیتر شەیتان چی لە ناوسکیدا بوو هەمووی هەڵهێنایەوە".

منیش دەڵێم: ئەم حەدیسە وا لێکدەدرێتەوە، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، هەتا دوایین پاروو نەیزانیوە کە پیاوەکە (بِسْمِ اللَّـهِ) نەکردوە. چونکە ئەگەر بیزانیایە، بێدەنگ نەدەبوو لە فەرمان پێکردنی بە (بِسْمِ اللَّهِ) کردن.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُـنَن)ی (تِرْمِـذِيّ)دا، لە (عَائِشَـة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) لەناو شەش کەس لە هاوەڵانیدا نانی دەخواردو، عەرەبێکی دەشتەکی هاتو، بە دوو پاروو خواردنەکەی خوارد. پێغەمبەری خواش (درودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: «أَمَا إِنَّهُ لَوْ سَمَّى، لَكَفاكُمْ». واته: "بزانن کە ئەگەر ناوی خوای بهێنایە، خواردنەکە بەشی دەکردن".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ نَسِيَ أَنْ يُسَمِّيَ عَلَى طَعَامِهِ، فَلْيَقْرَأْ: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ إِذَا فَرَغَ».[3] واته: "ئەو کەسەی

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٣٧٤ / بە ژمارە: ٣٧٦٨، وسُنَنُ النَّسَائِيِّ الْكُبْرَى / ٦ / ٧٨ / بە ژمارە: ١٠١١٣. ئیمامی (حَاكِم) فەرموویەتی: ڕشتەکەی (صَحِيْح)ـە. بەڵام شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی لاوازە. بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّـحِيْحَيْن / ٤ / ١٢١ / بە ژمارە: ٧٠٨٩، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ١٨٩.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٢٨٨ / بە ژمارە: ١٨٥٨.

(٣) ئەگەرچی ئیمامی نەوەوی نەیفەرموە ئەم حەدیسەی لە چی کتێبێکەوە بۆ ڕیوایەت کراوە، بەڵام لەم سەرچاوانەدا هاتوە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢١٨ / بە ژمارە: ٤٦٠، والدُّعَاء لِلطَّبَرَانِيّ / ٢٧٨ / بە ژمارە: ٨٩٠. جا حەدیسەکەش حەدیسێکی (مَوْضُـوْع)و

بیری چوو لەسەر خواردن ناوی خوا بهێنێت، با کە لێبوویەوە سورەتی ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ بخوێنێت".

منیش دەڵێم: زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە (بِسْمِ اللَّهِ) کردن لە سەرەتای خواردنەوە سونەتە. خۆ ئەگەر نەیکرد، ئیتر بە دەستی ئەنقەست، یان لەبیری نەبوو، یان زۆری لێ کرا، یان نەیتوانی لەبەر هەر هۆکارێکی ترو، پاشان لە میانەی نانخواردنەکەدا توانی بیکات، سونەتە بیکات. لەبەر ئەو حەدیسەی کە پێشتر باسمان کرد. جا وەکو لە حەدیسەکەشدا هاتوە با بڵێت: (بِسْمِ اللَّهِ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ).

هەروەها (بِسْمِ اللَّهِ) کردن بۆ خواردنەوەی ئاوو شیرو هەنگوینو شۆرباو هەموو شلەمەنیەکانی تریش، هەر وەکو (بِسْمِ اللَّهِ) کردن وەهایە بۆ خواردن، لە هەموو ئەوانەی باسمان کردن.

زانایانی هاوەڵانو زانایانی تریش فەرموویانە: سونەتە بە دەنگی ئاشکراو بەرز (بِسْمِ اللَّهِ) بکات، تاوەکو ببێتە ئاگادار کردنەوە بۆ کەسانی تر، کە ئەوانیش (بِسْمِ اللَّهِ) بکەنو، تاوەکو کەسەکەش ببێتە پێشەنگ لەو کارەدا. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

---

هەڵبەستراوە. چونکە کەسێك لە ڕشتەکەیدایە، بەناوی (حَمْزَةَ)ی (نَصِيْبِيّ)ـەوە، کە فەرموودەناسانو شارەزایان بە کەسێکی حەدیسهەڵبەستی دادەنێن. بڕوانە: الْمَوْضُوْعَات لابْنِ الْجَوْزِيّ / ٣ / ٣٤، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ١٩٢. بەڵام دەبێت حەدیسەکە بەلای ئیمامی نەوەویەوە (مَوْضُوْع) نەبێت، چونکە ئەگەر (مَوْضُوْع) بێت دەبێت بۆ خەڵکی ڕوون بکاتەوە کە (مَوْضُوْع)ـە، ئەگینا وەکو خۆیو زانایانیش فەرموویانە: دروست نیە ڕیوایەتی بکاتو بیگێڕێتەوە. بڕوانە: إِرْشَادُ طُلاَّبِ الْحَقَائِق / ١٠٥.

## باسێك: {حوكمەكانی (بِسْمِ اللهِ) كردن لەكاتی خواردنو خواردنەوەدا}

یەكێك لە گرنگترین ئەو شتانەی كە باشە بزانرێت، بریتیە لە شێوازی (بِسْمِ اللهِ) كردنو، ئەو برەی كە پێی دادەمەزرێت. بۆیە بزانە، كە باشتر وەهایە بڵێت: (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيْمِ). خۆ ئەگەر بڵێت: (بِسْمِ اللهِ)، ئەوە هەر بەسەو، سونەتەكەی پێ دێتەدیو، لەم مەسەلەشدا كەسی لەشگرانو، ئافرەت لە سووڕی مانگانەداو، كەسانی تریش یەكسانن.

هەروەها وا باشە كە هەریەكە لە نانخۆرەكان (بِسْمِ اللهِ) بكەن. خۆ ئەگەر تەنها یەكێكیان كردی، ئەوا بۆ ئەوانی تریش جێگە دەگرێت، وەكو ئیمامی (شَافِعِيّ) فەرموویەتی. منیش ئەم بۆچوونەم لە كتێبی (الطَّبَقَات)دا، لە باسی ژیانی ئیمامی (شَافِعِيّ)دا لە كۆمەڵێك لە زانایانەوە هێناوە.

جا ئەم مەسەلەش هەر وەكو مەسەلەی وەڵامدانەوەی سڵاوو دوعا كردن بۆ كەسی پژمیو وەهایە، كە لەمیشدا یەكێك بیكات بۆ كۆمەڵێك جێگە دەگرێت.

## باسی عەیبو نوقسانی نەبینینەوە لە خواردنو خواردنەوەدا

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) هەرگیز عەیبو نوقسانی لە خواردن نەبینیوەتەوە، ئەگەر حەزی لێ كردبێت، خواردوویەتیو، ئەگەر حەزیشی لێ نەكردبێت، وازی لێ هێناوە.[1]

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٣٠٦ / بە ژمارە: ٣٣٧٠، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٣٢ / بە ژمارە: ٢٠٦٤.

لە ڕیوایـەتێکی ئیمـامی موسـلیمدا هـاتوە، کـە ئەگـەر حـەزی لێ نـەکردبێت، پێدەنگ بوەو، هیچی نەفەرموە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە (سُنَن)ی ئیمـامی (أَبـو دَاوُد)و (تِرْمِـذِيّ)و (ابْـنُ مَاجَه)دا، لـە هاوەڵی خۆشەویست (هُلْب)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێـت)، کە فەرموویـەتی: لە پێغەمبەری خوام بیستوە (دروودی خـوای لەسـەر بێـت)، کـە پیاوێـك عـەرزی کـرد: "جۆرێك خـواردن هەیـە، مـن قێـزی لێ دەکەمـەوە". پێغەمبـەریش فـەرمووی: «لا يَتحَلَّجَنَّ فِيْ صَدْرِكَ شَيْءٌ، ضَارَعْتَ بِهِ النَّصْرانِيَّةَ».[2] واتە: "بـا هـیچ گومانێـك لـە دڵتا نەبێت لـەبارەی ئەو خواردنەوە، چونکە بەو گومانە لە گاورەکان دەچیت".

منیش دەڵێم: وشەی (يَتحَلَّجَنَّ) شێخی (هَرَوِيّ)و شێخی (خَطَّـابِيّ)و، زۆربـەی پێشـەوایانیش بـەم جـۆرە نوسـیویانەو خوێندویانەتـەوەو، ئێمـەش لـەو نوسـخە ئەصڵیانەی کە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و ئەوانی تریشمان لێوە بیستوە، هەر بـەو جۆرە وەرمان گرتوەو، زانای پایەبەرز (أَبو السَّعَادَاتِ ابْنُ الْأَثِيْر)یش هەر بـەو جـۆرە باسی کردوە. پاشان فەرموویەتی: هـەروەها بـە (يَـتَخَلَّجَنَّ)ش ڕیوایـەت کـراوەو، هەردووکیشیان بە یەك مانان.

شێخی (خَطَّابِيّ) فەرموویەتی: مانای ئەوەیە، کە با گومـانی لـەبارەیـەوە نـەبێت. هەروەها فەرموویەتی: ئەصـڵەکەی لـە (حَلَـج)ـەوە وەرگیراوە، کـە برتیـە لـە جوڵەجوولێو ناجێگیری.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٣٣ / بە ژمارە: ٢٠٦٤.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٣٧٨ / بە ژمارە: ٣٨٧٤، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ١٣٣ / بـە ژمارە: ١٥٦٥، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ٩٤٤ / بـە ژمـارە: ٢٨٣٠. شـێخی عەسـقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ١٩٦ – ١٩٧.

## ئەگەر پێویستی کرد، دروستە کەسێك بڵێت: حەزم لەم خواردنە نیە، یان عادەتم پێوە نەگرتوە بیخۆم، یان شتێکی لەو جۆرە

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (خَالِد)ی کوڕی (وَلِیْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، لە حەدیسی ئەو بزنمژەیەی، کە بە برژاوی خستیانە بەردەستی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، جا کە دەستی بۆ برد، هاوەڵان عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە بزنمژەیە. ئەویش دەستی گەڕاندەوە. (خَالِد)یش عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، بزنمژە حەرامە؟ ئەویش فەرمووی: نەخێر، بەڵام لە وڵاتی ئێمەدا نەبوەو، منیش حەزم لێی نیەو، تەبیعەتم ناچێتە سەری.[1]

## باسی وەسفکردنی خواردن لەلایەن کەسی بخۆرەوە

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، داوای پێخۆری کرد لە خێزانەکەی (واتە: شتێك کە بەنانەوە بخورێت)، ئەویش عەرزی کرد: تەنها سرکەمان هەیە. پێغەمبەریش فەرمووی بیهێنەو، ئەوجا دەستی کرد بە خواردنیو، دوو جار فەرمووی: «نِعْمَ الْأُدْمُ الْخَلُّ». واتە: "بەڕاستی سرکە پێخۆرێکی چاکە".[2]

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٠٦٠ / بە ژمارە: ٥٠٧٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٥٤٣ / بە ژمارە: ١٩٤٦.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٢٢ / بە ژمارە: ٢٠٥٢.

## باسی ئەوەی ئەو کەسە دەیڵێت، کە خواردن ئامادەبێت و، ئەویش بەڕۆژوو بێت و، نەیشی شکێنێت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ، فَلْيُجِبْ. فَإِنْ كَانَ صَائِماً، فَلْيُصَلِّ، وَإِنْ كَانَ مُفْطِراً، فَلْيَطْعَمْ».[1] واتە: "ئەگەر یەکێك لە ئێوە دەعوەت کرا، با بچێت بەدەم دەعوەتەکەوە. خۆ ئەگەر بەڕۆژوو بوو، با دوعای خەیریان بۆ بکات و، ئەگەر بەڕۆژووش نەبوو، با نان بخوات".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)و لە غەیری ئەویشدا، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «فَإِنْ كَانَ مُفْطِراً، فَلْيَأْكُلْ، وَإِنْ كَانَ صَائِماً، دَعَا لَهُ بِالْبَرَكَةِ».[2] واتە: "ئەگەر بەڕۆژوو نەبوو، با نان بخوات و، ئەگەر بەڕۆژووش بوو، با دوعای فەڕو بەرەکەت بۆ خاوەنی خواردنەکە بکات".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٠٥٤ / بە ژمارە: ١٤٣١.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٣٠ - ٢٣١ / بە ژمارە: ٤٨٩، والْمُعْجَمُ الْكَبِيْر / ١٠ / ٢٣١ / بە ژمارە: ١٠٥٦٣. شێخ (نُوْرُ الدِّيْن)ی (هَيْثَمِيّ) فەرموویەتی: ئیمامی (طَبَرَانِيّ) لە (الْمُعْجَمُ الْكَبِيْر)دا ڕیوایەتی کردوەو، کەسەکانی ڕشتەی گێڕانەوەکەشی متمانەدارن. بڕوانە: مَجْمَعُ الزَّوَائِد / ٤ / ٥٢ / بە ژمارە: ٦١٥٨.

منیش دەڵێم: فەرمایشتەکەی ئیمامی نەوەوی گومانی ئەوە دروست دەکات، کە حەدیسەکە لای ئەمانیش لە ڕێگەی (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە ڕیوایەت کرابێت. بەڵام ڕاستەکەی ئەوەیە، کە حەدیسەکە لای ئەمان لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)ەوە ڕیوایەت کراوە.

## باسی ئەوەی ئەو کەسە دەیلێت، کە دەعوەت کراوە بۆ خواردن و، کەسێکی تر کەوتۆتە شوێنی

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو مَسْعُوْد)ی (أَنْصَارِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پیاوێك پێغەمبەری خوای دەعوەت کرد بۆ خواردنێك، کە بۆ ئەوو بۆ چوار کەسی تر ئامادە کرابوو. ئەوەبوو پیاوێکیش کەوتە شوێنیان. جا کە گەیشتە دەرگاکە، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: «إِنَّ هَذَا اتَّبَعَنا، فإِنْ شِئْتَ أَنْ تأْذَنَ لَهُ، وَإِنْ شِئْتَ رَجَعَ». واتە: "ئەم پیاوە کەوتۆتە شوێنمان، جا ئەگەر دەتەوێت ڕێگەی پێ بدەیت، ئەوە باشە، ئەگەر دەشتەوێت، دەگەڕێتەوە". خاوەنی خواردنەکەش عەرزی کرد: بەڵکو ڕێگەی پێ دەدەم، ئەی پێغەمبەری خوا.[1]

## باسی ئامۆژگاری کردن و پەروەردە کردنی کەسێك، کە خراپ نان دەخوات

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عُمَر)ی کوڕی (أَبُو سَلَمَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: کاتێك منداڵ بووم لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (دروودی خوای لەسەر بێت)، دەستم دەبرد بۆ هەموو لایەکی قاپە خواردنەکە. پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) پێی فەرمووم: "ڕۆڵە، ناوی خوا بهێنەو، بە دەستی ڕاستت بخۆو، لە بەردەمی خۆتەوە بخۆ".[2]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٧٣٢ / بە ژمارە: ١٩٧٥، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٠٨ / بە ژمارە: ٢٠٣٦.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٠٥٦ / بە ژمارە: ٥٠٦١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٥٩٩ / بە ژمارە: ٢٠٢٢.

لە ڕیوایەتێکی (صَحِیْح)یشدا هاتوە، کە (عُمَر) فەرموویەتی: ڕۆژێك لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (دروودی خوای لەسەر بێت) نانم دەخواردو، لە هەموو لایەکی قاپەکەوە دەمخوارد. پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) پێی فەرمووم: (لە بەردەمی خۆتەوە بخۆ).[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە زانای پایەبەرزی شوێنکەوتوان (جَبَلَة)ی کوڕی (سُحَیْم)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ساڵێك لە سەردەمی فەرمانڕەوایی (عَبْدُالله)ی کوڕی (زُبَیْر)دا تووشی بێ بارانیو وشکەساڵی بووین، جا خورمامان پێدراو، لەو کاتەشدا هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالله)ی کوڕی ئیمامی (عُمَر) (خوای لە هەردووکیان ڕازی بێت) بەلاماندا تێپەڕیو، ئێمەش خورمامان دەخوارد، ئەویش فەرمووی: بەیەك پاروو دوو خورما مەخۆن (واتە: لەو کاتەدا کە چەند کەسێك بەیەکەوەن). چونکە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) نەهی کردوە لەوەی کە خورما دوو دوو بخورێت. پاشان فەرمووی: مەگەر یەکێك خۆی ڕێگە بە براکەی بدات، کە دوو دوو بیخوات (واتە: لەم کاتەدا دروستە).[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَلَمَة)ی کوڕی (أکْوَع)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پیاوێك لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا نانی دەخوارد، ئەویش پێی فەرموو: (بە دەستی ڕاستت بخۆ). پیاوەکەش وتی:

---

(١) بڕوانە: صَحِیْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٠٥٦ / بە ژمارە: ٥٠٦٢، وصَحِیْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٥٩٩ / بە ژمارە: ٢٠٢٢.

(٢) بڕوانە: صَحِیْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٨٦٧ / بە ژمارە: ٢٣٢٣، وصَحِیْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦١٧ / بە ژمارە: ٢٠٤٥.

ناتوانم. پێغەمبەریش فەرمووی: (دەی با هەر نەتوانیت). جا خۆبەگەورەزانین ڕێگەی پێ نەدا، بۆیە هەتا مابوو نەیتوانی دەستی ڕاستی بەرز بکاتەوە بۆ دەمی.[1]

منیش دەڵێم: ئەو پیـاوە (بُسْر)ی کـوڕی (رَاعِي الْعَيْـر) بـوەو، یەکێکیشـە لـە هاوەڵانو، لـە شەرحی صەحیحی موسلیمدا باسم کردوەو، ئـەم حەدیسـەشـم ڕوون کردۆتەوە.

## قسە کردن لەسەر نا نخواردن سونەتە

ئەو حەدیسەی هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ی لەبارەوە هـاتوە، کـە لـە (**باسی وەسفکردنی خواردن**)دا هێنامان.

پێشەوای پایەبـەرز (أَبُو حَامِد)ی (غَزَالِيّ) لـە کتێبـی (إِحْيَـاء)دا فەرموویـەتی: یەکێك لـە ئادابەکانی نانخواردن ئەوەیە، کە لـەکاتی خواردنیدا قسەی باش بکـەنو، باسی چیرۆكو سەرگوزەشتەی پیاوچاکان بکەن دەربارەی خواردنو شتی تریش.

## باسی ئەوەی ئەو کەسە دەیلێتو دەیکات، کە هەر دەخواتو تێر نابێت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لـە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لـە هاوەڵی خۆشەویست (وَحْشِيّ)ی کوڕی (حَرْب)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە هاوەڵان (خوایان لێ ڕازی بێت) عەرزی پێغەمبەری خوایان کرد (دروودی خوای لەسەر بێت): ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە هەر دەخۆینو تێر نابین!!! ئەویش فـەرمووی: «فَلَعَلَّكُم تَفْتَرِقُونَ». واتـە: "ڕەنگە بەجیاجیا نان بخۆن". ئـەوانیش عـەرزیان کـرد: بـەڵێ. ئـەویش فـەرمووی:

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٥٩٩ / بە ژمارە: ٢٠٢١.

«فَاجْتَمِعُوا عَلَى طَعَامِكُمْ، وَاذْكُرُوا اسْمَ اللّهِ، يُبَارَكْ لَكُمْ فِيْهِ».[1] واته: "دەی لەسەر خواردنەکەتان کۆببنەوەو، ناوی خوا بهێنن، تا بەرەکەتی تێ بخات بۆتان".

## ئەگەر کەسێك لەگەڵ دەردەدارێکدا نانی خوارد چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) دەستی کەسێکی (گولبووی) گرتو، لەگەڵ دەستی خۆیدا خستیە ناو قاپە خواردنەکەوەو، فەرمووی: «كُلْ بِسْمِ اللَّهِ، ثِقَةً بِاللَّهِ، وَتَوَكُّلاً عَلَيْهِ».[2] واتە: "بخۆ بەناوی خواوەو، بە متمانە بە خواو، بە پشتبەستن بەخوا".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٣٧٣ / بە ژمارە: ٣٧٦٤، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَە / ٢ / ١٠٩٣ / بە ژمارە: ٣٢٨٦. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ٢١٤.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٤١٣ / بە ژمارە: ٣٩٢٥، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٢٦٦ / بە ژمارە: ١٨١٧، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١١٧٢ / بە ژمارە: ٣٥٤٢. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ٢١٥ - ٢١٦.

## سونەتە خاوەنی خواردن بە میوان و بەو کەسەش کە حسابی میوانی بۆ دەکرێت، ئەگەر دەستیان لە خواردنەکە هەڵگرت، پێیان بڵێت: "بخۆن"و، چەند بارەی بکاتەوە، تا دڵنیا دەبێت لەوەی تێریان خواردوە، بە هەمان شێوە بۆ خواردنەوەو بۆنی خۆش و شتی تری هاوشێوەش

بزانە کە ئەم کارە سونەتە، بەجۆرێکی وەها کە سونەتە مێرد بە ژنەکەی خۆی‌و بە منداڵەکانیشی بڵێت، ئەوانەیان کە گومانی وایە دەستیان لە خواردنەکە هەڵگرتوەو، هێشتا پێویستیان پێی ماوە، باوەکو پێویستیەکی کەمیش بێت.

جا یەکێك لەو حەدیسانەی کە دەکرێت بە بەڵگە بۆ ئەم باسە، بریتیە لەو حەدیسەی کە بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَیْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە حەدیسێکی درێژەو، داگرەوەیە بەسەر چەندین موعجیزەی ئاشکرای پێغەمبەری خوادا (دروودی خوای لەسەر بێت). حەدیسەکەش ئەمەیە: جارێك (أَبو هُرَیْرَة) زۆر زۆر برسی دەبێت‌و، لەسەر ڕێگەیەکدا دادەنیشێت‌و، داوا لە هەموو ئەو کەسانە دەکات، کە بەلایدا تێدەپەڕن، تاوەکو قورئانی بۆ بخوێنن، بە ئومێدی ئەوەی کە میوانداری بکەن‌و لەگەڵ خۆیاندا بیبەنەوە. دواتر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) ناردی بەشوێن هاوەڵانی (أَهْل)ی (صُفَّة)داو، ئەویش هێنانی‌و، پێغەمبەریش هەموویانی بە پەرداخێك شیر تێراو کرد...... ئیتر (أَبو هُرَیْرَة) حەدیسەکە دەگێڕێتەوە، هەتا دەگاتە ئەوەی، کە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) پێی فەرمووم: "من‌و تۆ ماوین". منیش عەرزم کرد: ڕاست دەفەرمویت، ئەی پێغەمبەری خوا. ئەویش فەرمووی: "دانیشە تۆیش بخۆرەوە". منیش دانیشتم‌و خواردمەوە. دیسان فەرمووی: "دانیشە تۆیش بخۆرەوە" ئیتر هەر دەیفەرموو: "بخۆرەوە"، هەتا منیش عەرزم کرد: ناخۆم، سوێند بەو کەسەی تۆی بەحەق ڕەوانە کردوە، ڕێگەی بۆ نابینمەوە (واتە لە

گەدەمدا جێگەی نابێتەوە). ئەوجا پێغەمبەر فەرمووی: ئـادەی پەرداخەکـەم پیشـان بدە. منیش خستمە خزمەتیو، ئەویش سوپاسو ستایشـی خـوای گـەورەی کـردو، (بِسْمِ اللَّهِ)ی کردو، چی تێدا مابوو خۆی خواردیەوە.(١)

## ئەگەر کەسێك تێری خواردو دەستی هەڵگرت چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هـاوەڵی خۆشەویسـت (أَبـو أُمَامَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێـت)، کە پێغەمبـەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت)، ئەگـەر سفرەو قاپەکەی بەردەستی خۆی هەڵبگرتایە، دەیفـەرموو: «الْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيراً طَيِّبـاً مُبارَكاً فِيْهِ، غَيْرَ مَكْفِيٍّ، وَلا مُوَدَّعٍ، وَلا مُسْتَغْنىً عَنْهُ، رَبَّنا».(٢)

لە ڕیوایەتێکیشدا هاتوە: ئەگەر لەخواردن بوایەتەوە.

جارێکیش فەرمووی: ئەگەر سفرەو قاپەکـەی خـۆی هەڵبگرتایـە، دەیفـەرموو: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي كَفَانَا، وَأَرْوَانَا، غَيْرَ مَكْفِيٍّ، وَلا مَكْفُورٍ».(٣)

منیش دەڵێم: وشەی (مَكْفِيّ) لە ڕیوایەتی صەحیحو فەصـیحدا بـەم جۆرەیـەو، زۆرێکیش بە (مَكْفِيء) ڕیوایەتیان کردوە. کە ئەمە لـەڕووی زمانەوانیـەوە هەڵەیـە، ئیتر چی لە (كِفَايَة)وە، یان لـە (كُفِأَ)وە وەرگیرابێـت. هـەر وەکـو چـۆن ناوترێـت (مَقْرِيء)و، ناشوترێت: (مَرْمِيء).

خاوەنی کتێبی (مَطَالِعُ الْأَنْوَار) لە تەفسیری ئەم حەدیسەدا فەرموویەتی: مەبەستی بە هەموو ئەم شتانە خواردنەکەیەو، ڕاناوەکەش هەر بۆ ئەو دەگەڕێتەوە.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٧٠ / بە ژمارە: ٦٠٨٧.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٠٧٨ / بە ژمارە: ٥١٤٢.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٠٧٨ / بە ژمارە: ٥١٤٣.

شێخی (حَرْبِيّ) فەرموویەتی: (مَكْفِيّ) بریتیە لە قاپی دەمەوخوارکراو، لەبەر نیازپێنەمان، وەکو فەرموویەتی: (غَيْرَ مُسْتَغْنىً عَنْهُ)، یان دەمەوخوارکراو لەبەر شتی تر. (غَيْرَ مَكْفُور)یش واتە: ئێمە ئینکاری نیعمەتی خوا ناکەین، بەڵکو شوکرانەبژێری دەکەین‌و، دانپێدانانەکە ناشارینەوەو، سوپاس‌و ستایشی خوای لەسەر دەکەین.

شێخی (خَطَّابِيّ)ش وای بۆ چوە، کە مەبەست بە هەموو ئەم دوعایە خوای گەورەیەو، ڕاناوەکەش بۆ ئەو دەگەڕێتەوەو، مانای (غَيْرَ مَكْفِيّ)یش ئەوەیە، کە ئەو دابینکەری خۆراکەو، خۆیشی پێویستی بە خۆراك نیەو، لەم مەسەلەدا بێ ئیحتیاجە.

هەندێکیش لە زانایان لە تەفسیری ئەم حەدیسەدا هەر وای بۆچوون‌و، فەرموویانە: خوای گەورە پێویستی بە پشتیوان‌و هاوکار نیە.

شێخی (خَطَّابِيّ) فەرموویەتی: (وَلا مُوَدَّعٍ) واتە: واز لە داواکردن لە خوای گەورە ناهێنین‌و، تەنها ئارەزووی خزمەتی ئەویش دەکەین‌و، ئەمەش بەمانای (وَلا مُسْتَغْنىً عَنْهُ) دێت.

وشەی (رَبَّنَا)ش دەکرێت بە مەنصوبی بخوێنرێتەوە. ئەو کاتە وەکو ئەوە وەهایە، کە وترابێت: (يَا رَبَّنَا اسْمَعْ حَمْدَنَا وَدُعَاءَنَا)و، دەشکرێت بە مەرفوعی بخوێنرێتەوە. ئەو کاتە وەکو ئەوە وەهایە، کە وترابێت: (أَنْتَ رَبُّنَا)و، دەشکرێت بە مەجروریش بخوێنرێتەوەو، بەدەل بێت لە ناوی (اللّه)و، وەکو ئەوە وەهایە، کە وترابێت: (الْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّنَا).

زانای پایەبەرز (أَبُو السَّعَادَاتِ ابْنُ الْأَثِيْر)یش لە کۆتایی کتێبی (النِّهَايَةُ فِيْ غَرِيْبِ الْحَدِيْثِ وَالْأَثَر)دا ئەم ناکۆکیەی بە کورتی باس کردوەو، فەرموویەتی: ئەو کەسەی (رَبُّنَا)ی بە مەرفوعی خوێندۆتەوە، کردویەتی بە موبتەدای دواکەوتوو (الْمُبْتَدَأ

الْمُؤَخَّر). واته: (رَبُّنَا غَيْرُ مَكْفِيٍّ وَلا مُوَدَّعٍ). بەمەش دەبێت وشەی (غَيْـرُ)یش بە مەرفوعی بخوێنرێتەوە.

هەروەها فەرموویەتی: دەشکرێت هەموو فەرمایشتەکە بۆ (الْحَمْد) بگەڕێتەوە. بەمەش وەکو ئەوە وەهایە، کە فەرموویێتی: (حَمْداً كَثِيراً غَيْرَ مَكْفِيٍّ، وَلا مُوَدَّعٍ، وَلا مُسْتَغْنىً عَنْ هَذَا الْحَمْدِ).[1]

دەربارەی (وَلا مُوَدَّعٍ)یش فەرموویەتی: واتە: واز لە گوێڕایەڵی خوای گەورە ناهێنین. وتراویشە: لە خواحافیزیو بەجێهێشتنەوە وەرگیراوە.[2] خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى لَيَرْضَى عَنْ الْعَبْدِ أَنْ يَأْكُلَ الْأَكْلَةَ، فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا، أَوْ يَشْرَبَ الشَّرْبَةَ، فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا». واتە: "خوای گەورە ڕازی دەبێت لە بەندەی خۆی، ئەگەر ژەمێك (ی بەیانیان یان ئێواران) خواردن بخواتو، سوپاسی خوای لەسەر بکات، یان یەك جار ئاو بخواتەوەو، سوپاسی خوای لەسەر بکات".[3]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و هەردوو کتێبی (الْجَامِع)و (الشَّمَائِل)ی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، لە خواردن بوایەتەوە، دەیفەرموو: «الْحمدُ لِلَّهِ الَّذِيْ أَطْعَمَنَا، وَسَقَانا، وَجَعَلَنَا

---

(١) بڕوانە: النِّهَايَةُ فِيْ غَرِيْبِ الْحَدِيْثِ وَالْأثر / ٤ / ١٨٢.

(٢) بڕوانە: النِّهَايَةُ فِيْ غَرِيْبِ الْحَدِيْثِ وَالْأثر / ٥ / ١٦٨.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٩٥ / بە ژمارە: ٢٧٣٤.

مُسْلِمِيْنَ».[1] واتە: "سوپاس‌و ستایش بۆ ئەو خوایەی، کە خواردن‌و خواردنەوەی پێداین‌و، کردوینی بە موسوڵمان".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (نَسَائِيّ)دا، بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو أَيُّوْب خَالِد)ی کوڕی (زَيْد)ی (أَنْصَارِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، خواردنێکی بخواردایە، یان شلەمەنیەکی بخواردایەتەوە، دەیفەرموو: «الْحمدُ لِلَّهِ الَّذِيْ أَطْعَمَ، وَسَقَى، وَسَوَّغَهُ، وَجَعَلَ لَهُ مَخْرَجاً».[2] واتە: "سوپاس‌و ستایش بۆ ئەو خوایەی، کە خواردن‌و خواردنەوەی پێداین‌و، قوتدانیشی ئاسان کردوەو، جێگەی دەرچوونیشی بۆ داناوە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (مُعَاذ)ی کوڕی (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ أَكَلَ طَعَاماً، فَقَالَ: "الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنِي هَذَا، وَرَزَقَنِيْهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلاَ قُوَّةٍ"، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ».[3] واتە: ئەو کەسەی خواردنێك بخوات‌و، بەدوایدا بڵێت: "سوپاس‌و ستایش بۆ ئەو خوایەی، کە ئەم خواردنەی دەرخوارد دام‌و، وەك ڕۆزیەك پێی بەخشیم، بێ ئەوەی هێزو توانای خۆمی تێدا بێت"، خوای گەورە لەو تاوانانەی دەبوورێت، کە پێشتر کردوونی.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٣٩٤ / بە ژمارە: ٣٨٥٠، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٠٨ / بە ژمارە: ٣٤٥٧، والشَّمَائِلُ الْمُحَمَّدِيَّة / ١ / ٥٩ / بە ژمارە: ١٩٢. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ٢٢٩.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٣٩٤ / بە ژمارە: ٣٨٥١، وسُنَنُ النَّسَائِيِّ الْكُبْرَى / ٤ / ٢٠١ / بە ژمارە: ٦٨٩٤.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٤٤٠ / بە ژمارە: ٤٠٢٣، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٠٨ / بە ژمارە: ٣٤٥٨، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٠٩٣ / بە ژمارە: ٣٢٨٥.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.

هەروەها ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: لەم باسەدا -مەبەستی **(باسی ئەوەی کەسێك دەیڵێت، کە تێری خواردبێتو دەست هەڵبگرێت)**- حەدیس لە هەریەکە لەم هاوەڵە خۆشەویستانەوە ڕیوایەت کراوە: (عُقْبَة)ی کوڕی (عَامِر)و (أَبُو سَعِيْد)و دایکە (عَائِشَة)و (أَبُو أَيُّوْب)و (أَبُو هُرَيْرَة).[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (نَسَائِيّ)و لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، بە ڕشتەیەکی (حَسَن)، لە زانای پایەبەرزی شوێنکەوتوان (عَبْدُالرَّحْمَن)ی کوڕی (جُبَيْر)ەوە، کە پیاوێك بۆی گێڕاوەتەوە، هەشت ساڵ خزمەتی پێغەمبەری خوای کردوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەو ئەگەر خواردنی لە پێغەمبەر نزیك بکردایەتەوە، گوێی لێبوو دەیفەرموو: «بِسْمِ الله»و، ئەگەر لەخواردنەکەش بوایەتەوە، دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، أَطْعَمْتَ، وَسَقَيْتَ، وَأَغْنَيْتَ، وأَقْنَيْتَ، وَهَدَيْتَ، وَأَحْيَيْتَ، فَلَكَ الْحَمْدُ عَلَى مَا أَعْطَيْتَ».[2] واتە:"خوایە، جەنابت خواردنت پێ دامو، ئاوداشتەت کردمو، بێنیازو دەوڵەمەندت کردمو، ماڵو سەروەتت بۆ جەم کردمو، هیدایەتت دامو، ژیانت پێ بەخشیوم، دەی سوپاسو ستایش بۆ جەنابت لەسەر ئەو خەڵاتانەی بەمنت بەخشیوە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (عَمْرو)ی کوڕی (عَاص)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە ئەگەر لەخواردن بوایەتەوە، دەیفەرموو: «الْحمدُ لِلَّهِ الَّذِيْ مَنَّ عَلَيْنا، وَهَدَانا، وَالَّذِيْ أَشْبَعَنا، وَأَرْوَانا،

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٢٦٥ / لەپاش حەدیسی ژمارە: ١٨١٦.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ النَّسَائِيِّ الْكُبْرَى / ٤ / ٢٠٢ / بە ژمارە: ٦٨٩٨، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٢٠ / بە ژمارە: ٤٦٥. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ٢٣٦.

وَكُلَّ الْإِحْسانِ آتَانَا».[1] واتـه: "سـوپاس‌و سـتایش بـۆ ئـه‌و خوایـه‌ی، منـه‌تی نـاوه به‌سه‌رمانداو، هیدایه‌تی داوین‌و، تێرنان‌و تێرئاوی کردووین‌و، هه‌موو چاکه‌یه‌کی پێ به‌خشیوین".

بۆشمان ڕیوایه‌ت کراوه لـه (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و لـه کتێبه‌که‌ی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، له هاوه‌ڵی خۆشه‌ویست (ابْنُ عَبَّاس)ـه‌وه (خوا لـه هـه‌ردووکیان ڕازی بێت)، که فه‌رموویه‌تی: پێغه‌مبه‌ری خوا (دروودی خـوای لـه‌سـه‌ر بێت)، فه‌رموویـه‌تی: ئه‌گه‌ر یه‌کێك له ئێوه شتێکی خوارد –له ڕیوایه‌ته‌کـه‌ی شـێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا نوسراوه: ئه‌و که‌سه‌ی خوا خواردنێکی ده‌رخواردداـ با بڵێـت: «اللَّهُمَّ، بَارِكْ لَنَـا فِيْهِ، وَأَطْعِمْنا خَيْراً مِنْهُ». واته: "خوایه فـه‌ڕو به‌ره‌کـه‌تی تـێ بخـه بۆمـان‌و، لـه‌مـه‌ش باشترمان ده‌رخوارد بده". ئه‌و که‌سه‌ش خوای گه‌وره شیری ده‌رخواردداً، با بڵێـت: «اللَّهُمَّ، بَارِكْ لَنَا فِيْهِ، وَزِدْنا منهُ». واته: "خوایه فـه‌ڕو به‌ره‌کـه‌تی تـێ بخـه بۆمـان‌و، زۆرتریشمان بده‌رێ". چونکه بێجگه لـه شیر هـیچ شـتێکی تـر جێگـه‌ی خـواردن‌و خواردنه‌وه ناگرێت بۆ مرۆڤی برسی‌و تینو.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فه‌رموویه‌تی: حه‌دیسێکی (حَسَن)ـه.[2]

بۆشمان ڕیوایه‌ت کراوه لـه کتێبه‌که‌ی شێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، بـه ڕشـته‌یه‌کی لاواز، له هاوه‌ڵی خۆشه‌ویست (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (مَسْعُوْد)ه‌وه (خوای لێ ڕازی بێـت)، که فه‌رموویه‌تی: ئه‌گه‌ر پێغه‌مبه‌ری خوا (دروودی خوای له‌سه‌ر بێـت)، لـه قاپێکدا شـتێکی

---

(١) بڕوانه: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٢١ / به ژماره: ٤٦٦. حه‌دیسێکی زۆر لاوازه. بڕوانه: الْعِلَل لابْنِ أَبِيْ حَاتِمِ الرَّازِيّ / ٤ / ٤٠١ / به ژماره: ١٥١٦، وذَخِيْـرَةُ الْحُفَّـاظ لابْنِ طَاهِرِ الْمَقْدِسِيّ / ٢ / ٨٥٢ / به ژماره: ١٦٩٩.

(٢) بڕوانه: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٣٦٥ / به ژماره: ٣٧٣٠، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٠٦ / بـه ژماره: ٣٤٥٥، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٢٤ / به ژماره: ٤٧٤.

بخواردایەتەوە، سێ جار هەناسەی دەداو، لە هەر جارێکیاندا حەمدو سەنای خوای دەکردو، لە دواهەمینیشیاندا شوکرانەی دەکرد.[1]

## ئەگەر کەسی میوان و دەعوەتکراو دەستیان لە خواردن هەڵگرت سوننەتە دوعا بۆ خاوەن خواردنەکە بکەن

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّٰه)ی کوڕی (بُسْر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) تەشریفی هێنا بۆ میوانی ماڵی باوکم و، ئێمەش خواردنێکمان خستە خزمەتی (کە پێکهاتبوو لە خورماو کەشك و ڕۆن)و، پاشان خورمای بۆ هێنراو، ئەویش دەیخواردو، ناوکەکەی دەخستە نێوان هەردوو پەنجەی شایەتومان و ناوەڕاستەوە -ئیمامی (شُعْبَة) فەرموویەت: من گومانم وایە، کە ناوکی خورماکانی دەخستە نێوان ئەو دوو پەنجەیەوەو، ئەگەر خواش بیەوێت، هەر لەوێدا بوە- پاشان شلەمەنیەکی بۆ هێنراو، لەویشی خواردەوەو، ئەوجا دایە دەستی کەسی لای ڕاستی خۆی. پاشان باوکم عەرزی کرد: لەخوا بپاڕێرەوە بۆمان. پێغەمبەریش فەرمووی: «اللَّهُمَّ، بَارِكْ لَهُمْ فِيْمَا رَزَقْتَهُمْ، وَاغْفِرْ لَهُمْ، وَارْحَمْهُمْ».[2] واتە: "خوایە بەرەکەت بخەیتە ڕزق و ڕۆزیانەوەو، لێیان خۆشبەو، ڕەحمیان پێ بکە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و لە غەیری ئەویشدا، بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، تەشریفی هێنا بۆلای هاوەڵی خۆشەویست (سَعْد)ی کوڕی (عُبَادَة) (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش نان و مێوژی بۆ هێناو،

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٢٢ - ٢٢٣ / بە ژمارە: ٤٧١.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦١٥ / بە ژمارە: ٢٠٤٢.

پێغەمبەریش خواردیو، پاشان فەرمووی: «أَفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصَّائِمُونَ، وأَكَلَ طَعَـامَكُمُ الْأَبْرَارُ، وَصَلَّتْ عَلَيْكُمُ الْمَلاَئِكَةُ».[1] واتە: "داوا دەکەم کە بەردەوام ڕۆژووەوانان بەربانگتان لەلا بکەنەوەو، پیاوچاکانیش نانتان بخۆنو، فریشتەکانیش داوای لێخۆشبوونتان بۆ بکەن".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالله)ی کوڕی (زُبَيْر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، لای هاوەڵی خۆشەویست (سَعْد)ی کوڕی (مُعَاذ) (خوای لێ ڕازی بێت)، بەربانگی کردەوەو، ئەوجا فەرمووی: «أَفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصَّائِمُونَ، وأَكَلَ طَعَامَكُمُ الْأَبْرَارُ، وَصَلَّتْ عَلَيْكُمُ الْمَلاَئِكَةُ».[2]

منیش دەڵێم: ئەم دوو ڕووداوە بۆ هەردوو هاوەڵی خۆشەویست (سَعْد)ی کوڕی (عُبَادَة)و (سَعْد)ی کوڕی (مُعَاذ) ڕوویان داوە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)دا، لە (پیاوێکەوە)، لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو الْهَيْثَمِ ابْنُ التَّيِّهَان) (خوای لێ ڕازی بێت) خواردنێکی دروست کردبوو بۆ پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، جا پێغەمبەرو هاوەڵانی بۆ دەعوەت کرد. پاشان کە لە خواردنەکە بوونەوە، پێغەمبەر فەرمووی: «أَثِيبُوا أخاكُمْ». واتە: "پاداشتی براکەتان بدەنەوە". ئەوانیش عەرزیان کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، پاداشتدانەوەکەی چیە؟" ئەویش فەرمووی: «إنَّ الرَّجُلَ إِذَا دُخِلَ بَيْتُهُ، فأُكِلَ طَعامُهُ، وَشُرِبَ شَرَابُهُ، فَدَعَوْا لَهُ، فَذَلِكَ إثابَتُهُ». واتە: "ئەگەر پیاوێك سەردانی ماڵەکەی

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٣٩٥ / بە ژمارە: ٣٨٥٤.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٥٥٦ / بە ژمارە: ١٧٤٧. حەدیسەکە لەم ڕێگەیەوە لاوازە. چونکە کەسێکی لاواز بەناوی (مُصْعَب)ی کوڕی (ثَابِت) لە ڕشتەکەیدایە. بڕوانە: الْفُتُوحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ٢٤٧.

بکرێت‌و، خواردنی بخورێت‌و، خواردنه‌وه‌شی بخورێته‌وه‌، ئه‌وجا (میوانه‌کانی) دوعای بۆ بکه‌ن، ئه‌وه‌ پاداشتدانه‌وه‌که‌یه‌تی".[1]

## ئه‌گه‌ر که‌سێك ئاو یان شله‌مه‌نیه‌کی دا به‌ که‌سێکی تر، سونه‌ته‌ ئه‌و که‌سه‌ دوعای خه‌یری بۆ بکات

بۆمان ڕیوایه‌ت کراوه‌ له‌ صه‌حیحی موسلیمدا، له‌ هاوه‌ڵی خۆشه‌ویست (مِقْدَاد)ه‌وه‌ (خوای لێ ڕازی بێت)، له‌و حه‌دیسه‌ درێژه‌ به‌ناوبانگه‌ی، که‌ فه‌رموویه‌تی: پێغه‌مبه‌ری خوا (دروودی خوای له‌سه‌ر بێت)، سه‌ری به‌رز کرده‌وه‌ بۆ ئاسمان‌و، فه‌رمووی: «اللَّهُمَّ، أطْعِمْ مَنْ أطْعَمَني، وَاسْقِ مَنْ سَقَانِي».[2] واته‌: "خوایه‌ خواردن‌و خواردنه‌وه‌ بده‌یت به‌و که‌سه‌ی خواردن‌و خواردنه‌وه‌ی دا به‌من".

بۆشمان ڕیوایه‌ت کراوه‌ له‌ کتێبه‌که‌ی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، له‌ هاوه‌ڵی خۆشه‌ویست (عَمْرو)ی کوڕی (حَمِق)ـه‌وه‌ (خوای لێ ڕازی بێت)، که‌ ئه‌و هه‌ندێك شیری دا به‌ پێغه‌مبه‌ری خوا (دروودی خوای له‌سه‌ر بێت)، پێغه‌مبه‌ریش فه‌رمووی: «اللَّهُمَّ، أمْتِعْهُ بِشَبَابِهِ». واته‌: "خوایه‌، هه‌ر به‌ گه‌نجی بیهێڵه‌وه‌". ئه‌وه‌بوو (عَمْرو) ته‌مه‌نی چوه‌ هه‌شتا ساڵ‌و، یه‌ك ته‌ڵ مووی سپی له‌ گیانی خۆیدا نه‌بینی.[3]

بۆشمان ڕیوایه‌ت کراوه‌ له‌ کتێبه‌که‌ی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، له‌ هاوه‌ڵی خۆشه‌ویست (عَمْرو)ی کوڕی (أخْطَب)ـه‌وه‌ (خوای لێ ڕازی بێت)، که‌ فه‌رموویه‌تی:

---

(١) بڕوانه‌: سُنَنُ أبِيْ دَاوُد / ٢ / ٣٩٤ / به‌ ژماره‌: ٣٨٥٣. حه‌دیسێکی لاوازه‌. چونکه‌ که‌سێکی نه‌ناسراو له‌ ڕشته‌که‌یدایه‌. بڕوانه‌: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ٢٤٨.

(٢) بڕوانه‌: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٢٥ / به‌ ژماره‌: ٢٠٥٥.

(٣) بڕوانه‌: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٢٤ / به‌ ژماره‌: ٤٧٥. شێخی عه‌سقه‌لانی فه‌رموویه‌تی: حه‌دیسێکی لاوازه‌. به‌ڵام پاڵپشتی هه‌یه‌. بڕوانه‌: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ٢٥٤ - ٢٥٥.

پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، داوای ئاوی کردو، منیش لە (جُمْجُمَة)یەکدا (واتە: لە پەرداخێکی داریدا) ئاوم بۆ هێناو، ئاوەکەش تەڵە موویەکی تێدابوو، دەرمهێنا. پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت)، فەرمووی: «اللَّهُمَّ، جَمِّلْهُ». واتە: "خوایە هەر بەجوانی بیهێڵەرەوە".

ڕاوی ئەم حەدیسە دەفەرموێت: من (عَمْرو)م بینیوە، تەمەنی نەوەدوسێ (٩٣) ساڵ بوەو، قژو ڕیشی هەر ڕەش بوون.[١]

منیش دەڵێم: (جُمْجُمَة) بریتیە لە پەرداخی لەدار دروستکراو. جەمعەکەشی بریتیە لە (جَمَاجِم)و، هەر بە ئەمیش ئەو جێگایەی عێراق ناونراوە بە (دِيْرُ الْجَمَاجِم)، کە شەڕی (ابْنُ الْأَشْعَث) لەگەڵ (حَجَّاج)ی تێدا ڕوویداوە. چونکە پەرداخی دارینی تێدا دروست دەکرا. وتراویشە: بۆیە بەو ناوەوە ناونراوە، چونکە بە کەلەی سەری کوژراوەکان دروست کراوە، کە خەڵکێکی زۆری تێدا کوژرا.

## سونەتە دوعا بۆ ئەو کەسە بکرێت کە میوانداری خەڵکی دەکات‌و، هانیش بدرێت لەسەر ئەو کارە

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، تا پێغەمبەر میوانداری بکات‌و بیباتەوە بۆ ماڵەوە، ئەویش هیچی نەبوو تا میوانداری بکات. بۆیە فەرمووی: «أَلا رَجُلٌ يُضِيْفُ هَذَا، رَحِمَهُ اللهُ». واتە: "ئادەی چی پیاوێك میوانداری ئەم کەسە

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٢٥ / بە ژمارە: ٤٧٧. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: الْفُتُوحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ٢٥٥.

دەکات، ڕەحمەتی خوای لێبێت". ئەوەبوو پیاوێك لە پشتیوانان هەستاو، بردیەوە بۆ ماڵی خۆی....... ئیتر تەواوی حەدیسەکەی باس کرد.[1]

## باسی ستایشکردنی ئەو کەسەی ڕێز لە میوان دەگرێت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)و، عەرزی کرد: تەواو شەکەت‌و نارەحەتم (واتە: لە برسێتی‌و تینوێتیدا). پێغەمبەریش ناردی بۆلای یەکێك لە خێزانەکانی‌و، ئەویش فەرمووی: "سوێند بەو کەسەی تۆی بەحەق ناردوە، بێجگە لە ئاو هیچی ترم لا نیە". پاشان ناردی بۆلای خێزانێکی تری‌و، ئەویش هەر وەهای فەرموو. هەتا هەموویان هەر وایان فەرموو. ئەوجا پێغەمبەر فەرمووی: «مَنْ يُضِيْفُ هَذَا، رَحِمَهُ اللَّهُ؟». واتە: "کێ میوانداری ئەم پیاوە دەکات، ڕەحمەتی خوای لێبێت؟" پیاوێك لە پشتیوانان هەستاو، وتی: "من، ئەی پێغەمبەری خوا". ئەوەبوو بردیەوە بۆ ماڵی خۆی‌و، فەرمووی بە خێزانەکەی: "هیچت لەلایە؟" ئەویش وتی: "نەخێر، تەنها خواردنی منداڵەکانم نەبێت". پیاوەکەش وتی: "دەی بەشتێك مناڵەکان سەرقاڵ بکەو، هەر کە میوانەکەمان هاتە ژوورەوە، چراکە بکوژێنەوەو، وا پیشان بدە، کە ئێمەش نان دەخۆین. جا کە میوانەکە ویستی دەست بکات بە نانخواردن، تۆش هەستە چراکە بکوژێنەوە". ئەوەبوو هەرسێکەیان دانیشتن‌و، میوانەکە نانی خوارد. ئەوجا سبەینێ خاوەنماڵەکە چوو بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)و، پێغەمبەریش فەرمووی: «قَدْ عَجِبَ اللَّهُ مِنْ صَنِيْعِكُما بِضَيْفِكُما اللَّيْلَةَ». واتە: خوای گەورە زۆر ڕازیە لەو کارەی کە ئێوە ئەم شەو لەگەڵ میوانەکەتاندا کردتان.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيِّ / ٤ / ١٨٥٤ / بە ژمارە: ٤٦٠٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٢٥ / بە ژمارە: ٢٠٥٤.

بۆیە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزانـد: ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَـانَ بِهِـمْ خَصَاصَةٌ﴾ [الْحَشْـر: ٩] واتـە: {هاوەڵـە پشـتیوانەکان خـەڵکی پێشـدەخەن بەسـەر خۆیاندا، باوەکو خۆیشیان موحتاجو نەدار بن}.[1]

منیش دەڵێم: ئەم حەدیسە وا لێکدەدرێتەوە، کە منداڵەکان زۆر پێویسـتیان بـە خواردنەکە نەبوە. چونکە عادەت وەهایە، کە منداڵ بـاوەکو تێـریش بێـت، ئەگـەر بینـی کەسـێك نـان دەخـوات، ئـەویش داوای دەکـات. هـەروەها کـردەوەی ژنو مێردەکەش وا لێکدەدرێتەوە، کە ئـەوان بەشـەکەی خۆیـان داوە بـە میوانەکـەیان. خواش لـە هەموو کەس زانا ترە.

## سونەتە خاوەن ماڵ بەخێرهاتنی میوانەکەی بکاتو، سوپاسی خوای گەورە بکات، کە ئەو بوەتە میوانیو، دڵ خۆشی خۆی بەو بۆنەوە دەربب‌ڕێتو، ستایشی خوای گەورە بکات، کە کردوویەتی بە ئەهلی ئەو کارە

لـە چەندین ڕێگەوە بۆمان ڕیوایەت کـراوە لـە هـەردوو صـەحیحی بوخـاریو موسلیمدا، لـە هەردوو هـاوەڵی خۆشەویسـت (أَبـو هُرَيْـرَةَ)و (أَبـو شُـرَيْح)ی (خُزَاعِيّ)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبـەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ كان يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ».[2] واتـە: "ئـەو کەسەی باوەڕی بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، با ڕێزی میوانەکەی بگرێت".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٣٨٢ / بە ژمارە: ٣٥٨٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٢٤ / بە ژمارە: ٢٠٥٤.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٤٠ / بە ژمارە: ٥٦٧٢، وصَحِيْحُ مُسْـلِم / ١ / ٦٨ / بە ژمارە: ٤٧.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ڕۆژێك یان شەوێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) تەشریفی بردە دەرەوە، لەوێ گەیشت بە هەردوو هاوەڵی خۆشەویست: ئیمامی (أَبُو بَكْر)و ئیمامی (عُمَر) (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، جا لێی پرسین: "چی لەم کاتەدا ئێوەی هێناوەتە دەرەوە؟" عەرزیان کرد: "برسێتی، ئەی پێغەمبەری خوا". ئەویش فەرمووی: "سوێند بەخوا، هەر ئەوەی ئێوە منیشی هێناوەتە دەرەوە " ئەوجا فەرمووی: "ئادەی هەستن با بڕۆین". ئەوانیش هەستان لە خزمەتیدا ڕۆیشتن‌و، تەشریفی برد بۆ ماڵی پیاوێکی پشتیوانان، کەچی پیاوەکە لەماڵ نەبوو. جا کە خێزانەکەی چاوی بە پێغەمبەر کەوت، بەخێرهاتنی کردوو، فەرمووی (مَرْحَباً وَأَهْلاً). پێغەمبەریش پێی فەرموو: "فلأنەکەس لەکوێیە؟" ئەویش عەرزی کرد: "چوە ئاوی خاوێن‌و سازگارمان بۆ بهێنێت". ئەوەبوو پیاوەکە هاتەوەو، تەماشای پێغەمبەرو هەردوو هاوەڵەکەی کردو، فەرمووی: "سوپاس‌و ستایش بۆ خوای گەورە، ئەمڕۆ هیچ کەسێك میوانی لە میوانەکانی من بەڕێزتری بۆ نەهاتوە"...... ئیتر تەواوی حەدیسەکەی باس کرد.[1]

## ئەگەر کەسێك تێری خواردو دەستی لە خواردن هەڵگرت چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «أَذِيْبُوا طَعَامَكُمْ بِذِكْرِ اللَّهِ –عَزَّ وَجَلَّ– وَالصَّلاةِ، وَلا تَنَامُوا عَلَيْهِ،

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٠٩ / بە ژمارە: ٢٠٣٨.

فَتَقْسُوَ لَهُ قُلُوْبُكُمْ». [1] واته: "ئەوەی خواردووتانە بە زیکری خوای گەورەو بە نوێـژ کردن بیتاوێننەوەو هەزمی بکەن، نەکەن لەسەری بخەون، با دڵتان ڕەق نەبێت".

* * * * *          * * * * *          * * * * *

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٣٠ / بە ژمارە: ٤٨٨. حەدیسـێکی (مَوْضُوْع)و هەڵبەستراوە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ٢٦٤ - ٢٦٥.

# ((كتێبی سڵاو کردن و، داوای مۆڵەتی هاتنەژوورەوەی ماڵان و، دوعا کردن بۆ کەسی پژمیوو، ئەوەش پەیوەندی بەمانەوە هەیە ))

- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا دَخَلْتُمْ بُيُوتاً فَسَلِّمُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِنْ عِنْدِ اللَّهِ مُبَارَكَةً طَيِّبَةً﴾ [النُّور: ٦١] واتە: {ئەگەر چوونە ناو خانوویەکەوە، سڵاوێکی پیرۆزو خاوێنی خوایی لەخۆتان بکەن}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا حُيِّيتُمْ بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا﴾ [النِّسَاء: ٨٦] واتە: {ئەگەر بەجۆرێك سڵاوتان لێ کرا، ئێوەش بە جۆرێکی جوانتر یان هەروەکو خۆی وەڵامی بدەنەوە}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿لَا تَدْخُلُوا بُيُوتاً غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا﴾ [النُّور: ٢٧] واتە: {ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان بەخواو پێغەمبەرەکەی هێناوە، مەچنە ناو خانوویەك، بێجگە لە خانووی خۆتان، هەتا پرس نەکەن‌و، سڵاو لە خەڵکەکەی ناوی نەکەن}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا بَلَغَ الْأَطْفَالُ مِنْكُمُ الْحُلُمَ فَلْيَسْتَأْذِنُوا كَمَا اسْتَأْذَنَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ﴾ [النُّور: ٥٩] واتە: {کاتێکیش منداڵەکانتان گەیشتنە تەمەنی باڵغبوون‌و پێگەیشتن، با ئەوانیش داوای ئیزن‌و مۆڵەت بکەن، وەکو چۆن کەسانی پێش ئەوان داوایان دەکرد}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ الْمُكْرَمِينَ * إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ فَقَالُوا سَلَاماً قَالَ سَلَامٌ﴾ [الذَّارِيَات: ٢٤ - ٢٥] واتە: {ئایا تۆ باسی میوانە بەڕێزەکانی حەزرەتی (إِبْرَاهِيم)ت پێگەیشتوە؟ کاتێك هاتنەژوورەوە بۆلای، وتیان: سڵاوت لێبێت، ئەویش فەرمووی: سڵاو لە ئێوەش بێت}.

بشزانە کە ئەصڵی سڵاو کردن بە قورئان‌و بە سونەت‌و بە کۆدەنگی زانایان سابت بوە.

سەبارەت بە دانەدانەی مەسئەلەکانی‌و لقە لقە باسباسەکانی، ئەوە لەوە زۆرترن کە بژمێردرێن. منیش -ئەگەر خوای گەورە بیەوێت- پوختەی مەبەستە سەرەکیەکانی لە چەند باسێکدا کەمدا دەهێنم. تەوفیق‌و ڕێنموویی‌و پێکان‌و چاودێریش تەنها لەلایەن خوداوەیە.

## باسی گەورەیی سڵاو کردن و، فەرمان کردن بە بڵاوکردنەوەی سڵاو

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (عَمْرو)ی کوڕی (عَاص)ـەوە (خوا لە خۆی و باوکیشی ڕازی بێت)، کە پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا کرد (درودی خوای لەسەر بێت): (أَيُّ الْإِسْلامِ خَيْرٌ؟) واتە: "چی کارێك لە ئیسلامدا باشترین کارە؟" ئەویش فەرمووی: «تُطْعِمُ الطَّعامَ، وَتَقْرأُ السَّلامَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ».[1] واتە: "نان بدە بیت و، سڵاو بکەیت لەو کەسەی کە دەیناسیت و، لەوەش کە نایناسیت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «خَلَقَ اللَّهُ –عَزَّ وَجَلَّ– آدَمَ عَلَى صُورَتِهِ، طُولُهُ سِتُّونَ ذِرَاعاً. فَلَمَّا خَلَقَهُ، قَالَ: اذْهَبْ، فَسَلِّمْ عَلَى أُولَئِكَ نَفَرٍ مِنَ الْمَلائِكَةِ جُلُوسٍ، فَاسْتَمِعْ مَا يُحَيُّونَكَ، فَإِنَّهَا تَحِيَّتُكَ وَتَحِيَّةُ ذُرِّيَّتِكَ. فَقَالَ: "السَّلامُ عَلَيْكُمْ". فَقَالُوا: "السَّلامُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللَّهِ" فَزَادُوهُ: وَرَحْمَةُ اللَّهِ».[2] واتە: "خوای گەورە باوکە ئادەمی لەسەر شێوەی خۆی دروستکردوە (واتە: وەکو پیاوێکی ڕێك و پێك و تەواو، نەك وەکو نەوەو وەچەکانی کە بە چەند قۆناغێکدا تێدەپەڕن)، درێژیەکەی شەست قۆڵ بوو، جا کە دروستی کرد، فەرمووی: بڕۆ، سڵاو بکە لەو فریشتانەی دانیشتوون و، گوێشبگرە لە سڵاوەکەی ئەوان بۆ تۆ، چونکە ئەوە سڵاوی تۆو سڵاوی وەچەو نەوەکانیشتە. جا ئەویش فەرمووی: (السَّلامُ عَلَيْكُمْ). ئەوانیش (وَرَحْمَةُ اللَّهِ)یان بۆ زیاد کردو، فەرموویان: (السَّلامُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللَّهِ).

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ١٣ / بە ژمارە: ١٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٦٥ / بە ژمارە: ٣٩.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٩٩ / بە ژمارە: ٥٨٧٣، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢١٨٣ / بە ژمارە: ٢٨٤١.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (بَرَاء)ی کوڕی (عَـازِب)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمانی پێ کردین بە حەوت شت: بە سەردانی کردنی نەخۆش‌و، بە شوێنکەوتنی جەنازەو، بە دوعا کردن بۆ کەسی پژمیوو، بە پشتیوانی کردنی کەسی لاوازو بێدەسەڵاتو، بە یارمەتیدان‌و کۆمەکی کردنی کەسی ستەملێکراوو، بە بڵاوکردنەوەی سڵاو کردن‌و، بە نەشکاندن‌و بەجێهێنانی سوێند.[1]

جا ئەمە دەقی یەکێك لە ڕیوایەتەکانی ئیمامی بوخاریە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُـو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، فەرموویەتی: «لا تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا، وَلا تُؤْمِنُوا حَتَّـى تَحَـابُّوا. أَوَلا أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيْءٍ، إِذَا فَعَلْتُمُوهُ، تَحَابَبْتُمْ؟ أَفْشُوا السَّـلامَ بَيْـنَكُمْ».[2] واتە: "ناچنە بەهەشتەوە هەتا ئیمان نەهێنن، ئیمانیشتان تەواو نابێت، هەتا یەکترتان خۆش نەوێت. جا ڕێنموویتان نەکەم بۆلای شتێك، ئەگەر بیکەن یەکترتان خۆش دەوێت؟ سڵاو لەناو خۆتاندا بڵاو بکەنەوە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (مُسْنَد)ی ئیمامی (دَارِمِـيّ)و هەردوو کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)و لە غەیری ئەوانیشدا، بە چەند ڕشتەیەکی جوان (جَيِّد)، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّٰه)ی کوڕی (سَلام)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: لە پێغەمبەری خوام بیستوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ، أَفْشُوا السَّلامَ، وَأَطْعِمُوا الطَّعامَ، وَصِلُوا الْأَرْحَامَ، وَصَلُّوا

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٠٢ / بە ژمارە: ٥٨٨١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٣٥ / بە ژمارە: ٢٠٦٦.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٧٤ / بە ژمارە: ٥٤.

وَالنَّاسُ نِيَامٌ، تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ بِسَلَامٍ». واته: "ئەی خەڵکینە، لەنێوان خۆتاندا سلاّو بلاّوبکەنەوەو، نانبدە بنو، پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنن (بە هەواڵپرسینو سەردانی کردن)و، ئەو کاتەش خەڵکی نوستوون، ئێوە نوێژ بکەن، تا بە سەلامەتی بچنە بەهەشتەوە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو کتێبەکەی ئیمامی (ابْنُ مَاجَه)و شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو أُمَامَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەرەکەمان (دروودی خوای لەسەر بێت)، فەرمانی پێکردین، کە سلاّو زۆر بلاّو بکەینەوە.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (مُوَطَّأ)ی ئیمامی (مَالِك)دا (خوای لێ ڕازی بێت)، لە (إِسْحَاق)ی کوڕی (عَبْدُالله)ی کوڕی (أَبُو طَلْحَة)وە، کە (طُفَيْل)ی کوڕی (أُبَيّ)ی کوڕی (كَعْب) هەواڵی پێ داوە، کە ئەو دەهات بۆ خزمەتی هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالله)ی کوڕی ئیمامی (عُمَر)و، بەیانیان زوو لەخزمەتیدا دەچوو بۆ بازاڕ. (طُفَيْل) دەفەرموێت: جا کە دەچووینە بازاڕ، (عَبْدُالله) بەلای هیچ وردەواڵەفرۆشو کۆنەفرۆشو گرانبەهافرۆشو، هەژارو، هیچ کەسێکدا تێنەدەپەڕی، هەتا سلاّوی لێ نەکات. (طُفَيْل) دەفەرموێت: ڕۆژێك هاتم بۆ خزمەتی (عَبْدُالله)و، داوای لێکردم کە شوێنی بکەوم بۆ بازاڕ. منیش عەرزم کرد: ئیشت چیە لەبازاڕ؟ خۆ تۆ هیچ ناکڕیتو، پرسیاری شمەكو کالاّیەك ناکەیتو، مامەڵەی پێوە ناکەیت (واتە: نە

(١) بڕوانە: سُنَنُ الدَّارِمِيّ / ١ / ٤٠٥ / بە ژمارە: ١٤٦٠، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٦٥٢ / بە ژمارە: ٢٤٨٥، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٠٨٣ / بە ژمارە: ٣٢٥١.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٢١٨ / بە ژمارە: ٣٦٩٣، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١١٠ - ١١١ / بە ژمارە: ٢١٦. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـەو، پاڵپشتیشی هەیە. بڕوانە: الْفُتُوحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ٢٨٠.

کڕیاریت‌و نه فرۆشیار)و، لـه هیچ کۆڕێکی بازاڕەکەشدا دانانیشیت! ئەوجا عـەرزم کرد: دانیشه با لێرەدا قسه بکەین. ئیتر هـاوەڵی خۆشەویسـت (ابْــنُ عُمَــر) پێـی فەرمووم: ورگن -چونکه (طُفَيْل) کەسێکی ورگن بوە-! لـەبەر سڵاو کردن دەچین بۆ بازاڕ، سڵاو دەکەین لـەو کەسەی پێی دەگەین.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـه صەحیحی بوخاریدا، لـه ئیمامی بوخاری خۆیەوە، کـه فەرموویەتی: هاوەڵی خۆشەویست (عَمَّــار) (خـوای لێ ڕازی بێـت) فەرموویـەتی: سـێ سیفەت هەن، هەر کەسێك لـەخۆیدا کۆیان بکاتەوە، ئیمانی لـەخۆیدا کۆکردۆتەوە: هەبوونی ویژدان لـەگەڵ نەفس‌و دەروونـی خۆتـداو، سـڵاو کـردن لــه خــەڵکی‌و، بەخشین‌و خێرکردن لـەکاتی هەژاری‌و نەداریدا.[2]

ئێمه ئەم حەدیسەمان لـه غەیری صــەحیحی بوخاریشــدا بـۆ ڕیوایـەت کـراوە‌و، حەدیسەکەش دراوەته پاڵ پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لـەسەر بێت).[3]

منـیش دەڵـێم: بەڕاسـتی ئـەم سـێ ڕسـتەیه خێروبێـری دنیـاو دوارۆژی تێـدا کۆکراوەتەوە. چونکه هەبوونی ویژدان وا دەخوازێت، که هەرچی مـاف‌و فـەرمانی خوای گەورە هەیه جێبەجێیان بکات‌و، خۆی لـه هەموو ئەو شتانه لابدات، که خـوا

---

(١) بڕوانه: مُوَطَّأ الْإِمَام مَالِك / ٢ / ٩٦١ / به ژمارە: ١٧٢٦. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: فەرمایشتێکی (مَوْقُوْف)ی (صَحِيْح)ـە. بڕوانه: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ٢٨٠.

(٢) بڕوانه: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ١٨.

(٣) زانای پایەبەرز شێخ (نُوْرُ الدِّيْن)ی (هَيْثَمِيّ) فەرموویەتی: ئیمامی (طَبَرَانِــيّ) لــه (الْمُعْجَــمُ الْكَبِيْر)دا ڕیوایەتی کردوە‌و، لـه ڕشتەکەشیدا کەسێکی لاواز هەیه، به نـاوی (الْقَاسِم أَبُــو عَبْدِالرَّحْمَن). بڕوانه: مَجْمَعُ الزَّوَائِد / ١ / ٢١٩ / به ژمارە: ١٨٤. هـەروەها لــه هــەمان لاپەڕەداو لـەسەر حەدیسێکی پێشتر به هەمان دەق‌و به ژمارە (١٨٣) فەرموویەتی: ئیمامی (بَزَّار) ڕیوایەتی کردوە‌و، کەسەکانی ڕشتەی گێڕانەوەکەشی ئەو کەسانەن که لـه ڕشـتەی گێڕانەوەی حەدیسی صەحیحدا هەن. بەڵام ئەوەندە هەیه، که مامۆستاکەی ئیمامی (بَزَّار)، که بریتیه لـه (حَسَن)ی کوڕی (عَبْدُالله)ی (كُوْفِيّ)، نەمبینیوە کەس باسی بکات.

نەهی لێ کردونو، مافی خەڵکیش جێبەجێ بکاتو، داوای شتێك نەکات، کە هی خۆی نیەو، ویژدانیشی هەبێت لەگەڵ نەفسو دەروونی خۆیدا، بەهیچ جۆرێك نەیخاتە ناو خراپەو تاوانەوە.

سەبارەت بە سڵاو کردنیش لە خەڵکی، مانای ئەوەیە، کە سڵاو لە هەموو کەسێك بکات. ئەمەش ئەوە لەخۆدەگرێت، کە خۆی لەکەس بە گەورەتر نەزانێتو، لەگەڵ هیچ کەسێکیشدا ساردی لەنێوانیاندا نەبێت، کە بەهۆیەوە سڵاوی لێ نەکات.

سەبارەت بە بەخشینو خێرکردنیش لەکاتی نەبوونیو نەداریدا، ئەوە وادەخوازێت کە ئەو کەسە بەتەواوەتی متمانەی بەخوای گەورە هەیەو، پشتی بە ئەو بەستوەو، سۆزو بەزەییشی بۆ موسوڵمانان هەیەو، شتی تریش.

جا ئێمەش لەخوای بەخشندە داواکارین، کە سەرکەوتوومان بکات بۆ هەموو ئەمانە.

## باسی چۆنێتی سڵاو کردن

بزانە کە باشتر وەهایە کەسی موسوڵمان بڵێت: (السَّلامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ). واتە: ڕاناوی کۆ بەکار بهێنێت، باوەکو سڵاو لێکراوەکە یەك کەسیش بێت. هەروەها کەسی وەڵامدەرەوەی سڵاوەکەش بڵێت: (وَعَلَيْكُمُ السَّلامُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكاتُه).

جا هەندێك لەو زانایانەی کە فەرموویانە: باشتر وەهایە کەسی سڵاوکەر بڵێت: (السَّلامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ): پێشەوای پایەبەرز (أَبو الْحَسَن)ی (مَاوَرْدِيّ)، لە کتێبی (الْحَاوِي)دا، لە (كِتَابُ السِّيَر)داو، پێشەوای پایەبەرز (أَبو سَعْد)ی

(مُتَوَلِّي) -كە یەکێکە لە هاوەڵانمان- لـە (كِتَابُ صَـــلاةِ الْجُمُعَــةِ)و، لـە غـەیری ئەویشدا.

بەڵگەی ئەمەش بریتیە لەو حەدیسەی، کە بۆمان ڕیوایەت کراوە لـە (مُسْنَد)ی ئیمامی (دَارِمِيّ)و (سُنَن)ی (أَبُـــو دَاوُد)و (تِرْمِـــذِيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (عِمْرَان)ی کوڕی (حُصَيْن)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)و، وتـی: (السَّـــلامُ عَلَـــيْكُمْ). پێغەمبەریش وەڵامی دایەوەو، پاشـان پیاوەکـە دانیشـتو، پێغەمبـەریش فـەرمووی: «عَشْرٌ». واتە: (دە خـەیری دەسـت کـەوت). پاشـان پیـاوێکی تـر هـاتو، وتـی: (السَّلامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّـــهِ)و، پێغەمبـەریش وەڵامـی دایـەوەو، ئـەوجا ئـەویش دانیشتو، پێغەمبەریش فـەرمووی: «عِشْـــرُونَ». واتـە: (بیسـت خـەیری دەسـت کەوت). پاشان پیاوێکی تر هاتو، وتـی: (السَّلامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُـــهُ)و، پێغەمبەریش وەڵامی دایەوەو، ئـەوجا ئـەویش دانیشـتو، پێغەمبـەریش فـەرمووی: «ثَلاثُونَ». واتە: (سی خەیری دەست کەوت).

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

لە ڕیوایەتێکی ئیمامی (أَبو دَاوُد)دا، لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (مُعَـــاذ)ی کوڕی (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، زیاتر لـەمەش هاتوە، ئەو فەرموویـەتی: پاشـان پیاوێکی تر هاتو، وتی: (السَّلامُ عَلَـــيْكُمْ وَرَحْمَـــةُ اللَّـــهِ وَبَرَكَاتُـــهُ وَمَغْفِرَتُـــهُ)و، پێغەمبەریش فەرمووی: «أَرْبَعُونَ». واتـە: (چـل خـەیری دەسـت کـەوت). ئـەوجا فەرمووی: (دەستکەوتنی فەزڵو پاداشتی زۆر بەم جۆرە دەبێت).[2]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ الدَّارِمِيّ / ٢ / ٣٦٠ / بە ژمارە: ٢٦٤٠، وسُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٧١ / بـە ژمارە: ٥١٩٥، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٢ / بە ژمارە: ٢٦٨٩.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِـــيْ دَاوُد / ٢ / ٧٧١ / بـە ژمـارە: ٥١٩٦. حەدیسـێکی لاوازە. بڕوانـە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ٢٩١ - ٢٩٢.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، بـە ڕشـتەیەکی (ضَعِيْف)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویـەتی: جارێـك پێغەمبـەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت)، چـاودێری ئـاژەڵی هـاوەڵانی دەکردو، پیاوێکیش بەلایدا تێپەڕی‌و، وتی: (السَّلامُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ الله). پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) پێـی فـەرموو: (وَعَلَيْكَ السَّلامُ وَرَحْمَةُ اللّهِ وَبَرَكَاتُـهُ وَمَغْفِرَتُهُ وَرِضْوَانُهُ). جا عەرزی کرا: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو سڵاوەی لەم پیـاوەی دەکەیت، سڵاوت لـە هیچ یەکێك لە هاوەڵانت پێ نەکردوە؟! ئـەویش فـەرمووی: جا چی ڕێگریم لێدەکات لەوە، لەکاتێکدا ئەو پیاوە پاداشتی (١٠ – ١٩) کەسـی دەست دەکەوێت؟.[١]

هاوەڵانمان فەرموویانە: ئەگەر کەسی سڵاوکەر بڵێت: (السَّلامُ عَلَـيْكُمْ)، ئـەوا سڵاوەکە دێتەجێ‌و، ئەگەر بشڵێت: (السَّلامُ عَلَيْكَ)، یان (سَلامٌ عَلَيْكَ) دیسان هەر دێتەجێ.

سەبارەت بە وەڵامی سڵاوەکەش، ئـەوە کـەمترین وەڵام بریتیـە لـە: (وَعَلَيْـكَ السَّلامُ)، یان (وَعَلَيْكُمُ السَّلامُ). خـۆ ئەگـەر واوەکـە لابـات‌و، بڵێـت: (عَلَـيْكُمُ السَّلامُ)، ئەوا هـەر دروسـتەو، دەبێتـە وەڵامـیش. ئەمـەش ئـەو مەزهەبـە دروسـتە مەشهورەیە، کە ئیمـامی (شَـافِعِيّ) لـە کتێبـی (الْـأُمّ)دا فەرموویـەتی‌و، زۆربـەی هاوەڵانیشمان هەر وایان فەرموە.

زانای پایەبەرز (أَبو سَعْد)ی (مُتَوَلِّي) –کە یەکێکـە لـە هاوەڵانمـان– لـە کتێبـی (التَّتِمَّة)دا فەرموویەتی: (عَلَيْكُمُ السَّلامُ) دروست نیەو، وەڵامیش نیە.

جا ئەمە بۆچوونێکی لاوازە یان هەڵەیەو، پێچەوانەی قورئان‌و حـەدیس‌و دەقـی فەرمایشتی ئیمامی (شَافِعِيّ)ـە.

---

(١) بڕوانـە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١١٨ – ١١٩ / بـە ژمـارە: ٢٣٥. حەدیسـێکی زۆر لاوازە. بڕوانە: الْفُتُوحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ٢٩٢.

سەبارەت بە قورئانی پیرۆز، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قَالُوا سَلاماً قَالَ سَلامٌ﴾ [هُود: ٦٩]. جا ئەمە ئەگەرچی شەرعی ئومەتەکانی پێش ئێمەیە، بەلاّم شەرعەکەی ئیمەش پەسەندی کردوە. ئەویش بەو حەدیسەی هاوەڵی خۆشەویست (أبو هُرَيْرَة) (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێشتر باسمان کرد، سەبارەت بە وەلاّمی فریشتەکان بۆ باوکە (آدَم) (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) هەواڵی پێ داوین، کە خوای گەورە فەرموویەتی: (هِيَ تَحِيَّتُكَ وَتَحِيَّةُ ذُرِّيَّتِكَ). واتە: ئەمە سلاّوی تۆو، سلاّوی وەچەو نەوەکانیشتە. جا مەعلومە کە ئەم ئومەتەش بەشێکە لە وەچەو نەوەکانی باوکە (آدَم). خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

هاوەلاّنیشمان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی، کە ئەگەر لە وەلاّمی سلاّودا بلێت: (عَلَيْكُمُ)، ئەوە بە وەلاّم دانانرێت. جا ئەگەر بلێت: (وَعَلَيْكُمُ)، ئایا بە وەلاّم دادەنرێت یان نا؟ ئەوە دوو بۆچوونی هاوەلاّنمانی لەبارەوە هاتوە.

ئەگەر کەسی سلاّوکەر وتی: (سَلامٌ عَلَيْكُمْ)، یان وتی: (السَّلامُ عَلَيْكُمْ)، ئەوا کەسی وەلاّمدەرەوە بۆی هەیە لە هەردوو شێوازەکەدا بلێت: (سَلامٌ عَلَيْكُمْ)و، بۆیشی هەیە بلێت: (السَّلامُ عَلَيْكُمْ). خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَقَالُوا سَلاماً قَالَ سَلامٌ﴾.

پێشەوای پایەبەرز (أبو الْحَسَن)ی (وَاحِدِيّ) -کە یەکێکە لە هاوەلاّنمان- فەرموویەتی: تۆ لە بە ناسراوی (مَعْرِفَة)و بە نەناسراوی (نَكِرَة) هێنانی وشەی (سَلامُ)دا سەرپشكو ئارەزوومەندی.

منیش دەڵێم: بەلاّم باشتر وەهایە کە بە ئەلف‌ولامەوە بهێنرێت (واتە: بە ناسراوی).

## باسێك: {دووبارەكردنەوەی سڵاو سونەتە}

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، كە ئەگەر شتێكی بفەرموایە، سێ جار دووبارەی دەكردەوە، هەتا لێی تێبگەن و، ئەگەر تەشریفیشی بهێنایە بۆلای خەڵكێك، سێ جار سڵاوی لێ دەكردن.[1]

منیش دەڵێم: ئەم حەدیسە وا لێكدەدرێتەوە، كە ئەگەر خەڵكەكە كۆمەڵێكی زۆر بوون. لەمەولاش ئەگەر خوای گەورە بیەوێت، ئەم مەسەلە بەڕوونی باس دەكەین و، فەرمایشتی ئیمامی (مَاوَرْدِيّ)شی لەبارەوە دەهێنین، كە خاوەنی كتێبی (الْحَاوِي)ـە.

## باسێك: {سڵاو كردن بە دەنگی بەرز}

كەمترین سڵاو كردن، كە بەهۆیەوە وا دادەنرێت كەسێك سونەتی سڵاو كردنی بەجێهێناوە، ئەوەیە، كە دەنگی خۆی بەجۆرێك بەرز بكاتەوە، كە كەسە سڵاو لێكراوەكە گوێی لێبێت. خۆ ئەگەر ئەو گوێی لێنەبێت، ئەوە وا دانانرێت كە سڵاوی كردبێت و، واجبیش نیە وەڵامی بدرێتەوە.

كەمترینی وەڵامدانەوەش، كە فەرزی وەڵامدانەوەی سڵاوی پێ دادەكەوێت، ئەوەیە، كە دەنگی بەجۆرێك بەرز بكاتەوە، كە كەسە سڵاوكەرەكە گوێی لێبێت. خۆ ئەگەر ئەو گوێی لێنەبێت، ئەوا فەرزی وەڵامدانەوەكەی لەسەر داناكەوێت. وەكو شێخی (مُتَوَلِّي)و غەیری ئەویش فەرموویانە.

منیش دەڵێم: سونەتە ئەوەندە دەنگی بەرز بكاتەوە، كە كەسە سڵاو لێكراوەكە، یان سڵاو لێكراوەكان بەدڵنیاییەوە گوێیان لە سڵاوەكە بێت. خۆ ئەگەر گومانی

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤٨ / بە ژمارە: ٩٥.

هەبوو، کە ئایا گوێیان لێبوە یان نا، ئەوا با ئیحتیات بکاتو، زیاتر دەنگی بەرز بکاتەوە.

بەڵام ئەگەر سڵاوی لە کۆمەڵە کەسێکی بەخەبەر کرد، کە چەند کەسێکی خەوتوویان لەلادابوو، ئەوا سونەتە بەجۆرێك دەنگی نزم بکاتەوە، کە بەخەبەرەکان گوێیان لێبێتو، خەوتوەکانیش خەبەرنەکاتەوە.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (مِقْدَاد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، لەو حەدیسە درێژەی، کە فەرموویەتی: ئێمە بەشە شیرەکەی پێغەمبەری خوامان (دروودی خوای لەسەر بێت) دەبرد بۆ خزمەتیو، ئەویش لە شەودا تەشریفی دەهێناو، سڵاوێکی وەهای دەکرد، کە کەسی خەوتووی خەبەر نەدەکردەوەو، کەسی بەخەبەریش گوێی لێ دەبوو.منیش جارێك خەوم نەدەهاتو، دوو هاوڕێکەشم خەوتبوون. جا پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، تەشریفی هێناو، هەر بەو جۆرە سڵاوی کرد، کە پێشتر دەیکرد.[1] خواش لە هەموو کەس زاناترە.

## باسێك: {وەڵامدانەوەی سڵاو دەست بەجێ}

پێشەوای پایەبەرز قاضی (حُسَيْن)و (أَبو الْحَسَن)ی (وَاحِدِيّ)و، غەیری ئەوانیش لە هاوەڵانمان فەرموویانە: بەمەرج گیراوە کە وەڵامدانەوەی سڵاو دەست بەجێ بێت. خۆ ئەگەر دوایخستو، پاشان وەڵامی دایەوە، ئەوە بە وەڵام دانانرێتو، تاوانباریش دەبێت، کە وەڵامی نەداوەتەوە.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٢٥ / بە ژمارە: ٢٠٥٥.

## باسی ئەو حەدیسانەی سەبارەت بە ناپەسەندی سڵاو کردن بە ئیشارەتی دەست و شتی تر هاتون، بەبێ دەنگ

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە (عَمْـرو)ی کوڕی (شُعَیْب)ـەوە، ئەویش لە باوکیەوەو، ئەویش لە باپیرەیەوە، ئـەویش لـە پێغەمبـەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «لَیْسَ مِنَّا مَـنْ تَشَـبَّهَ بِغَیْرِنَـا. لا تَشَبَّهُوا بِالْیَهُوْدِ وَلا بِالنَّصَارَى، فَإِنَّ تَسْلِیمَ الْیَهُودِ الْإِشَارَةُ بِالْأَصَابِعِ، وَتَسْلِیمَ النَّصَارَى الْإِشارَةُ بِالْكَفِّ». واتە: "ئەو کەسـە لـە ئێمـە نیـە، کـە خـۆی بـە غـەیری ئێمـەوە دەشوبهێنێت. خۆتان مەشوبهێنن بە جولەکەو گاورەکانەوە: چونکە بەڕاستی سڵاو کردنی جولەکەکان بریتیە لە ئاماژەکردن بە پەنجەکانو، سڵاو کردنی گاورەکانیش بریتیە لە ئاماژەکردن بە لەپی دەست".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: ڕشتەکەی لاوازە.[1]

منیش دەڵێم: سەبارەت بەو حەدیسەش، کە بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە ژنەهاوەڵی خۆشەویست (أسْمَاء)ی کچی (یَزِیْـد)ەوە، "کـە ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسـەر بێـت) بـە مزگەوتـدا تێپـەڕیو، کۆمەڵـە ئافرەتێکیش دانیشتبوون، ئەویش بە دەستی ئاماژەی بۆ کـردنو سـڵاوی لێ کـردن" ئیمامی (تِرْمِذِيّ)ش فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە[2]، ئـەوە وا لێکدەدرێتـەوە، کـە پێغەمبـەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) بـە دەسـتو بـە زمـانیش سـڵاوی لێکردون.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٦ / بە ژمـارە: ٢٦٩٥. بـەڵام پاڵپشتیشـی هەیـە. بڕوانـە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِیَّة / ٥ / ٢٩٩ – ٣٠٠.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٨ / بە ژمارە: ٢٦٩٧.

بەڵگەی ئەم لێکدانەوەش ئەوەیە، کە ئیمامی (أبو دَاوُد) ئەم حەدیسەی ڕیوایەت کردوەو، لە گێڕانەوەشیدا فەرموویەتی: پێغەمبەر سلاّوی لێکردین.[1]

## باسی حوکمی سلاّو کردن

بزانە کە سلاّو کردن سونەتەو، واجب نیەو، سونەتی (کِفَایَة)شە. بۆیە ئەگەر سلاّوکەرەکان کۆمەڵێك بوون، ئەوا سلاّو کردنی یەکێکیان بەسە بۆ هەموویان. خۆ ئەگەر هەموویان سلاّو بکەن، ئەوە باشترە.

پێشەوای پایەبەرز قاضي (حُسَیْن) –کە یەکێکە لە پێشەوایانی هاوەڵانمان– لە (کِتَابُ السِّیَر)ی (تَعْلِیْق)ـەکەیدا فەرموویەتی: بێجگە لە ئەمە سونەتی (کِفَایَة)ی ترمان نیە.

منیش دەڵێم: ئەمەی کە قاضي (حُسَیْن) وای داناوە تاکە نموونەیە، جێگەی سەرنجە. چونکە هاوەڵانمان (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) فەرموویانە: دوعا کردن بۆ کەسی پژمیویش هەر سونەتی (کِفَایَة)یە، وەکو لەم نزیکانەدا –ئەگەر خوای گەورە بیەوێت– بەڕوونی باسی دەکەین.

کۆمەڵێکیش لە هاوەڵانمان، بەڵکو هەموویان فەرموویانە: قوربانی کردن سونەتی (کِفَایَة)یە، دەرهەق بە تەواوی ئەندامانی خێزانێك. بۆیە ئەگەر یەکێکیان قوربانی بکات، ئەوا شیعارو سونەتەکە بۆ هەموویان دێتەدی.

سەبارەت بە وەڵامدانەوەی سلاّویش، ئەوە ئەگەر سلاّو لێکراوەکە یەك کەس بوو، ئەوا پێویستە لەسەری وەڵام بداتەوە. خۆ ئەگەر کۆمەڵێك بوون، ئەوا وەڵامدانەوەکە فەرزی (کِفَایَة)یە لەسەر هەموویان. بۆیە ئەگەر یەکێکیان وەڵامی

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٧٣ / بە ژمارە: ٥٢٠٤.

دایەوە، ئەوا ئەرکەکە لەسەر ئەوانی تر نامێنێت. خۆ ئەگەر هەموویان وەڵامیان نەدایەوە، ئەوا هەموویان تاوانبار دەبن. ئەگەر هەمووشیان وەڵامیان دایەوە، ئەوە ئەوپەڕی تەواوی‌و گەورەییە. هاوەڵانمان وایان فەرموەو، فەرمایشتەکەشیان بەهێزو جوانە.

هاوەڵانیشمان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی، کە ئەگەر کەسێکی تر (لە دەرەوەی کۆمەڵەکە) وەڵامی دایەوە، ئەوا وەڵامدانەوەکە لەسەر کۆمەڵەکە داناکەوێت. بەڵکو پێویستە لەسەریان وەڵامی سڵاوەکە بدەنەوە. خۆ ئەگەر تەنها ئەو کەسە وەڵامی دایەوە، ئەوا هەموویان تاوانبار دەبن.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)دا لە ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «يُجْزِئُ عَنِ الْجَمَاعَةِ إِذَا مَرُّوا أَنْ يُسَلِّمَ أَحَدُهُمْ، وَيُجْزِئُ عَنِ الْجُلُوسِ أَنْ يَرُدَّ أَحَدُهُمْ».[1] واتە: "ئەگەر کۆمەڵێك تێپەڕین‌و، تەنها یەکێکیان سڵاوی کرد، بۆ هەموویان جێگە دەگرێت‌و، ئەگەر کۆمەڵێکیش دانیشتبوون‌و، تەنها یەکێکیان وەڵامی دایەوە، بۆ هەموویان جێگە دەگرێت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (مُوَطَّأ)دا، لە زانای پایەبەرزی شوێنکەوتوان (زَیْد)ی کوڕی (أَسْلَم)ـەوە، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، فەرموویەتی: «إِذَا سَلَّمَ وَاحِدٌ مِنَ القَوْمِ، أَجْزَأَ عَنْهُمْ».[2] واتە: "ئەگەر یەك کەس لە کۆمەڵێك سڵاوی کرد، بۆ هەموویان جێگە دەگرێت".

منیش دەڵێم: ئەمە حەدیسێکی (مُرْسَل)ـەو، ڕشتەکەشی (صَحِيْح)ـە.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٧٥ / بە ژمارە: ٥٢١٠. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ٣٠٥.

(٢) بڕوانە: مُوَطَّأُ الْإِمَامِ مَالِك / ٢ / ٩٥٩ / بە ژمارە: ١٧٢١.

## باسێك: {ئەو كەسەی سلاوێكی پێگەیشت، واجبە وەڵامی بداتەوە}

پێشەوای پایەبەرز (أَبو سَعْد)ی (مُتَوَلِّي)و غەیری ئەویش فەرموویانە: ئەگەر كەسێك لە پشتی پەردەیەك یان دیوارێكەوە بانگی كەسێكی تری كردو، وتی: (السَّلامُ عَلَيْكَ يَا فُلانُ). واتە: سلاوت لێبێت، ئەی فلانە كەس. یان نوسراوێكی نوسیو، تێیدا نوسیبووی: (سلاوت لێبێت، ئەی فلانە كەس)، یان (سلاو لە فلانە كەس). یان كەسێكی ناردبوو، پێیشی وتبوو: (سلاو بكە لە فلانە كەس)و، كەسەكەش نوسراوەكە یان نێردراوەكەی پێگەیشت، پێویستە وەڵامی سلاوەكە بداتەوە.

هەروەها شێخی (وَاحِدِيّ)و غەیری ئەویش فەرموویانە: پێویستە لەسەر كەسە نوسراوبۆكراوەكە وەڵامی سلاوەكە بداتەوە، ئەگەر پێی گەیشت.

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە (عَائِشَةَ)ی دایكی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) پێی فەرمووم: «ئەمە جوبرەئیلە سلاوت لێ دەكات». منیش وتم: (وَعَلَيْهِ السَّلامُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكاتُهُ).[1]

جا لە هەندێك لە ڕیوایەتەكانی هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا بەم جۆرە هاتووەو، وشەی (وَبَرَكاتُهُ)ی تێدایە. بەڵام لە هەندێك لە ڕیوایەتەكاندا ئەو وشەیەی تێدا نیەو، زیادەی كەسی متمانەداریش قبوڵكراوە.

لە كتێبەكەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)شدا وشەی (وَبَرَكاتُهُ) هاتووەو، ئەویش فەرموویەتی: حەدیسێكی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ە.[2]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٣٧٤ / بە ژمارە: ٣٥٥٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٨٩٥ / بە ژمارە: ٢٤٤٧.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٥ / بە ژمارە: ٢٦٩٣.

سونەتیشە سڵاو بۆ کەسی غائبو دوور بنێردرێت.

## باسێك: {ئەو کەسەی سڵاوی کەسێکی دووری پێگەیشت، واجبە دەست بەجێ وەڵامی بداتەوە}

ئەگەر کەسێك بە کەسێکی تردا سڵاوی ناردو، نێردراوەکەش وتی: (فڵانە کەس سڵاوت لێ دەکات)، ئەوە وەکو باسمان کرد، پێویستە دەست بەجێ وەڵامی سڵاوەکە بداتەوەو، سونەتیشە وەڵامی کەسە سڵاوگەیەنەرەکەش بداتەوەو، بڵێت: (وَعَلَيْكَ وَعَلَيْهِ السَّلامُ) واتە: (سڵاو لە تۆو، لە ئەویش).

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)دا، لە (غَالِب)ی (قَطَّان)ەوە، ئەویش لە (پیاوێکەوە)، کە وتوویەتی: باوکم بۆی گێڕامەوە لە باپیرەمەوە، کە فەرموویەتی: باوکم ناردمی بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)و، وتی: بچۆرە خزمەتیو، سڵاوی لێ بکە. منیش هاتمە خزمەتیو، عەرزم کرد: باوکم سڵاوت عەرز دەکات. ئەویش فەرمووی: «وَعَلَيْكَ السَّلامُ، وَعَلَى أَبِيْكَ السَّلامُ».[1]

منیش دەڵێم: ئەمە ئەگەرچی ڕیوایەتە لە (کەسێکی نادیارو نەناسراو)، بەڵام پێشتر باسمان کرد، ئەو حەدیسانەی لەبارەی کردەوە چاکەکانەوە هاتون، بەلای هەموو زانایانەوە چاوپۆشیان تێدا دەکرێت.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٨٠ / بە ژمارە: ٥٢٣١.

## باسێك: {سڵاو كردن لە كەسی گوێ گران}

شێخی (مُتَوَلِّي) فەرموویەتی: ئەگەر سڵاوی لە كەسێكی گوێ گران كرد، ئەوا پێویستە بە دەم سڵاوی لێ بكات، چونكە دەتوانێت، هەروەها بە دەستیش ئاماژەی بۆ بكات، تاوەكو كەسەكە تێبگاتو، ئەمیش شایستەی وەڵامدانەوە بێت. بۆیە ئەگەر بە هەردوو جۆرەكە سڵاو نەكات، ئیتر شایستەی وەڵامدانەوە نابێت.

دیسان فەرموویەتی: هەروەها ئەگەر كەسێكی گوێ گران سڵاوی لەم كردو، ئەمیش ویستی وەڵامی بداتەوە، دەبێت بە زمان وەڵامەكە بداتەوەو، بە دەستیش ئاماژەی بۆ بكات، تاوەكو كەسەكە تێبگاتو، ئەمیش فەرزی وەڵامدانەوەكەی لەسەر دابكەوێت.

هەروەها فەرموویەتی: ئەگەر سڵاوی لە كەسێكی لاڵ كردو، كەسە لاڵەكەش بە دەست ئاماژەی كرد، ئەوا فەرزی وەڵامدانەوەكەی لەسەر دادەكەوێت. چونكە ئاماژەكردنەكەی ئەو لەجێگەی قسەدا دادەنیشێت.

بە هەمان شێوە ئەگەر كەسێكی لاڵ بە ئاماژە سڵاوی لێكرد، ئەوا هەر شایستەی وەڵامدانەوە دەبێت، لەبەر ئەو هۆكارەی كە باسمان كرد.

## باسێك: {سڵاو كردن لە منداڵ}

شێخی (مُتَوَلِّي) فەرموویەتی: ئەگەر كەسێك سڵاوی لە منداڵێك كرد، ئەوا پێویست نیە لەسەر منداڵەكە وەڵامی بداتەوە. چونكە منداڵ لەو كەسانە نیە، كە شتی لەسەر فەرز بێت.

جا ئەمەی كە شێخی (مُتَوَلِّي) فەرموویەتی ڕاستو دروستە. بەڵام ئەدەب وەهایەو، سونەتیشە كە منداڵەكە وەڵامی بداتەوە.

قاضي (حُسَيْن)و قوتابیەکەشی -کە شێخی (مُتَـوَلّي)ــە- فەرموویانـە: ئەگـەر منداڵێك سڵاوی لـە کەسێکی پێگەیشتووی باڵغ کرد، ئایا پێویسـتە لەسـەر کەسـە پێگەیشـتوەکە وەڵامـی سـڵاوەکەی بداتـەوە؟ ئـەوە دوو بۆچـوونی لەسـەرە، کـە پەیوەندیان بە دروستێتی موسوڵمانبوونی منداڵەوە هەیە:

- ئەگەر بڵێین: موسوڵمانبوونی دروستە، ئەوا سڵاوی ئـەمیش وەکـو سـڵاوی کەسی پێگەیشتوو وەهایەو، پێویستە وەڵامی بدرێتەوە.
- ئەگـەر بیشـڵێین: موسـوڵمانبوونی دروسـت نیـە، ئـەوا وەڵامدانـەوەی سڵاوەکەی واجب نیە، بەڵکو سونەتە.

منیش دەڵێم: بۆچوونە دروست و ڕاستەکەی ئەم دوو بۆچـوونە، ئەوەیانـە، کـە واجبە وەڵامی سـڵاوەکەی بدرێتـەوە. چـونکە خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿وَإِذَا حُيِّيْتُمْ بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوْهَا﴾ [النّساء: ٨٦].

سـەبارەت بـەوەش کـە ئـەوان فەرموویانـە: "پەیوەنـدی بـە درووسـتێتی موسوڵمانبوونی منداڵەکەوە هەیە"، زانای پایەبـەرز شـێخ (أَبُـو بَکْـر) (شَاشِـيّ) فەرموویەتی: بۆچوونێکی هەڵەیە. جا هەر ئەوە ڕاستە، کە ئەو فەرموویەتی. خـواش لە هەموو کەس زانا ترە.

ئەگەر کەسێکی پێگەیشتوو سڵاوی لە کۆمەڵێك کرد، کە منداڵێکیان تێدابوو، منداڵەکە وەڵامی دایەوەو، ئەوانی تر وەڵامیان نەدایـەوە، ئایـا فەرزەکـەیان لەسـەر دادەکەوێت؟ ئەمەش دوو بۆچوونی لەسەرە:

- دروستترینیان -کە (قَاضِي حُسَيْن)و شێخی (مُتَوَلّي) لەسـەرە- ئەوەیـە، کـە فەرزەکەیان لەسەر داناکەوێت. چونکە منداڵەکە لەو کەسانە نیە، کە شـتی لەسەر فەرز بێت. خۆ وەڵامدانەوەی سڵاویش فەرزە، بۆیە بە وەڵامدانـەوەی

منداڵەکە فەرزەکە داناکەوێت، هەروەکو چۆن فەرزی نوێژی جەنازەی پێ داناکەوێت.

- بۆچوونی دوەمیش، کە فەرمایشتی شێخ (أَبو بَكْر)ی (شَاشِيّ)ـە، خاوەنی کتێبی -(حِلْيَةُ الْعُلَماءِ فِيْ مَعْرِفَةِ مَذاهِبِ الْفُقَهاءِ) ناسراو بە- (الْمُسْتَظْهِرِيّ) -کە یەکێکە لە هاوەڵانمان- ئەوەیە: کە فەرزەکەی پێ دادەکەوێت، هەر وەکو چۆن بانگدانی منداڵ بۆ پیاوان دروستەو، بە بانگدانەکەی ئەو، داوای بانگدان لەسەر پیاوان دادەکەوێت.

منیش دەڵێم: سەبارەت بە نوێژ کردن لەسەر جەنازەش، ئەوە هاوەڵانمان دوو بۆچوونی جیاوازو مەشهوریان هەیە لەسەر داکەوتنی فەرزێتی ئەو نوێژە، بە کردنی لەلایەن منداڵێکەوە: دروستترینیان بەلای هاوەڵانمانەوە ئەوەیە کە دادەکەوێتو، فەرمایشتی ئیمامی (شَافِعِيّ)شی لەسەر هاتوە. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## باسێك: {دوبارەکردنەوەی سڵاو لەگەڵ هەموو بەیەك گەیشتنێکدا}

ئەگەر کەسێك سڵاوی لە کەسێکی تر کردو، پاشان لە ماوەیەکی نزیکدا پێی گەیشتەوە، ئەوا سونەتە بۆ جاری دوەمو جاری سێیەمو زیاتریش سڵاوی لێ بکاتەوەو، هاوەڵانمان لەسەر ئەمە یەکدەنگن. بەڵگەش لەسەری بریتیە لە:

ئەو حەدیسەی کە بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، لە حەدیسی ئەو کەسەی، کە نوێژی بە خراپی کردوە. جا کەسەکە هاتوەو، نوێژی کردوەو، پاشان هاتوە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)و، سڵاوی لێ کردوەو، ئەویش وەڵامی سڵاوەکەی داوەتەوەو، پێیشی فەرموە: «بگەڕێرەوە نوێژەکەت بکەرەوە. چونکە ئەوە نوێژ نیە، کە تۆ کردت». جا کابراش گەڕایەوەو،

نوێژەکەی کردەوەو، ئەوجا هاتەوەو، سڵاوی لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) کردەوە، هەتا سێ جار ئەم کارەی کرد.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُوْ دَاوُد)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «إِذَا لَقِيَ أَحَدُكُمْ أخاهُ، فَلْيُسَلِّمْ عَلَيْهِ. فَإِنْ حَالَتْ بَيْنَهُمَا شَجَرَةٌ أَوْ جِدَارٌ أَوْ حَجَرٌ، ثُمَّ لَقِيَهُ، فَلْيُسَلِّمْ عَلَيْهِ».[2] واتە: "ئەگەر یەکێك لە ئێوە گەیشت بە برایەکی دینی خۆی، با سڵاوی لێ بکات. جا ئەگەر درەختێك یان دیوارێك یان بەردو تاوێرێك کەوتە نێوانیانەوەو، پاشان پێی گەیشتەوە، با هەر سڵاوی لێ بکاتەوە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ڕێیان دەکردو دەهاتن‌و دەچوون. جا ئەگەر دارێك یان بەرزاییەك بهاتایەتە پێشیان، دەبوون بەدوو بەشەوە، بۆ لای ڕاست‌و بۆ لای چەپ. پاشان لەو دیوی ئەوەوە دەگەیشتنەوە بەیەکترو، سڵاویان لەیەکتر دەکرد.[3]

---

(1) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٦٣ / بە ژمارە: ٧٢٤، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٢٩٧ / بە ژمارە: ٣٩٧.

(2) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٧٢ / بە ژمارە: ٥٢٠٠. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ٣١٨.

(3) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٢٣ / بە ژمارە: ٢٤٥. هەروەها ئیمامی بوخاریش لە (الْأَدَبُ الْمُفْرَد)و ئیمامی (طَبَرَانِيّ)ش لە (الْمُعْجَمُ الْأَوْسَط)دا ڕیوایەتیان کردووەو، شێخی (هَيْثَمِيّ)ش سەبارەت بە ڕیوایەتەکەی ئیمامی (طَبَرَانِيّ) فەرموویەتی: ڕشتەکەی (حَسَن)ـە. بڕوانە: الْأَدَبُ الْمُفْرَد / ٣٤٩ / بە ژمارە: ١٠١١، والْمُعْجَمُ الْأَوْسَط / ٨ / ٦٩ / بە ژمارە: ٧٩٨٧، ومَجْمَعُ الزَّوَائِد / ٨ / ٣٤ / بە ژمارە: ١٢٧٥٢.

## باسێك: {سڵاو كردنی دوو كەسی بەیەك گەیشتوو لە یەك كاتدا}

ئەگەر دوو كەس بەیەكتر گەیشتن‌و، لە یەك كاتدا هەریەكەیان سڵاوی لەوی تریان كرد، یان یەكێكیان دوای ئەوی تریان سڵاوی كرد، ئەوە (قَاضِي حُسَيْن)و شێخی (مُتَوَلِّي) فەرموویانە: هەریەكە لەو دوو كەسە دەبن بە سڵاوكەر. بۆیە پێویستە لەسەر هەریەكەیان وەڵامی سڵاوی ئەوی تریان بداتەوە.

شێخی (شَاشِيِّ) فەرموویەتی: ئەمە جێگەی سەرنجە. چونكە ئەو تەعبیرەی بۆ سڵاو كردن بەكار دەهێنرێت، بۆ وەڵامدانەوەش دەشێت. بۆیە ئەگەر یەكێكیان لەدوای ئەوی تریانەوەبوو، ئەوە دەبێتە وەڵام. بەڵام ئەگەر هەردووكیان بە یەك جار بوو، ئەوە نابێتە وەڵام.

جا بۆچوونی ڕاست ئەمەیە، كە شێخی (شَاشِيِّ) فەرموویەتی.

## باسێك: {حوكمی ئەو كەسەی دەگات بە كەسێكی ترو، پێی دەڵێت: (وَعَلَيْكُمُ السَّلام)}

ئەگەر كەسێك گەیشت بە كەسێكی ترو، كەسی سڵاوكەر وتی: (وَعَلَيْكُمُ السَّلام)، شێخی (مُتَوَلِّي) فەرموویەتی: ئەوە بە سڵاو دانانرێت. بۆیە شایستەی وەڵامدانەوەش نیە. چونكە ئەو تەعبیرە بۆ سڵاو كردن ناشێت.

منیش دەڵێم: بەڵام ئەگەر بڵێت: (عَلَيْكَ السَّلام)، یان (عَلَيْكُمُ السَّلام)، بەبێ واو، ئەوە پێشەوای پایەبەرز (أَبُو الْحَسَن)ی (وَاحِدِيّ) فەرموویەتی: بە سڵاو كردن دادەنرێت‌و، پێویستیشە لەسەر كەسی بەرامبەر وەڵامی بداتەوە، ئەگەرچی تەعبیرە عادەتیەكەشی هەڵگێڕاوەتەوە.

جا بۆچوونی بەهێز ئەمەیە، كە شێخی (وَاحِدِيّ) فەرموویەتی.

هەروەها زانای پایەبەرز (إِمَامُ الْحَرَمَيْن)یش هەر وای فەرموە. بۆیە پێویستە کەسی بەرامبەر وەڵامی سڵاوەکەی بداتەوە. چونکە تەعبیرەکە بە سڵاو دادەنرێت.

دەشگونجێت بوترێت: لەوەدا کە ئایا ئەو تەعبیرە بە سڵاو دادەنرێت، دوو بۆچوونی لەسەرە، وەکو ئەو دوو بۆچوونەی هاوەڵانمان، سەبارەت بەوەی کە ئەگەر کەسی نوێژخوێن بۆ دەرچوونی لەنوێژەکەی بڵێت: (عَلَيْكُمُ السَّلام)، ئایا بەوە لە نوێژەکەی دەردەچێت، یان نا؟ دروستترین بۆچوونیان ئەوەیە کە: بەڵێ دەردەچێت.

هەروەها دەشگونجێت بوترێت، ئەم کەسە بەهیچ جۆرێك شایستەی وەڵامدانەوە نیە. لەبەر ئەو حەدیسەی، کە بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و لە غەیری ئەوانیشدا، بە چەند ڕشتەیەکی (صَحِيْح) لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو جُرَيّ)ی (هُجَيْمِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ناوی (جَابِر)ی کوڕی (سُلَيْم)ـە -وتراویشە: ناوی (سُلَيْم)ی کوڕی (جَابِر)ە- جا ئەو فەرموویەتی: جارێك هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)و، عەرزم کرد: (عَلَيْكَ السَّلامُ يَا رَسُوْلَ الله). ئەویش فەرمووی: «لا تَقُلْ: "عَلَيْكَ السَّلامُ"، فَإِنَّ عَلَيْكَ السَّلامُ تَحِيَّةُ الْمَوْتَى». واتە: "مەڵێ: (عَلَيْكَ السَّلامُ)، چونکە ئەو تەعبیرە بۆ سڵاو کردن لە مردووەکان بەکار دەهێنرێت".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[1]

منیش دەڵێم: دەگونجێت ئەم حەدیسە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوە بێت، کە باشترین و تەواوترین تەعبیری سڵاو کردن کامەیە. نەك مەبەستەکە ئەوە بێت، کە ئەو تەعبیرە بۆ سڵاو کردن بەکار ناهێنرێت. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٧٤ / بە ژمارە: ٥٢٠٩، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٧١ / بە ژمارە: ٢٧٢١.

پێشەوای پایەبەرز (أبو حَامِد)ی (غَزَالِيّ) لە کتێبی (إِحْيَاء)دا فەرموویەتی: ناپەسەندە کەسی سڵاوکەر یەکەمجار بڵێت: (عَلَيْكُمُ السَّلام)، لەبەر ئەم حەدیسە. جا بۆچوونی هەڵبژێردراو ئەوەیە کە سڵاو کردن بەو صیغەیە ناپەسەندە. خۆ ئەگەر کەسێك بەو جۆرە سڵاوی کرد، پێویستە وەڵام بدرێتەوە، چونکە بە سڵاو دادەنرێت.

## باسێك: {سڵاوکردن بەر لە قسە کردن سونەتە}

سونەتە کەسی موسوڵمان بەر لە هەموو قسەیەك سڵاو بکات. حەدیسە (صَحِيْح)ـەکانو، کاری (سَلَف)و (خَلَف)ی ئەم ئومەتەش لەو بارەوە مەشهورن.

جا بەڵگەی پشت پێ بەستراوی ئەم باسە بریتیە لەو حەدیسە صەحیحانەو، لە کاری (سَلَف)و (خَلَف)ی ئومەت.

سەبارەت بەو حەدیسەش، کە بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «السَّلامُ قَبْلَ الْكَلامِ»، ئەوە حەدیسێکی لاوازەو، ئیمامی (تِرْمِذِيّ)ش فەرموویەتی: ئەمە حەدیسێکی (مُنْكَر)ە.[1]

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٩ / بە ژمارە: ٢٦٩٩.

## باسێك: {فەزڵ و گەورەیی سڵاو کردن}

سڵاو کردن (لە وەڵامدانەوە) باشترە. لەبەر ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە لە حەدیسی صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتوە: «وَخَيْرُهُما الَّذِيْ يَبْدأُ بِالسَّلامِ».[1] واتە: "باشترینیان ئەوەیانە کە سڵاوەکە دەکات".

بۆیە باشتر وەهایە بۆ هەریەکە لەو دوو کەسەی بەیەکتر دەگەن، سووربێت لەسەر ئەوەی کە ئەو سڵاوەکە بکات.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)دا، بە ڕشتەیەکی جوان (جَيِّد)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو أُمَامَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِنَّ أَوْلَى النَّاسِ بِاللَّهِ مَنْ بَدأَهُمْ بِالسَّلامِ».[2] واتە: "شایستەترینی خەڵکی بە لوتفی خوا، ئەو کەسەیە کە سەرەتا سڵاو لە خەڵکی دەکات".

لە ڕیوایەتەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا هاتوە، کە عەرزی پێغەمبەر کراوە: ئەی پێغەمبەری خوا، دوو پیاو بەیەکتر دەگەن، کامیان سڵاو بکات؟ ئەویش فەرمووی: «أَوْلاهُمَا بِاللَّهِ تَعَالَى».

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[3]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٥٦ / بە ژمارە: ٥٧٢٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٩٨٤ / بە ژمارە: ٢٥٦٠.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٧١ / بە ژمارە: ٥١٩٧.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٦ / بە ژمارە: ٢٦٩٤.

## باسی ئەو حاڵەتانەی کە سڵاو کردن تێیاندا سونەتەو، ئەوانەش کە تێیاندا ناپەسەندەو، ئەوانەش کە تێیاندا (مُبَاح)ـە

بزانە کە ئێمە فەرمانمان پێکراوە سڵاو زۆر بکەین، وەکو پێشتر باسمان کرد. بەڵام سڵاو کردن لە هەندێك حاڵەتدا زۆرتر جەختی لەسەر کراوەتەوەو، لە هەندێك حاڵەتیشدا کەمترو، لە هەندێك حاڵەتیشدا نەهی لێ کراوە.

سەبارەت بەو حاڵەتانەی کە زۆر جەختی لەسەرکراوەتەوەو سونەتە، ئەوە لە ژمارە نایەن. چونکە سڵاو کردن ئەصڵە. بۆیە ئێمەش زۆر لەخۆمان ناکەین بۆ باسکردنی یەکەبەیەکەی حاڵەتەکان.

بشزانە کە سڵاو کردن لە زیندوەکانو لە مردوەکان بەر ئەم حاڵەتانە دەکەونو، پێشتریش لە ((**کتێبی زیکرەکانی مردوو**))دا چۆنێتی سڵاو کردن لە مردوومان باس کرد.

سەبارەت بەو حاڵەتانەش کە سڵاو کردن تێیاندا ناپەسەندە، یان کەمتر جەختی لەسەر کراوەتەوە، یان (مُبَاح)ـە، ئەوانە هەڵاوێرکراون لە ئەصڵەکە. بۆیە پێویستە بەڕوونی باس بکرێن.

یەکێك لەو حاڵەتانە ئەوەیە کە: ئەگەر سڵاو لێکراوەکە خەریکی میزکردن یان جوتبوون یان شتێکی لەو جۆرە بێت. کە لەم حاڵەتانەدا ناپەسەندە سڵاوی لێ بکرێت. خۆ ئەگەر کەسێك سڵاوی کرد، ئەوا شایستەی وەڵامدانەوە نابێت.

یەکێکیش لەو حاڵەتانە ئەوەیە کە: کەسە سڵاو لێکراوەکە خەوتبێت، یان خەوەنووچکە بیباتەوە.

یەکێکیش لەو حاڵەتانە ئەوەیە کە: کەسەکە نوێژ بکات، یان خەریکی بانگدان، یان قامەت کردن بێت بۆ نوێژ، یان لە حەمامو لەو جێگانەی تردا بێت، کە سڵاو کردن تێیاندا پەسەن نیە.

یەکێکیش لەو حاڵەتانە ئەوەیە کە: خەریکی نانخواردن بێت‌و، پارووی لەدەمدا بێت.

جا ئەگەر کەسێك لەم حاڵەتانەدا سڵاوی لێکرد، ئەوا شایستەی وەڵامدانەوە نابێت. بەڵام ئەگەر لەسەر خواردن بوو، پارووی لەدەمدا نەبوو، ئەوا هیچ خراپەیەکی تێدا نیە، کە سڵاوی لێ بکرێت‌و، پێویستە لەسەریشی وەڵامی سڵاوەکە بداتەوە.

بە هەمان شێوە لە کاتی کڕین‌و فرۆشتن‌و سەرجەم مامەڵەکانی تریشدا سڵاو هەر دەکرێت‌و، واجبیشە وەڵام بدرێتەوە.

سەبارەت بە سڵاو کردن لەکاتی وتاری ڕۆژی جومعەش، هاوەڵانمان فەرموویانە: ناپەسەندە لەو کاتەدا سڵاو بکرێت. چونکە نوێژخوێنەکان فەرمانیان پێکراوە بە بێدەنگ بوون‌و گوێ گرتن لە وتارەکە. جا ئەگەر کەسێك لەم حاڵەتەدا سڵاوی کرد، ئایا وەڵامی دەدرێتەوە؟ هاوەڵانمان بۆچوونی جیاوازیان هەیە:

- هەندێکیان فەرموویانە: وەڵامی نادرێتەوە. چونکە کەمتەرخەمی کردوە.
- هەندێکیش فەرموویانە: ئەگەر بڵێین بێدەنگی‌و گوێ گرتن واجبە، ئەوا وەڵامی نادرێتەوە. ئەگەر بشڵێین: سونەتە، ئەوا یەکێك لە ئامادەبوەکان وەڵامی دەداتەوەو، لە هەموو حاڵەتێکدا نابێت زیاتر لە یەك کەس وەڵامی بداتەوە.

سەبارەت بە سڵاو کردنیش لەو کەسەی کە خەریکی خوێندنی قورئانە، پێشەوای پایەبەرز (أَبو الْحَسَن)ی (وَاحِدِيّ) فەرموویەتی: باشتر وایە سڵاوی لێ نەکرێت. چونکە خەریکی خوێندنی قورئانە. خۆ ئەگەر کەسێك سڵاوی لێکرد، ئەوا تەنها ئەوەندە بەسە، کە بە ئاماژە وەڵامی بداتەوە. جا ئەگەر بە زمانیش وەڵامی

دایەوە، ئەوا با سەرلەنویێ (أَعُوْذُ بِاللّهِ مِـــنَ الشَّـــيْطَانِ الـــرَّجِيْم) بکـاتو، ئـەوجا بگەڕێتەوە بۆ قورئان خوێندنەکەی.

ئەمە فەرمایشتی شێخی (وَاحِدِيّ)ـەو، جێگەی سەرنجیشە. بۆچـوونی بـەهێزیش ئەوەیە کە کەسی قورئانخوێن سلاّوی لیّ دەکرێتو، واجیبیشە بە زمان وەلاّم بداتەوە.

خۆ ئەگەر خـەریکی نـزاو پاڕانـەوە بـوو، تـەواویش ڕۆچـووبوو تێـداو، دڵـی بەتەواوەتی لەلای بوو، ئەوە دەکرێت بوترێت: ئەمیش لەوەدا کە باسمان کرد وەکو ئەو کەسە وەهایە، کە خەریکی خوێندنی قورئانە. بۆچوونی بەهێزیش بـەلای منـەوە سەبارەت بەم کەسە ئەوەیە، کە ناپەسەندە سـلاّوی لیّ بکرێـت. چـونکە دڵـی پێـی دەشکێتو گەرد دەگرێتو، زۆر زیاتر لەو کەسە ناڕەحەتتر دەبێت، کـە خـەریکی خواردنە.

سەبارەت بەو کەسـەش، کـە خـەریکی تەلبیـە کردنـە لـە ئیحرامـدا، ئـەویش ناپەسەندە سلاّوی لیّ بکرێت. چونکە ناپەسەندە تەلبیەکردنەکـەی ببچـڕێنێت. خـۆ ئەگەر کەسێك سلاّوی لێکرد، ئەوا وەکو ئیمـامی (شَـــافِعِيّ)و هاوەلاّنمـان (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) فەرموویانە: دەبێت بە زمان وەلاّمی سلاّوەکە بداتەوە.

## باسێك: {حوکمەکانی وەلاّمدانەوەی سلاّو}

پێشتر باسی ئەو حاڵەتانەمان کرد، کە سلاّو کردن تێیانـدا ناپەسـەندەو، باسـی ئەوەشمان کرد، کە لـەو حاڵەتانەدا کەسی سلاّوکەر شایستەی وەلاّمدانـەوە نابێـت. بۆیە ئەگەر کەسە سلاّو لێکراوەکە خۆی ویستی وەلاّمی بداتەوە، ئایا دروستە بۆی، یان سونەتە؟ ئەوە جۆرە تەفصیلێکی تێدایە:

سەبارەت بەو کەسەی کە خەریکی میزکردن یـان کـاری لـەو جۆرەیـە، ئـەوە ناپەسەندە وەلاّمی سلاّوەکە بداتەوەو، ئەمەشمان لە سەرەتای کتێبەکەوە باس کرد.

سەبارەت بەو کەسەش کە خەریکی نانخواردنو شتی وەهایە، ئەوە سونەتە وەڵامی سڵاوەکە بداتەوە، لەو جێگەدا کە واجب نیە لەسەری.

سەبارەت بەو کەسەش کە نوێژ دەکات، ئەوە حەرامە بۆ وەڵامدانەوەی سڵاوەکە بڵێت: (وَعَلَيْكُمُ السَّلام). خۆ ئەگەر وای وتو، دەشیزانی حەرامە، ئەوا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە. بەڵام ئەگەر نەیدەزانی، ئەوە بەلای دروستترینی دوو بۆچوونەکەی لای ئێمەوە: نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە. هەروەها ئەگەر بشڵێت: (عَلَيْهِ السَّلام)، نوێژەکەی هەر بەتاڵ نابێتەوە. چونکە دوعاو پاڕانەوەیە، نەوەك (خِطَاب)و ڕوو تێکردن.

سونەتیشە کەسی سڵاو لێکراو لەناو نوێژدا بە ئاماژە وەڵامی سڵاو بداتەوەو، بە زمان هیچ نەڵێت. خۆ ئەگەر لەدوای لێبوونەوە لە نوێژەکە بە زمان وەڵامی بداتەوە، ئەوە هیچ خراپەیەکی تێدا نیە.

سەبارەت بە کەسی بانگخوێنیش ناپەسەند نیە بە لەفزە عادەتیەکە وەڵامی سڵاو بداتەوە. چونکە لەفزەکە کەمەو، بانگەکەی پێ بەتاڵ نابێتەوەو، خەلەلیشی تێ ناکەوێت.

## باسی ئەو کەسەی سڵاوی لێ دەکرێت و، ئەوەش سڵاوی لێ ناکرێت و، ئەوەش وەڵامی دەدرێتەوەو، ئەوەش وەڵامی نادرێتەوە

بزانە کە ئەو کەسە موسوڵمانەی، کـە ناوبـانگی تاوانبـاری‌و بیدعـەکاری نیـە، سڵاو دەکات‌و، سڵاویشی لێ دەکرێت. بۆیە سونەتە ئەو سـڵاو بکـات‌و، واجبیشـە وەڵامی بدرێتەوە.

هاوەڵانمان فەرموویانە: ئافرەت لـەگەڵ ئافرەت وەکو پیاو لـەگەڵ پیاو وەهایە.

سەبارەت بە ئافرەت لـەگەڵ پیاو، پێشەوای پایەبەرز (أَبـــو سَـــعْد)ی (مُتَـــوَلِّي) فەرموویەتی: ئەگەر ژنی خـۆی بـوو، یـان کـەنیزەکی بـوو، یـان یـەکێك بـوو لــە مەحرەمەکانی، ئەوە ئەو ئافرەتە لـەگەڵ ئەو پیاوەدا وەکو پیاو لـەگـەڵ پیـاو وەهایـە. بۆیە سونەتە بۆ هەریەکەیان سڵاو لـەوی تریان بکـەن‌و، پێویستیشـە لـەسـەر ئـەوی تریان وەڵامی بداتەوە.

ئەگەر ئافرەتێکی بێگانەش بوو، ئەوا ئەگـەر جـوان‌و گـەنج بـوو، ترسـی حـەز لێکردن‌و دڵبردنی هەبوو، ئەوا نابێت پیاو سڵاوی لێ بکـات. خـۆ ئەگـەر سـڵاوی لێکرد، ئەوا دروست نیە ئەو وەڵامی بداتەوەو، ناشبێت ئەو سەرەتا سـڵاو لـە پیـاو بکات. خۆ ئەگەر سڵاوی لێکرد، ئەوا شایستەی وەڵام نابێت. خۆ ئەگـەر وەڵامـی دایەوە، ئەوا کارێکی ناپەسەندی کردوە.

بەڵام ئەگەر پیرو بەتەمەن بوو، ترسی حـەز لێکـردن‌و دڵ بردنـی نـەبوو، ئـەوا دروستە ئەو سڵاو لـە پیاو بکـات‌و، پێویستیشـە لـەسـەر پیـاو وەڵامـی سـڵاوەکەی بداتەوە.

ئەگەر ئافرەتەکان کۆمەڵێك بوون، ئەوا دروستە پیـاو سـڵاویان لێ بکـات. یـان ئەگەر پیاوەکان کۆمەڵێکی زۆر بوون‌و، سڵاویان لـە ئافرەتێك کرد، ئەوا دروسـتە،

ئەگەر ترسی فیتنەی تێدا نەبوو بۆ پیاوێك یان بـۆ ژنـەكان، یـان بـۆ ژنێـك یـان بـۆ پیاوەكان.

بۆمان ڕیوایەت كراوە لـە (سُنَن)ی ئیمـامی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)و لە غەیری ئەوانیشدا، لە ژنەهاوەڵی خۆشەویست (أَسْمَاء)ی كچی (یَزِیْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: پێغەمبـەری خـوا (دروودی خوای لەسـەر بێـت)، بەلامانـدا تێپەڕیو، سلاّوی لێكردینو، ئێمەش كۆمەڵە ئافرەتێك بووین.[1]

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێكی (حَسَن)ـە.

ئەمەش كە من هێنام دەقی ڕیوایەتەكەی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)ە.

سەبارەت بە ڕیوایەتەكەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)ش، لەودا لە (أَسْمَاء)ەوە هاتوە، كـە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) ڕۆژێك بەناو مزگەوتـدا تێپـەڕیو، كۆمەڵـە ئافرەتێكیش دانیشتبوونو، ئەویش بە ئاماژەی دەست سلاّوی لێ كردن.

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە كتێبەكـەی شـێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (جُرَیْر)ی كوڕی (عَبْدُاللّه)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە پێغەمبـەری خـوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، بەلای كۆمەڵە ژنێكدا تێپەڕیو، سلاّوی لێ كردن.[2]

بۆشمان ڕیوایـەت كـراوە لـە صـەحیحی بوخاریـدا، لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (سَهْل)ی كوڕی (سَعْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: ئافرەتێكمان لـەناودا بوو -لە ڕیوایەتێكدا هاتوە كـە پیرەژنێكمـان هـەبوو- لاسـكی سـڵقی دەگـرتو، دەیكردە ناو مەنجەڵەوەو، چەند دنكە جۆیەكیشی دەهاڕی. جا ئێمەش ئەگەر نوێژی

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٧٣ / بە ژمارە: ٥٢٠٤، وسُنَنُ التِّرْمِـذِيّ / ٥ / ٥٨ / بـە ژمارە: ٢٦٩٧، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٢٢٠ / بە ژمارە: ٣٧٠١.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْیَوْمِ وَاللَّیْلَة (ابْنُ السُّـنِّيّ) / ١١٤ / بـە ژمـارە: ٢٢٥. حەدیسـێكی لاوازە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِیَّة / ٥ / ٣٣٤.

جومعەمان بکردایە، دەگەڕاینەوەو، سلاّومان لیّ دەکردو، ئەویش خواردنەکەی دەخستە بەردەممان.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە (أُمُّ هَانِئ)ی کچی (أَبُو طَالِب)ەوە (خوای لیّ ڕازی بیّت)، کە فەرموویەتی: لە ڕۆژی فەتحی شاری (مکە)ی پیرۆزدا هاتم بۆ خزمەتی پیّغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بیّت)، ئەویش لەو کاتەدا خۆی دەشۆردو، (فَاطِمَة)ش پەردەی بۆ گرتبوو، منیش سلاّوم لیّکرد........ ئیتر تەواوی حەدیسەکەی باس کرد.[2]

## باسیّك: {حوكمی سلاّو كردن له كافری (ذِمِّيّ)}

هاوەلاّنمان سەبارەت بە بیّباوەڕی (ذِمِّيّ) بۆچوونی جیاوازیان هەیە: زۆربەیان پیّیان وایە، کە دروست نیە سلاّویان لیّ بکریّت‌و، هەندیّکیش فەرموویانە: سلاّو لیّکردنیان حەرام نیە، بەڵکو ناپەسەندە. خۆ ئەگەر ئەوان سلاّویان لە موسوڵمانیّك کرد، با ئەویش لە وەلاّمیاندا بلّیّت: (وَعَلَيْكُم)و، هیچی تری بۆ زیاد نەکات.

شیّخی (مَاوَرْدِيّ) باسی بۆچوونی هەندیّك لە هاوەلاّنمانی کردوە، کە بەلای ئەوانەوە دروستە سلاّویان لیّ بکریّت. بەلاّم موسوڵمان دەبیّت تەنها بلّیّت: (السَّلامُ عَلَيْكَ)، نابیّت صیغەی کۆ بەکاربهیّنیّت. (واتە: نەڵیّت: السَّلامُ عَلَيْكُم).

هەروەها شیّخی (مَاوَرْدِيّ) باسی بۆچوونیّکی تریشی کردوە، کە پیّی وایە ئەگەر ئەوان سلاّویان کرد، با موسوڵمان لە وەلاّمیاندا بلّیّت: (وَعَلَيْكُم السَّلامُ). بەلاّم با نەڵیّت: (وَرَحْمَةُ الله).

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٠٦ / بە ژمارە: ٥٨٩٤.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤٩٨ / بە ژمارە: ٣٣٦. هەروەها لە صەحیحی بوخاریشدا هاتوە. بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ١٤١ / بە ژمارە: ٣٥٠.

جا ئەم دوو بۆچوونە هەردووکیان نامۆو ڕەدکراوەن.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لا تَبْدَؤُوا الْيَهُودَ وَلا النَّصَارَى بِالسَّلامِ، فَإِذَا لَقِيتُمْ أَحَدَهُمْ فِيْ طَرِيقٍ، فَاضْطَرُّوْهُ إِلَى أَضْيَقِهِ».[1] واتە: "ئێوە سەرەتا سڵاو لە جولەکەو گاورەکان مەکەن. ئەگەر لە ڕێگەشدا بە یەکێك لەوان گەیشتن، ناچاری بکەن بچێتە تەنگەبەری ڕێگەکەوە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا سَلَّمَ عَلَيْكُمْ أَهْلُ الْكِتَابِ، فَقُوْلُوا: وَعَلَيْكُمْ».[2] واتە: "ئەگەر کەسێکی ئەهلی کیتاب سڵاوی لێ کردن، ئێوەش لە وەڵامدا بڵێن: (وَعَلَيْكُمْ)".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا سَلَّمَ عَلَيْكُمْ الْيَهُوْدُ، فَإِنَّمَا يَقُولُ أَحَدُهُمْ: "السَّامُ عَلَيْكَ"، فَقُلْ: وَعَلَيْكَ».[3] واتە: "ئەگەر جولەکەیەك سڵاوی لێ کردن، ئەوە ئاگەداربن کە ئەو دەڵێت: (السَّامُ عَلَيْكَ). (واتە: مردن بێت بەسەرتدا). بۆیە تۆش بڵێ: (وَعَلَيْكَ)".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧٠٧ / بە ژمارە: ٢١٦٧.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٠٩ / بە ژمارە: ٥٩٠٣، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧٠٥ / بە ژمارە: ٢١٦٣.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٠٩ / بە ژمارە: ٥٩٠٢. هەروەها ئیمامی موسلیمیش ڕیوایەتی کردوە. بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧٠٦ / بە ژمارە: ٢١٦٤.

هەروەها لەم مەسەلەدا زۆرێك حەدیسی تریش هەن، هاووێنەی ئەمانەی باسمان کردن. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

زانای پایەبەرز (أَبو سَعْد)ی (مُتَوَلِّي) فەرموویەتی: ئەگەر موسوڵمانێك سڵاوی لە پیاوێك کردو، گومانی وابوو موسوڵمانەو، کەچی دەرکەوت کافرە، سونەتە داوای گەڕاندنەوەی سڵاوەکەی لێ بکاتو، پێی بڵێت: (سڵاوەکەم بۆ بگەڕێنەرەوە).

مەبەستیش لەم کارە ئەوەیە، کە وای لێ بکات هەست بە تەنهاییو نامۆیی بکاتو، پیشانیشی بدات، کە هیچ جۆرە خۆشەویستیەك لەنێوانیاندا نیە.

ڕیوایەتیش کراوە کە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَـر) (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، سڵاوی کردوە لە پیاوێكو، پێی وتراوە: "ئەوە جوولەکەیە". ئیتر ئەویش کەوتە شوێنیو، پێی فەرموو: (سڵاوەکەم بۆ بگەڕێنەرەوە).[1]

منیش دەڵێم: بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (مُوَطَّأ)ی ئیمامی (مَالِك)دا (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، کە پرسیار کراوە لە ئیمامی (مَالِـك)، دەربارەی ئەو کەسەی سڵاو لە یەهودیەك یان نەصرانیەك دەکات، ئایا داوای گەڕاندنەوەی سڵاوەکەی لێ بکاتەوە؟

---

(١) ئیمامی نەوەوی نەیفەرموە کە ئەم حەدیسە لە چی سەرچاوەیەکدا ڕیوایەت کراوە!!! جا من دەڵێم زانای پایەبەرز (عَبْدُ الرَّزَّاق)ی کوڕی (هَمَّام) لە (مُصَنَّف)ـەکەی خۆیدا ڕیوایەتی کردوە. هەروەها ئیمامی بوخاریش لە (الْأَدَبُ الْمُفْرَد)داو، ئیمامی (بَيْهَقِيّ)ش لە (شُعَبُ الْإيْمان)دا ڕیوایەتیان کردوە، بەڵام لە ڕیوایەتەکەی ئەماندا نوسراوە کابراکە گاور بوە، نەوەك جوولەکە. بڕوانە: مُصَنَّفُ عَبْدِ الرَّزّاق / ١٠ / ٣٩٢ / بە ژمارە: ١٩٤٥٨، والْأَدَبُ الْمُفْرَد / ٣٨١ / بە ژمارە: ١١١٥، وشُعَبُ الْإيْمان / ٦ / ٤٦٢ / بە ژمارە: ٨٩٠٦. هەروەها شێخی (ابْنِ أَبِيْ شَيْبَة)ش ڕیوایەتی کردوە، کە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْـرَة) بەلای کەسێکدا تێپەڕیوەو، سڵاوی لێ کردوەو، دواتر پێی وتراوە: ئەوە جوولەکەیە، ئەویش پێی فەرموە: "ئەی جوولەکە، سڵاوەکەم بۆ بگەڕێنەوە". بڕوانە: مُصَنَّفُ ابْنِ أَبِيْ شَيْبَة / ٥ / ٢٥٩ / بە ژمارە: ٢٥٨٦٨.

ئەویش فەرموویەتی: نەخێر.[1] جا ئەمە مەزهەبی ئەوەو، زانای پایەبەرز (ابْنُ الْعَرَبِيّ) (مَالِكِيّ)ش هەڵی بژاردوەو پێی پەسەندە.

شێخی (أبو سَعْد) فەرموویەتی: ئەگەر ویستی سڵاو لە بێباوەڕێکی (ذِمِّيّ) بکات، با بە تەعبیرێکی تری بێجگە لە سڵاو بیکات. بۆ نموونە بڵێت: (هَدَاكَ اللهُ)، یان (أنْعَمَ اللهُ صَبَاحَكَ).

منیش دەڵێم: ئەمەی کە شێخی (أبو سَعْد) فەرموویەتی خراپ نیە، ئەگەر پێویستی بە سڵاو کردن هەبوو. بۆیە دەکرێت بڵێت: (صُبِّحْتَ بِالْخَيْر)، یان (صُبِّحْتَ بِالسَّعَادَة)، یان (صُبِّحْتَ بِالْعَافِيَة)، یان (صَبَّحَكَ اللهُ بِالسُّرُوْر)، یان (صَبَّحَكَ اللهُ بِالسَّعَادَةِ وَالنِّعْمَة)، یان (صَبَّحَكَ اللهُ بِالْمَسَرَّة)، یان هەر تەعبیرێکی تری هاوشێوە.

بەڵام ئەگەر پێویستی بە سڵاو کردن نەبوو، ئەوا بۆچوونی هەڵبژێردراو لەسەر ئەوەیە، کە هیچ نەڵێت. چونکە ئەو جۆرە قسانە بێباوەڕەکە دڵ خۆش دەکاتو، جۆرە خۆشەویستیەکیشی بۆ دەردەخات، ئێمەش فەرمانمان پێکراوە کە لەگەڵ بێباوەڕاندا ڕەق بینو، نەهیشمان لێ کراوە، کە خۆشمان بەوێن. بۆیە نابێت خۆشەویستیان بۆ دەربڕین. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## لقە باسێك: {سڵاو کردن لە کۆمەڵێکی تێکەڵ لە موسوڵمان و لە غەیرە موسوڵمان}

ئەگەر کەسێك بەلای کۆمەڵێکدا تێپەڕی، کە چەند موسوڵمانێکیان تێدا بوو، یان موسوڵمانێكو چەند بێباوەڕێکیان تێدا بوو، ئەوا سونەتە سڵاویان لێ بکاتو، مەبەستیشی تەنها موسوڵمانەکان، یان موسوڵمانەکە بێت.

---

(١) بڕوانە: مُوَطَّأ الْإِمَامِ مَالِك / ٢ / ٩٦٠ / بە ژمارە: ١٧٢٣.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (أُسَامَةَ)ی کوڕی (زَيْد)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبـەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) بەلای کۆڕێکدا تێپەڕی، کە تێکەڵبوو لە موسوڵمانان‌و موشریکە بتپەرستەکان‌و، یەهودیەکان‌و، سڵاویشی لێ کردن.[1]

## لقەباسێك: {حوکمی نووسینی سڵاو بۆ کەسی موشریك}

ئەگەر نوسراوێکی نووسی بۆ موشریکێك‌و، سڵاو یان شتێکی لەو جۆرەی تێـدا نوسیبوو، ئەوا پێویستە ئەوەی تێدا بنوسێت، کە بۆمان ڕیوایەت کراوە لـە هـەردوو صەحیحی بوخـاری‌و موسـلیمدا، لـە حەدیسـەکەی هـاوەڵی خۆشەویسـت (أَبـو سُفْيَان)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێـت)، لـە چیرۆکەکەی (هِرَقْــل)دا، کـە پێغەمبـەری خـوا (دروودی خوای لەسەر بێت) نوسیبووی: (مِنْ مُحَمَّدٍ عَبْدِاللَّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى هِرَقْــلَ عَظِــيمِ الرُّومِ، سَلَامٌ عَلَى مَنْ اتَّبَعَ الْهُدَى).[2] واتە: "لـە موحەمەدی بەندەو پێغەمبەری خواوە بۆ (هِرَقْل)ی گەورەی ڕۆمەکان، سڵاو لـەو کەسەی شوێن ڕێگەی ڕاست کەوتوە".

## لقە باسێك سەبارەت بەوەی موسوڵمانێك دەیڵێت، ئەگەر چوو بۆ سەردانی کافرێکی (ذِمِّيّ) نەخۆش.

بزانە، کە هاوەڵانمان بۆچوونی جیاوازیان هەیە سـەبارەت بـە سـەردانی کردنـی کافری (ذِمِّيّ) نەخۆش: کۆمەڵێك بە سونەتیان دانـاوە‌و، کۆمـەڵێکیش ڕێگریـان لێ

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٠٧ / بە ژمارە: ٥٨٩٩، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٤٢٢ / بە ژمارە: ١٧٩٨.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٧ / بە ژمـارە: ٧، وصَـحِيْحُ مُسْـلِم / ٣ / ١٣٩٣ / بـە ژمارە: ١٧٧٣.

کردوه. شـێخی (شَاشِــي)ش باسـی ڕاجیاییەکـەی کـردوەو، پاشـان فەرموویـەتی: بۆچوونی ڕاست بەلای منەوە ئەوەیە، کە بوترێت: سەردانی کردنی کافری نـەخۆش لـە هەندێك حاڵـەتدا دروستەو، چاوەڕێی دەسـتکەوتنی پاداشـتیش لـەو سـەردانەدا لـەسەر جۆری ئەو پەیوەندیە ڕاوەستاوە کە لـەنێوانیان موسـوڵمانەکەو کافرەکـەدا هەیە، ئایا دراوسێیەتیە، یان خزمایەتیە.

منیش دەڵێم: ئەمەی کە شێخی (شَاشِي) فەرموویەتی بۆچوونێکی جوانە. چونکە بۆمان ڕیوایەت کراوە لـە صەحیحی بوخاریدا، لـە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ــەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە منداڵێکی یەهودی خزمەتی پێغەمبەری خوای دەکـرد (درودی خوای لەسەر بێت). جا کە نـەخۆش کـەوت، پێغەمبـەری خـوا سـەردانی کـردو، لای سەریدا دانیشتو، پێی فەرموو: "موسوڵمان بە". منداڵەکەش تەماشـایەکی بـاوکی کرد، کە لـەوێ دانیشتبوو، باوکیشی وتی: گوێڕایـەڵی (أَبُو الْقَاسِم) بکـە. ئـەوەبوو منداڵەکـە موسـوڵمان بـوو. پێغەمبـەریش تەشـریفی هێنایـە دەرەوەو، فـەرمووی: "سوپاس بۆ ئەو خوایەی، کە لە ئاگر ڕزگاری کرد".[1]

بۆشمـان ڕیوایـەت کـراوە لـە هـەردوو صـەحیحی بوخـاریو موسـلیمدا، لـە (مُسَيِّب)ی کوڕی (حَزْن)ــەوە -کـە بـاوکی زانـای پایەبـەرز (سَــعِيْد)ی کـوڕی (مُسَيِّب)ــە (خوای لێ ڕازی بێت)- ئەو فەرموویەتی: لـەکاتی سـەرەمەرگی (أَبُو طَالِب)دا

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤٥٥ / بە ژمارە: ١٢٩٠. ئەم حەدیسـە بەڵگەیـە لـەسـەر ئەوەی، کە دروستە کەسی بێباوەڕ بە خزمەتکار بگیردرێتو، دروستیشە بە منـداڵ بوترێـت موسوڵمان ببەو، بەڵگەشە لـەسەر ئەوەی، کە ئەگەر منداڵ فامی پەیدا کـردو، زانـی کـوفر مانای چیەو، دواتر مردو باوەڕی نەهێناو موسوڵمان نەبوو، تووشی سزا دەبێت. بڕوانە: فَتْحُ الْبَارِيْ / ٣ / ٢٢١.

پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، تەشریفی هێنا بۆلای‌و، فەرمووی: "مامە، بڵێ: لا إِلهَ إِلاَّ اللَّهُ". ئیتر حەدیسەکەی بەدرێژی باس کرد.[1]

منیش دەڵێم: ئەو کەسەی سەردانی کافرێکی (ذِمِيّ) نەخۆش دەکات، وا باشە بۆی، کە باسی ئاینی پیرۆزی ئیسلامی بۆ بکات‌و، جوانی‌و چاکیەکانی بۆ ڕوون بکاتەوەو، هانی بدات بۆی‌و، هەڵی بنێت لەسەر باوەڕ پێهێنانی، بەر لەوەی بگاتە حاڵەتێك، کە تەوبەو پەشیمانی تێیدا سوودی پێ نەگەیەنێت. هەروەها ئەگەر دوعایشی بۆ کرد، با دوعای هیدایەت‌و شتی لەو جۆرەی بۆ بکات.

## باسێك: {سڵاوکردن لە کەسی بیدعەکار}

کەسی بیدعەکارو ئەو کەسەی تاوانێکی گەورەی ئەنجام داوەو تەوبەشی نەکردوە، پێویستە سڵاویان لێ نەکرێت‌و، وەڵامی سڵاویشیان نەدرێتەوە. ئیمامی بوخاری‌و زانایانی تر وەهایان فەرموە.

ئیمامی بوخاری لە صەحیحەکەی خۆیدا بۆ ئەم مەسەلە بەڵگەی بەو حەدیسە هێناوەتەوە، کە بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە چیرۆکەکەی هاوەڵی خۆشەویست (كَعْب)ی کوڕی (مَالِك)دا، کە خۆی‌و دوو هاوڕێکەی لە غەزای تەبوك دواکەوتن، (كَعْب) فەرمووی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، نەهی کرد لەوەی قسەمان لەگەڵدا بکرێت. هەروەها فەرمووی:

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤٥٧ / بە ژمارە: ١٢٩٤، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥٤ / بە ژمارە: ٢٤.

من دەهاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەرو، سڵاوم لێ دەکردو، لە دڵی خۆمدا دەموت: گوایە لێوەکانی جوڵاندەوە بۆ وەڵامدانەوەی سڵاوەکەم، یان نا؟[1]

ئیمامی بوخاری فەرموویەتی: هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّٰه)ی کوڕی (عَمْرو) (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت) فەرموویەتی: سڵاو لە مەیخۆرەکان مەکەن.[2]

منیش دەڵێم: ئەگەر کەسێك ناچاربوو سڵاو لە ستەمکاران بکات، بەهۆی ئەوەی کە چوو بۆلایانو، ئەگەر سڵاوی نەکردایە، ترسی توشبوونی زیانو خەساری دینەکەی یان دنیاکەی یان هەردووکیانی هەبوو، ئەوا با سڵاویان لێ بکات.

پێشەوای پایەبەرز (أَبُو بَكْر)ی (ابْنُ الْعَرَبِيّ) فەرموویەتی: زانایان فەرموویانە: با سڵاو لە کەسی ستەمکار بکاتو، مەبەستیشی ئەوە بێت، کە (السَّلام) یەکێکە لە ناوەکانی خوای گەورە، ئەو کاتە مانای (السَّلامُ عَلَيْكُم) بەم جۆرەی لێ دێت: (اللّٰهُ عَلَيْكُمْ رَقِيْبٌ). واتە: (خوا چاودێرە بەسەرتانەوە).

## باسێك: {سڵاو کردن لە منداڵان}

سونەتە سڵاو لە منداڵان بکرێت.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەو بەلای کۆمەڵە منداڵێکدا

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٦٠٣ / بە ژمارە: ٤١٥٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢١٢٠ / بە ژمارە: ٢٧٦٩.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٠٧.

تێپەڕیوەو، سڵاوی لێکردوونو، فەرموویەتی: پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) سڵاوی لە منداڵان دەکرد.[1]

لە ڕیوایەتێکی ئیمامی موسلیمدا لە (أَنَس)ـەوە هاتوە، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) بەلای کۆمەڵە منداڵێکدا تێپەڕیوەو، سڵاوی لێکردوون.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و لە غەیری ئەویشدا –بە ڕشتەیەك، کە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا حەدیسی پێ ڕیوایەت کراوە– لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، بەلای کۆمەڵە منداڵێکدا تێپەڕی، کە یاریان دەکرد، ئەویش سڵاوی لێ کردن.[3]

ئەم حەدیسەمان لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)و لە غەیری ئەویشدا بۆ ڕیوایەت کراوە، کە (أَنَس) لە گێڕانەوەکەیدا فەرموویەتی: پێغەمبەر فەرمووی: "السَّلامُ عَلَيْكُمْ يَا صِبْيَانُ". واتە: (منداڵینە، سڵاوتان لێبێت).[4] خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## باسی ئادابەکانی سڵاوکردنو، چەند مەسەلەیکی تایبەت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٠٦ / بە ژمارە: ٥٨٩٣، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧٠٨ / بە ژمارە: ٢١٦٨.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧٠٨ / بە ژمارە: ٢١٦٨.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٧٣ / بە ژمارە: ٥٢٠٢.

(٤) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١١٥ / بە ژمارە: ٢٢٧.

(دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى الْمَاشِي وَالْمَاشِي عَلَى الْقَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ».[1] واتە: "با سوار سڵاو لە پیادە بکات‌و، پیادەش سڵاو لە دانیشتوو بکات‌و، کۆمەڵی کەمیش سڵاو لە کۆمەڵی زۆر بکەن".

لە ڕیوایەتێکی ئیمامی بوخاریدا هاتوە، کە: «يُسَلِّمُ الصَّغِيرُ عَلَى الْكَبِيرِ، وَالْمَاشِي (والْمَارُّ) عَلَى الْقَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ».[2] واتە: "با منداڵ سڵاو لە گەورە بکات‌و، پیادەش لە دانیشتوو، کۆمەڵی کەمیش لە کۆمەڵی زۆر".

هاوەڵانمان‌و زانایانی تریش فەرموویانە: سونەت ئەمەیە کە باسکرا. خۆ ئەگەر پێچەوانەی ئەمەیان کردو، کەسی پیادە سڵاوی لە کەسی سواری کرد، یان کەسی دانیشتوو سڵاوی لە پیادەو لە سواری کرد، ئەوە ناپەسەند نیە. وەکو پێشەوای پایەبەرز (أَبو سَعْد)ی (مُتَوَلِّي)و غەیری ئەویش فەرموویانە.

جا بەپێی ئەم فەرمایشتە بێت، ناپەسەندیش نیە کە کۆمەڵێکی زۆر سڵاو لە کۆمەڵێکی کەم بکەن‌و، گەورەش سڵاو لە منداڵ بکات. بەڵام ئەمە وازهێنانە لەوەی کە حەق وایە ئەوان سڵاو لەمان بکەن.

ئەم ئەدەبەش بۆ کاتێکە کە دوو کەس لە ڕێگەیەکدا بەیەك بگەن. بەڵام ئەگەر کەسێك چوو بەسەر کەسێکی دانیشتوودا، ئەوە هەر دەبێت ئەو سڵاو بکات، ئیتر بچووك بێت، یان گەورە، کەم بن یان زۆر.

شێخی (مَاوَرْدِيّ) ئەمەی دوەمیانی بە سونەت ناوبردوەو، ئەوەی یەکەمیشیان بە ئەدەب‌و، فەرموویەتی ئەمەیان لەخوار سونەتەوەیە لە فەزڵ‌و پاداشتدا.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٠١ / بە ژمارە: ٥٨٧٨، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧٠٣ / بە ژمارە: ٢١٦٠.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٠١ / بە ژمارە: ٥٨٧٧.

## باسێك: {نا پەسەندە لەناو كۆمەڵە خەڵكێكدا تەنها سڵاو لە هەندێكیان بكرێت}

شێخی (مُتَوَلِّي) فەرموویەتی: ئەگەر پیاوێك گەیشت بە كۆمەڵێكو، ویستی تەنها سڵاو لە هەندێكیان بكات، ئەوە ناپەسەندە. چونكە مەبەست لە كردنی سڵاو دروستبوونی خۆشەویستیو پێكەوەبوونە. جا لە تایبەت كردنی سڵاوەكە لە هەندێكیان عاجز كردنو بێتاقەت كردنی ئەوەكانی تێدایەو، ڕەنگە بشبێت بە هۆكارێك بۆ دوژمنایەتی.

## باسێك: {حوكمی سڵاو كردن لە جێگە قەرەباڵغەكاندا}

ئەگەر كەسێك بە بازاڕێكدا یان بە كۆڵانێكدا زۆر تێدەپەڕی، یان بە شوێنێكی وەهادا كە بەزۆری خەڵكی تێدا بەیەك دەگەن. ئەوە شێخی (مَاوَرْدِيّ) فەرموویەتی: لەو جێگایانەدا تەنها سڵاو لە هەندێك كەس دەكرێتو، لەوانی تر ناكرێت. جا فەرموویەتی: چونكە ئەگەر سڵاو لە هەموو ئەو كەسانە بكات، كە پێیان دەگات، ئەوا بە خەڵكیەوە سەرقاڵ دەبێتو، ناپەرژێتە سەر كارو پێویستیەكانی خۆیو، لە دابو نەریتیش دەردەچێت.

هەروەها فەرموویەتی: مەبەست لەو سڵاو كردنەش تەنها یەكێكە لەم دوو شتە: یان دەستخستنی خۆشەویستی، یان لەكۆڵ كردنەوەی خراپەو كێشە.

## باسێك: {تەنها یەك جار وەڵامی سڵاوی كۆمەڵێك بدرێتەوە بەسە}

شێخی (مُتَوَلِّي) فەرموویەتی: ئەگەر كۆمەڵێك سڵاویان لە پیاوێك كردو، ئەویش لە وەڵامدا وتی: (وَعَلَيْكُمُ السَّلام)و، مەبەستیشی ئەوە بوو، كە وەڵامی هەموویان بداتەوە، ئەوا فەرزی وەڵامدانەوەی دەرهەق بە هەموویان لەسەر

لادەچێت. وەکو چۆن ئەگەر بە یەك جار نوێژ لەسەر چەند مردوویەك بکات، ئەوا فەرزی نوێژەکە لەسەر تەواوی خەڵکەکە لادەچێت.

## باسێك: {سڵاو کردن لە کۆمەڵێك}

شێخی (مَاوَرْدِيّ) فەرموویەتی: ئەگەر کەسێك چوو بەسەر کۆمەڵێکی کەمی وەهادا، کە یەك سڵاو کردن هەموویانی دەگرتەوە، ئەوا با تەنها یەك جار سڵاو لە هەموویان بکات. خۆ ئەگەر بەتایبەتی سڵاویشی لە هەندێکیان کردەوە، ئەوە زیادە ئەدەبەو، تەنها یەك کەسیش لە کۆمەڵەکە وەڵامی بداتەوە هەر بەسە. خۆ ئەگەر زیاد لە کەسێك وەڵامیان دایەوە، ئەوەش زیادە ئەدەبە.

بەڵام ئەگەر کۆمەڵێکی وەهابوون، کە تەنها یەك سڵاو بە هەموویان نەدەگەیشت، وەکو مزگەوتی گەورە، یان کۆڕی ئاهەنگ، ئەوە سونەت وەهایە – ئەگەر خەڵکەکەی دەبینی– هەر لە سەرەتای چوونەژوورەوەیدا سڵاو بکات، بەمەش وا دادەنرێت کە سڵاوی لە هەموو ئەو کەسانە کردوە، کە گوێیان لە سڵاوەکەی بوە. ئیتر وەڵامدانەوەی سڵاوەکە بۆ هەموو ئەوانەی گوێیان لێبوە دەبێت بە فەرزی (كِفَايَة). جا ئەگەر ویستی لەناو ئەوانەدا دابنیشێت، ئیتر سونەتی سڵاو کردنی لەسەر نامێنێت سەبارەت بەوانەی گوێیان لە سڵاوەکەی نەبوە. بەڵام ئەگەر ویستی لەودیوی ئەوانەوە دابنیشێت، کە گوێیان لە سڵاوەکەی بوە (واتە: لەناو ئەوانەدا، کە گوێیان لە سڵاوەکەی نەبوە)، ئەوە هاوەڵانمان دوو بۆچوونیان هەیە:

- یەکێکیان ئەوەیە، کە بە سڵاو کردن لەوانەی یەکەم جار سونەتی سڵاو کردن بۆ ئەوانیش هەر هاتۆتەجێ. چونکە هەموویان یەك کۆمەڵن. بۆیە ئەگەر سڵاو لەوانیش بکاتەوە، ئەوە ئەدەبی بەجێهێناوە. جا بەپێی ئەم

بۆچوونە، هەرکام لە خەڵکی مزگەوتەکە وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە، ئیتر فەرزی (كِفَايَة)ی وەڵامدانەوەکە لەسەر هەموویان لادەچێت.

- دومیشیان ئەوەیە، کە ئەگەر ویستی لەناو ئەوانەدا دابنیشێت، کە سڵاوەکەی یەکەم جاریان پێ نەگەیشتوە، سونەتە سڵاویان لێ بکات. جا بەپێی ئەم بۆچوونە، فەرزی (كِفَايَة)ی وەڵامدانەوەی سڵاوی یەکەم لەسەر ئەوانەی یەکەم جار لاناچێت، بەهۆی وەڵامدانەوەی ئەمانەی دواترەوە.

## باسێك: {سڵاو کردن لەکاتی چوونەماڵەوەدا}

ئەگەر کەسێك چوە ماڵی خۆیەوە، سونەتە سڵاو بکات، باوەکو کەسیشی تێدا نەبێت. سونەتیشە بڵێت: (السَّلامُ عَلَيْنا وَعَلَى عِبادِ اللَّهِ الصَّالِحِيْنَ).

هەروەها لە سەرەتای ئەم کتێبەوە باسی ئەوەشمان کرد، کە سونەتە کەسێك چی بڵێت، کاتێك دەیەوێت بچێتەوە ماڵی خۆی.

هەروەها ئەگەر چوە مزگەوتێکەوە، یان چوە ماڵی کەسێکی ترەوەو، ماڵەکەش کەسی تێدا نەبوو، سونەتە هەر سڵاو بکاتو، بڵێت: (السَّلامُ عَلَيْنا وَعَلَى عِبادِ اللَّهِ الصَّالِحِيْنَ. السَّلامُ عَلَيْكُمْ أهْلَ البَيْتِ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ).

## باسێك: {سڵاو کردن لەکاتی بەجێهێشتنی کۆڕێکدا}

ئەگەر کەسێك لەگەڵ کۆمەڵێکدا دانیشتبوو، پاشان هەستا بۆئەوەی بەجێیان بهێڵێتو لێیان جیاببێتەوە، سونەت وەهایە، کە سڵاویان لێ بکات.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و لە غەیری ئەوانیشدا، بە چەند ڕشتەیەکی جوان (جَيِّد)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أبو

هُرَيْرَة)وه (خوای لیّ ڕازی بیّت)، كه فه‌رموویه‌تی: پێغه‌مبه‌ری خوا (دروودی خوای له‌سه‌ر بێت)، فه‌رموویه‌تی: «إِذَا انْتَهَى أَحَدُكُمْ إِلَى الْمَجْلِسِ، فَلْيُسَلِّمْ. فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَقُومَ، فَلْيُسَلِّمْ. فَلَيْسَتِ الْأُولَى بِأَحَقَّ مِنَ الْآخِرَةِ». واته: "ئه‌گه‌ر یه‌كێك له ئێوه گه‌یشت به كۆڕێك، با سلاو بكات. جا ئه‌گه‌ر ویستی هه‌ستێت، با سلاو بكاته‌وه. چونكه سلاو كردنی یه‌كه‌م له‌مه‌ی تریان حه‌قترو له‌پێشتر نیه".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فه‌رموویه‌تی: حه‌دیسێكی (حَسَن)ـه.[1]

منیش ده‌ڵێم: ڕواڵه‌تی ئه‌م حه‌دیسه وا پیشان ده‌دات، كه واجبه له‌سه‌ر دانیشتوانی كۆڕه‌كه، وه‌ڵامی سلاوی ئه‌و كه‌سه بده‌نه‌وه، كه سلاوی لیّ كردن‌و به‌جێی هێشتن.

هه‌ردوو پێشه‌وای پایه‌به‌رز قاضي (حُسَيْن)و قوتابیه‌كه‌شی -كه شێخ (أَبُو سَعْد)ی (مُتَوَلِّي)ـه- فه‌رموویانه: عاده‌تی هه‌ندێك كه‌س وه‌هایه، كه له‌كاتی جیابوونه‌وه‌یان له كۆمه‌ڵێك سلاو ده‌كه‌ن. جا ئه‌م كاره دوعا كردنه‌و، سونه‌ته وه‌ڵام بدرێته‌وه، به‌ڵام واجب نیه. چونكه سلاو كردن ته‌نها بۆ كاتی به‌یه‌ك گه‌یشتنه، نه‌وه‌ك بۆ كاتی لێكجیابوونه‌وه.

جا ئه‌مه فه‌رمایشته‌كه‌ی ئه‌وانه.

به‌ڵام پێشه‌وای پایه‌به‌رز (أَبو بَكْر)ی (شَاشِيّ) پێی ڕازی نیه‌و، فه‌رموویه‌تی: ئه‌وه بۆچوونێكی هه‌ڵه‌یه. چونكه سلاو كردن له‌كاتی ڕۆشتن‌و به‌جێهێشتنیشدا سونه‌ته، هه‌روه‌كو چۆن له‌كاتی هاتن‌و دانیشتندا سونه‌ته‌و، ئه‌و حه‌دیسه‌شی له‌باره‌وه هاتوه.

جا ئه‌مه‌ی كه شێخی (شَاشِيّ) فه‌رموویه‌تی، بۆچوونه ڕاست‌و دروسته‌كه‌یه.

---

(١) بروانه: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٧٤ / به ژماره: ٥٢٠٨، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٦٢ / به ژماره: ٢٧٠٦.

## باسێك: {حوكمی سڵاو كردن لەو كەسەی، گومان وایە وەڵام ناداتەوە}

ئەگەر كەسێك بەلای كەسێكی تر یان چەند كەسێكدا تێپەڕی‌و، زیاتریش گومانی وا بوو، كە ئەگەر سڵاو بكات، وەڵامی نادرێتەوە، ئیتر یان لەبەر خۆبەگەورەزانینی كابرای بەلاداتێپەڕیو، یان لەبەر گوێنەدانی بە كابرای تێپەڕیو، یان بە سڵاوەكەی، یان لەبەر شتێكی تر، ئەوا باشتر وەهایە كە سڵاو بكات‌و، لەبەر ئەو گومانە واز لە سڵاو كردن نەهێنێت. چونكە سڵاو كردن فەرمانی پێكراوەو، كەسە فەرمانپێكراوەكەش بریتیە لە كەسە تێپەڕیوەكە. بەڵام فەرمان نەكراوە كە دەبێت وەڵام بدرێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەگونجێت كەسە بەلاداتێپەڕیوەكە بە هەڵە گومانی خراپی پێ برابێت‌و، كەچی وەڵامیش بداتەوە.

سەبارەت بە بۆچوونی ئەو كەسەش، كە تەحقیقی نەكردوە: گوایە "سڵاو كردنی كەسە تێپەڕیوەكە هۆكارە بۆ تاوانباربوونی كەسە بەلاداتێپەڕیوەكە" ئەمە نەزانینێكی ئاشكراو، نەفامیەكی ڕوونە. چونكە فەرمانپێكراوە شەرعیەكان لەسەر كەسی فەرمانپێكراو داناكەون بەوێنەی ئەم خەیاڵە پڕوپووچانە. خۆ ئەگەر تەماشای ئەم خەیاڵە پووچەڵە بكەین، ئەوا دەبێت واز لە ئینكاری كردنی كاری خراپ بهێنین، كە كەسێك ئەنجامی دەدات‌و، نازانێت خراپەو، ئێمەش زیاتر گومانمان وابێت، كە بە قسەی ئێمە وازی لێ ناهێنێت. چونكە ئینكاری كردنی ئێمەو، پێناساندنی خراپی كارەكە دەبێتە هۆكار بۆ تاوانباربوونی، ئەگەر وازی لێ نەهێنێت. جا گومانیشی تێدا نیە، كە ئێمە بە گومانی لەم جۆرە واز لە ئینكاری كردنی كاری خراپ ناهێنین.

جا نموونەی هاوشێوەی ئەمە زۆرەو زانراوە. خواش لە هەموو كەس زانا ترە.

ئەگەر كەسێك بە دەنگێكی وەها سڵاوی لە كەسێكی تر كرد، كە گوێی لێبێت‌و، واجب بێت لەسەری كە وەڵامی بداتەوە، ئەویش وەڵامی نەدایەوە،

سونەتە گەردنی ئازاد بکاتو، بە دەم بڵێت: گەردنی ئازاد دەکەم لە مافی خۆم سەبارەت بە وەڵامدانەوەی سڵاوەکەم، یان گەردنیم ئازاد کردوە لە وەڵامدانەوە، یان تەعبیرێکی تری هاوشێوە. بەمەش مافەکەی نامێنێتو دادەکەوێت. خواش لە هەموو کەس زاناترە.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالرَّحْمن)ی کوڕی (شِبْل)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ أجَابَ السَّلامَ، فَهُوَ لَهُ؛ وَمَنْ لَمْ يُجِبْ، فَلَيْسَ مِنَّا».[1] واتە: "ئەو کەسەی وەڵامی سڵاو بداتەوە، پاداشتەکەی بۆ خۆیەتیو، ئەو کەسەش وەڵام نەداتەوە، ئەوە لە ئێمە نیە".

ئەو کەسەی سڵاوی لە کەسێکی تر کردوەو، ئەویش وەڵامی نەداوەتەوە، سونەتە بەشێوەیەکی جوانو لەسەرخۆ پێی بڵێت: (وەڵامدانەوەی سڵاو واجبە، بۆیە باشتر وایە بۆ تۆ وەڵامم بدەیتەوە، تاوەکو فەرزەکەت لەسەر لابچێت). خواش لە هەموو کەس زاناترە.

## باسی داوای ڕێگە پێدان بۆ چوونە ماڵێک

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتاً غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا﴾ [النُّور: ٢٧].

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٠٨ - ١٠٩ / بە ژمارە: ٢١١. ئیمامی (أحْمَد)و (طَبَرَانِيّ) بەم دەقە: (وَمَنْ لَمْ يُجِبْ، فَلَا شَيْءَ لَهُ) ڕیوایەتیان کردوەو، شێخی (هَيْثَمِيّ)ش فەرموویەتی: کەسەکانی ڕشتەی حەدیسەکە لای هەردووکیان هەمان ئەو کەسانەن، کە لە ڕشتەی حەدیسە صەحیحەکاندا ناویان هاتوە. بڕوانە: مَجْمَعُ الزَّوَائِد / ٨ / ٣٦ / بە ژمارە: ١٢٧٦٢.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا بَلَغَ الْأَطْفَالُ مِنْكُمُ الْحُلُمَ فَلْيَسْتَأْذِنُوا كَمَا اسْتَأْذَنَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ﴾ [النُّور: ٥٩].

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو مُوْسَى)ی (أَشْعَرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «الاسْتِئْذَانُ ثَلاثٌ، فَإِنْ أُذِنَ لَكَ، وَإِلاَّ فَارْجِعْ».[1] واتە: "داوای مۆڵەت کردن سێ جارە، ئەگەر ڕێگەت پێدرا، ئەوە باشەو بچۆرە ژوورەوە، ئەگینا بگەڕێرەوە".

هەروەها ئەم حەدیسەمان لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا بۆ ڕیوایەت کراوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)و، لە غەیری ئەویشەوە، ئەوانیش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت).

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَهْل)ی کوڕی (سَعْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِنَّمَا جُعِلَ الِاسْتِئْذَانُ مِنْ أَجْلِ البَصَرِ».[2] واتە: "داوای مۆڵەت کردن بۆیە دانراوە، لەبەر پاراستنی چاو لە تەماشاکردنی ناڕەوا".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٠٥ / بە ژمارە: ٥٨٩١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٩٤ / بە ژمارە: ٢١٥٣.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٠٤ / بە ژمارە: ٥٨٨٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٩٨ / بە ژمارە: ٢١٥٦.

هەروەها لە زۆر ڕێگەی تـرەوە مەسـەلەی سـێ جـار داواکردنـی ڕێگەپێـدانی چوونەژوورەوەمان بۆ ڕیوایەت کراوە.[1]

جا سونەت وەهایە کەسەکە سـەرەتا سـڵاو بکـات، پاشـان داوای ڕێگەپێـدانی چوونەژوورەوە بکاتو، لای دەرگاکەدا بوەستێت، بەجۆرێکی وەها، کـە تەماشـای ئەو کەسانە نەکات وا لـە ژوورەوەن. پاشـان بڵێـت: (السَّلامُ عَلَـيْكُمْ)، ئایـا بێمـە ژوورەوە؟ ئەگەر کەس وەڵامی نەدایەوە، بۆ جاری دووەمو بۆ جاری سێیەم بیڵێتەوە. ئەگەر کەس وەڵامی نەدایەوە، با بگەڕێتەوەو بڕوات.

بۆشمان ڕیوایەت کـراوە لــە (سُـنَن)ی ئیمـامی (أَبُـو دَاوُد)دا، بـە ڕشـتەیەکی (صَحِيْح)، لە زانای پایەبەرزی شوێنکەوتوان (رِبْعِيّ)ی کوڕی (حِـرَاش)ــەوە، کـە فەرموویەتی: پیاوێك لـە هۆزی (عَامِر) بۆی گێڕاینەوە، کە پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لەسـەر بێـت)، تەشـریفی لــە ماڵێکـدا بــوەو، ئـەویش داوای ڕێگەپێـدانی چــوونەژوورەوەی کـردوەو، عـەرزی کـردوە: بێمـە ژوورەوە؟ پێغەمبـەریش بـە خزمەتکارەکەی فەرموە: بچـۆرە دەرەوە بـۆلای ئـەو کەسـەو، فێـری داواکردنـی ڕێگەپێدانی هاتنەژوورەوەی بکەو، پێی بڵێ: بڵـێ: (السَّـلامُ عَلَـيْكُمْ)، ئایـا بێمـە ژوورەوە؟ جا کابراش گوێی لـە فەرمایشتەکەوە بوو، بۆیە وتـی: (السَّلامُ عَلَـيْكُمْ)، ئایا بێمە ژوورەوە؟ ئیتر پێغەمبەر ڕێگەی پێداو، ئەویش هاتە ژوورەوە.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (كَلَدَة)ی کوڕی (حَنْبَل)ــەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، کـە فەرموویـەتی: جارێـك هـاتم بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لەسـەر بێـت)و، چـوومە

(١) شێخی (ابْنُ عَلاَّن) فەرموویەتی: شێخی عەسقەلانی تەخریجی حەدیسەکانی تا ئێرە کـردوەو، ئیتر لـە (١٨)ی مانگی (ذُو الْحِجَّة)ی ساڵی (٨٥٢)ی کۆچیدا وەفـاتی فـەرموە (ڕەحمـەتی خوای لێبێت). بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ٣٧١.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٦٦ / بە ژمارە: ٥١٧٧.

ژوورەوەو، سڵاوم نەکرد! پێغەمبەریش فەرمووی: بگەڕێرەوەو، بڵێ: (السَّلامُ عَلَيْكُمْ)، ئایا بێمە ژوورەوە؟

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

جا ئەمەی کە باسمان کرد، لە پێشخستنی سڵاو کردن بەسەر داواکردنی ڕێگەپێدانی چوورەنەژوورەوەدا، ئەوە بۆچوونە ڕاستەکەیە. بەڵام شێخی (مَاوَرْدِيّ) لەم مەسەلەدا باسی سێ بۆچوونی کردوە: یەکێکیان ئەمەیەو، دوەمیشیان بریتیە لە پێشخستنی داواکردنەکە بەسەر سڵاو کردنداو، سێیەمیشیان، کە هەڵبژاردەو پەسەندی خۆیەتی، ئەوەیە: ئەگەر کەسەکە پێش چوونەژوورەوە چاوی بە خاوەنی ماڵەکە کەوت، ئەوا با سڵاوەکە پێش بخاتو، ئەگەر چاویشی پێی نەکەوت، با داوای ڕێگەپێدانەکە پێش بخات.

ئەوجا ئەگەر سێ جار داوای کردو، ڕێگەی پێ نەدراو، گومانی وەهابوو، کە خاوەن ماڵەکە گوێی لە دەنگی ئەم نەبوە، ئایا دروستە زیاد لە سێ جار داوا بکات، یان نا؟

پێشەوای پایەبەرزی مەزهەبی ئیمامی (مَالِك) شێخ (أَبُو بَكْر)ی (ابْنُ الْعَرَبِيّ) سەبارەت بەم مەسەلە باسی سێ مەزهەبو بۆچوونی کردوە: یەکەمیان ئەوەیە: کە دەکرێت دووبارەی بکاتەوە. دوەمیشیان ئەوەیە: کە نابێت دووبارەی بکاتەوە. سێیەمیشیان ئەوەیە: کە ئەگەر بەو شێوازە داوای کردبوو، کە پێشتر باسمان کرد، ئەوە با دووبارەی نەکاتەوە. ئەگەر بە شێوازێکی تر بوو، ئەوە دەکرێت دووبارەی بکاتەوە.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٦٥ / بە ژمارە: ٥١٧٦، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٦٤ / بە ژمارە: ٢٧١٠.

شێخی (ابْنُ الْعَرَبِيّ) فەرموویەتی: درووستترین بۆچوون ئەوەیە کە بە هیچ جۆرێك نابێت دووبارەی بکاتەوە.

جا ئەمەی کە ئەو بە دروستی داناوە، سونەتیش هەر وا دەخوازێت (واتە: موافیقی سونەتی پێغەمبەرە). خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## باسێك: {ئادابەکانی داوای مۆڵەتی چوونەژوورەوە کردن}

ئەگەر کەسێك بە سڵاو کردن، یان بە لەدەرگادان داوای مۆڵەتی چوونەژوورەوەی لە کەسێکی تر کردو، پێی وترا: (کێی؟) پێویستە بڵێت: (فلانی کوڕی فلانم)، یان (فلانە کەسی ناسراو بە فلانە شت)، یان قسەیەکی لەو جۆرە بکات، بەجۆرێك کە بەتەواوەتی بناسرێتەوە.

ناپەسەندیشە کە تەنها بڵێت: (منم)، یان (خزمەتکارم)، یان (منالێکم)، یان (دۆستێکم)، یان هەر قسەیەکی هاوشێوەی ئەمانە.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە حەدیسە بەناوبانگەکەی شەوڕەویەکە (الْإِسْرَاء)دا، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: پاشان جوبرەئیل بردمیە سەرەوە بۆ ئاسمانی دنیاو، داوای کردنەوەی کرد، جا وترا: (کێیە؟) ئەویش فەرمووی: (جوبرەئیلە). وترا: (کێت لەگەڵدایە؟) فەرمووی: (مُحَمَّد). پاشان بردمیە سەرەوە بۆ ئاسمانی دوەمو سێیەمو ئەوانی ترو، لە دەرگای هەموو ئاسمانێکدا دەوترا: (کێیە؟) ئەویش دەیفەرموو: (جوبرەئیلە).[1]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٤١٠ / بە ژمارە: ٣٦٧٤، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ١٤٨ / بە ژمارە: ١٦٣.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە حەدیسەکەی هاوەڵی خۆشەویست (أَبو مُوْسَى)دا، کە کاتێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لەسەر بیری باخەکە دانیشت‌و، ئیمامی (أَبو بَكْر) تەشریفی هێناو، داوای ڕێگەپێدانی کردو، (أَبو مُوْسَى)ش فەرمووی: (کێیە؟) ئەویش فەرمووی: (أَبو بَكْر)ە. ئەوجا ئیمامی (عُمَر) تەشریفی هێناو، داوای ڕێگەپێدانی کردو، (أَبو مُوْسَى)ش فەرمووی: (کێیە؟) ئەویش فەرمووی: (عُمَر)ە. پاشان ئیمامی (عُثْمَان)یش هەر بەو جۆرە.[1]

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: جارێك هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)و، لە دەرگام داو، ئەویش فەرمووی: (ئەوە کێیە؟) منیش عەرزم کرد: (منم). ئەویش فەرمووی: (منم منم!) وەکو بڵێت، پێی ناخۆش بوو.[2]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٣٤٣ / بە ژمارە: ٣٤٧١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٨٦٨ / بە ژمارە: ٢٤٠٣.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٠٦ / بە ژمارە: ٥٨٦٩، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٩٧ / بە ژمارە: ٢١٥٥.

## باسێك: {خۆناساندن لەكاتی داوای مۆڵەتی چوونەژوورەوەدا}

هیچی تێدا نیە ئەگەر کەسێك بەجۆرێك خۆی بناسێنێت، کە پێی بناسرێتەوە، ئەگەر کەسی بەرامبەر بەبێ ئەو جۆرە نەیدەناسیەوە، ئیتر باوەکو خۆناساندنەکەش جۆرە گەورەییەکی تێدا بێت. وەکو ئەوەی کە بە کونیە خۆی بناسێنێت (واتە: بڵێت: باوکی فلانە کەسم). یان بڵێت: (فلانە کەسی موفتیم)، یان (فلانە کەسی قازیم)، یان (شێخ فلانە کەسم)، یان هەر قسەیەکی تری هاوشێوەی ئەمانە.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە (أُمُّ هَانِئ)ی کچی (أَبو طَالِب)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت) -کە بەپێی بۆچوونی مەشهور ناوی (فَاخِتَة)یەو، وتراویشە (فَاطِمَة)و، وتراویشە (هِنْد)- جا ئەو فەرموویەتی: جارێك هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەویش لەو کاتەدا خۆی دەشۆردو، (فَاطِمَة)ش پەردەی بۆ کردبوو، پێغەمبەر فەرمووی: (ئەوە کێیە؟) منیش وتم: (أُمُّ هَانِئ)م.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو ذَرّ)ەوە -کە ناوی (جُنْدُب)ەو، وتراویشە: (بُرَیْر)- جا ئەو فەرموویەتی: شەوێك چوومە دەرەوەو، بینیم وا پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) بە تەنها ڕێ دەکات. منیش لە سێبەری ڕۆشنایی مانگەوە ڕێم دەکردو، ئەویش لای کردەوەو، بینیمیو، فەرمووی: (ئەوە کێیە؟) منیش عەرزم کرد: (أَبو ذَرّ)م.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو قَتَادَة) (حَارِث)ی کوڕی (رِبْعِيّ)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، لە حەدیسی مەسینەکەدا

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١١٥٧ / بە ژمارە: ٣٠٠٠، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤٩٨ / بە ژمارە: ٣٣٦.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٦٦ / بە ژمارە: ٦٠٧٨، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٨٨ / بە ژمارە: ٩٤.

(الْمِيْضَأَة)، كه داگرەوەیه بەسەر زۆرێك موعجیزەی پێغەمبەری خوادا (دروودی خوای لەسەر بێت)و، بەسەر چەند جۆرێك زانستو زانیاریدا. (أَبو قَتَادَة) لەو حەدیسەدا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) سەری بەرز كردەوەو، فەرمووی: (ئەوە كێیە؟) منیش عەرزم كرد: (أَبو قَتَادَة)م.[1]

منیش دەڵێم: هاووێنەی ئەم جۆرە خۆناساندنە زۆرە، چونكە هەم پێویستەو، هەم كەسەكەش مەبەستی شانازی كردن نیە.

نزیكیشە لەم باسەوە ئەو حەدیسەی كە لە صەحیحی موسلیمدا بۆمان ڕیوایەت كراوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْـرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت) -كە بەپێی ڕاستترین بۆچوون ناوی (عَبْدُالرَّحْمن)ی كوڕی (صَخْر)ە- جا ئەو فەرموویەتی: عەرزی پێغەمبەری خوام كرد: ئەی پێغەمبەری خوا، لەخوا بپاڕێرەوە تا هیدایەتی دایكی (أَبو هُرَيْرَة) بدات..... ئیتر حەدیسەكەی باس كرد، هەتا گەیشتە ئەوێ كە فەرمووی: ئەوجا گەڕامەوەو، عەرزم كرد: ئەی پێغەمبەری خوا، خوا پاڕانەوەكەتی گیرا كردو، دایكی (أَبو هُرَيْرَة)ی هیدایەتدا.[2]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤٧٢ / بە ژمارە: ٦٨١.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٩٣٨ / بە ژمارە: ٢٤٩١.

## باسی چەند مەسەلەیەك، كە دەبنە لقە باسی سلاو كردن

### مەسەلەیەك: {سلاو كردن لەو كەسەی لە حەمام دێتەدەرەوە}

پێشەوای پایەبەرز (أَبو سَعْد)ی (مُتَــوَلّي) فەرموویــەتی: ســلاو كــردن لــەكاتی هاتنەدەرەوە لـە حەمام، بەوەی كە پێـی بوترێـت: (طَابَ حَمَّامُك)، هـیچ ئەصــڵێكی نیە. بەڵام ڕیوایەت كراوە، كە ئیمامی (عَلِيّ) (خوای لێ ڕازی بێت)، بە پیاوێكی فـەرموە كە لـە حەمام هاتۆتە دەرەوە: (طَهُرْتَ، فَلا نَجِسْتَ). واتە: (هەر خاوێن بیتو، پیس نەبیت).

منیش دەڵێم: ئەم جێگەیە هیچ فەرمایشتێكی صەحیحی لـەبارەوە نەهاتوە. بـەلام ئەگەر كەسێك بە مەبەستی خۆشەویستیو دۆستایەتیو ڕاكێشانی مەیلی هاوڕێیەكی خۆی، پێی بلێت: (أَدَامَ اللهُ لَكَ النَّعِيْمَ)، یان دوعایەكی تری هاوشێوەی بـۆ بكـات، ئەوە هیچ خراپەیەكی تێدا نیە.

### مەسەلەیەك: {سلاو كردن بە تەعبیرێكی تر، بێجگە لە (السَّلامُ عَلَيْكُم)}

ئەگەر كەسێك بەلای كەسێكی تردا تێپەڕیو، سلاوی لێكردو، وتـی: (صَبَّحَكَ اللهُ بِالْخَيْر)، یان (صَبَّحَكَ اللهُ بِالسَّعَادَةِ)، یان (قَوَّاكَ اللهُ)، یان (لا أَوْحَشَ اللهُ مِنْــكَ)، یان ئەو تەعبیرانەی تر، كە خەڵكی بەپێی عادەت بەكاریان دەهێنن، ئەوە شایســتەی وەلامدانەوە نابێت. خۆ ئەگەر لـەبەرامبەردا كەسەكەی تر دوعای خەیری بۆ بكات، ئەوە كارێكی باشە، مەگەر هەر بیەوێت بەهیچ جۆرێك وەلامـی نەداتــەوە، تـاوەكو تێبگەیەنێت، كە ئەو پێچەوانەی سونەتی كردوەو، وازی لـە صیغەی تایبــەتی ســلاو كردن هێناوە. هەروەها وەكو تەربیەتدانێكیش بێت بۆ ئەوو بۆ كەسانی تـریش، كـە بایەخی تایبەتی بە سلاو كردن بدەن.

## باسێك: {حوكمی ماچكردنی دەستو ڕوومەتی كەسێك}

ئەگەر كەسێك ویستی دەستی كەسێكی تر ماچ بكات، ئەوە ئەگەر لەبەر دنیانەویستیو چاكێتی، یان لەبەر زانست، یان پایەبەرزی كەسەكە بێت، یان لەبەر هەر شتێكی تری ئاینی بێت، ئەوە ناپەسەند نیە، بەڵكو سونەتە. بەڵام ئەگەر لەبەر دەوڵەمەندیو دنیاداریو سەروەتو شانو شەوكەتو ناوداری كەسەكە بێت لای دنیاداران، یان لەبەر هەر شتێكی تری هاوشێوەی ئەوانە بێت، ئەوە زۆر ناپەسەندە.

شێخی (مُتَوَلِّي) -كە یەكێكە لە هاوەڵانمان- فەرموویەتی: ئەو كارە دروست نیە. وەكو ئاماژەیەك بەوەی كە كارێكی حەرامە.

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە (سُنَن)ی (أَبـوْ دَاوُد)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (زَارِع)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت) -كە لەناو شاندی نوێنەرایەتی هۆزی (عَبْدُ الْقَيْس)دا بوە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا- جا ئەو فەرموویەتی: ئێمەش بە پەلە لە ولاخەكانمان دابەزینو، دەستمان كرد بە ماچكردنی دەستو قاچی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت).[1]

دیسان چیرۆكێكمان بۆ ڕیوایەت كراوە لە (سُنَن)ی (أَبُوْ دَاوُد)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووكیان ڕازی بێت)، كە تێیدا فەرموویەتی: ئەوجا لێی نزیك بووینەوە (مەبەستی ئەوەیە: لە پێغەمبەری خوا نزیكبوونەتەوە)و، دەستیمان ماچ كرد.[2]

سەبارەت بەوەی كە پیاو ڕوومەتی منداڵێكی خۆی، یان برایەكی ماچ بكات، یان جێگەیەكی تری ماچ بكات، وەكو دەستو قاچو باڵو ڕان، یان هەر

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٧٨ / بە ژمارە: ٥٢٢٥. حەدیسێكی (حَسَن)ـە. بڕوانە: فَتْحُ الْبَارِيّ / ١١ / ٥٧.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٧٨ / بە ژمارە: ٥٢٢٣. كەسێك لە ڕشتەكەیدایە، بەناوی (يَزِيْد)ی كوڕی (أَبُو زِيَاد)ەوە، زۆرێك لە زانایان بە لاوازیان داناوە.

جێگەیەکی تری لاشەی، بە مەبەستی سۆزو بەزەیی‌و لوتف‌و خۆشەویستی خزمایەتی، ئەوە سونەتە.

ئەو حەدیسانەش کە سەبارەت بەم مەسەلە هاتون زۆرو صەحیح‌و مەشهورن، ئیتر منداڵەکە نێرینە بێت یان مێینە.

بە هەمان شێوە سونەتە منداڵی هاوڕێی خۆی، یان منداڵی کەسێکی تر ماچ بکات، بە هەمان ئەو مەبەستانەی سەرەوە.

بەڵام ماچکردنی بەئارەزوو بە یەکدەنگی زانایان کارێکی حەرامە. ئیتر ئایا منداڵی خۆی بێت یان هی کەسێکی تر. بەڵکو بە یەکدەنگی زانایان تەماشاکردنی بەئارەزووش هەر حەرامە، ئیتر تەماشاکراوەکە خزم بێت یان بێگانە.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) حەسەنی کوڕی ئیمامی (عَلِيّ) ماچ کرد (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، لەو کاتەشدا (أَقْرَع)ی کوڕی (حَابِس)ی (تَمِيْمِيّ) لەخزمەتدا بوو. (أَقْرَع) وتی: من دە منداڵم هەیەو، تاوەکو ئێستە هیچکامیانم ماچ نەکردوە. پێغەمبەریش تەماشایەکی کردو، فەرمووی: «مَنْ لا يَرْحَمُ، لا يُرْحَمُ».[1] واتە: "ئەو کەسەی ڕەحم نەکات، ڕەحی پێ ناکرێت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: کۆمەڵە عەرەبێکی دەشتەکی هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، جا وتیان: "ئێوە منداڵەکانتان ماچ دەکەن؟" هاوەڵانیش وەڵامیان دانەوە: "بەڵێ".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٣٥ / بە ژمارە: ٥٦٥١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٨٠٨ / بە ژمارە: ٢٣١٨.

ئەوانیش وتیان: "سوێند بەخوا ئێمە منداڵەکانمان ماچ ناکەین!" پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: «أَوَ أَمْلِكُ أَنْ كَانَ اللهُ تَعَالَى نَزَعَ مِنْكُمُ الرَّحْمَةَ؟». [1] واتە: "من چیم بەدەستە، ئەگەر خوای گەورە ڕەحمو سۆزی لە دڵی ئێوە دەرکێشابێت".

جا ئەمە دەقی یەکێکە لە ڕیوایەتەکانو، بە چەند دەقێکی تریش ڕیوایەت کراوە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریو لە غەیری ئەویشدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) (إِبْرَاهِيْم)ی کوڕی خۆی گرتە باوەشەوەو، ماچی کردو بۆنیشی کرد. [2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُوْ دَاوُد)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (بَرَاء)ی کوڕی (عَازِب)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: کاتێک یەکەم جار ئیمامی (أَبُو بَكْر) تەشریفی هێنایە شاری مەدینەی پیرۆزەوە، من لەخزمەتیدا بووم تەشریفی بردەوە ماڵەوە، بینی وا (عَائِشَة)ی کچی (خوای لێ ڕازی بێت) ڕاکشاوەو، تووشی تا بوە. ئیتر ئیمامی (أَبُو بَكْر) تەشریفی برد بۆلایو، فەرمووی: "چۆنیت کچی خۆم؟" ئەوجا ڕوومەتیشی ماچ کرد. [3]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکانی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، بە چەند ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (صَفْوَان)ی کوڕی

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٣٥ / بە ژمارە: ٥٦٥٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٨٠٨ / بە ژمارە: ٢٣١٧.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤٣٩ / بە ژمارە: ١٢٤١.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٧٧ / بە ژمارە: ٥٢٢٢. هەروەها ئیمامی بوخاریش ئەم حەدیسەی ڕیوایەت کردوە. بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٤٢٦ / بە ژمارە: ٣٧٠٤.

(عَسَّال)ــەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە فەرموویـەتی: کەسـێکی یـەهودی وتـی بـە هاوڕێیەکی خۆی: وەرە با بچین بۆ لای ئـەو پێغەمبـەرە. ئـەوجا هـاتن بـۆ خزمـەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)و، پرسیاری نۆ ئایەتو بەڵگەیان لێکرد..... ئیتر حەدیسەکەی باس کرد، هەتا گەیشتە ئەوەی کـە فـەرمووی: ئـیتر کەسـەکەو هاوڕێکەی دەستو قاچی پێغەمبەریان ماچ کردو، وتیان: شـایەتی دەدەیـن کـە تـۆ پێغەمبەریت.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کـراوە لـە (سُـنَن)ی ئیمـامی (أَبــو دَاوُد)دا، بـە ڕشـتەیەکی (صَحِیْح)ی جوان، لە (إِیَاس)ی کوڕی (دَغْفَل)ـەوە، کە فەرموویـەتی: (أَبو نَضْرَة)م بینی، ڕوومەتی حەسەنی کوڕی ئیمامی (عَلِــيّ) مـاچ کـرد (خـوا لـە هـەردووکیان ڕازی بێت).[2]

منیش دەڵێم: (أَبو نَضْرَة) ناوی (مُنْذِر)ی کوڕی (مَالِك)ی کوڕی (قُطَعَــة)یـەو، شوێنکەوتوویەکی متمانەدارە (تَابِعِيٌ ثِقَةٌ).

لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)یشەوە هاتوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کـە (سَالِم)ی کوڕی خۆی ماچ دەکردو، دەیفەرموو: "سەرتان سوورِ بمێنێت لە پیرێـك، کە پیرێك ماچ دەکات".[3]

هەروەها لە زانای پایەبەرز (سَهْل)ی کـوڕی (عَبْدُالله)ی (تُسْتَرِيّ)شـەوە هـاتوە، کە یەکێکە لە دنیانەویستە خواپەرستەکانی ئەم ئومەتە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، جـا ئـەو

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٧٧ / بە ژمارە: ٢٧٣٣، وسُنَنُ النَّسَــائِيّ / ٧ / ١١١ / بـە ژمارە: ٤٠٧٨، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٢٢١ / بە ژمـارە: ٣٧٠٥. ئیمـامی (تِرْمِــذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِیْح)ـە.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٧٧ / بە ژمارە: ٥٢٢١.

(٣) بڕوانە: مُسْنَدُ ابْنِ الْجَعْد / ٣١٠ / بە ژمارە: ٢١٠٣، والتَّأْرِیْخُ الْكَبِیْر (الْمَعْرُوْفُ بِتَأْرِیْخِ ابْنِ أَبِيْ خَیْثَمَة) / ٢ / ٨٩٥ / بە ژمارە: ٣٧٩٠.

تەشریفی دەهێنا بۆ خزمەتی ئیمامی (أَبو دَاوُد)ی (سِجِسْتَانِيّ)و، دەیفەرموو: ئەو زمانەتم بۆ دەربهێنە، کە حەدیسی پێغەمبەری خوای پێ دەگێڕیتەوە، با ماچی بکەم. ئەویش زمانی دەردەهێناو، ئەمیش ماچی دەکرد.

جا کارو کردەوەی زانایانی (سَلَف) سەبارەت بەم باسە زۆر لەوە زیاترە کە بژمێردرێتو سنوری بۆ دابنرێت. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## باسێك: {ماچکردنی ڕوخسارو شوێنی تری مردوو}

هیچی تێدا نیە کە ڕوخساری مردووی چاکەکار بۆ پیرۆزی ماچ بکرێتو، هیچیشی تێدا نیە کە کەسێك ڕوخساری هاوڕێیەکی خۆی ماچ بکات، ئەگەر لە سەفەرێك یان شتێکی لەو جۆرە گەڕایەوە.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، لەو حەدیسە درێژەی دەربارەی وەفاتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) هاتوە. دایکە (عَائِشَة) فەرموویەتی: ئیمامی (أَبو بَكْر) تەشریفی هێنایە ژوورەوەو، پەردەکەی لەسەر ڕوخساری پیرۆزی پێغەمبەری خوا لابردو، پاشان خۆیدا بەسەریداو، (نێوچاوانی) ماچکردو، دەستی کرد بە گریان.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: هاوەڵی خۆشەویست (زَيْد)ی کوڕی (حَارِثَة) (خوای لێ ڕازی بێت) تەشریفی هێنایەوە بۆ شاری مەدینەی پیرۆزو، پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت)، تەشریفی لە ماڵی مندا بوو، (زَيْد)یش هات بۆ خزمەتیو، دای لە دەرگاو، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) هەستایەوە

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤١٨ / بە ژمارە: ١١٨٤.

بۆ پێشوازیو، کراسەکەی بەشوێن خۆیدا ڕادەکێشاو، دەستی کردە ملـیو، ماچـی کرد.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

سەبارەت بە دەست لەمل کردنو ماچکردنی ڕوخساری کەسانی تر –بێجگە لە منداڵو لەو کەسەش لە سەفەر گەڕاوەتەوە– ئەوە هەردووکیان ناپەسـەندن. زانـای پایەبەرز (أَبُو مُحَمَّد)ی (بَغَوِيّ)و غەیری ئەویش لە هاوەڵانمان وایان فەرموە.

بەڵگەی ناپەسەندیەکەشیان بریتیە لەو حەدیسەی، کە بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو کتێبەکەی ئیمـامی (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَـه)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پیاوێك عـەرزی پێغەمبـەری خـوای کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، یەکێك لە ئێمە دەگات بە برایـەك یـان بـە هاوڕێیـەکی خۆی، ئایا خۆی بۆ بچەمێنێتەوە؟ ئەویش فـەرمووی: "نـەخێر". پیاوەکـەش عـەرزی کرد: ئـەی دەسـت بکاتـە ملـیو، ماچـی بکـات؟ ئـەویش فـەرمووی: "نـەخێر". پیاوەکەش عەرزی کرد: ئەی دەستی بگرێتو، تەوقـەی لەگەڵـدا بکـات؟ ئـەویش فەرمووی: "بەڵێ".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[2]

منیش دەڵێم: ئەوەی باسمان کرد سەبارەت بە ماچ کردنو دەست لەمل کـردن، کە لەکاتی گەڕانەوە لە سەفەرو شتی لەو جۆرەدا هیچی تێدا نیەو، لە غەیری ئـەو حاڵـەتەشدا ناپەسـەندە، ئەوە بۆ کەسێکە کە (أَمْرَد)و ڕوخسار جوان نەبێت (أَمْــرَد:

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٧٦ / بە ژمارە: ٢٧٣٢.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٧٥ / بە ژمارە: ٢٧٢٨، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٢٢٠ / بـە ژمارە: ٣٧٠٢.

واته: گەنجی لوسکەو موولێدەرنەهاتوو). بەڵام (أمْرَد) لە هەموو حاڵەتێکدا ماچ کردنی حەرامە، ئیتر لە سەفەر گەڕابێتەوە یان نا.

جا وا دەردەکەوێت کە دەست لەمل کردنیشی هەر وەکو ماچ کردنی وەها بێت، یان نزیك بێت لێیەوە. جیاوازیش نیە لەم مەسەلەدا لەنێوان ئەوەی، کە ماچکەرەکەو ماچکراوەکە دوو پیاوی چاکەکار بن، یان دوانی خراپەکار بن، یان یەکێکیان چاکەکار بێت. هەمووی هەر وەکو یەك وەهایە.

مەزهەبی دروستیش بەلای ئێمەوە ئەوەیە، کە تەماشا کردنی (أمْرَد)ی ڕوخسار جوان کارێکی حەرامە، باوەکو تەماشا کردنەکە ئارەزووی لەگەڵدا نەبێتو، ترسی فیتنەشی نەبێت. بۆیە تەماشا کردنی (أمْرَد)ی ڕوخسار جوان هەر وەکو تەماشا کردنی ئافرەت حەرامە. چونکە ئەمیش هەر لە مانای ئافرەتدایە.

## باسێك سەبارەت بە تەوقە کردن

بزانە کە زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی، تەوقە کردن لەکاتی بەیەك گەیشتندا سونەتە.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە زانای پایەبەرز (قَتَادَة)وە، کە فەرموویەتی: عەرزی هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)م کرد (خوای لێ ڕازی بێت): ئایا تەوقە کردن لەنێوان هاوەڵانی پێغەمبەری خوادا (دروودی خوای لەسەر بێت) هەبوو؟ ئەویش فەرمووی: "بەڵێ".[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە حەدیسی چیرۆکی تەوبەکردنەکەی هاوەڵی خۆشەویست (كَعْب)ی کوڕی (مَالِك)دا، کە

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣١١ / بە ژمارە: ٥٩٠٨.

(كَعْب) فەرمووی: هاوەڵی خۆشەویست (طَلْحَة)ی کوڕی (عَبَيْدُالله) (خوای لێ ڕازی بێت) لەبەرم هەستاو، بەڕاکردن هات بۆلام، هەتا تەوقەی لەگەڵدا کردمو، پیرۆزبایی لێ کردم.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)دا، بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: کاتێك خەڵکی یەمەن هاتن، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) بە هاوەڵانی فەرموو: وا خەڵکی یەمەن هاتن بۆلاتانو، ئەوان یەکەم خەڵکن کە تەوقەیان کردبێت.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (بَرَاء)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَلْتَقِيَانِ فَيَتَصَافَحَانِ، إِلاَّ غُفِرَ لَهُمَا قَبْلَ أَنْ يَفْتَرِقَا».[3] واتە: هیچ دوو موسوڵمانێك نین کە بەیەکتر بگەنو تەوقە لەگەڵ یەکتر بکەن، هەتا خوای گەورە لە گوناهەکانیان خۆش نەبێت بەر لەوەی لەیەکتر جیاببنەوە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پیاوێك عەرزی پێغەمبەری خوای کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، یەکێك لە ئێمە دەگات بە

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٦٠٣ / بە ژمارە: ٤١٥٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢١٢٠ / بە ژمارە: ٢٧٦٩.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٧٥ / بە ژمارە: ٥٢١٣.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٧٥ / بە ژمارە: ٥٢١٢، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٧٤ / بە ژمارە: ٢٧٢٧، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٢٢٠ / بە ژمارە: ٣٧٠٣. ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.

برایەك یان هاورێیەكی خۆی، ئایا خۆی بۆ بچەمێنێتەوە؟ ئەویش فەرمووی: "نەخێر". پیاوەكە عەرزی كرد: ئەی دەست بكاتە ملیو، ماچی بكات؟ ئەویش فەرمووی: "نەخێر". پیاوەكە عەرزی كرد: ئەی دەستی بگرێتو، تەوقەی لەگەڵدا بكات؟ ئەویش فەرمووی: "بەڵێ".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێكی (حَسَن)ـە.[1]

هەروەها لەم باسەدا زۆرێك حەدیسی تریش هاتوون.

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە (مُوَطَّأ)ی ئیمامی (مَالِك)دا (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، لە (عَطَاء)ی كوڕی (عَبْدُالله)ی (خُرَاسَانِيّ)ـەوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) پێی فەرمووم: «تَصَافَحُوا، يَذْهَبِ الْغِلُّ، وَتَهَادُوْا، تَحَابُّوا، وَتَذْهَبِ الشَّحْنَاءُ».[2] واتە: تەوقە لەگەڵ یەكتر بكەن تا ڕقو كینە لەدڵتاندا نەمێنێت بەرامبەر بە یەكتر، دیاریو خەڵاتیش بەیەكتر بدەن، تا یەكترتان خۆش بوێتو، دژایەتی لەنێوانتاندا نەمێنێت.

منیش دەڵێم: ئەمە حەدیسێكی (مُرْسَل).

جا بزانە كە ئەم تەوقە كردنە لەكاتی هەموو بەیەك گەیشتنێكدا سونەتە.

سەبارەت بەوەش كە خەڵكی كردوویانە بە عادەت، لەدوای هەردوو نوێژی بەیانیو عەسرەوە تەوقە لەگەڵ یەكتر دەكەن، ئەوە هیچ ئەصڵێكی لە شەرعدا نیە بەم جۆرە. بەڵام كارێكی خراپیش نیە. چونكە تەوقە كردن خۆی سونەتەو، ئەوەش كە ئەوان لە هەندێك حاڵەتدا پاراستوویانەو، لە زۆرێك یان لە زۆرینەی حاڵەتەكاندا كەمتەرخەمیان تێدا كردوە، وا ناكات كە ئەو كارەی ئەوان بەر ئەو تەوقە كردنە نەكەوێت، كە ئەصڵەكەی لە شەرعدا هاتوە.

---

(١) كەمێك پێشتر تەخریجمان كرد.

(٢) بڕوانە: مُوَطَّأ الْإِمَامِ مَالِك / ٢ / ٩٠٨ / بە ژمارە: ١٦١٧.

پێشەوای پایەبەرز (أَبو مُحَمَّد)ی کوڕی (عَبْدُالسَّلام)یش (ڕەحمەتی خوای لێبێت)[1]، لە کتێبی (الْقَوَاعِد)دا فەرموویەتی: بیدعە پێنج بەشە: واجب‌و حەرام‌و ناپەسەندو سونەت‌و موباح. ئەوجا فەرموویەتی: نموونەی بیدعەی موباح وەکو تەوقە کردن لەدوای نوێژی بەیانی‌و عەسردا. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

منیش دەڵێم: پێویستە خۆی لە تەوقە کردن بپارێزێت لەگەڵ (أَمْرَد)ی ڕوخسار جواندا. چونکە وەکو لە باسەکەی پێشتردا باسمان کرد، تەماشا کردنی حەرامەو، هاوەڵانیشمان فەرموویانە: هەر کەسێك تەماشا کردنی حەرام بێت، دەست پێوەدانیشی هەر حەرامە (واتە: پێست بەری پێست بکەوێت). بەڵکو دەست پێوەدان خراپترە. چونکە تەماشا کردنی ئافرەتی بێگانە حەڵاڵە، ئەگەر کەسەکە یەوێت مارەی بکات. هەروەها لەکاتی فرۆشتن‌و کڕین‌و وەرگرتن‌و بەخشین‌و هاوشێوەی ئەمانەشدا هەر تەماشاکردنی ئافرەتی بێگانە حەڵاڵە. بەڵام دروست نیە لە هیچکام لەم حاڵەتانەدا دەستی پێوە بدرێت. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

---

(١) ئەم زانا پایەبەرزە بریتیە لە (عَبْدُالْعَزِيْز)ی کوڕی (عَبْدُالسَّلام)، کونیەکەی (أَبو مُحَمَّد)ەو، نازناوەکەشی (عِزُّ الدِّيْن)ـەو، ناسراوە بە (سُلْطَانُ الْعُلَمَاء) (عِزّ)ی کوڕی (عَبْدُالسَّلام). کتێبەکەشی بریتیە لە: (قَوَاعِدُ الْأَحْكَامِ فِيْ مَصَالِحِ الْأَنَامِ). کە یەکێکە لە سەرچاوە متمانەدارەکانی زانستی (أُصُوْلُ الْفِقْه). سەبارەت بەو زانیاریەش کە ئیمامی نەوەوی لێیەوە هێناویەتی، بڕوانە: قَوَاعِدُ الْأَحْكَامِ فِيْ مَصَالِحِ الْأَنَامِ (مُرَاجَعَة وَتَعْلِيْق: طه عَبْدُالرَّؤُوْف سَعْد) / ٢ / ٢٠٤ – ٢٠٥.

## باسێك: {ئادابەكانی تەوقە كردن}

**لەگەڵ تەوقە كردندا ڕوو خۆشیو داوای لێخۆشبوون كردنو شتی تریش سونەتن.**

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو ذَرّ)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) پێی فەرمووم: «لا تَحْقِرَنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ شَيْئاً، وَلَوْ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ».[1] واتە: "هیچ كارێكی باشو چاك بە بچووكو كەم بایەخ مەزانە، باوەكو ئەوەش بێت كە بە ڕوویەكی كراوەو خۆشەوە بگەیت بە برایەكی دینی خۆت".

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە كتێبەكەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيِّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (بَرَاء)ی كوڕی (عَازِب)ەوە (خوا لە هەردووكیان ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِنَّ الْمُسْلِمَيْنِ إِذَا الْتَقَيا، فَتَصَافَحَا، وَتَكَاشَرَا بِوُدٍّ وَنَصِيحَةٍ، تَنَاثَرَتْ خَطَايَاهُمَا بَيْنَهُما».[2] واتە: "بەڕاستی ئەگەر دوو موسوڵمان بەیەكتر بگەن، تەوقە بكەن، بە خۆشەویستیو دڵسۆزیەوە بزەو پێكەنین لەگەڵ یەكتردا بكەن، هەڵەو تاوانەكانیان لەنێوانیاندا دادەوەرێت".

لە ڕیوایەتێكیشدا هاتوە: «إِذَا الْتَقَى الْمُسْلِمانِ، فَتَصَافَحَا، وَحَمِدَا اللَّهَ تَعَالَى، وَاسْتَغْفَرَا، غَفَرَ اللهُ -عَزَّ وَجَلَّ- لَهُمَا».[3] واتە: "ئەگەر دوو موسوڵمان بەیەكتر

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٢٦ / بە ژمارە: ٢٦٢٦. ئیمامی نەوەوی فەرموویەتی: وشەی (طَلْق) بە سێ جۆر ڕیوایەت كراوە: (طَلْق)و (طَلِق)و (طَلِيْق). بڕوانە: شَرْحُ النَّوَوِيّ عَلَى صَحِيْحِ مُسْلِم / ١٦ / ١٧٧.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٠١ / بە ژمارە: ١٩٥. شێخ (سَلِيْم الْهِلالِـيّ) فەرموویەتی: ڕشتەكەی لاوازە. بڕوانە: عُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّي / ٢٥٥.

(٣) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٠٠ / بە ژمارە: ١٩٣. شێخ (سَلِيْم الْهِلالِـيّ) فەرموویەتی: بەم دەقە لاوازە. بڕوانە: عُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّي / ٢٥١.

گەیشتن‌و، تەوقەیان کردو، سوپاس‌و ستایشی خوای گەورەیان کردو، داوای لێخۆشبوونیان لێ کرد، خوای گەورەش لێیان خۆشدەبێت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَا مِنْ عَبْدَيْنِ مُتَحابَّيْنِ فِي اللهِ، يَسْتَقْبِلُ أَحَدُهُما صَاحِبَهُ، فَيُصَافِحَهُ، فَيُصَلِّيانِ عَلَى النَّبِيِّ -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- إِلاَّ لَمْ يَتَفَرَّقَا حَتَّى تُغْفَرَ ذُنُوبُهُمَا مَا تَقَدَّمَ مِنْها وَمَا تَأَخَّرَ».[1] واتە: "هیچ دوو بەندەیەك نیە، کە لەبەر خوا یەکتریان خۆشبوێت‌و، یەکێکیان پێشوازی لەوی تریان بکات‌و، تەوقەی لەگەڵدا بکات‌و، هەردووکیشیان صەلاوات لەسەر پێغەمبەری خوا بدەن، ئەوا لەیەکتر جیانابنەوە، هەتا خوای گەورە لە تاوان‌و گوناهی پێشترو دواتریشیان نەبوورێت".

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: هەر کەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، دەستی کەسێکی گرتبێت‌و تەوقەی لەگەڵدا کردبێت‌و، دواتر لێی جیابووبێتەوە، فەرموویەتی: «اللَّهُمَّ، آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ».[2]

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٠٠ - ١٠١ / بە ژمارە: ١٩٤. حەدیسێکی لاوازە. بڕوانە: مَجْمَعُ الزَّوَائِد / ١٠ / ٢٧٥ / بە ژمارە: ١٧٩٨٧، وإتْحَافُ الْخِيْرَةِ الْمَهَرَةِ بِزَوَائِدِ الْمَسَانِيْدِ الْعَشَرَة (لِلْبُوْصِيْرِيّ) / ٦ / ٤٠ / بە ژمارە: ٥٢٨٠، والْقَوْلُ الْبَدِيْع / ٤٤٩، وعُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّي / ٢٥٢ - ٢٥٣.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٠٥ / بە ژمارە: ٢٠٤. ڕشتەکەی (حَسَن)ـە. بڕوانە: عُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّي / ٢٦٣.

## باسێك: {خۆچەماندنەوە بۆ كەسێك بە عینوانی سڵاو ناپەسەندە}

پشت چەماندنەوە بۆ هەموو كەسێك لە هەموو حاڵەتێكدا ناپەسەندە. بەڵگەكەشی بریتیە لەو حەدیسەی هاوەڵی خۆشەویست (أنس) (خوای لێ ڕازی بێت)، كە لە دوو باسەكەی پێشتردا هێنامان، كە كابرا پرسیاری لە پێغەمبەری خوا كرد: "ئایا خۆی بۆ بچەمێنێتەوە؟" ئەویش فەرمووی: "نەخێر".

ئەمەش حەدیسێكی (حَسَن) بوو، وەكو باسمان كردو، هیچ حەدیسێكیش نەهاتوە دژایەتی بكات. بۆیە ناكرێت سەرپێچی لێ بكرێتو، نابێت كەسیش بەوە هەڵبخەڵەتێت كە خەڵكانێكی زۆر ئەیكەن، لەوانەی كە بە كەسانی زاناو بە پیاوچاكو بە پایەبەرز دادەنرێن. چونكە شوێنكەوتن تەنها بۆ پێغەمبەری خوایە (دروودی خوای لەسەر بێت). خوای گەورەش فەرموویەتی: ﴿وَما آتاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا﴾ [الحَشر: ٧] واتە: {ئەوەی پێغەمبەری خوا بۆی هێناونو پێی داون، ئێوەش دەستی پێوە بگرنو وەریگرنو پەیڕەوی لێ بكەن، ئەوەش ئەو نەهیی لێ كردوون، ئێوەش وازی لێ بهێننو، توخنی مەكەون}.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخالِفُونَ عَنْ أمْرِهِ أنْ تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ ألِيمٌ﴾ [النُّور: ٦٣] واتە: {كەواتە با ئەوانەی سەرپێچی لە فەرمانی پێغەمبەری خوا دەكەن، ترسی ئەوەیان هەبێت كە ئاشووبو بەڵایەكیان تووش ببێت، یان سزایەكی ئازاراویان تووش ببێت}.

پێشتریش لە ((**كتێبی زیكرەكانی مردوو**))دا فەرمایشتێكمان لە خواناسی پایەبەرز (فُضَیْل)ی كوڕی (عِیَاض)ـەوە هێنا، كە ئەمە واتاكەیەتی: "شوێن ڕێگەی ڕاست بكەوەو، كەمی شوێنكەوتوانیشی زیانت لێ نەداتو، خۆشت لە ڕێگەی گومڕایی بپارێزەو، هەڵیش مەخەڵەتێ بە زۆری ئەو تیاچوانەی كە لەسەرینی".

تەوفیقیش تەنها بە دەستی بەخوایە.

## باسێك: {هەستانەوە لەبەر كەسانی گەورەو پایەبەرز دروستە}

ئەگەر كەسێك هاتەژوورەوە بۆ جێگەیەكو تۆش لەبەری هەستایتەوە، ئەوە بەلای ئێمەوە كارێكی سونەتە، ئەگەر كەسەكە فەزڵو گەورەییەكی ئاشكرای تێدابوو، وەكو خوێندەواریو زانایی، یان پیاوچاكی، یان پایەبەرزی، یان سەرپەرشتیاریەكی بەپارێز، یان ئەگەر مافی لێبوون (وِلادَة)ی بەسەرتەوە هەبوو، یان خزمێكی بەتەمەن بوو، یان شتێكی لەو جۆرە.

جا ئەم هەستانەوەیەش بۆ چاكەكاریو رێز گرتنە، نەك بۆ رووپاماییو بەگەورە زانین.

كارو هەڵسوكەوتی زانایانی (سَلَف)و (خَلَف)یش هەر لەسەر ئەوە هاتووەو بەردەوامە، كە ئێمە بە پەسەندمان زانیوەو هەڵمان بژاردوە.

منیش لەمبارەوە كتێبێكی بچووكی تایبەتیم داناوە، ئەو حەدیسو فەرمایشتو كردەوانەی زانایانی (سَلَف)و (خَلَف)م تێدا كۆكردۆتەوە، كە دەبنە بەڵگە لەسەر ئەوەی باسم كرد. هەروەها ئەو شتانەشم تێدا باس كروە، كە پێچەوانەی ئەوەنو، بە روونی وەڵامم داونەتەوە. بۆیە ئەو كەسەی لە شتێك لەو بارەوە كێشەو جۆرە تێنەگەیشتنێكی هەیەو، حەزیش دەكات ئەو كتێبەی من بخوێنێتەوە، ئومێدم هەیە -ئەگەر خوای گەورە بیەوێت- كێشەو تێنەگەیشتنەكەی نەمێنێت. خواش لە هەموو كەس زانا ترە.[1]

(١) كتێبەكەشی بریتیە لە: (التَّرْخِيْصُ بِالْقِيَامِ لِذَوِيْ الْفَضْلِ وَالْمَزِيَّةِ مِنْ أَهْلِ الْإِسْلامِ).

## باسێك: {ڕۆیشتن بۆ خزمەتی پیاوچاكان}

سەردانی پیاوچاكانو برایانو دراوسێكانو هاوڕێیانو خزمانو ڕێــز گرتنیــانو، چاكە لەگەڵدا كردنیانو، هەبوونی پەیوەندی لەگەڵیاندا سونەتێكی دووپاتكراوەیە.

جا زەبتی ئەم سەردانو پەیوەندیانە بــەپێی جیــاوازی حــاڵو پلــەو كــاتی ئــەوان دەگۆڕێت. بۆیە دەبێت سەردانەكان بۆلایان بەجۆرێك بێــت، ئــەوان پێیــان نــاخۆش نەبێتو، لە كاتێكیشدا بێت، كە پێی ڕازی بن.

حەدیسو فەرمایشتی هــاوەڵانو شــوێنكەوتوانیش لــەمبارەوە زۆرو مەشــهورن. یەكێك لە جواترینیان بریتیە لەو حەدیسەی كــە لــە صــەحیحی موســلیمدا بۆمــان ڕیوایەت كراوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئــەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، كە پیاوێك ســەردانی برایــەكی خــۆی كردوە لە لادێیەكی تر. خوای گەورەش لەسەر ڕێگەكەی فریشتەیەكی دانا. جا كە پێی گەیشت، فریشتەكە پێی فەرموو: "بۆ كــوێ دەچیــت؟" ئــەویش وتــی: "بــۆلای برایەكی خۆم لەو لادێیە". فریشتەكە فــەرمووی: "ئایــا بەرژەوەندیــەكت لایــەتیو، دەتەوێت بیپارێزیتو ئاگات لێی بێت؟" ئەویش وتی: "نەخێر، بێجگــە لــەوەی كــە لەبەر خاتری خوا خۆشم دەوێــت". فریشــتەكەش فــەرمووی: دەی مــن نێــردراوی خوای گەورەم بۆلای تۆ، تا پێت بڵێم: خوای گەورەش تۆی خۆش دەوێــت، وەكــو تۆ ئەوت لەبەر خاتری خوا خۆش دەوێت.[1]

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو كتێبەكەی ئیمــامی (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویســت (أَبُــو هُرَيْــرَةَ)وە (خــوای لێ ڕازی بێــت)، كــە فەرموویــەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویــەتی: «مَنْ عَادَ مَرِيْضاً، أَوْ زَارَ أَخاً لَهُ

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٩٨٨ / بە ژمارە: ٢٥٦٧.

فِي اللهِ، نَادَاهُ مُنَادٍ: أَنْ طِبْتَ، وَطَابَ مَمْشَاكَ، وَتَبَوَّأْتَ مِنْ الْجَنَّةِ مَنْزِلاً».[1] واته: "ئەو کەسەی لەبەر خوا سەردانی نەخۆشێك یان برایەکی خۆی بکات، بانگکەرێك بانگی دەکات‌و، پێی دەڵێت: یاخوا لە تاوان خاوێن ببیتەوەو لەدنیا بەختەوەر بژیت‌و، ڕێگەی بەختەوەری دوارۆژیش بگریتە بەرو، پلەو پایەیەکی گەورەشت دەست بکەوێت‌و، بەهەشت ببێتە جێگەو مەنزڵت".

## باسێك سەبارەت بەوەی کە سونەتە کەسێك داوا لە هاوڕێیەکی چاکی خۆی بکات، کە سەردانی بکات‌و، زۆریش سەری لێ بدات

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، بە جوبرەئیلی فەرموە: «مَا يَمْنَعُكَ أَنْ تَزُورَنَا أَكْثَرَ مِمَّا تَزُورُنَا؟»، واتە: "ئەوە چی ڕێگریت لێ دەکات، کە زیاتر لەمە سەردانمان بکەیت؟". ئیتر ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿وَما نَتَنَزَّلُ إِلاَّ بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُ ما بَيْنَ أَيْدِينا وَما خَلْفَنا﴾ [مَرْيَم: ٦٤] واتە: {ئەی جوبرەئیل، بە پێغەمبەری خوا بفەرموو: ئێمە بە فەرمانی پەروەردگاری تۆ نەبێت دانابەزین‌و نایەینە خوارەوە، ئەوەی لەبەردەمماندایەو، ئەوەش لەدوامانەوەیە هەمووی هی خوایە}.[2]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٣٦٥ / بە ژمارە: ٢٠٠٨، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٤٦٤ / بە ژمارە: ١٤٣٤. ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـەو، شێخی (ابْنُ حِبَّان)یش لە صەحیحەکەیدا هێناویەتی. بڕوانە: صَحِيْحُ ابْنِ حِبَّان / ٧ / ٢٨٨ / بە ژمارە: ٢٩٦١.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٧٦٠ / بە ژمارە: ٤٤٥٤.

## باسی دوعا کردن بۆ کەسی پژمیوو، حوکمی باویشکدان

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَیْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يُحِبُّ الْعُطاسَ، وَيَكْرَهُ التَّثاؤُبَ، فَإِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ، وَحَمِدَ اللَّهَ تَعَالَى، كَانَ حَقّاً عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ سَمِعَهُ أَنْ يَقُولَ لَهُ: "يَرْحَمُكَ اللهُ". وَأَمَّا التَّثَاؤُبُ، فَإِنَّما هُوَ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ، فَلْيَرُدَّهُ مَا اسْتَطَاعَ؛ فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا تَثَاءَبَ، ضَحِكَ مِنْهُ الشَّيْطانُ».[1] واتە: "خوای گەورە پژمینی خۆشدەوێت‌و، باویشکدانی پێ ناخۆشە. جا ئەگەر یەکێك لە ئێوە پژمی‌و، سوپاس‌و ستایشی خوای گەورەی کرد، ئەوە دەبێت بە ئەرکی سەر شانی هەموو موسوڵمانێك، کە گوێی لێیەتی، پێی بڵێت: خوا ڕەحمەت پێ بکات (يَرْحَمُكَ اللهُ). سەبارەت بە باویشکدانیش، ئەوە لە شەیتانەوەیە. بۆیە ئەگەر یەکێك لە ئێوە باویشکی بۆ هات، با چەندە لەتوانایدایە بیگەڕێنێتەوە. چونکە ئەگەر یەکێك لە ئێوە باویشك بدات، شەیتان پێی پێدەکەنێت".

منیش دەڵێم: زانایان فەرموویانە: مانای ئەم حەدیسە ئەوەیە، کە پژمین هۆکارەکەی باشە، کە بریتیە لە سوکێتی لاشە، کە بەهۆی کەمی چوار تێکەڵەکەی (زەرداوو خوێن‌و بەڵغەم‌و ڕەشاو)و، خواردنی سوکەوە پەیدا دەبێت. کە ئەمەش کارێکی باشە. چونکە ئارەزوو لاواز دەکات‌و، بەندایەتی‌و گوێڕایەڵی ئاسان دەکات. بەڵام باویشکدان بە پێچەوانەی ئەمەوەیە. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَیْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «إِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلْ: "الْحَمْدُ لِلَّهِ" وَلْيَقُلْ لَهُ أَخُوهُ أَوْ صَاحِبُهُ: "يَرْحَمُكَ اللهُ". فَإِذَا قَالَ لَهُ يَرْحَمُكَ اللهُ، فَلْيَقُلْ: "يَهْدِيكُمُ اللهُ، وَيُصْلِحُ

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيِّ / ٥ / ٢٢٩٨ / بە ژمارە: ٥٨٧٢.

بَالَكُمْ"».[1] واته: "ئەگەر یەکێك لە ئێوە پژمی، با بڵێت: سوپاس‌و ستایش بۆ خـوا. براکەشی یان هاوڕێکەشی، کە گوێیان لـێـەتی، با بڵـێن: خـوا ڕەحمـت پـێ بکـات. ئەوجا با ئەویش بڵێت: خوا هیدایەتتان بدات‌و، دڵو حاڵو کاروبارتان سـازو بـاش بکات".

زانایان فەرموویانە: (بَالَكُمْ) واتە: (شَأْنَكُمْ).

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هـاوەڵی خۆشەویست (أَنس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: دوو پیاو لـە خزمـەتی پێغەمبەری خوادا پژمین، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) دوعـای بـۆ یـەکێکیان کردو، بۆ ئەوی تریانی نەکرد. جا ئەوەی کە دوعای بۆ نـەکردبوو عـەرزی کـرد: فلانە کەس پژمی، دوعات بۆ کرد، من پژمیم، دوعـات بـۆ نـەکردم!؟ پێغەمبـەریش فەرمووی: ئەو سوپاس‌و ستایشی خوای گەورەی کردو، تۆ نەتکرد![2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبـو مُوْسَى)ی (أَشْعَرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویـەتی: لـە پێغەمبـەری خـوام بیستوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە دەیفـەرموو: «إِذَا عَطَسَ أَحَـدُكُمْ، فَحَمِـدَ اللهَ تَعَالَى، فَشَمِّتُوهُ، فَإِنْ لَمْ يَحْمَدِ اللهَ، فَلا تُشَمِّتُوهُ».[3] واتە: "ئەگـەر یـەکێك لـە ئێـوە پژمی‌و، سوپاس‌و ستایشی خوای گەورەی کرد، ئێوەش دوعای خەیری بۆ بکـەن‌و، پێی بڵێن (يَرْحَمُكَ اللهُ). خۆ ئەگەر سوپاس‌و ستایشی خوای نەکرد، ئێوەش دوعـای خەیری بۆ مەکەن".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٩٨ / بە ژمارە: ٥٨٧٠.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٩٨ / بە ژمارە: ٥٨٧١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٢٩٢ / بە ژمارە: ٢٩٩١.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٢٩٢ / بە ژمارە: ٢٩٩٢.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (بَرَاء)ی کوڕی (عَازِب)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرمانی پێ کردین بە حەوت شت‌و، نەهیشی لێ کردین لە حەوت شت: فەرمانی پێ کردین بە سەردانی نەخۆش‌و، بە شوێنکەوتنی جەنازەو، بە دوعا کردن بۆ کەسی پژمیو، بەدەمەوەچوونی دەعوەت‌و، وەڵامدانەوەی سڵاوو، هاوکاری‌و پشتیوانی کەسی ستەملێکراوو، نەخستنی سوێند.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «حَقُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ خَمْسٌ: رَدُّ السَّلامِ، وَعِيَادَةُ الْمَرِيْضِ، وَاتِّبَاعُ الْجَنَائِزِ، وَإِجَابَةُ الدَّعْوَةِ، وَتَشْمِيْتُ الْعَاطِسِ».[2] واتە: "مافی موسوڵمان لەسەر موسوڵمان پێنج شتە: وەڵامدانەوەی سڵاوو، سەردانی نەخۆش‌و، شوێنکەوتنی جەنازەو، بەدەمەوەچوونی دەعوەت‌و، دوعا کردن بۆ کەسی پژمیو".

لە ڕیوایەتێکی ئیمامی موسلیمدا هاتوە: «حَقُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ سِتٌّ: إِذَا لَقِيتَهُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، وَإِذَا دَعَاكَ فَأَجِبْهُ، وَإِذَا اسْتَنْصَحَكَ فَانْصَحْ لَهُ، وَإِذَا عَطَسَ فَحَمِدَ اللهَ فَشَمِّتْهُ، وَإِذَا مَرِضَ فَعُدْهُ، وَإِذَا مَاتَ فَاتَّبِعْهُ».[3] واتە: "مافی موسوڵمان لەسەر موسوڵمان شەش شتە: ئەگەر پێی گەیشتیت، سڵاوی لێ بکەو، ئەگەر دەعوەتی کردیت، بچۆ بەدەمیەوەو، ئەگەر داوای ئامۆژگاری لێ کردیت، ئامۆژگاری بکەو،

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٩٧ / بە ژمارە: ٥٨٦٨، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٣٥ / بە ژمارە: ٢٠٦٦.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤١٨ / بە ژمارە: ١١٨٣، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧٠٤ / بە ژمارە: ٢١٦٢.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧٠٥ / بە ژمارە: ٢١٦٢.

ئەگەر پژمی‌و سوپاس‌و ستایشی خوای کرد، تۆش دوعای خەیری بۆ بکەو، ئەگەر نەخۆش کەوت، سەردانی بکەو، ئەگەر مردیش، شوێنی تەرمەکەی بکەوە".

## باسێك: {سونەتە کەسی پژمیو بڵێت: (الْحَمْدُ لِلّه)}

زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە سونەتە کەسی پژمیو لەدوای پژمینەکەیەوە بڵێت: (الْحَمْدُ لِلّه). خۆ ئەگەر بڵێت: (الْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِيْن) ئەوە باشترەو، ئەگەر بشڵێت: (الْحَمْدُ لِلّهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ)، ئەوە باشترە.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و لە غەیری ئەویشدا، بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْـرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «إِذا عَطَسَ أَحَدُكُمْ، فَلْيَقُلْ: "الْحَمْدُ لِلّهِ عَلَى كُلِّ حَال"، وَلْيَقُلْ أَخُوْهُ أَوْ صَاحِبُهُ: "يَرْحَمُكَ اللهُ"، وَيَقُولُ هُوَ: "يَهْدِيكُمُ اللهُ، وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ».[1] واتە: "ئەگەر یەکێك لە ئێوە پژمی، با بڵێت: (الْحَمْدُ لِلّهِ عَلَى كُلِّ حَال)و، با براکەی یان هاوڕێکەی بڵێت: (يَرْحَمُكَ اللهُ)و، با ئەویش بڵێت: (يَهْدِيكُمُ اللهُ، وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ)".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پیاوێك لای ئەودا پژمی‌و، وتی: (الْحَمْدُ لِلّهِ، وَالسَّلامُ عَلَى رَسُوْلِ الله). (ابْنُ عُمَر)یش فەرمووی: منیش دەڵێم: (الْحَمْدُ لِلّهِ، وَالسَّلامُ عَلَى رَسُوْلِ اللهِ -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ-)و، کەچی

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٢٦ / بە ژمارە: ٥٠٣٣، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٨٣ / بە ژمارە: ٢٧٤١.

پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) وای فێرنەکردوین. بەڵکو فێری کردوین، کە بڵێین: (الْحَمْدُ لِلّهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ).[1]

منیش دەڵێم: سونەتە بۆ هەموو ئەو کەسانەی گوێیان لێیەتی، پێی بڵێن: (يَرْحَمُكَ اللّٰهُ)، یان (يَرْحَمْكُمُ اللّٰهُ)، یان (رَحِمَكَ اللّٰهُ)، یان (رَحِمَكُمُ اللّٰهُ). سونەتیشە بۆ کەسە پژمیوەکە دوای ئەوە بڵێت: (يَهْدِيكُمُ اللّٰهُ، وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ)، یان (يَغْفِرُ اللّٰهُ لَنَا وَلَكُمْ).

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (مُوَطَّأ)ی ئیمامی (مَالِك)دا (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، لەوەوە، ئەویش لە (نَافِع)ـەوە، ئەویش لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە پژمیو، پێی وترا: (يَرْحَمُكَ اللّٰهُ)، با ئەویش بڵێت: (يَرْحَمُنَا اللّٰهُ وَإِيَّاكُمْ، وَيَغْفِرُ اللّٰهُ لَنَا وَلَكُمْ).[2] واتە: "خوا ڕەحم بە ئێمەو بە ئێوەش بکاتو، لە ئێمەو لە ئێوەش خۆشبێت".

جا هەموو ئەمانە سونەتن و، هیچ شتێکی واجبیان تێدا نیە.

هاوەڵانمان فەرموویانە: وتنی (يَرْحَمُكَ اللّٰهُ) بۆ کەسی پژمیو سونەتی (كِفَايَة)یە. بۆیە ئەگەر یەکێك لە ئامادەبوان بیڵێت، بۆ هەموویان جێگە دەگرێت. بەڵام باشتر وەهایە کە هەموویان بیڵێن، ئەویش لەبەر ڕواڵەتی ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە لە حەدیسی (صَحِيْح)دا هاتبوو: «كَانَ حَقّاً عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ سَمِعَهُ أَنْ يَقُوْلَ لَهُ: "يَرْحَمُكَ اللّٰهُ"».

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٨١ / بە ژمارە: ٢٧٣٨. ئیمامی (حَاكِم)یش ڕیوایەتی کردوەو، پاشان فەرموویەتی: ڕشتەکەی (صَحِيْح)ـە. بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ٤ / ٢٩٥ / بە ژمارە: ٧٦٩١.

(٢) بڕوانە: مُوَطَّأ الْإِمَامِ مَالِك / ٢ / ٩٦٥ / بە ژمارە: ١٧٣٣. ڕشتەکەی (صَحِيْح)ـە. بەڵکو بەلای ئیمامی بوخاریەوە لە هەموو ڕشتەکان صەحیحترە. بڕوانە: إِرْشَادُ طُلَّابِ الْحَقَائِقِ إِلَى مَعْرِفَةِ سُنَنِ خَيْرِ الْخَلائِق (تَحْقِيْق: الدُّكْتُوْر نُوْرُ الدِّيْن عِتْر) / ٥٨.

پاشان ئەمەی کە باسمان کرد سەبارەت بە سونەتبوونی وتنی (يَرْحَمُكَ اللهُ)، ئەوە مەزھەبی خۆمانە.

هاوەڵانی ئیمامی (مَالِك)یش بۆچوونی جیاوازیان هەیە سەبارەت بەوەی کە واجبە یان سونەتە:

- زانای پایەبەرز قاضي (عَبْدُالْوَهَّاب)یش هەر وەکو مەزھەبەکەی ئێمە فەرموویەتی: سونەتەو، یەکێکیش بیڵێت بۆ کۆمەڵێك دادەمەزرێت.
- زانای پایەبەرز (ابْنُ مُزَيْن) فەرموویەتی: لەسەر هەموویان واجبەو، شێخی (ابْنُ الْعَرَبِيّ)ش ئەم بۆچوونەی هەڵبژاردوە.

## باسێك: {حوکمی دوعای خەیر کردن بۆ کەسی پژمیو، ئەگەر ئەو (الْحَمْدُ لِلّهِ)ی نەکرد}

ئەگەر کەسی پژمیو نەیوت (الْحَمْدُ لِلّهِ)، پێی ناوترێت: (يَرْحَمُكَ اللهُ). لەبەر ئەو حەدیسەی پێشوو.

جا بەلایەنی کەمەوە بۆ وتنی (الْحَمْدُ لِلّهِ)و، (يَرْحَمُكَ اللهُ)و، وەڵامەکەیشی دەبێت ئەوەندە دەنگ بەرز بکاتەوە، تا کەسی بەرامبەر گوێی لێبێت.

## باسێك: {ئەگەر كەسی پژمیو شتێكی تری وت، بێجگە لە (الْحَمْدُ لِلّهِ)، ئەوا شایستەی ئەوە نیە، كە پێی بوترێت: (يَرْحَمُكَ اللهُ)}

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَالِم)ی كوڕی (عُبَيْد)ی (أَشْجَعِيّ)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: جارێك لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بووین (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەوەبوو كەسێك لەناو خەڵكەكەدا پژمیو، وتی: (السَّلامُ عَلَيْكُمْ). پێغەمبەریش فەرمووی: (وَعَلَيْكَ وَعَلَى أُمِّكَ). ئەوجا فەرمووی: ئەگەر یەكێكتان پژمی، با سوپاس و ستایشی خوا بكات‌و، -ئیتر هەندێك شێوازی سوپاسكردنیشی باس كرد- ئەو كەسەش لەلایدایە با بڵێت: (يَرْحَمُكَ اللهُ). ئەوجا با ئەویش وەڵامیان بداتەوەو، بڵێت: (يَغْفِرُ اللهُ لَنَا وَلَكُمْ).[1]

## باسێك: {پژمین لەناو نوێژدا}

ئەگەر كەسێك لە نوێژدا پژمی، سونەتە بڵێت: (الْحَمْدُ لِلّهِ)و، خۆیشی بیبیسێت. ئەمە مەزهەبی ئێمەیە.

هاوەڵانی ئیمامی (مَالِك)یش سێ بۆچوونیان هەیە:

یەكێكیان ئەمەیەو، شێخی (ابْنُ الْعَرَبِيّ)ش هەڵیبژاردوەو پێی پەسەندە.

دوەمیشیان ئەوەیە كە با لە دڵی خۆیدا (الْحَمْدُ لِلّهِ) بكات.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٢٦ / بە ژمارە: ٥٠٣١، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٨٢ / بە ژمارە: ٢٧٤٠. ڕشتەی ئەم حەدیسە لاوازە. چونكە یان بچڕانی تێدایە، یان كەسی نەناسراو. بڕوانە: التَّأْرِيْخُ الْكَبِيْر (لِلْبُخَارِيّ) / ٤ / ١٠٦ / لە باسی (سَالِم)ی كوڕی (عُبَيْد)ی (أَشْجَعِيّ)دا.

سێیەمیشیان، کە بۆچوونی (سُحْنُوْن)ـە[1]: ئەوەیە کە نابێت (الْحَمْدُ لِلّهِ)، نە بـە دەنگی بەرزو، نە لـە دڵی خۆشیدا.

## باسێك: {ئادابەکانی کەسی پژمیو}

ئەگەر کەسێك پژمەی بۆهات، سونەت وەهایە دەسـتی یـان کراسـەکەی، یـان شتێکی لـەو شێوە لـەسەر دەمی دابنێت‌و، دەنگیشی نزم بکاتەوە.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لـە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویـەتی: ئەگـەر پێغەمبـەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) بپژمیایە، دەستی یان کراسەکەی دەخستە سەر دەمـی‌و، دەنگی خۆی پێ نزم، یان کەم دەکـردەوە -ڕاویەکـە گومـانی هەیـە، کـە کامیـانی فەرموە-.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە کتێبەکـەی شـێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (عَبْدُاللهِ)ی کـوڕی (زُبَيْـر)ەوە (خـوای لـە هـەردووکیان ڕازی بێـت)، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسـەر بێـت) فەرموویـەتی: «إِنَّ اللهَ -عَـزَّ

---

(١) بە (سُحْنُوْن)و، بە (سَحْنُوْن)یش دەخوێنرێتەوە. بڕوانە: كِفَايَةُ الطَّالِبِ الرَّبَّانِيِّ لِرِسَالَةِ أَبِيْ زَيْدٍ الْقَيْرَوَانِيّ / ١ / ٧٣٧. أَبو الْحَسَنِ الْمَالِكِيّ / تَحْقِيْق: يُوْسُفُ الشَّيْخ مُحَمَّد الْبِقَـاعِيّ / دَارُ الْفِكْر - بَيْرُوْت / ١٤١٢ هـ.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٢٥ / بە ژمارە: ٥٠٢٩، وسُنَنُ التِّرْمِـذِيّ / ٥ / ٨٦ / بـە ژمارە: ٢٧٤٥.

وَجَلَّ- يَكْرَهُ رَفْعَ الصَّوْتِ بِالتَّثَاؤُبِ وَالعُطَاسِ».[1] واته: "خوای گەورە پێی ناخۆشە دەنگ بەرز بکرێتەوە بۆ باویشکدانو بۆ پژمین".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە (أُمُّ سَلَمَةَ)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: لە پێغەمبەری خوام بیستوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «التَّثَاؤُبُ الرَّفِيعُ وَالْعَطْسَةُ الشَّدِيدَةُ مِنَ الشَّيْطَانِ».[2] واتە: "باویشکدان بە دەنگی بەرزو، پژمینی توندو بەهێز لە شەیتانەوەیە".

## باسێك: {حوكمی چەندبارەبوونەوەی پژمین}

ئەگەر کەسێك چەند جارێك بەشوێن یەکدا پژمی، ئەوا سونەتە بۆ هەموو جارێك پێی بوترێت: (يَرْحَمُكَ اللهُ)، هەتا دەگاتە سێ جار.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمو (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَلَمَة)ی کوڕی (أَكْوَع)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە گوێی لە پێغەمبەری خوا بوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە پیاوێك لە خزمەتیدا پژمیوەو، ئەویش پێی فەرموە: (يَرْحَمُكَ اللهُ). پاشان جارێکی تر پژمیەوە، پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: ئەم پیاوە هەڵامەتی هەیە.

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٣٣ / بە ژمارە: ٢٦٧. حەدیسێکی زۆر لاوازە. چونکە کەسێك لە ڕشتەکەیدایە، تۆمەتبارە بە درۆ کردن. بڕوانە: عُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّي / ٣٢٣.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٣٢ / بە ژمارە: ٢٦٤. ڕشتەکەی لاوازە. چونکە بچڕانی تێدایەو، کەسی نەناسراویشی تێدایە. بڕوانە: عُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّي / ٣٢٢.

جا ئەمە دەقی ڕیوایەتەکەی ئیمامی موسلیمە.[1]

سەبارەت بە ڕیوایەتەکەی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِـــذِيّ)، ئـەوان فەرموویانـە: (سَلَمَة) فەرموویەتی: پیاوێك لـە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) پژمیو، منیش بەدیارەوە بووم، پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: (يَرْحَمُكَ اللهُ). پاشان بۆ جاری دوم یان سێیەم پژمیەوە. پێغەمبـەری خـواش (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: (يَرْحَمُكَ اللهُ)، ئەم پیاوە هەلأمەتی هەیە.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[2]

سەبارەت بەو حەدیسەش، کە لـە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا بۆمان ڕیوایەت کراوە، لـە هاوەڵی خۆشەویست (عُبَيْدُالله)ی کـوڕی (رِفَاعَــة)وە (خـوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) فەرموویـەتی: «يُشَمَّتُ الْعَاطِسُ ثَلاثاً، فَإِنْ زَادَ، فَإِنْ شِئْتَ فَشَمِّتْهُ، وَإِنْ شِئْتَ فَلا».[3] واتـە: "سـێ جار دوعای خەیر بۆ کەسی پژمیو دەکرێت. جا ئەگـەر زیـاتر پـژمی، ئـەوە ئەگـەر ویستت دوعای خەیری بۆ بکەو، ئەگەرنا بۆی مەکە"، ئـەوە حەدیسـێکی لاوازەو، ئیمامی (تِرْمِذِيّ) لـەبارەیەوە فەرموویەتی: حەدیسـێکی (غَرِيْـــب)ـــەو، ڕشتەکەشـی نەناسراوە.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٢٩٢ / بە ژمارە: ٢٩٩٣.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٢٧ / بە ژمارە: ٥٠٣٧، وسُنَنُ التِّرْمِـــذِيّ / ٥ / ٨٤ / بـە ژمارە: ٢٧٤٣.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٢٧ / بە ژمارە: ٥٠٣٦، وسُنَنُ التِّرْمِـــذِيّ / ٥ / ٨٥ / بـە ژمارە: ٢٧٤٤.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، بە ڕشتەیەك -کە پیاوێکی تێدایە، دڵنیا نیم لەوەی حاڵی چۆنە-[1]، بەڵام ئەوەولای ڕشتەکەی (صَحِيْح)ـە، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لیّ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خواوە بوو (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە دەیفەرموو: «إِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ فَلْيُشَمِّتْهُ جَلِيسُهُ، وَإِنْ زَادَ عَلَى ثَلاثَةٍ، فَهُوَ مَزْكُومٌ، وَلا يُشَمَّتُ (تَشْمِيْتَ) بَعْدَ ثَلاثِ (مَرَّاتٍ)».[2] واتە: "ئەگەر یەکێك لە ئێوە پژمی، با ئەو کەسەی لەلایدا دانیشتوە دوعای خەیری بۆ بکات. جا ئەگەر زیاد لە سێ جار پژمی، ئەوە هەڵامەتی هەیە. بۆیە لەدوای سێ جارەوە دوعای خەیری بۆ ناکرێت".

زانایانیش سەبارەت بەم حاڵەتە بۆچوونی جیاوازیان هەیە:

شێخی (ابْنُ الْعَرَبِيّ) فەرموویەتی: وتراوە: لە جاری دوەمدا پێی دەوترێت: تۆ هەڵامەتت هەیە. وتراویشە: لە سێیەم جاردا وای پێدەوترێت. وتراویشە: لە چوارەم جاردا. دروستترین بۆچوونیش ئەوەیە کە لە سێیەم جاردا پێی دەوترێت.

هەروەها فەرموویەتی: مانای وایە تۆ لەو کەسانە نیت، کە لەدوای ئەم جارەوە پێت بوترێت: (يَرْحَمُكَ اللهُ). چونکە ئەمەی کە توشی تۆ بوە هەڵامەتو نەخۆشیە، نەوەك پژمین.

---

(١) شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ئەم کەسە بریتیە لە (سُلَيْمَان)ی کوڕی (أَبُو دَاوُد)ی (حَرَّانِيّ)، کە کەسێکی لاوازەو، ئیمامی نەسائی لەبارەیەوە فەرموویەتی: کەسێکی ئەمین و متمانەدار نیە. بڕوانە: فَتْحُ الْبَارِيّ / ١٠ / ٦٠٥.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٢٦ / بە ژمارە: ٢٥١. شێخ (سَلِيْم الْهِلالِيّ) لە فەرمویەتی: ڕشتەکەی زۆر لاوازە. بەڵام حەدیسەکە (صَحِيْح)ـە، چونکە لە چەند ڕێگەیەکی ترەوە ڕیوایەت کراوە. بڕوانە: عُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّيّ / ٣٠٦ - ٣٠٧.

جا ئەگەر بوترێت: خۆ ئەگەر پژمینەکە نەخۆشی بێت، ئەوا هەر دەبێت دوعای بۆ کەسەکە بکرێتو، پێی بوترێت: (يَرْحَمُكَ اللهُ). چونکە ئەو لە کەسانی تر زیاتر شایانی ئەوەیە دوعای خەیری بۆ بکرێت.

وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە، کە بەڵێ سونەتە دوعای بۆ بکرێت، بەڵام نەك ئەو دوعایەی کە بۆ پژمین دانراوە. بەڵکو دەبێت ئەو دوعایانەی بۆ بکرێت، کە موسوڵمان بۆ موسوڵمانی دەکات، لە لەشساغیو سەلامەتیو شتی لەو جۆرە، نەك ئەوەی بۆ پژمین بەکاردێت.

## باسێك: {ئەو کەسەی گوێی لە (الْحَمْدُ لِلّهِ) کەسی پژمیو بوو، با دوعای خەیری بۆ بکات}

ئەگەر کەسێك پژمیو، (الْحَمْدُ لِلّهِ) نەکرد، ئەوا وەکو باسمان کرد، دوعای بۆ ناکرێتو پێی ناوترێت: (يَرْحَمُكَ اللهُ). بە هەمان شێوە ئەگەر (الْحَمْدُ لِلّهِ) کردو، کەس گوێی لێ نەبوو. خۆ ئەگەر کۆمەڵێك لە نزیکی بوونو، هەندێکیان گوێیان لێبوو، هەندێکیشیان گوێیان لێ نەبوو، ئەوا تەنها ئەوانەیان پێی دەڵێن: (يَرْحَمُكَ اللهُ)، کە گوێیان لێبوە، نەك ئەوانی تر.

شێخی (ابْنُ الْعَرَبِيّ) باسی ناکۆکیەکی کردوە سەبارەت بە وتنی (يَرْحَمُكَ اللهُ) لەلایەن ئەوانەی گوێیان لێ نەبوە، ئەگەر گوێیان لێبوو یەکێك لە هاوڕێکانیان وتی (يَرْحَمُكَ اللهُ):

جا وتراوە: ئەوانیش با پێی بڵێن: (يَرْحَمُكَ اللهُ). چونکە بەهۆی وتنیەوە لەلایەن ڕەفیقەکەیانەوە زانیویانە کە کابرا پژمیوەو، (الْحَمْدُ لِلّهِ)یشی کردوە.

وتراویشە: نەخێر با پێی نەڵێن، چونکە خۆیان گوێیان لە (الْحَمْدُ لِلّهِ)یەکەی کابرا نەبوە.

بشزانه ئەگەر کابرا (الْحَمْدُ لِلّهِ) هەر نەکرد، ئەوا سونەتە بۆ ئەو کەسەی لەلایدا ئامادەیە بیخاتەوە بیری. ئەمەش بۆچوونی هەڵبژێردراوە.

ئێمەش بۆچوونێکی لەم جۆرەمان لە کتێبی (مَعَالِمُ السُّنَن)ی شێخی (خَطَّابِيّ)یەوە بۆ ڕیوایەت کراوە، لە پێشەوای پایەبەرز (إِبْرَاهِیْم)ی (نَخَعِيّ)ـەوە، چونکە ئەو کارە دەچێتە ژێر باسی دڵسۆزیو، فەرمان کردن بە چاکەو، هاوکاری کردن لەسەر چاکەکاریو لەخوا ترسان.

شێخی (ابْنُ الْعَرَبِيّ) فەرموویەتی: نابێت بیخاتەوە بیری. جا ئەو وای داناوە کە ئەو کەسەی کاری وا بکات نەزانە. بەلاَم ئەو لەو بۆچوونەیدا نەپێکاوە. بەڵکو بۆچوونی ڕاست ئەوەیە کە سونەتە بیخاتەوە بیری، لەبەر ئەو هۆکارانەی باسمان کردن. تەوفیقیش تەنها بە دەستی خوایە.

## باسێك سەبارەت بەوەی، کە ئەگەر کەسێکی جوولەکە پژمی:

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و لە غەیری ئەوانیشدا، بە چەند ڕشتەیەکی (صَحِیْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو مُوْسَى)ی (أَشْعَرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: جوولەکەکان لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (دروودی خوای لەسەر بێت) دەپژمینو، ئاواتەخوازیش بوون، کە پێیان بڵێت: (یَرْحَمُکُمُ اللهُ)، کەچی ئەو دەیفەرموو: «یَهدِیْکُمُ اللهُ، وَیُصْلِحُ بالَکُمْ».

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِیْح)ـە.[1]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٢٧ / بە ژمارە: ٥٠٣٨، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٨٢ / بە ژمارە: ٢٧٣٩.

## باسێك: {پژمین لەكاتی قسە كردندا}

بۆمان ڕیوایەت كراوە لـە (مُسْنَد)ی پێشەوای پایەبەرز (أبو يَعْلَى)ی (مَوْصِلِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبــو هُرَيْــرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، كـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویـەتی: «مَنْ حَدَّثَ حَــدِيثاً، فَعَطَــسَ عِنْدَهُ، فَهُوَ حَقٌّ».[1] واتە: "ئەو كەسەی قسەیەك بگێڕێتـەوەو، لـەكاتی گێڕانەوەیـدا بپژمێت، ئەوە قسەكەی ڕاستە".

هەموو كەسەكانی ڕشتەی گێڕانەوەی ئەم حەدیسە متمانەدارو مەزبوتن، بێجگـە لە (بَقِيَّة)ی كوڕی (وَلِيْد)، كە ڕای جیاوازی لەسەرەو، زۆرینەی فەرموودەناسـانو پێشەوایان ئەو حەدیسەی دەكەن بە بەڵگە، كـە لـە (شَــامِيّ)ـەكانەوە ڕیوایـەتی كردوە، جا ئەم حەدیسەشی لە (مُعَاوِيَة)ی كوڕی (يَحْيَى)ی (شَامِيّ)ـەوە ڕیوایـەت كردوە.[2]

---

(١) بڕوانە: مُسْنَدُ أَبِيْ يَعْلَى / ١١ / ٢٣٤ / بە ژمارە: ٦٣٥٢.

(٢) ئەم فەرمایشتە وا دەگەیەنێت، كە ئیمامی نەوەوی ئـەم حەدیسـەی بـەلاوە پەسـەندەو، بـۆ بەڵگەهێنانەوە دەشێت. ئەگەرچی هەنـدێك لـە زانایـانی تـر بـە حەدیسـێكی (مَوْضُــوْع)و هەڵبەستراوی دەزانن. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٦ / ٢٨ – ٢٩، وكَشْفُ الْخَفَاءِ وَمُزِيْــلُ الْإِلْبَاس (لِلْعَجْلُوْنِيّ) / ٢ / ٢٩١ / بە ژمارە: ٢٤٦١.

## باسێك: {ئادابەكانی باویشكدان}

ئەگەر كەسێك باویشكی بۆ هات، سونەتە ئەوەنـدەی بنوانێت بیگەڕێنێتـەوە، لـەبەر ئەو حەدیسە (صَحِیْح)ـەی، كە پێشتر باسمان كرد.

سونەتیشە دەستی بخاتە سەر دەمی، لەبـەر ئـەو حەدیسـەی كـە لـە صـەحیحی موسـلیمدا بۆمـان ڕیوایـەت كـراوە، لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (أَبُـو سَـعِیْد)ی (خُدْرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، فەرموویەتی: «إِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ، فَلْيُمْسِكْ بِيَدِهِ عَلَى فَمِـهِ، فَـإِنَّ الشَّـيْطَانَ يَدْخُلُ».[1] واتە: "ئەگەر یەكێك لە ئێوە باویشكی دا، با دەستی بخاتـە سـەر دەمـی، چونكە شەیتان دەچێتە ژوورەوە".

منیش دەڵێم: جا باویشكدانەكە لە نوێژدا بێت، یان لە دەرەوەی نوێژ، سـونەتە كەسی باویشكدەر دەستی بخاتـە سـەر دەمـی. بـەڵام كاتێـك ناپەسـەندە نوێـژخوێن دەستی بخاتە سەر دەمی، كە پێویستیەك نەبوو، وەكو باویشكدان، یان شـتێكی لـەو شێوە. خواش لە هەموو كەس زانا ترە.

## باسی وەسفو سەنا كردن

بزانە كە وەسفو سەناكردنی كەسێكو باسكردنی سیفەتە جوانەكانی هەنـدێك جار بە ئامادەبوونی خۆیەتیو، هەندێك جاریش بە ئامادەبوونی خۆی نیە.

جا ئەگەر بە ئامادەبوونی خۆی نەبوو، ئەوا هیچ ڕێگریەك نیە لـە وەسـفكردنی، مەگەر كەسە وەسفكەرەكە زیـادەڕەوی بكـاتو، بكەوێتـە نـاو درۆوە. ئـەو كاتـە بەهۆی درۆ كردنەكەوە قسەكانی حەرام دەبێت، نەك بەهۆی وەسف كردنەكە.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٢٩٣ / بە ژمارە: ٢٩٩٥.

جا هەر وەسفکردنێك کە درۆی تێدا نەبێت، کارێکی سونەتە، ئەگەر بەرژەوەندیەکی تێدا بێت‌و، سەرنەکێشێت بۆ خراپە. بەوەی کە بگاتەوە بە کەسە وەسفکراوەکەو، ئەویش پێی خۆشحاڵو سەرسام بێت، یان شتێکی لەو جۆرە.

سەبارەت بەو وەسفکردنەش کە بە ئامادەبوونی خودی وەسفکراوەکەیە، ئەوە چەندین حەدیسی لەبارەوە هاتوە، کە وا دەخوازن ئەو کارە کارێکی دروست بێت، یان سونەت بێت‌و، چەندین حەدیسیش هاتون، کە وا دەخوازن ڕێگری لێ بکرێت.

زانایان فەرموویانە: ڕێگەی کۆکردنەوەو یەکخستنەوەی حەدیسەکان بەوە دەبێت، کە بوترێت: ئەگەر کەسە وەسفکراوەکە خاوەنی ئیمانێکی تەواوو، دڵنیاییەکی باش‌و، ڕاهێنانی نەفس‌و، شارەزاییەکی تەواو بوو، بەجۆرێك، کە بە وەسفکردنەکە خۆشحاڵ نەدەبوو، لەخۆشی بایی نەدەبوو، نەفسیشی یاری‌و گاڵتەی پێ نەدەکرد، ئەوە حەرام نیەو، ناپەسەندیش نیە. بەڵام ئەگەر ترسی شتێك لەمانەی لێکرا، ئەوا وەسفکردنی کارێکی زۆر ناپەسەندە.

جا لەو حەدیسانەی کە سەبارەت بە ڕێگری لێکردن هاتون:

- بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (مِقْدَاد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پیاوێك دەستی کرد بە وەسف‌و سەنا کردنی ئیمامی (عُثْمَان)، (مِقْدَاد)یش کەوتە سەر ئەژنۆکانی‌و، دەستی کرد بە هەڵکردنی زیخ‌و وردەبەرد بەڕوویدا. ئیمامی (عُثْمَان)یش پێی فەرموو: ئەوە چیتە؟ (واتە: بۆچی وا دەکەیت؟) (مِقْدَاد)یش فەرمووی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، فەرموویەتی: «إِذَا رَأَيْتُمُ الْمَدَّاحِينَ، فَاحْثُوا فِي وُجُوهِهِمُ التُّرَابَ».[1]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٢٩٧ / بە ژمارە: ٣٠٠٢.

- بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە هـەردوو صـەحیحی بوخـاریو موسـلیمدا، لـە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو مُوْسَى)ی (أشْعَرِيّ)ـەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسـەر بێـت) گـوێی لـە پیاوێکـەوە بوو، کە وەسفو سەنای پیاوێکی تری دەکردو، زیادەڕەویشـی دەکـرد لـە وەسفیدا، ئەویش فەرمووی: «أَهْلَكْتُمْ أَوْ قَطَعْتُمْ ظَهْـرَ الرَّجُـلِ!».[1] واتـە: "پیاوەکەتان لەناوبرد، یان پشتیتان شکاند".
- بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە هـەردوو صـەحیحی بوخـاریو موسـلیمدا، لـە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو بَكْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پیاوێك لە خزمەتی پێغەمبەری خـوادا (درودی خـوای لەسـەر بێـت) باسـکراو، کەسـێکیش وەسـفی کردو باسی چاکەی کرد. پێغەمبەریش چەند جارێك فـەرمووی: «وَيْحَـكَ! قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ!». واتـە: "نەگبـەت، گـەردنی ڕەفیقەکـەتت بڕیـەوەو ملیت شکاند". ئەوجا فـەرمووی: «إِنْ كَانَ أَحَدُكُمْ مَادِحاً أَخَاهُ، لَا مَحَالَـةَ، فَلْيَقُلْ: "أَحْسبُ كَذَا وَكَذَا"، إِنْ كَانَ يَرَى أَنَّهُ كَذَلِكَ، وَحَسِيبُهُ اللهُ، وَلَا يُزَكِّي عَلَى اللهِ أَحَداً».[2] واتە: "ئەگەر یەکێك لە ئێوە ناچـاربوو وەسـفی برایـەکی خۆی بکات، با بڵێت: وا بزانم فلانە وەسفی چـاكو فیسـارە وەسـفی باشـی تێدایە، بـە مـەرجێك زیـاتر گومـانی وا بێـت، کـە کەسـەکە وەهایـە، ئـیتر ئەوەولای لێگەڕێت بۆ خوا، ئەو دەزانێت چۆنە، با نەڵێت لای خواش هـەر وەهایە کە من دەیڵێم".

سەبارەت بەو حەدیسانەش، کە لەبارەی دروستی وەسف کـردن هـاتون، ئـەوە گەلێك زۆرنو نایەنە هەژمار. بەڵام ئێمە تەنها ئاماژە بە هەندێکیان دەدەین:

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٩٤٧ / بە ژمارە: ٢٥٢٠، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٢٩٧ / بە ژمارە: ٣٠٠١.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٥٢ / بە ژمارە: ٥٧١٤، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٢٩٦ / بە ژمارە: ٣٠٠٠.

- یەکێك لەوانە بریتیە لەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە لە حەدیسی (صَحِیْح)دا هاتوەو، بە ئیمامی (أَبو بَکْـر)ی فەرموە: «مَا ظَنُّكَ بِاثْنَيْنِ، اللهُ ثَالِثُهُما؟». واتە: "گومانت چۆنە بەو دوو کەسەی، کە خوای گەورە سێیەمیانە؟".[1]
- لە حەدیسێکی تردا بە ئیمامی (أَبو بَكْر)ی فەرموە: «لَسْتَ مِنْهُمْ». واتە: "تۆ لەو کەسانە نیت، کە لەبەر شانازی کردنو خۆبەگەورە زانین جلو بەرگی خۆیان درێژو شۆڕ دەکەن".[2]
- لە حەدیسێکی تریشدا فەرموویەتی: «يَا أَبَا بَكْرٍ، لَا تَبْكِ. إنَّ أَمَنَّ النَّاسِ عَلَيَّ فِي صُحْبَتِهِ وَمَالِهِ أَبُو بَكْرٍ. وَلَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا خَلِيلًا مِنْ أُمَّتِي، لَاتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ خَلِيلًا». واتە: "(أَبو بَكْر) مەگری. بەڕاستی بەمنەتترین کەس لەسەر من لە ڕەفاقەتو ماڵیشدا بریتیە لە (أَبـو بَکْـر). خۆ ئەگەر لە ئومەتەکەمدا خۆشەویستو دۆستێکم بۆ خۆم هەڵبژاردایە، ئەوا (أَبو بَکْـر)م دەکرد بە خۆشەویستو دۆستی خۆم".[3]
- لە حەدیسێکی تریشدا پێی فەرموە: «أرْجُو أنْ تَكُونَ مِنْهُم». واتە: "تکام وایە تۆ لەو کەسانە بیت، کە لە هەموو دەرگاکانی بەهەشتەوە بانگ دەکرێن، بۆئەوەی بچنە ژوورەوە".[4]
- لە حەدیسێکی تریشدا سەبارەت بە ئیمامی (أَبو بَكْر) فەرموویەتی: «ائْذَنْ لَهُ، وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ». واتە: "ڕێگەی پێ بدەو، مژدەی بەهەشتیشی بدەری".[1]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٧١٢ / بە ژمارە: ٤٣٨٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٨٥٤ / بە ژمارە: ٢٣٨١.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٥٢ / بە ژمارە: ٥٧١٥.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ١٧٧ / بە ژمارە: ٤٥٤، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٨٥٤ / بە ژمارە: ٢٣٨٢.

(٤) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٦٧١ / بە ژمارە: ١٧٩٨، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٧١١ / بە ژمارە: ١٠٢٧.

- له حەدیسێکی تریشدا فەرموویەتی: «اثْبُتْ أُحُدُ، فَإِنَّمَا عَلَيْكَ نَبِيٌّ وَصِدِّيْقٌ وَشَهِيْدَانِ». واتە: "(أُحُد) جێگیربەو مەجوڵێ، چونکە تەنها پێغەمبەرێك‌و، (صِدِّيْق)ێك‌و، دوو شەهیدت لەسەرە".[2]
- هەروەها پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، فەرموویەتی: «کە چوومە بەهەشتەوە، باڵەخانەیەکم بینی. پرسیم: ئەوە هی کێیە؟ وتیان: هی (عُمَر)ە. جا منیش ویستم بچمە ناویەوە، غیرەتی تۆم بیرکەوتەوە ئەی (عُمَر)». ئیمامی (عُمَر)یش فەرمووی: باوك‌و دایکم بەقوربانت بێت، ئەی پێغەمبەری خوا، بۆچی غیرەت بەرامبەر بە جەنابیشت دەمگرێت؟![3]
- له حەدیسێکی تریشدا پێی فەرموە: «مَا لَقِيَكَ الشَّيْطَانُ سَالِكاً فَجّاً، إِلَّا سَلَكَ فَجّاً غَيْرَ فَجِّكَ». واتە: "ئەی (عُمَر)، شەیتان تۆ ببینێت بە هەر ڕێگەیەکدا بڕۆیت، دەچێتە سەر ڕێگەیەکی تر بێجگە لە ڕێگەکەی تۆ".[4]
- له حەدیسێکی تریشدا سەبارەت بە ئیمامی (عُثْمان) فەرموویەتی: «افْتَحْ لِعُثْمانَ وَبَشِّرْهُ بالجَنَّةِ». واتە: "بیکەرەوە بۆ (عُثْمان)و، مژدەی بەهەشتیشی بدەری".[5]
- له حەدیسێکی تریشدا بە ئیمامی (عَلِيّ) فەرموە: «أَنْتَ مِنِّي، وَأَنَا مِنْكَ». واتە: "تۆ لە منی‌و، منیش لە تۆم".[1]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٣٤٣ / بە ژمارە: ٣٤٧١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٨٦٨ / بە ژمارە: ٢٤٠٣.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٣٤٤ / بە ژمارە: ٣٤٧٢.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٣٤٦ / بە ژمارە: ٣٤٧٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٨٦٣ / بە ژمارە: ٢٣٩٥.

(٤) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٣٤٧ / بە ژمارە: ٣٤٨٠، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٨٦٣ / بە ژمارە: ٢٣٩٦.

(٥) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٣٤٣ / بە ژمارە: ٣٤٧١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٨٦٨ / بە ژمارە: ٢٤٠٣.

- لە حەدیسێکی تریشدا بە ئیمامی (عَلِيّ) فەرموە: «أَمَا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ مِنِّي بِمَنْزِلَةِ هَارُونَ مِنْ مُوسَى؟». واتە: "ئایا ڕازی نابیت، کە جێگەو پێگەی تۆ نیسبەت بە من، وەکو جێگەو پێگەی (هَارُون) وابێت نیسبەت بە حەزرەتی (مُوسَى)؟".[2]
- لە حەدیسێکی تریشدا بە (بِلال)ی فەرموە: «سَمِعْتُ دَفَّ نَعْلَيْكَ فِي الْجَنَّةِ». واتە: "گوێم لە تەپەو خشەی نەعلەکانت بوو لە بەهەشتدا".[3]
- لە حەدیسێکی تریشدا بە (أُبَيّ)ی کوڕی (كَعْب)ی فەرموە: «لِيَهْنَأْكَ (لِيَهْنِكَ) الْعِلْمُ أَبَا الْمُنْذِرِ». واتە: "یاخوا زانست بە ئاسانی بێتە بەردەستت، ئەی (أَبُو الْمُنْذِر)".[4]
- لە حەدیسێکی تریشدا بە (عَبْدُالله)ی کوڕی (سَلام)ی فەرموە: «أَنْتَ عَلَى الْإِسْلامِ حَتَّى تَمُوْتَ». واتە: "تۆ لەسەر ئیسلام دەمێنیتەوە، هەتاکو دەمریت".[5]
- لە حەدیسێکی تریشدا بە هاوەڵە (أَنْصَارِيّ)ـەکەی فەرموە: «ضَحِكَ اللهُ –عَزَّ وَجَلَّ– أَوْ عَجِبَ مِنْ فِعَالِكُمَا». واتە: "خوای گەورە پێی خۆش بوو، وە

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٩٦٠ / بە ژمارە: ٢٥٥٢.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٣٥٩ / بە ژمارە: ٣٥٠٣، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٨٧٠ / بە ژمارە: ٢٤٠٤.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٣٨٦ / بە ژمارە: ١٠٩٨، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٩١٠ / بە ژمارە: ٢٤٥٨.

(٤) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥٥٦ / بە ژمارە: ٨١٠.

(٥) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٣٨٧ / بە ژمارە: ٣٦٠٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٩٣٠ / بە ژمارە: ٢٤٨٤.

ڕازی بــوو لـــه کــردەوەو مامەڵـــەی خــۆتو ژنەکـــەت بەرامبـــەر بـــە میوانەکەتان".[1]

- لـه حەدیسێکی تریشدا بە هاوەڵە (أنْصَارِيّ)ـــەکانی فـەرموە: «أَنْتُمْ مِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ». واتە: "ئێوە لـه خۆشەویستترینی خەڵکن بەلای منەوە".[2]
- لـه حەدیسێکی تریشدا بە (أشجّ)ی (عَبْــدِ الْقَــيْس)ی فـەرموە: «إِنَّ فِيْــكَ خَصْلَتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللهُ وَرَسُولُهُ: الْحِلْمَ وَالْأَنَاةَ». واتە: "تۆ دوو سیفەتت تێدایـە، خواو پێغەمبەرەکەی خۆشیان دەوێن: ئارام گرتنو لـەسەرخۆیی".[3]

جا هەموو ئەم حەدیسانەی کـە ئامـاژەم پێـدان مەشـهورنو لــە صــەحیحەکانی بوخاریو موسلیمدا هاتوون، بۆیە نەمدانە پـاڵ سەرچـاوەکانیان. هــەروەها زۆرێـك حەدیسی تری هاووێنەی ئەمانە سەبارەت بە وەسف کردنی ڕووبەڕووی پێغەمبــەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) هاتوون.

سەبارەت بە وەسف کردنی هاوەڵانو شوێنکەوتوانو، ئەوانەی دواتـریش لــەو زاناو پێشەوا پایەبەرزانەی کە کراون بە پێشەنگ (خوا لە هەموویان ڕازی بێـت)، ئەو زۆر لـەوە زیاترە کە بژمێردرێتو سنووری بۆ دابنرێت. خواش لـە هەموو کەس زانا ترە.

پێشەوای پایەبەرز (أَبُو حَامِد)ی (غَزَالِيّ) لـە کۆتـایی (كِتَابُ الزَّكَـــاة)ی کتێبـی (إِحْيَاء)دا فەرموویەتی: ئەگەر کەسێك خەیرو صەدەقەیەکی کرد، باشـتر وایـە ئـەو کەسەی کە لێی وەردەگرێت تەماشا بکات: ئەگەر خەیرکەرەکە لـەو کەسانە بـوو، کە پێی خۆشبوو سوپاسو ستایشی بکرێت لـەسەر ئەو خەیرەی کردوویەتیو، پێشی

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٣٨٢ / بە ژمارە: ٣٥٨٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٢٤ / بە ژمارە: ٢٠٥٤.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٣٧٩ / بە ژمارە: ٣٥٧٤، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٩٤٨ / بە ژمارە: ٢٥٠٨.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤٨ / بە ژمارە: ١٧.

خۆش بوو کارەکەی بەناو خەڵکیدا بلاّو ببێتەوە، ئەوا باشتر وایە کەسە وەرگرەکە خەیرەکە بشارێتەوە. چونکە دانەوەی مافی کەسە خەیرکەرەکە لەلایەن کەسە خەیروەرگرەکەوە بەوە دەبێت، کە لەسەر ستەم کردن پاڵپشتی نەکات. جا حەزکردنی کەسە خەیرکەرەکە بەوەی کە سوپاسی بکرێت، جۆرێکە لە جۆرەکانی ستەم کردن.

خۆ ئەگەر بە حاڵو هەڵسوکەوتیدا دەیزانی کە حەز بە سوپاس کردن ناکاتو، مەبەستیشی نیە، ئەوا باشتر وەهایە سوپاسی بکاتو، خەیرکردنەکەشی ئاشکرا بکات.

پێشەوای پایەبەرز (سُفْيَان)ی (ثَـوْرِيّ) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ئەو کەسەی خۆی دەناسێت، وەسفو سەنای خەڵکی زیانی پێ ناگەیەنێت.

پێشەوای پایەبەرز (أَبُـو حَامِـد)ی (غَزَالِـيّ) دوای ئەو فەرمایشتەی پێشوو فەرموویەتی: پێویستە ئەو کەسەی چاودێری دڵی خۆی دەکات وردەکاری ئەم مانایانە لەبەرچاو بگرێت. چونکە کاری ئەندامەکانی لاشە لەگەڵ فەرامۆش کردنی ئەم وردەکاریانە مایەی پێکەنینی شەیتانە، چونکە ئەم جۆرە کارە ماندووبوونی زۆری تێدایەو، سوودیشی کەمە. جا هاووێنەی ئەم زانستەیە کە لەبارەیەوە دەوترێت: "مەسئەلەیەکی لێ بزانیت، لە بەندایەتی ساڵێك باشترە". چونکە بەهۆی ئەم زانستەوە بەندایەتی بەردەوام دەبێتو، بە ئاگا لێ نەبوونیشی بەندایەتی نامێنێتو پەکی دەکەوێت. تەوفیقیش تەنها بەدەستی خوایە.

## ئایا درووسته کەسێك وەسفی خۆی بکات‌و، باسی چاکەکانی بکات؟

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَلا تُزَكُّوا أَنْفُسَكُمْ﴾ [النجم: ٣٢] واتـە: {وەسـفو سەنای خۆتان مەکەن}.

بزانە کە باسکردنی چاکەکانی خۆی دوو جۆرە: خراپ‌و باش.

- خراپەکـە ئەوەیـە کـە کەسـەکە بـۆ شـانازی کـردن‌و خۆهەڵکێشـان‌و خۆجیاکردنەوە لـە هاوڕێ‌و ڕەفیقـەکانی، یـان بـۆ شـتی لـەو جـۆرە باسـی چاکەکانی خۆی بکات.
- باشەکەش ئەوەیە کە بەرژەوەندیەکی ئـاینی تێـدا بێـت. وەکـو ئـەوەی کـە فەرمان بە چاکە بکـات، یـان نـەهی لـە خراپـە بکـات، یـان نەصـیحەت‌و دڵسۆزی بنوێنێت، یان ئاماژە بە بەرژەوەندیەك بکات، یان مامۆستا بێت، یان پەروەردەکەر بێت، یـان ئامۆژگاریکـەر بێـت، یـان بیرهێنـەرەوە بێـت، یـان یەکخەرەوەو چاککەرەوەی پەیوەندی نێوان دوو کەس بێت، یان خراپەیـەك لەکۆڵی خۆی بکاتەوە، یان شتی لەو جۆرە. جا ئەم کەسـە دروسـتە باسـی چاکەکانی خۆی بکات‌و، لە باسکردنەکەشدا نیـەتی ئـەوە بێـت، کـە ئـەو باسکردنە وا دەکات زیاتر قسەی لێ وەربگیرێـت‌و، ئـەوەی باسـی دەکـات پشتی پێ ببەسترێت، یان بڵێت: ئەو قسەی من بۆتان دەکەم، لای کەسـێکی تر دەستتان ناکەوێت، بۆیە لەبەری بکەن، یان شتێکی لەو جۆرە.

جا سەبارەت بەم جۆرە باسکردنەش ئەوەندە دەق‌و فەرمایشت هـاتون، کـە لـە ژمارە نایەن. وەکو ئەم فەرمایشتانەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت):

- «أَنَا النَّبِيُّ لا كَذِبْ». واتە: "من پێغەمبەرم‌و درۆشی تێدا نیە".[1]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٠٥١ / بە ژمارە: ٢٧٠٩، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٤٠٠ / بە ژمارە: ١٧٧٦.

- «أَنَا سَيِّدُ وَلَد آدَمَ». واته: "من سەردارو گەورەی ڕۆڵەی ئادەمم".[1]
- «أَنَا أَوَّلُ مَنْ تَنْشَقُّ عَنْهُ الْأَرْضُ». واته: "من یەکەم کەسم، کە زەویم بۆ دەکرێتەوەو، لە گۆڕ دێمە دەرەوە".[2]
- «أَنَا أَعْلَمُكُمْ بِاللَّهِ وأَتْقاكُمْ». واته: "من لە ئێوە خواناسترو لەخواترسترم".[3]
- «إِنِّيْ أَبِيْتُ عِنْدَ رَبِّـيْ». واته: "من لە خزمەتی پەروەردگارمدام شەو دەکەمەوە".[4]

هەروەها هاوشێوەی ئەم حەدیسانە زۆر زۆرن.

- حەزرەتی (يُوْسُف)یش (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: ﴿اجْعَلْنِي عَلَى خَزَائِنِ الْأَرْضِ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ﴾ [يُوسُف: ٥٥] واته: {حەزرەتی (يُوْسُف) بە فەرمانڕەوای میصری فەرموو: بمخەرە سەر گەنجینەی وڵاتی میصر، چونکە من کەسێکی سپاردە پارێزو زاناو لێزانم}.
- حەزرەتی (شُعَيْب)یش (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: ﴿سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّالِحِينَ﴾ [القَصَص: ٢٧] واته: {ئەگەر خوا بیەوێت دەمبینیت، کە کەسێکی ڕاسالو چاکەکارم}.
- ئیمامی (عُثْمَان)یش (خوای لێ ڕازی بێت) کاتێك گەمارۆ درا، ئەوە فەرمایشتەی فەرموو، کە لە صەحیحی بوخاریدا بۆمان ڕیوایەت کراوەو، فەرموویەتی: گوایە ئێوە نازانن، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ جَهَّزَ جَيْشَ الْعُسْرَةِ، فَلَهُ الْجَنَّةُ؟». واته: (کێ پێداویستیەکانی سوپای (عُسْرَة) دابین دەکات، بەهەشت بۆ ئەو؟). جا من دابینم کرد. گوایە ئێوە

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧٨٢ / بە ژمارە: ٢٢٧٨.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٨٥٠ / بە ژمارە: ٢٢٨١.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ١٦ / بە ژمارە: ٢٠.

(٤) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٦٩٣ / بە ژمارە: ١٨٦٠، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٧٧٤ / بە ژمارە: ١١٠٣.

نازانن، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ حَفَرَ بِئْرَ رُوْمَةَ، فَلَهُ الْجَنَّةُ؟». واتە: (کێ بیری (رُوْمَة) هەڵدەکەنێت، بەهەشت بۆ ئەو؟). جا من هەڵمکەند. ئیتر ئەوانەی گەمارۆیان دابوو وتیان: ڕاست دەکەیتو، بڕوایان بە فەرمایشتەکانی کرد.[1]

- بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَعْد)ی کوڕی (أَبُو وَقَّاص)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: کاتێك خەڵکی کوفە شکاتیان لێکردم لای ئیمامی (عُمَر)ی کوری (خَطَّاب)و، وتیان: (نوێژ باش ناکات!). (سَعْد)یش فەرمووی: (سوێند بەخوا، من یەکەم پیاوی عەرەبم، کە تیری لەڕێگەی خوادا هاویشتبێت. ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (دروودی خوای لەسەر بێت) غەزامان دەکرد......) ئیتر تەواوی حەدیسەکەی باس کرد.[2]
- بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە ئیمامی (عَلِيّ)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: سوێند بەو کەسەی تۆوی تەقاندوەو، نەفسیشی دروست کردوە، ئەوە پەیمانو فەرمایشتی دوپاتکراوەی پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەر بێت) بۆ من، کە تەنها کەسی ئیماندار خۆشی دەوێمو، تەنها کەسی دووڕووش ڕقی لێمە.[3]
- بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە (أَبُو وَائِل)ەوە، کە فەرموویەتی: هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد) (خوای لێ ڕازی بێت) وتاری بۆداینو، فەرمووی: سوێند بەخوا، حەفتاو ئەوەندە سورەتی قورئانی پیرۆزم لە دەمی پیرۆزی پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت) وەرگرتوەو، هاوەڵانی پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) دەیانزانی،

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٠٢١ / بە ژمارە: ٢٦٢٦.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٣٦٤ / بە ژمارە: ٣٥٢٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٢٧٧ / بە ژمارە: ٢٩٦٦.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٨٦ / بە ژمارە: ٧٨.

که من یەکێکم لە زاناترینیان بە کتێبەکەی خوای گەورە. بەڵام من باشترینیان نیم. خۆ ئەگەر بزانم کەسێك لە من زاناتر هەبێت، ئەوا دەچووم بۆلای.[1]

- بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پرسیاری لێ کراوە دەربارەی حوشتر، ئەگەر پەکی بکەوێت و بوەستێت. ئەویش فەرموویەتی: کەوتویت بەسەر کەسی شارەزادا -مەبەستی خۆی بوە-..... ئیتر تەواوی حەدیسەکەی باس کرد.[2]

هەروەها هاووێنەی ئەمانە ئەوەندە زۆرن، لەژمارە نایەن و، هەمووشیان بەو جۆرە لێکدەدرێنەوە کە باسمان کرد. تەوفیقیش تەنها بە دەستی خوایە.

## باسێك سەبارەت بە چەند مەسەلەیەك کە پەیوەندیان بەو باسانەی پێشووەوە هەیە

## مەسەلەیەك: {سەبارەت بە وەڵامدانەوەی ئەو کەسەی بانگی کردوویت، بە (لَبَّیْكَ وَسَعْدَیْكَ)}

ئەگەر کەسێك بانگی کردیت، سونەتە وەڵامی بدەیتەوەو، بڵێیت: (لَبَّیْكَ وَسَعْدَیْكَ)، یان (لَبَّیْكَ) بەتەنها.

ئەگەر کەسێکیش هات بۆلات، سونەتە پێی بڵێیت: (مَرْحَباً).

---

(١) بڕوانە: صَحِیْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٩١٢ / بە ژمارە: ٤٧١٤، وصَحِیْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٩١٢ / بە ژمارە: ٢٤٦٢.

(٢) بڕوانە: صَحِیْحُ مُسْلِم / ٢ / ٩٦٢ / بە ژمارە: ١٣٢٥.

ئەگەر کەسێکیش چاکەیەکی بەرامبەرت کرد، یان کارێکی جوانت لێ بینی، سونەتە پێی بڵێیت: خوا بتپارێزێت (حَفِظَكَ اللهُ)، یان خوا پاداشتی چاکت بداتەوە (جَزَاكَ اللهُ خَيْراً)، یان هەر قسەیەکی تری هاوشێوە.

جا بەڵگەکانی ئەمانە لە حەدیسی (صَحِيْح)دا زۆرو مەشهوورن.

## مەسەلەیەك: {حوکمی ئەوەی، کە خۆت یان کەسێکت بکەیت بە قوربانی کەسێکی تر}

هیچ خراپەیەکی تێدا نیە کە کەسێك بە پیاوێکی پایەبەرز -بە زانستەکەی یان چاکەکاریو دینداریەکەی، یان بە شتێکی تری لەو شێوە- بڵێت: خوا بمکات بە قوربانت (جَعَلَنِي اللهُ فِدَاكَ)، یان باوكو دایکم بن بە قوربانت (فِدَاكَ أَبِيْ وَأُمِّيْ)، یان قسەیەکی تری لەو شێوە.

جا بەڵگەکانی ئەمانەش لە حەدیسی (صَحِيْح)دا زۆرو مەشهوورن، منیش لەبەر درێژنەبوونەوەی کتێبەکە نەمهێنانو لامبردن.[1]

---

(١) یەکێك لەوانە بریتیە لەو حەدیسە صەحیحەی کە ئیمامی بوخاریو موسلیم ریوایەتیان کردوە، لە رێگەی ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوای لێ رازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) لە رۆژی غەزای (أُحُد)دا بە هاوەڵی خۆشەویست (سَعْد)ی کوڕی (أَبِيْ وَقَّاص)ی (خوای لێ رازی بێت) فەرموە: (فِدَاكَ أَبِيْ وَأُمِّيْ). بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٨٧ / بە ژمارە: ٥٨٣٠، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٨٧٦ / بە ژمارە: ٢٤١١.

## مەسەلەیەك: {ئادابەكانی قسە كردنی ئافرەت لەگەڵ كەسانی نامەحرەمدا}

ئەگەر ئافرەتێك پێویستی بەوە هەبوو لـەگەڵ كەسانی نامەحرەمـدا قسـە بكـات، ئیتر بۆ فرۆشتن یان بۆ كڕین، یان بۆ ئەو حاڵەتانەی تر كە دروسـتە تێیانـدا ئـافرەت لـەگەڵ نامەحرەمدا قسە بكات، ئەوا دەبێت دەنگـی خـۆی نێـرو گـەورە بكـاتو، ناسكی نەكاتەوە، نەوەكو تەماعی تێ بكرێت.

پێشەوای پایەبەرز (أَبُو الْحَسَن)ی (وَاحِدِيّ) -كە یەكێكـە لـە هاوەڵانمـان- لــە كتێبی (الْبَسِيْط)دا فەرموویەتی: هاوەڵانمان فەرموویانە: ئەگەر ئافرەت قسەی لەگەڵ بێگانەدا كرد، سونەتە دەنگی خۆی نێر بكات. چونكە ئەو كارە دورتری دەخاتـەوە لەوەی تەماعی تێ بكرێت. بە هەمان شێوە ئەگەر قسەی لەگەڵ كەسێكدا كرد، كە بەهۆی ژنخوازیەوە بووبوو بە مەحرەمی. ئایا تۆ نابینیت كە خـوای گـەورە وەسـێتی لەم جۆرەی بۆ دایكانی ئیمانداران كردوە، لەگەڵ ئەوەشدا كە ئەوان بۆ هەتا هەتایە لە ئیمانداران حەرامن. وەكو فەرموویەتی: ﴿يَا نِسَاءَ النَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِنَ النِّسَاءِ إِنِ اتَّقَيْتُنَّ فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ﴾ [الـأحزاب: ٣٢] واتـە: {ئـەی خێزانەكانی پێغەمبەر، ئێوە وەكو هیچ ژنێكی تر وەها نـین، ئەگـەر لـەخوا بترسـنو خۆتـان بپـارێزن، بۆیـە لـەكاتی قسـە كردنتـان لـەگـەڵ بێگانـەدا دەنگتـان ناسـك مەكەنەوە، تا ئەو كەسەی دڵی نەخۆشی تێدایە تەماعتان تێ نەكات}.

منیش دەڵێم: هاوەڵانیشمان هەر بەو جۆرەیان فەرموە، كـە شـێخی (وَاحِـدِيّ) فەرموویەتی، دەبێت ئافرەت لەو حاڵەتەدا دەنگی خۆی نێر بكات.

شێخ (إِبْراهِيْم)ی (مَرْوَزِيّ) -كە یەكێكە لە هاوەڵانمان- فەرموویـەتی: ڕێگـەی نێركردنی دەنگی ئافرەت ئەوەیە، كە پشـتی دەسـتی بلكێنێـت بـە دەمیـەوەو، بـەو جۆرە وەڵام بداتەوە. خواش لە هەموو كەس زانا ترە.

ئەوەش کە شێخی (وَاحِدِيّ) باسی کـردوە، کـە گوایـە ئـەو کەسـەی بـەهۆی ژنخوازیـەوە بـوە بـە مـەحرەم، هـەر وەکـو بێگانـە وەهایـە لـەم مەسـەلەدا، ئـەوە بۆچـوونێکی لاوازەو، پێچـەوانەی ئـەو بۆچـوونەیە، کـە بـەلای هاوەڵانمانـەوە مەشهوورە. چونکە ئەو کەسە هەر وەکو ئەو کەسە وەهایە کە بەهۆی خزمایەتیـەوە مەحرەمە، لـە دروستی تەماشا کردنو، بەتەنها لـەگەڵدا دانیشتن.

سەبارەت بە دایکانی ئیمانـدارانیش، ئـەوان دایکـن لـەوەدا کـە حەرامـە مـارە بکرێنو، پێویستە ڕێزیان لێ بگیرێتو، هەر بۆیە حەڵاڵە کچـەکانیان مـارە بکـرێن. خواش لـە هەموو کەس زانا ترە.

* * * * *      * * * * *      * * * * *

## باسی ئەوەی ئەو کەسە دەیلێت، کە خوازبێنی ئافرەتێك دەکات لە کەس‌وکارەکەی، بۆ خۆی، یان بۆ کەسێکی تر

سونەتە کەسی خوازبێنیکار بە سوپاس‌و ستایشی خوای گەورەو، بە صەلاّوات لەسەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) دەست پێ بکاتو، بڵێت: شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە خوای گەورە، کە تەنهایەو شەریکی نیەو، شایەتیش دەدەم کە (مُحَمَّد) بەندەو پێغەمبەری ئەوە. ئەوجا بڵێت: هاتوومەتە خزمەتتان بۆ خوازبێنی فلاّنە کچتان، یان بۆ ئافرەتە بەڕێزەکەتان فلاّنی کچی فلاّن، یان شتێکی لەو جۆرە.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «كُلُّ كَلامٍ»، لە هەندێك لە ڕیوایەتەکاندا فەرموویەتی: «كُلُّ أَمْرٍ لا يُبْدَأُ فِيْهِ بِالْحَمْدِ لِلَّهِ، فَهُوَ أَجْذَمُ». هەروەها بە (أَقْطَعُ)یش ڕیوایەت کراوەو، هەردووکیشیان بە یەك مانان. واتە: "هەر وتەیەك، یان هەر کارێك بە سوپاس‌و ستایشی خوای گەورە دەستی پێ نەکرێت، ئەوە بێفەڕو کەم بەرەکەت دەبێت".[1]

ئەم حەدیسە حەدیسێکی (حَسَن)ە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «كُلُّ خُطْبَةٍ لَيْسَ فِيْهَا تَشَهُّدٌ، فَهِيَ كَالْيَدِ الْجَذْمَاءِ». واتە: هەر وتارێك شایەتومانی تێدا نەبێت، وەکو دەستی بڕاو، یان دەستی گول وەهایە.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٧٧ / بە ژمارە: ٤٨٤٠، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٦١٠ / بە ژمارە: ١٨٩٤.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

## درووستە پیاو باسی کچی خۆی یان باسی ئەو ئافرەتەی بەشوودانی بەدەستی ئەوە بکات بۆ کەسانی بەڕێزو چاکەکار، تا ماری بکەن

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، کە کاتێك مێردەکەی (حَفْصَة)ی کچی ئیمامی ئیمامی (عُمَر)ی کوری (خَطَّاب) (خوایان لێ ڕازی بێت) کۆچی دوایی کرد، ئیمامی (عُمَر) فەرمووی: بە ئیمامی (عُثْمَان) گەیشتمو، باسی (حَفْصَة)م بۆ کردو، وتم: ئەگەر دەتەوێت، (حَفْصَة)ی کچی (عُمَر)ت لێ مارە دەکەم. ئەویش فەرمووی: "با سەیرێکی کاروباری خۆم بکەم". منیش چەند شەوێك چاوەڕێم کردو، پاشان گەیشتەوە پێمو، فەرمووی: "وام بەلاوە پەسەندە کە لەم کاتەدا ژن نەهێنم". ئیمامی (عُمَر) دەفەرموێت: ئەوجا بە ئیمامی (أَبو بَكْر) گەیشتمو، وتم: ئەگەر دەتەوێت، (حَفْصَة)ی کچی (عُمَر)ت لێ مارە دەکەم. ئیمامی (أَبو بَكْر)یش بێدەنگ بوو.... ئیتر تەواوی حەدیسەکەی باس کرد.[2]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٧٧ / بە ژمارە: ٤٨٤١، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٣ / ٤١٤ / بە ژمارە: ١١٠٦.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٤٧١ / بە ژمارە: ٣٧٨٣.

## باسی ئەوەی ئەو کەسە دەیلێت، کە خوازبێنی ئافرەتێك دەکات لە کەس‌وکارەکەی، بۆ خۆی، یان بۆ کەسێکی تر

سونەتە کەسی خوازبێنیکار بە سوپاس‌و ستایشی خوای گەورەو، بە صەڵاوات لەسەر پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) دەست پێ بکات‌و، بڵێت: شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە خوای گەورە، کە تەنهایەو شەریکی نیەو، شایەتیش دەدەم کە (مُحَمَّد) بەندەو پێغەمبەری ئەوە. ئەوجا بڵێت: هاتوومەتە خزمەتتان بۆ خوازبێنی فلانە کچتان، یان بۆ ئافرەتە بەڕێزەکەتان فلانی کچی فلان، یان شتێکی لەو جۆرە.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «كُلُّ كَلامٍ»، لە هەندێك لە ڕیوایەتەکاندا فەرموویەتی: «كُلُّ أمْرٍ لا يُبْدأُ فِيْهِ بِالْحَمْدِ لِلَّهِ، فَهُوَ أَجْذَمُ». هەروەها بە (أَقْطَعُ)یش ڕیوایەت کراوەو، هەردووکیشیان بە یەك مانان. واتە: "هەر وتەیەك، یان هەر کارێك بە سوپاس‌و ستایشی خوای گەورە دەستی پێ نەکرێت، ئەوە بێفەڕو کەم بەرەکەت دەبێت".[1]

ئەم حەدیسە حەدیسێکی (حَسَن)ـە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «كُلُّ خُطْبَةٍ لَيْسَ فِيْهَا تَشَهُّدٌ، فَهِيَ كَالْيَدِ الْجَذْمَاءِ». واتە: هەر وتارێك شایەتومانی تێدا نەبێت، وەکو دەستی بڕاو، یان دەستی گوڵ وەهایە.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٧٧ / بە ژمارە: ٤٨٤٠، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٦١٠ / بە ژمارە: ١٨٩٤.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

## درووستە پیاو باسی کچی خۆی یان باسی ئەو ئافرەتەی بەشوودانی بەدەستی ئەوە بکات بۆ کەسانی بەڕێزو چاکەکار، تا ماری بکەن

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، کە کاتێك مێردەکەی (حَفْصَة)ی کچی ئیمامی ئیمامی (عُمَر)ی کوری (خَطَّاب) (خوایان لێ ڕازی بێت) کۆچی دوایی کرد، ئیمامی (عُمَر) فەرمووی: بە ئیمامی (عُثْمَان) گەیشتمو، باسی (حَفْصَة)م بۆ کردو، وتم: ئەگەر دەتەوێت، (حَفْصَة)ی کچی (عُمَر)ت لێ مارە دەکەم. ئەویش فەرمووی: "با سەیرێکی کاروباری خۆم بکەم". منیش چەند شەوێك چاوەڕێم کردو، پاشان گەیشتەوە پێمو، فەرمووی: "وام بەلاوە پەسەندە کە لەم کاتەدا ژن نەهێنم". ئیمامی (عُمَر) دەفەرموێت: ئەوجا بە ئیمامی (أبو بَكْر) گەیشتمو، وتم: ئەگەر دەتەوێت، (حَفْصَة)ی کچی (عُمَر)ت لێ مارە دەکەم. ئیمامی (أبو بَكْر)یش بێدەنگ بوو.... ئیتر تەواوی حەدیسەکەی باس کرد.[2]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٧٧ / بە ژمارە: ٤٨٤١، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٣ / ٤١٤ / بە ژمارە: ١١٠٦.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٤٧١ / بە ژمارە: ٣٧٨٣.

## ئەوەی لەکاتی گرێبەستی هاوسەرگیریدا دەوترێت

سونەتە بەر لە بەستنی گرێبەستەکە وتارێك بدات، کە داگرەوە بێت بەسەر ئەوانەی لە باسەکەی پێشووتردا باسمان کردن‌و، با لە وتارەکەی ئەویش درێژتر بێت، ئیتر ئایا ئەو کەسە وتارەکە بدات کە گرێبەستەکە ئەنجام دەدات، یان کەسێکی تر.

باشترین وتاریش بریتیە لەو وتارەی کە بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)و لە غەیری ئەوانیشدا، بە چەند ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّـه)ی کوڕی (مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، وتاری پێویستی (خُطْبَةُ الْحَاجَة)ی فێرکردین: «الْحَمْدُ لِلَّهِ، نَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسنا، مَنْ يَهْدِ اللهُ، فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ، فَلا هَادِيَ لَهُ، وأشْهَدُ أنْ لا إلهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ، وَأشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ. (يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً) [النِّسَاء: ١]، (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلا تَمُوتُنَّ إلاَّ وَأَنْتُمْ مُسْلِمُون) [آل عِمْرَان: ١٠٢]، (يَا أَيُّهَا الَّذِيْنَ آمَنُوا اتَّقُوا اللهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيْداً * يُصْلِحْ لَكُمْ أعْمالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزَاً عَظِيماً) [الأَحْزَاب: ٧١] .[1]

ئەمە دەقی یەکێك لە ڕیوایەتەکانی ئیمامی (أَبو دَاوُد)ەو، لە ڕیوایەتێکی تری ئەودا لەدوای (وَرَسُوْلُهُ) ئەمەش هاتوە: «أَرْسَلَهُ بِالْحَقِّ بَشِيْراً وَنَذِيْراً بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ، مَنْ يُطِعِ اللهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ رَشَدَ، وَمَنْ يَعْصِهِمَا فَإِنَّهُ لا يَضُرُّ إلاَّ نَفْسَهُ، وَلا يَضُرُّ

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٦٤٤ / بە ژمارە: ٢١١٨، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٣ / ٤١٣ / بە ژمارە: ١١٠٥، وسُنَنُ النَّسَائِيّ / ٣ / ١٠٤ / بە ژمارە: ١٤٠٤، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٦٠٩ / بە ژمارە: ١٨٩٢.

اللهَ شَيْئاً».[1] واته: "خوای گەورە پێغەمبەری ڕەوانە کردوە بە ئاینێکی ڕاست، وەکو مژدەدەرو، ترسێنەر، بەر لە هاتنی ڕۆژی قیامەت. ئەو کەسەی گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، ڕێگەی ڕاستی گرتوەو، ئەو کەسەش بێگوێیان بکاو یاخی بێت لە فەرمانیان، تەنها زیان لەخۆی دەدات‌و، هیچ زیانێك بەخوای گەورە نادات".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.

هاوەڵانمان فەرموویانە: سونەتە لەگەڵ ئەمەدا (سەرپەرشتیاری ئافرەتەکە) بڵێت: "لێت مارە دەکەم لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە فەرمانی پێکردوە، یان بەچاکی دەستی پێوە بگریت، یان بەجوانی ڕێگەی بۆ چۆڵ بکەیت".

کەمترینی ئەم وتارەش برتیە لە (الْحَمْدُ لِلَّهِ، وَالصَّلاةُ عَلَى رَسُوْلِ اللهِ –صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ–، أُوْصِيْ بِتَقْوَى اللهِ). خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

بشزانە کە ئەم وتارە سونەتەو، زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی، کە ئەگەر هیچیشی لێ نەهێنێت، مارەبڕینەکە هەر دروستە. حیکایەت کراوە لە زانای پایەبەرز (دَاوُد)ی (ظَاهِرِيّ)ـەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر ئەو وتارە نەدرێت مارەبڕینەکە دروست نیە. بەڵام زانا لێکۆڵەرەکان ئەم ناکۆکیەی (دَاوُد) بە ناکۆکیەکی موعتەبەر دانانێن‌و، کۆدەنگی زانایانیش بە بۆچوونە پێچەوانەکەی ئەو هەڵناوەشێتەوە. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

سەبارەت بە مێردەکەش، مەزهەبی هەڵبژێردراو لەسەر ئەوەیە، کە هیچ وتارێك نادات. بەڵکو ئەگەر سەرپەرشتیارەکە پێی وت: "زَوَّجْتُكَ فُلانَةَ"، ئەویش بەدوایدا بڵێت: "قَبِلْتُ تَزْوِيْجَهَا". ئەگەر ویستیشی با بڵێت: "قَبِلْتُ نِكَاحَهَا". خۆ ئەگەر وتی: "الْحَمْدُ لِلَّهِ، وَالصَّلاةُ عَلَى رَسُوْلِ اللهِ –صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ–، قَبِلْتُ" ئەوا

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٣٥٥ / بە ژمارە: ١٠٩٧.

مارەکردنەکە هەر دروستەو، ئەم قسەیەش لە نێوان (إِيْجَاب)و (قَبُوْل)ــەکەدا هیچ زیانێکی نیە. چونکە کەمەو، پەیوەندیشی بە گرێبەستەکەوە هەیە. هەندێکیش لە هاوەڵانمان فەرموویانە: مارەکردنەکەی پێ بەتاڵ دەبێتەوەو، هەندێکیش فەرموویانە: پێی بەتاڵ نابێتەوە، بەڵکو سونەتە ئەوەش بڵێت. بەڵام بۆچوونی ڕاست ئەوەیە کە پێشتر وتمان، پێویست نیە ئەوە بڵێت. خۆ ئەگەر سەرپێچی کردو، وتی، ئەوە مارەکردنەکەی پێ بەتاڵ نابێتەوە. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## ئەوەی لەدوای گرێبەستی هاوسەرگیریەکە بە مێردەکە دەوترێت

سونەتە بە مێردەکە بوترێت: "بَارَكَ اللهُ لَكَ" یان "بَارَكَ اللهُ عَلَيْكَ، وَجَمَعَ بَيْنَكُمَا فِيْ خَيْرٍ". واتە: (خوای گەورە کارەکەت بەرەکەتدار بکات) یان (خوای گەورە بەرەکەت داباریێنێت بەسەرتداو، بە خەیریش بتانگەیەنێتە یەکتر).

سونەتیشە بە هەریەکە لە ژنو مێردەکە بوترێت: "بَارَكَ اللهُ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْكُمَا فِيْ صَاحِبِهِ، وَجَمَعَ بَيْنَكُمَا فِيْ خَيْرٍ". واتە: (خوای گەورە بۆ هەریەکەتان بەرەکەت بخاتە ڕەفیقەکەیەوەو، بە خەیریش بتانگەیەنێتە یەکتر).

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ــەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە کاتێك هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالرَّحْمَن)ی کوڕی (عَوْف) هەواڵی ژنهێنانی خۆی بە پێغەمبەری خوا گەیاند، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) پێی فەرموو: «بَارَكَ اللهُ لَكَ».[1]

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٤٦ / بە ژمارە: ٦٠٢٣، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ١٠٤٢ / بە ژمارە: ١٤٢٧.

دیسان لە حەدیسی صەحیحدا بۆمان ڕیوایەت کراوە، کە کاتێك هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر) هەواڵی ژنهێنانی خۆی بە پێغەمبەری خوا گەیاند، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) پێی فەرموو: «بَارَكَ اللهُ لَكَ».[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)و لە غەیری ئەوانیشدا، بە چەند ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەگەر پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، بیویستایە پیرۆزبایی‌و دوعای بەیەك گەیشتن‌و پێکەوەژیان بۆ کەسێك بکات، کە هاوسەرگیری کردبێت، دەیفەرموو: «بَارَكَ اللهُ لَكَ، وَبَارَكَ اللهُ عَلَيْكَ، وَجَمَعَ بَيْنَكُمَا فِيْ خَيْرٍ». واتە: "خوای گەورە بەرەکەت بخاتە کارتەوەو، بەرەکەتیش دابارێنێت بەسەرتداو، بە خەیرو خۆشیش کۆتان بکاتەوەو بەیەکتان بگەیەنێت".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[2]

## باسێك: {حوکمی وتنی (بِالرِّفَاءِ وَالْبَنِيْنَ)}

ئەو کەسەی ژنی هێناوە ناپەسەندە پێی بوترێت: (بِالرِّفَاءِ وَالْبَنِيْنَ). واتە: (بەخۆشی پێکەوە بژین‌و منداڵیشتان ببێت). ئەگەر خوای گەورەش بیەوێت، لە کۆتایی ئەم کتێبەوە لە ((**کتێبی پاراستنی زمان**))دا بەڵگەی ناپەسەندی ئەم وتەیە دەهێنین.[3]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٠٥٣ / بە ژمارە: ٥٠٥٢.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٦٤٧ / بە ژمارە: ٢١٣٠، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٣ / ٤٠٠ / بە ژمارە: ١٠٩١، وسُنَنُ النَّسَائِيِّ الْكُبْرَى / ٦ / ٧٣ / بە ژمارە: ١٠٠٨٩، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٦١٤ / بە ژمارە: ١٩٠٥.

(٣) بەڵام تەقدیری خوا وەهایە، کە لەوێ بەڵگەی ناپەسەندیەکەی نەهێناوەو لەبیری چوە!!!

(رِفَاء)یش واته: بەیەك گەیشتن‌و پێكەوەبوون.

## باسی ئەوەی مێردەكە دەڵێت كاتێك ژنەكەی لە شەوی گواستنەوەیدا دێتە ژوورەوە بۆلای

سونەتە یەكەمجار ناوی خوا بهێنێت‌و، كە یەكەم جاریش بە ژنەكەی دەگات پێشی سەری بگرێت‌و، بڵێت: "خوای گەورە بۆ هەریەكەمان بەرەكەت بخاتە رەفیقەكەیەوە".

هەروەها ئەوەشی لەگەڵدا بڵێت، كە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُـو دَاوُد)و (ابْنُ مَاجَه)و كتێبەكەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)و لە غەیری ئەوانیشدا بۆمان ریوایەت كراوە، بە چەند رِشتەیەكی (صَحِيْح)، لە (عَمْرو)ی كوڕی (شُعَيْب)ـەوە، ئەویش لە باوكیەوەو، ئەویش لە باپیرەیەوە (خوای لێ رازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، كە فەرموویەتی: «إِذَا تَزَوَّجَ أَحَدُكُمْ امْرَأَةً، أَوِ اشْتَرَى خَادِماً

---

جا بەڵگەكەش ئەوەیە، كە (عَقِيْل)ی كوڕی (أَبُو طَالِب) ژنێكی لە شاری بەصرە لە هۆزی (بَنُو جُشَم) مارەكردوە، جا كە گواستوویەتیەوەو، دواتر لەماڵ دەرچوە، خەڵكی پیرۆزباییان لێكردوەو، پێیان وتوە: (بِالرِّفَاءِ وَالْبَنِيْنَ). ئەویش فەرموویەتی: (وا مەڵێن). ئەوانیش عەرزیان كردوە: (ئەی بڵێین چی؟) ئەویش فەرموویەتی: بڵێن: (بَارَكَ اللهُ لَكُمْ، وَبَارَكَ عَلَيْكُمْ)، چونكە ئێمە بەم جۆرە فەرمانمان پێكراوە. لە ریوایەتێكی تردا فەرموویەتی: (وا مەڵێن، بەڵكو ئەوە بڵێن، كە پێغەمبەری خوا دەیفەرموو: اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمْ وَبَارِكْ عَلَيْهِمْ). لە ریوایەتێكی تردا فەرموویەتی: (وا مەڵێن. چونكە پێغەمبەری خوا نەهی كردوە لەوەی كە وا بوترێت، بەڵكو فەرمانی پێ كردووین، كە بڵێین: بَارَكَ اللَّهُ لَكَ وَبَارَكَ عَلَيْكَ). ئەم حەدیسە ئیمامی (أَحْمَد)و (دَارِمِيّ)و (ابْنُ مَاجَة)و (نَسَائِيّ)و (حَاكِم)و (بَيْهَقِيّ)و چەند زانایەكی تریش ریوایەتیان كردوەو، لێكۆڵەرەوەكانی (مُسْنَد)ەكەی ئیمامی (أَحْمَد)یش بە صەحیحیان داناوە. بڕوانە: مُسْنَدُ الْإِمَامِ أَحْمَد / ٣ / ٢٦٠ / بە هەردوو ژمارە: ١٧٣٨ و ١٧٣٩.

فَلْيَقُلِ: "اللَّهُمَّ، إِنِّيْ أَسْأَلُكَ خَيْرَها، وَخَيْرَ مَا جَبَلْتَها عَلَيْهِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا، وَشَرِّ مَا جَبَلْتَها عَلَيْهِ". وَإِذَا اشْتَرَى بَعِيراً، فَلْيَأْخُذْ بِذِرْوَةِ سِنَامِهِ، وَلْيَقُلْ مِثْلَ ذلِكَ».[1] واتە: "ئەگەر یەکێك لە ئێوە ژنێکی هێنا، یان خزمەتکارێکی کڕی، با بڵێت: خوایە، من داوای خەیری ئەم ژنەت لێ دەکەم‌و، داوای خەیری ئەو ڕەوشت‌و سیفەتانەشت لێ دەکەم کە لەگەڵ دروست کردنی ئەم ژنەدا کردووتن بە بەشێك لە طەبیعەتی. پەناشت پێ دەگرم لە خراپەی ئەم ژنەو، خراپەی ئەو ڕەوشت‌و سیفەتانەش کە لەگەڵ دروست کردنی ئەم ژنەدا کردووتن بە بەشێك لە طەبیعەتی. ئەگەر حوشترێکیشی کڕی، با لوتکەی پشتی بگرێت‌و، هەمان شت بڵێت".

لە ڕیوایەتێکیشدا هاتوە: «ثُمَّ لِيَأْخُذْ بِنَاصِيَتِها، وَلْيَدْعُ بِالْبَرَكَةِ فِيْ الْمَرْأَةِ وَالْخَادِمِ».[2] واتە: "ئەوجا با پێشی سەری بگرێت‌و، داوای بەرەکەت بکات بۆ ئافرەت‌و خزمەتکارەکە".

## باسی ئەوەی بە پیاو دەوترێت، دوای ئەوەی خێزانەکەی دەچێتە ژوورەوە بۆلای

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاری‌و لە غەیری ئەویشدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) دایکە (زَيْنَب)ی گواستەوەو، نان‌و گۆشتی کرد بەخواردنی شاییەکە.... ئیتر باسی شێوازی خواردنەکەو، زۆری ئەو کەسانەشی کرد، کە دەعوەت کرابوون بۆی. پاشان فەرمووی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) هاتە دەرەوەو، تەشریفی برد بۆ ژوورەکەی دایکە (عَائِشَةَ)و، فەرمووی: «السَّلامُ

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٦٥٥ / بە ژمارە: ٢١٦٠، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٦١٧ / بە ژمارە: ١٩١٨، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٨٣ / بە ژمارە: ٦٠٠.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٦٥٥ / بە ژمارە: ٢١٦٠.

عَلَيْكُمْ أَهْلَ الْبَيْتِ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ». دایکە (عَائِشَـــةَ)ش فـەرمووی: (وَعَلَيْــكَ السَّلَامُ وَرَحْمَةُ اللهِ، كَيْفَ وَجَدْتَ أَهْلَكَ؟ بَارَكَ اللهُ لَكَ). واتـە: (خێزانەکـەت چـۆن بوو بەلاتەوە؟ خوا بەرەکەت بخاتە کاروبارتەوە). ئـیتر پێغەمبـەر تەشـریفی بـرد بـۆ ژووری خێزانەکانی یەك بەیەك‌و، هەر ئـەوەی پـێ دەفـەرموون، کـە فـەرمووی بـە دایکە (عَائِشَةَ). ئەوانیش هەر ئـەوەیان پـێ دەفـەرموو، کـە دایکـە (عَائِشَـــةَ) پێـی فەرموو.[1]

## ئەوەی کە پیاو لەکاتی سەرجێکەیی‌و جووتبووندا دەیڵێت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لـە چـەندین ڕێگەوە، لە هـاوەڵی خۆشەویسـت (ابْنُ عَبَّاس)ـــەوە (خـوا لـە هـەردووکیان ڕازی بێـت)، ئەویش لـە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسـەر بێـت)، کـە فەرموویـەتی: «لَـــوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا أَتَى أَهْلَهُ[2]، قَالَ: "بِسْمِ اللهِ، اللَّهُمَّ، جَنِّبْنَا الشَّيْطانَ، وَجَنِّبِ الشَّيْطانَ مَــا رَزَقْتَنا" فَقُضِيَ بَيْنَهُمَا وَلَدٌ، لَمْ يَضُرَّهُ».[3] واتە: "ئەگەر یەکێك لە ئێوە ویستی بچـێتە لای خێزانەکـەی خـۆی‌و، بڵێـت: (خوایـە شـەیتان لـە خۆمـان‌و لـەو منداڵـەش دووربخەرەوە، کە دەماندەیتێ)، جـا ئەگـەر بڕیـاری خـوا وەهـابوو کـە بـەو بەیـەك گەیشتنە منداڵیان ببێت، ئەوا شەیتان زیانی پێ ناگەیەنێت".

لە ڕیوایەتێکی ئیمامی بوخاریدا هـاتوە: «لَمْ يَضُـــرَّهُ شَـــيْطَانٌ أَبَـــداً».[4] واتـە: "هەرگیز شەیتان زیانی پێ ناگەیەنێت ".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيِّ / ٤ / ١٧٩٩ / بە ژمارە: ٤٥١٥.

(٢) واتە: (إِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْتِيَ أَهْلَهُ) وەکو لە هەندێك لـە ڕیوایەتەکاندا هاتوە.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيِّ / ١ / ٦٥ / بە ژمارە: ١٤١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ١٠٥٨ / بـە ژمارە: ١٤٣٤.

(٤) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيِّ / ٥ / ١٩٨٢ / بـە ژمـارە: ٤٨٧٠. هـەروەها لـە ڕیوایەتەکـەی ئیمامی موسلیمیشدا هەر بەم جۆرە هاتوە.

## باسی یاری کردن و گاڵته کردن و قسەی خۆش کردنی پیاو لەگەڵ ژنی خۆیدا

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، پێی فەرمووم: «کچت مارەکرد یان بێوەژن؟». منیش عەرزم کرد: (بێوەژنم مارەکرد). ئەویش فەرمووی: «هَلاَّ تَزَوَّجْتَ بِكْرًا، تُلاعِبُهَا، وَتُلاعِبُكَ». واتە: "ئەی بۆچی کچت مارە نەکرد، تا یاری لەگەڵدا بکەیت و، یاریشت لەگەڵدا بکات".[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (سُنَن)ی ئیمامی (نَسَائِيّ)دا، لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِيْنَ إِيْمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا، وَأَلْطَفُهُمْ لِأَهْلِهِ».[2] واتە: "لەناو ئیماندارانداا ئەو کەسەیان تەواوترین ئیمانی

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٧٣٩ / بە ژمارە: ١٩٩١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ١٠٨٧ / بە ژمارە: ٧١٥.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٩ / بە ژمارە: ٢٦١٢، وسُنَنُ النَّسَائِيُّ الْكُبْرَى / ٥ / ٣٦٤ / بە ژمارە: ٩١٥٤. ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە. منیش دەڵێم: واتە: (صَحِيْحٌ لِغَيْرِهِ)یە، چونکە ئەو کەسەی حەدیسەکەی لە دایکە (عَائِشَة)وە ڕیوایەت کردوە بریتیە لە (أَبُو قِلَابَة)، ئیمامی (تِرْمِذِيّ)ش فەرموویەتی: "وا نازانین (أَبُو قِلَابَة) حەدیسی لە دایکە (عَائِشَة) بیستبێت". واتە: ڕشتەی حەدیسەکە بچڕانی تێدایە.

ماوە کە بڵێم: دەقی حەدیسەکە لە تەواوی نوسخەکانی کتێبی (الْأَذْكَار)دا بەم جۆرە هاتوە: (وَأَلْطَفُهُمْ لِأَهْلِهِ). بەڵام لە تەواوی کتێبە حەدیسیەکاندا بەم جۆرە هاتوە: (وَأَلْطَفُهُمْ بِأَهْلِهِ).

هەیـە، کـە لـە هـەموویان ڕەوشـتو هەڵسوکـەوتی جـوانترەو، لـە هەموشـیان نەرمونیانترە بۆ خێزانو ماڵو منداڵەکەی خۆی".

## باسی ئەدەبی زاوا لەگەڵ خەزورانیدا لە چۆنێتی قسە کردندا

بزانە کە سونەتە زاوا لە قسە کردن لەگەڵ خزمەکانی ژنەکەیدا شتێك نـەڵێت، کە باسی جیماعی ئافرەت، یان ماچکردن، یان دەست لەمل کردن، یان هەر شتێکی تر لە جۆرەکانی چێژ بردن لە ئافرەتی تێدابێت، یان شتێك نەڵێت، کـە ئـەو باسـانە لەخۆ بگرێت، یان بکرێت بە بەڵگە لەسەریان، یان لێیەوە وەربگیرێن.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسـلیمدا، لـە ئیمـامی (عَلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێـت)، کە فەرموویەتی: من پیاوێك بووم (مَذِي)م زۆر بـوو، شەرمم کرد بپرسم لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێـت)، چـونکە کچـەکەی خێزانم بوو. بۆیە فەرمانم بە (مِقْدَاد) کردو، ئەو پرسیاری لێکرد.[1]

## باسی ئەوەی لەکاتی منداڵبوون و ژان و ئازاری ئافرەتدا دەوترێت

باش وەهایە ئەو نزاو پاڕانەوانە زۆر بکات، کە پێشتر بۆ خەمو خەفـەت باسمـان کردن.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە (فَاطِمَة)ی کچی پێغەمبەری خواوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە کاتێك وادەی منداڵبوونی نزیـك بوویـەوە، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، فەرمانی کرد بە هەردوو دایکی ئیمانـداران (أُمُّ سَلَمَة)و (زَيْنَب)ی کچی (جَحْش)، تا بێن بۆلای، (آيَةُ الْكُرْسِيّ)و ﴿إِنَّ رَبَّكُـمُ اللهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْـلَ

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٦١ / بە ژمـارە: ١٣٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٢٤٧ / بـە ژمارە: ٣٠٣.

النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ تَبَارَكَ اللهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾ [الأعراف: ٥٤]و، ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾و، ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ی لەلادا بخوێنن.[١]

## باسی بانگدان بەگوێی منداڵی تازە لەدایکبوودا

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و لە غەیری ئەوانیشدا، لە (أَبُو رَافِع)ی (مَوْلَى)ی پێغەمبەرەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: کاتێك (حُسَیْن)ی کوڕی ئیمامی (عَلِيّ)و کچەزای پێغەمبەری خوا لەدایك بوو (خوا لە هەموویان ڕازی بێت)، بینیم پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، هەمان ئەو بانگەی خوێند بەگوێیدا، کە بۆ نوێژ دەخوێنرێت.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِیْح)ـە.[٢]

کۆمەڵێك لە هاوەڵانمان فەرموویانە: سونەتە بانگ بەگوێی ڕاستیدا بخوێنێتو، قامەتیش بەگوێی چەپیدا.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە (حُسَیْن)ی کوڕی ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، فەرموویەتی: «مَنْ وُلِدَ لَهُ مَوْلُودٌ، فَأَذَّنَ فِيْ أُذُنِهِ الْيُمْنَى،

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٩٣ / بە ژمارە: ٦٢٠. حەدیسێکی زۆر لاوازە، ئەگەر (مَوْضُوْع)یش نەبێت، چونکە کەسێکی زۆر لاواز لە ڕشتەکەیدا هەیە بەناوی (مُوْسَى)ی کوڕی (مُحَمَّد)ی کوڕی (عَطَاء)ی (دِمْیاطِيّ)ـەوە، کە هەندێك لە زانایان تۆمەتباریان کردوە بە درۆ کردن. بڕوانە: الْكامِلُ فِيْ ضُعَفاءِ الرِّجالِ (لابْنِ عَدِيّ) / ٨ / ٦٤ / بە ژمارە: ١٨٢٩، ومِيْزانُ الِاعْتِدالِ فِيْ نَقْدِ الرِّجالِ (لِلذَّهَبِيّ) / ٤ / ٢١٩ / بە ژمارە: ٨٩١٥، وعُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّي / ٦٩٩.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٤٩ / بە ژمارە: ٥١٠٥، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٩٧ / بە ژمارە: ١٥١٤.

وَأَقَامَ فِيْ أُذُنِهِ الْيُسْرَى، لَمْ تَضُرَّهُ أُمُّ الصِّبْيَانِ».[1] واتە: "ئەو کەسەی منداڵێکی ببێتو، بانگ بدات بە گوێی ڕاستیداو، قامەتیش بکات بە گوێی چەپیدا، (أُمُّ الصِّبْيَان)[2] زیان بە منداڵەکەی ناگەیەنێت".

## باسی دوعا کردن لەکاتی هێنانی پەنجەی شیرینکراو بە مەلاشووی منداڵدا

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)دا، بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە (عَائِشَةَ)ی دایکی ئیمانداارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) منداڵ دەهێنرا بۆ خزمەتیو، ئەویش دوعای بۆ دەکردنو، پەنجەی شیرینکراویشی دەهێنا بە مەلاشوویاندا.[3]

لە ڕیوایەتێکیشدا هاتوە، کە دوعای بەرەکەتی بۆ دەکردن.

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٩٤ / بە ژمارە: ٦٢٣. شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ) ئەم حەدیسەی لە ڕێگەی زانای پایەبەرز (أَبُو يَعْلَى)ی (مَوْصِلِيّ)ـەوە ڕیوایەت کردوە، جا لە ڕشتەکەیدا دوو کەسی زۆر لاواز هەیە بەناوەکانی (يَحْيَى)ی کوڕی (عَلاء)ی (رَازِيّ)و (مَرْوَان)ی کوڕی (سَالِم)ی (غِفَارِيّ)ـەوە، بۆیە حەدیسەکە زۆر لاوازە، بەڵکو هەندێك لە زانایان بە (مَوْضُوْع)یان داناوە. بڕوانە: مُسْنَدُ أَبِيْ يَعْلَى / ١٢ / ١٥٠ / بە ژمارە: ٦٧٨٠، والْكَامِلُ فِيْ ضُعَفَاءِ الرِّجَالِ / ٩ / ٢٣ – ٢٤ / بە ژمارە: ٢١٠٤، ومِيْزَانُ الِاعْتِدَالِ / ٤ / ٣٩٧ / بە ژمارە: ٩٥٩١، ومَجْمَعُ الزَّوَائِد / ٤ / ٥٩، وفَيْضُ الْقَدِيْر / ٦ / ٢٣٨ / لەسەر حەدیسی ژمارە: ٩٠٨٥، عُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّي / ٧٠١ – ٧٠٢.

(٢) (أُمُّ الصِّبْيَان): بۆنێکە ڕەنگە بەهۆیەوە منداڵ لەهۆشی خۆی بچێت، یان جۆرە جنۆکەیەکە. بڕوانە: فَيْضُ الْقَدِيْر شَرْحُ الْجامِعِ الصَّغِيْر / ٦ / ٢٣٨.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٤٩ / بە ژمارە: ٥١٠٦. ئەم حەدیسە لە صەحیحی موسلیمیشدا هاتوە. بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٩١ / بە ژمارە: ٢١٤٧.

بۆشمـان ڕیوایـەت کـراوە لـە هـەردوو صـەحیحی بوخـاریو موسـلیمدا، لـە ژنەهاوەڵی خۆشەویست (أَسْمَاء)ی کچی ئیمامی (أَبو بَكْر)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: لە شاری (مَكَّة)ی پیرۆز دووگیان بووم بە (عَبْدُالله)ی کوڕی (زُبَيْر)ەوە، جا کە هاتمە شاری (مَدِيْنَة)ی پیرۆز، لە (قُبَاء) نیشتەجێ بوومو، لەوێ منداڵەکەم بوو، پاشان هێنام بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەویش لە چاکی خۆیدا داینا، ئەوجا داوای خورمایەکی کردو، لە دەمی خۆیدا هەجووی‌و، پاشان هەندێکی کردە دەمی منداڵەکەوە. بۆیە یەکەم شتێك کە چوە ناوسکی منداڵەکەوە بریتی بوو لە لیکی پیرۆزی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت). ئەوجا خورماکەی هێنا بە مەلاشوویداو، پاشان دوعای بەرەکەتی بۆ کرد.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو مُوْسَى)ی (أَشْعَرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: کوڕێکم لەدایك بوو، منیش هێنام بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەویش ناوی نا (إِبْرَاهِيْم)و، خورماکەی هێنا بە مەلاشوویداو، دوعای بەرەکەتی بۆ کرد.[2]

ئەمە دەقی ڕیوایەتەکەی ئیمامی بوخاریو موسلیمیشە، بێجگە لەوەی کە فەرموویەتی: "دوعای بەرەکەتی بۆ کرد"، کە ئەمە تایبەت هی ئیمامی بوخاریە.

* * * * *     * * * * *     * * * * *

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٤٢٢ / بە ژمارە: ٣٦٩٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٩١ / بە ژمارە: ٢١٤٦.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٠٨١ / بە ژمارە: ٥١٥٠، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٩٠ / بە ژمارە: ٢١٤٥.

## باسی ناونانی منداڵی تازە لەدایکبوو

سـونەت وەهایـە منـداڵ لـە ڕۆژی حەوتـەمی لەدایکبوونیـدا، یـان لـە ڕۆژی لەدایکبوونیدا ناو بنرێت.

سەبارەت بەوەی کە ناونان لە ڕۆژی حەوتەمدا سونەتە، لەبەر ئـەو حەدیسـەیە کە لە (سُنَن)ی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا بۆمان ڕیوایەت کـراوە، لـە (عَمْـرو)ی کـوڕی (شُعَيْب)ـەوە، ئەویش لە باوکیەوەو، ئەویش لـە باپیرەیـەوە، کـە پێغەمبـەری خـوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، فەرمانی کردوە بە ناونانی منداڵی تازە لەدایکبوو لە ڕۆژی حەوتەمیداو، فەرمانیشی کردوە کە سەری بتاشرێت و، گوێزەبانەشی بۆ بکرێت.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمـامی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَـائِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)و لە غەیری ئەوانیشدا، بـە چـەند ڕشـتەیەکی (صَـحِيْح)، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (سَمُرَة)ی کوڕی (جُنْدَب)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبـەری خـوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، فەرموویـەتی: «كُلُّ غُلامٍ رَهِيْنَةٌ بِعَقِيقَتِهِ تُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ سَابِعِهِ، وَيُحْلَقُ، وَيُسَمَّى». واتە: "هەموو منداڵێك بەستراوەتەوە بە حەوتەکەیـەوە، کـە لـە ڕۆژی حەوتەمیدا بۆی سەربڕێت و، سەریشی بتاشرێت و، ناویش بنرێت".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[2]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ١٣٢ / بە ژمارە: ٢٨٣٢.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ١١٧ / بە ژمارە: ٢٨٣٧، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ١٠١ / بـە ژمارە: ١٥٢٢، وسُنَنُ النَّسَائِيِّ / ٧ / ١٦٦ / بە ژمارە: ٤٢٢٠، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَـە / ٢ / ١٠٥٦ / بە ژمارە: ٣١٦٥.

سەبارەت بەوەش کە ناونان لە ڕۆژی لەدایکبوونیدا سونەتە، لەبەر ئەو حەدیسەیە کە لە باسەکەی پێشوودا هێنامانو، لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (أَبو مُوْسَى)ی (أَشْعَرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت) بۆمان ڕیوایەت کرابوو.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمو لە غەیری ئەویشدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، فەرموویەتی: «وُلِدَ لِيْ اللَّيْلَةَ غُلامٌ، فَسَمَّيْتُهُ بِاسْمِ أَبِـيْ إِبْرَاهِيْمَ».[1] واتە: "ئەمشەو منداڵێکمان بوو، منیش بەناوی (إِبْرَاهِيْم)ی باوکمەوە ناوم لێنا".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: هاوەڵی خۆشەویست (أَبو طَلْحَة) کوڕێکیان بوو، منیش هێنام بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەویش شیرینی هێنا بە مەلاشوویداو، ناویشی نا (عَبْدُالله).[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَهْل)ی کوڕی (سَعْد)ی (سَاعِدِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: کاتێك (مُنْذِر)ی کوڕی (أَبو أُسَيْد) لەدایك بوو، هێنرا بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەویش خستیە سەر ڕانی پیرۆزیو، (أَبو أُسَيْد)یش دانیشتبوو، پێغەمبەریش بە شتێکی بەردەستی خۆیەوە خەریك بوو، (أَبو أُسَيْد)یش فەرمانی کرد کوڕەکەی لابەن. ئەوەبوو لەسەر ڕانی پێغەمبەر هەڵگیراو، برایەوە ماڵەوە. ئەوجا پێغەمبەر بەئاگا هاتەوەو، فەرمووی: (کوڕەکە کوا؟) (أَبو أُسَيْد)یش عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، بردمانە ماڵەوە. پێغەمبەریش

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٨٠٧ / بە ژمارە: ٢٣١٥.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٠٨٢ / بە ژمارە: ٥١٥٣، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٨٩ / بە ژمارە: ٢١٤٤.

فەرمووی: ناوی چیە؟ ئەویش عەرزی کرد: فلاَن. پێغەمبەریش فـەرمووی: نـەخێر، بەڵکو ناوی (مُنْذِر)ە. ئیتر ئەو ڕۆژە ناوی نا (مُنْذِر).[1]

## باسی ناونانی کۆرپەی لەبارچوو

سونەتە کۆرپەی لـەبارچوو ناو بنرێت. خۆ ئەگەر نـەزانرا نێرینەیـە یـان مێیینـە، ئەوا با بەناوێك ناو بنرێت، کە بۆ نێرینەو بۆ مێیینەش بگونجێـت. وەکـو ناوەکـانی: (هِنْد)و (هُنَيْدَة)و (خَارِجَة)و (طَلْحَة)و (عُمَيْرَة)و (زُرْعَة)و هاووێنەی ئەمانە.

ئیمـامی (بَغَوِيّ) فەرموویـەتی: سـونەتە کۆرپـەی لـەبارچـوو ناوبنرێـت، لـەبـەر حەدیسێك کە لـەوبارەوە هاتوە.[2]

هەروەها بێجگە لە ئیمـامی (بَغَوِيّ)یـش، هەنـدێك لـە هاوەڵانمـان هـەر وایـان فەرموە.

هاوەڵانمان فەرموویانە: ئەگەر منـداڵی لـەدایکبوو بـەر لـە ناونـانی مـرد، هـەر سونەتە ناو بنرێت.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٨٩ / بە ژمارە: ٥٨٣٨، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٩٢ / بە ژمارە: ٢١٤٩.

(٢) چەند حەدیسێك لـەو بارەوە هاتوون، هەموویان لاوازن. بڕوانە: الْبَدْرُ الْمُنِيْــر / ٩ / ٣٤٢ – ٣٤٣، والتَّلْخِيْصُ الْحَبِيْر / ٤ / ٢٧٠ / لـەدوای حەدیسی ژمارە: ٤٢٢٠، والْفُتُوْحَـاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٦ / ١٠٣.

## سونەتە بۆ ناونان ناوی جوان و باش هەڵبژێردرێت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)دا، بە ڕشتەیەکی جوان (جَيِّد)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو الـدَّرْدَاء)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِنَّكُمْ تُدْعَوْنَ يَوْمَ القِيامَةِ بِأَسْمائِكُمْ وَأَسْمَاءِ آبَائِكُمْ، فَأَحْسِنُوا أَسْماءَكُمْ».[1] واتە: "بەڕاستی ئێوە لە ڕۆژی قیامەتدا بەناوی خۆتان و باوکتانەوە بانگ دەکرێن، بۆیە با ناوەکانتان باش بن".

## باسی خۆشەویستترین ناو بەلای خوای گەورەوە

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، فەرموویەتی: «إِنَّ أَحَبَّ أَسْمائكُمْ إِلَى اللهِ -عَزَّ وَجَلَّ-: عَبْدُاللهِ وَعَبْدُالرَّحْمَنِ».[2] واتە: "بەڕاستی خۆشەویستترینی ناوەکانتان بەلای خوای گەورەوە بریتیە لە: (عَبْدُاللهِ)و (عَبْدُالرَّحْمَن)".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پیاوێك لە ئێمە کوڕێکی بوو، ناوی لێنا (قَاسِم). ئێمەش پێمان وت: ئێمە بە کونیەی (أَبو الْقَاسِم)

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٠٥ / بە ژمارە: ٤٩٤٨. سەیرە بەلامەوە کە ئیمامی نەوەوی ڕشتەی ئەم حەدیسەی بە جوان (جَيِّد) داناوەو، کەچی ئیمامی (أَبو دَاوُد) خۆی فەرموویەتی: (عَبْدُاللهِ)ی کوڕی (أَبو زَكَرِيَّا) ئەم حەدیسەی لە (أَبو الدَّرْدَاء)ەوە ڕیوایەت کردووەو، بەخزمەتیشی نەگەیشتوە. کەواتە: وەکو شێخی عەسقەلانیش فەرموویەتی: ڕشتەکە بچڕانی تێدایە. بڕوانە: فَتْحُ الْبَارِي / ١٠ / ٥٧٧.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٨٢ / بە ژمارە: ٢١٣٢.

بانگت ناکەین‌و، ئەو ڕێزەشت لێ نانێین. ئـەویش خەبەرەکـەی گەیانـدە پێغەمبـەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت)، پێغەمبـەریش فـەرمووی: «کوڕەکـەت نـاوبنێ: عَبْدُالرَّحْمَن».[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە (سُنَن)ی ئیمـامی (أَبُو دَاوُد)و (نَسَائِيّ)و لـە غـەیری ئەوانیشدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو وَهْب)ی (جُشَمِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێـت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسـەر بێـت)، فەرموویـەتی: «تَسَمَّوا بِأَسْماءِ الْأَنْبِياءِ، وَأَحَبُّ الْأَسْماءِ إِلَى اللهِ تَعَالَى: عَبْدُاللهِ وَعَبْدُالرَّحْمَن، وَأَصْدَقُهَا: حَارِثٌ وَهَمَّامٌ، وَأَقْبَحُها: حَرْبٌ وَمُرَّةٌ».[2] واتە: "ناوی پێغەمبەرەکان هەڵبـژێرن بـۆ ناونـان. خۆشەویسـترینی ناوەکـانیش بـەلای خـوای گـەورەوە بریتیـە لـە: (عَبْـدُالله)و (عَبْدُالرَّحْمَن)، ڕاستگۆترینیشـیان بریتیـە لـە (حَـارِث)و (هَمَّـام)و، ناشـیرینترین‌و خراپترینیشیان بریتیە لە (حَرْب)و (مُرَّة)".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٨٧ / بە ژمارە: ٥٨٣٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٨٤ / بە ژمارە: ٢١٣٣.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٠٥ / بە ژمـارە: ٤٩٥٠، وسُنَنُ النَّسَـائِيِّ الْكُبْـرَى / ٦ / ٢١٨ / بە ژمارە: ٣٥٦٥. ڕشتەکەی لاوازە، چونکە کەسێکی تێدایە، بـەناوی (عَقِيْل)ی کوڕی (شَبِيْب)ـەوە، کە زۆربەی زانایان بە لاوازی دادەنێن، ئەگەرچی شێخی (ابْنُ حِبَّان) بە متمانەداری داناوەو، لە کتێبی (الثِّقَات)دا ناوی بردوە. هەروەها ئیمامی (بُوْصِـيْرِيّ)ش ئەم حەدیسـەی لە ڕێگەی زانای پایەبەرز (أَبُـوُ يَعْلَـى)وە هێنـاوەو، پاشـان فەرموویـەتی: کەسەکانی ڕشتەکەی متمانەدارن. بڕوانـە: الثِّقَات (لابْنِ حِبَّان) / ٥ / ٢٧٢ / بـە ژمـارە: ٤٨٠١، وإِتْحَافُ الْخِيْرَةِ الْمَهَرَة / ٥ / ٣٣٢ / بە ژمارە: ٤٧٩٢.

## سونەتە پیرۆزبایی منداڵبوون لە باوك و دایكی منداڵەكە بكرێت و، ئەوانیش وەڵامی پیرۆزباییکەرەکە بدەنەوە

پیرۆزبایی كردن لە خاوەنی منداڵ لەدایكبووەكە سونەتە.

هاوەڵانمان فەرموویانە: سونەتە بەو فەرمایشتە پیرۆزبایی لێ بكرێت، كە لە ئیمامی (حُسَيْن)ـەوە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)[1]، كە پیرۆزبایی فێری پیاوێك دەكردو، فەرمووی: بڵێ: (بَارَكَ اللهُ لَكَ فِيْ الْمَوْهُوْبِ لَكَ، وَشَكَرْتَ الْوَاهِبَ، وَبَلَغَ أَشُدَّهُ، وَرُزِقْتَ بَرَّهُ). واتە: "خوای گەورە بەرەكەت بخاتە ئەو خەڵاتەی پێی بەخشیویت و، شوكرانەبژێری بەخشەرەكەش بكەیت و، منداڵەكەشت بۆ پێی بگات و، باشیش بێت لەگەڵتدا".

سونەتە كەسە پیرۆزبایی لێكراوەكەش وەڵام بداتەوەو، بڵێت: (بَارَكَ اللهُ لَكَ، وَبَارَكَ عَلَيْكَ، وَجَزَاكَ اللهُ خَيْراً، وَرَزَقَكَ اللهُ مِثْلَهُ)، یان (أَجْزَلَ اللهُ ثَوَابَكَ)، یان شتێكی لەو جۆرە. واتە: (خوای گەورە بەرەكەت بخاتە ژیانی تۆوەو، بەرەكەتیش دابارێنێت بەسەرتداو، پاداشتی خەیرت بداتەوەو، منداڵێكی واش بە تۆ ببەخشێت)، یان (خوا پاداشتی گەورەت بداتەوە).

## باسی نەهی كردن لە ناونان بەناوە ناپەسەندەكان

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَمُرَة)ی كوڕی (جُنْدَب)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا

---

(١) شێخی (ابْنُ عَلاَّن) فەرموویەتی: بەڵێ لە نوسخەكانی كتێبی (الْأَذْكَار)دا نوسراوە (حُسَيْن)، بەڵام لەو سەرچاوانەی كە ئەم فەرمایشتەیان نقل كردوە نوسراوە (حَسَن). جا ئەو (حَسَن)ـەش یان (حَسَن)ی كوڕی ئیمامی (عَلِيّ)ـە، یان شێخ (حَسَن)ی (بَصْرِيّ)ـە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٦ / ١٠٨ - ١٠٩.

(دروودی خوای لەسەر بێت)، فەرموویەتی: «لا تُسَمِّيَنَّ غُلامَكَ يَسَاراً، وَلا رَباحاً، وَلا نَجاحاً، وَلا أفْلَحَ، فَإنَّكَ تَقُولُ: "أثَمَّ هُوَ؟" فَلا يَكُونُ، فَتَقُولُ: "لا"».[1] واتە: "منداڵەکەت ناو مەنێ (يَسَار)و (رَبَاح)و (نَجَاح)و (أفْلَح)، چونکە تۆ دەڵێیت: ئەرە ئەوە فلان لەوێیە؟ جا کە لەوێ نەبوو، تۆ دەڵێیت: نەخێر".

جا (سَمُرَة) فەرموویەتی: بەڕاستی ناوەکان هەر ئەم چوارەبوون، بۆیە بەناوی منەوە بۆی زیاد مەکەن".

هەروەها ئەم حەدیسەمان لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و لە غەیری ئەویشدا بۆ ڕیوایەت کراوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت). جا ئەوەشی تێدایە، کە نەهی کردوە لە ناونانی منداڵ بە: (بَرَكَة).[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «إنَّ أخْنَعَ اسْمٍ عِنْدَ اللهِ تَعَالَى رَجُلٌ تَسَمَّى مَلِكَ الْأمْلاكِ».[3] واتە: "سووک‌و ڕسواترین ناو بەلای خوای گەورەوە، ئەوەیە کە پیاوێك خۆی ناوبنێ بە: شاهان شاه".

لە ڕیوایەتێکیشدا لەبرێتی (أخْنَعَ) نوسراوە (أخْنَى).

لە ڕیوایەتێکی ئیمامی موسلیمیشدا بەم جۆرە هاتوە: «أغْيَظُ رَجُلٍ عِنْدَ اللهِ يَوْمَ القِيامَةِ وأخْبَثُهُ رَجُلٌ كَانَ يُسَمَّى مَلِكَ الْأمْلاكِ».[4]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٨٥ / بە ژمارە: ٢١٣٧.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٠٨ / بە هەردوو ژمارە: ٤٩٥٨ و ٤٩٦٠.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٩٢ / بە ژمارە: ٥٨٥٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٨٨ / بە ژمارە: ٢١٤٣.

(٤) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٨٨ / بە ژمارە: ٢١٤٣.

زانایان فەرموویانە: مانای (أَخْنَعَ)و (أَخْنَى) بریتیە لە: سوكو ڕسواترین.

لە صەحیح(ی موسلیم)یشدا لە زانای پایەبەرز (سُفْیَان)ی كوڕی (عُیَیْنَـــةَ)وە هاتوە، كە فەرموویەتی: (مَلِكُ الْأَمْلاكِ) وەكو (شاهان شاه) وایە.[1]

## دروستە ئادەمیزاد كەسێكی شوێنكەوتەی خۆی، وەكو منداڵ، یان خزمەتكار، یان قوتابی، یان كەسێكی هاوێنەی ئەوان بە ناوێكی خراپ ناو بهێنێت، بۆئەوەی تەمێی بكات، ڕێگری لێ بكات لە كارێكی خراپ، نەفسی ڕابهێنێت

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە كتێبەكەی شێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی كوڕی (بُسْر)ی (مَــازِنِيّ)ــەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: دایكم بە بۆڵێك ترێوە ناردمی بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (درورودی خوای لەسەر بێت)، منیش بەر لەوەی بیگەنمە دەستی هەندێكم لێ خوارد، جا كە هێنامە خزمەتی، گوێی گرتمو، فەرمووی: (یَا غُدَرُ!). واتە: (هەی ناپاك!).[2]

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالرَّحْمَن)ی كوڕی ئیمامی (أَبو بَكْــر)ی (صِــدِّیْق)ــەوە (خوا لە هەردووكیان ڕازی بێت)، لەو حەدیسە درێژەیدا، كە داگرەوەیە بەسەر كەرامەتێكی

---

(١) بڕوانە: صَحِیْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٨٨.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْیَوْمِ وَاللَّیْلَة (ابْنُ السُّـنِّيّ) / ١٩٢ / بە ژمارە: ٤٠١. شێخی (هَیْثَمِـيّ) فەرموویەتی: ئیمامی (طَبَرَانِيّ) ڕیوایەتی كردوەو، (عَبْدُالله)ی كوڕی (بُسْر)ی (حُبْرَانِــيّ) لە ڕشتەكەیدا هەیە، شێخی (ابْنُ حِبَّان) بە متمانەداری داناوەو، زۆربەی زانایانیش بە لاوازیان داناوەو، كەسەكانی تری ڕشتەكەی متمانەدارن. بڕوانە: مَجْمَعُ الزَّوَائِـد / ٩ / ٤٠٥ / بە ژمارە: ١٦١٢١.

ئاشكراى ئیمامی (أَبو بَكْر)دا (خوای لیّ ڕازی بێت)، كه ماناكه‌ی ئه‌مه‌یه‌: ئیمامی (أَبو بَكْر) كۆمه‌ڵێك میوانی هێنایه‌وه‌و، له‌ماڵه‌وه‌دا دایینیشاندن‌و، خۆی ته‌شریفی برد بۆ خزمه‌تی پێغه‌مبه‌ری خوا (دروودی خوای له‌سه‌ر بێت)و، دره‌نگ ته‌شریفی هێنایه‌وه‌. جا كه گه‌ڕایه‌وه فه‌رمووی: "نانتان پێ داون؟" عه‌رزیان كرد: "نه‌خێر". ئه‌ویش ڕووی كرده (عَبْدُالرَّحْمَن)ی كوڕی‌و، فه‌رمووی: (يَا غُنْثَرُ). واته‌: (هه‌ی ناڕه‌سه‌ن)، ئه‌وجا فه‌رمووی: ده‌ك لوتت به‌بڕین بچێت‌و، هه‌ندێك قسه‌ی تریشی پێ فه‌رموو.[1]

## باسی بانگكردن له‌و كه‌سه‌ی ناوی نازانرێت

ئه‌گه‌ر ناوی كه‌سێك نه‌زانرا وا باشه به‌ جۆرێك بانگ بكرێت، كه پێی ئازار نه‌خوات‌و، بانگكردنه‌كه‌ش درۆو زیاده‌ڕه‌وی‌و مه‌رایی‌و (تَمَلُّق)ی تێدا نه‌بێت. وه‌كو ئه‌وه‌ی پێی بڵێیت: براكه‌م، یان مامۆستا، یان كابرای فه‌قیر، یان گه‌وره‌م، یان هێی تۆ، یان كراس سپی، یان نه‌عل له‌پێ، یان ئه‌سپ سوار، یان خاوه‌ن حوشتر، یان شمشێر به‌ده‌ست، یان خاوه‌ن ڕم، یان هه‌ر شتێكی تری هاوشێوه‌و، به‌پێی حاڵی بانگراوه‌كه‌، یان بانگكه‌ره‌كه‌.

بۆمان ڕیوایه‌ت كراوه له‌ (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (نَسَائِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، به‌ ڕشته‌یه‌كی (حَسَن)، له‌ هاوه‌ڵی خۆشه‌ویست (بَشِيْر)ی كوڕی (مَعْبَد)ه‌وه‌، كه ناسراوه به‌ (ابْنُ الْخَصَاصِيَة) (خوای لیّ ڕازی بێت)، كه فه‌رموویه‌تی: جارێك له‌ خزمه‌تی پێغه‌مبه‌ری خوادا (دروودی خوای له‌سه‌ر بێت) ڕێم ده‌كرد، كه ته‌ماشای كرد، بینی وا پیاوێك به‌ نێوان گۆڕه‌كاندا ڕێ ده‌كات‌و، نه‌علیشی له‌پێدایه‌، جا بانگی كردو

---

(١) بڕوانه‌: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢١٦ / به‌ ژماره‌: ٥٧٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٢٧ / به‌ ژماره‌: ٢٠٥٧.

فەرمووی: کابرای نەعل لەپێ (جووتێك نـەعلی بێمـووی لەپێدا بـوو)، نەگبـەت، نەعلەکانت داکەنە.... ئیتر تەواوی حەدیسەکەی باس کرد.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکـەی شـێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (جَارِيَة)ی (أنْصَارِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: جارێـك لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بووم (دروودی خوای لەسەر بێت) جا ئەگەر ناوی پیـاوێکی لەبەرنەبوایەو نەیزانیایە، دەیفـەرموو: (يَا ابْنَ عَبْدِاللهِ). واتـە: ئـەی کـوڕی بەنـدەی خوا.[2]

## باسی نەهی کردن لە منداڵو قوتابی کە باوكو مامۆستا بە ناوی خۆیانەوە بانگ نەکەن

بۆمان ڕیوایەت کراوە لـە کتێبەکـەی شـێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە پێغەمبـەری خـوا (دروودی خـوای لەسەر بێت) پیاوێکی بینی کوڕێکی بچووکی لەگەڵدا بـوو، فـەرمووی بـە کوڕەکـە: (ئەم پیاوە کێیە؟) ئەویش وتی: (باوکمە). پێغەمبەریش فـەرمووی: «فَلا تَمْشِ أمامَهُ، ولا تَسْتَسبَّ لَهُ، وَلا تَجْلِسْ قَبْلَهُ، وَلا تَدْعُهُ باسْـمِهِ». واتـە: "دەی لەپێشـیەوە ڕێ مەکەو، کارێکیش مەکە قسەت پێ بلێیتو، بەر لە ئـەویش دامەنیشـەو، بـە نـاوی خۆیشیەوە بانگی مەکە".[3]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٢٣٦ / بە ژمارە: ٣٢٣٠، وسُنَنُ النَّسَـائِيِّ / ٤ / ٩٦ / بـە ژمارە: ٢٠٤٨، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٤٩٩ / بە ژمارە: ١٥٦٨.

(٢) بڕوانـە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّـنِّيّ) / ١٩١ / بـە ژمـارە: ٣٩٩. ڕشـتەکەی لاوازە. چونکە کەسی نەناسراوی تێدایە. بڕوانە: مَجْمَعُ الزَّوَائِد / ٨ / ٥٦ / بە ژمارە: ١٢٨٩٥.

(٣) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّـنِّيّ) / ١٩٠ / بـە ژمـارە: ٣٩٥. حەدیسـێکی لاوازە. بڕوانە: عُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّي / ٤٤٩.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْــنُ السُّــنِّيّ)دا، لــە خواناســی پایەبەرز (عُبَيْدُالله)ی کوڕی (زَحْر)ەوە (خوای لیّ ڕازی بێت) -کە بەیەکـدەنگی زانایـان کەسێکی چاکەکارە- ئەو فەرموویەتی: دەوترێت: جۆرێك لە جۆرەکانی ئـازاردانی دڵی باوك ئەوەیە، کە بەناوی خۆیەوە نـاوی ببـەیتو، لــە ڕێگـادا لەپێشـیەوە ڕێ بکەیت.[1]

## سونەتە ناو بگۆڕدرێت بۆ ناوی باشتر

یەکێك لەو حەدیسـانەی لـەم بـارەوە هـاتوە بریتیـە لـەو حەدیسـەی هـاوەڵی خۆشەویست (سَهْل)ی کوڕی (سَعْد)ی (سَاعِدِيّ) (خوای لیّ ڕازی بێت)، کە لــە باسـی (**ناونانی منداڵ**)دا، لە چیرۆکی ناوگۆڕینەکەی (مُنْــذِر)ی کــوڕی (أَبــو أُسَــيْد)دا هێنامان.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هـاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لیّ ڕازی بێت)، کە (زَيْنَب) نـاوی (بَـرَّة) بـوە. جـا وتراوە: (تەزکیەو وەسفی خۆیی پیّ دەکات!) پێغەمبەری خواش (دروودی خـوای لەسـەر بێت)، ناوی نا (زَيْنَب).[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسـلیمدا، لــە (زَيْنَــب)ی کچـی (أَبــو سَلَمَة)وە (خوای لیّ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: نـاونرابووم (بَرَّة). پێغەمبـەری خـواش (دروودی خوای لەسەر بێت)، فەرمووی: نـاوی بنـێن (زَيْنَــب). هـەروەها فەرموویـەتی:

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٩٠ / بە ژمارە: ٣٩٦.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٨٩ / بە ژمارە: ٥٨٣٩، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٨٧ / بە ژمارە: ٢١٤١.

(زَيْنَب)ی کچی (جَحْش)یش هاتە خزمەتی پێغەمبەرو، ئەویش هەر ناوی (بَرَّة) بوەو، پێغەمبەر ناوی نا (زَيْنَب).[1]

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ــەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: (جُوَيْرِيَّة) نـاوی (بَرَّة) بوە. پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، گـۆڕی بـۆ (جُوَيْرِيَّـــة). چـونکە پێـی ناخۆش بوو، کە بوترێت: {لای (بَرَّة) هاتە دەرەوە}.[2]

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە زانـای پایەبـەرز (سَــعِيْد)ی کوڕی (مُسَيِّب)ی کوڕی (حَزْن)ــەوە، ئەویش لە باوکیەوە، کە باوکی ئـەو (واتـە: باپیرەی سَعِيْد) هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت)، ئـەویش فەرمووی: ناوت چیە؟ وتی: (حَزْن). پێغەمبەریش فەرمووی: تـۆ (سَهْل)ی. ئـەویش وتی: من ئەو ناوە ناگۆڕم کە باوکم ناوی ناوم! (سَعِيْد) دەفەرموێت: (فَمَــا زَالَـــتِ الْحَزُوْنَةُ فِيْنَا بَعْدُ). واتە: هەتا ئێستەش ڕووگرژی‌و زبریمان تێدایە.[3]

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هـاوەڵی خۆشەویسـت (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبـەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت)، ناوی (عَاصِيَة)ی گۆڕی‌و، فەرمووی: تۆ (جَمِيْلَة)یت.[4]

دیسان لە ڕیوایەتێکی صەحیحی موسلیمدا هاتوە، کە کچێکی ئیمـامی (عُمَــر) (خوای لێ ڕازی بێت)، پێی دەوترا (عَاصِيَة). پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسـەر بێـت)، ناوی نا (جَمِيْلَة).[1]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٨٧ / بە ژمارە: ٢١٤٢.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٨٧ / بە ژمارە: ٢١٤٠.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٨٨ / بە ژمارە: ٥٨٣٦.

(٤) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٨٦ / بە ژمارە: ٢١٣٩.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)دا، بە ڕشتەیەکی (حَسَن)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أُسَامَة)ی کوڕی (أَخْدَريّ)ـەوە، کە کۆمـەڵێك هـاتن بـۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)و، پیاوێکیـان تێـدابوو، پێـی دەوتـرا (أَصْرَم). پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: "نـاوت چـیە؟" ئـەویش عەرزی کرد: (أَصْرَم). پێغەمبەریش فەرمووی: بەڵکو تۆ (زُرْعَة)ی.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (نَسَائِيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (أَبو شُرَيْح هَانِىء)ی (حَارِثِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێـت)، کاتێـك لـەگـەڵ هۆزەکەیدا هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێـت)، پێغەمبەر گوێی لێبوو، هۆزەکەی پێیان دەوت: (أَبو الْحَكَم). جا بانگی کردو، پێی فـەرموو: "تـەنها خوا حەکەمەو، حوکمیش بەدەستی ئەوە. ئیتر بۆچی پێت دەوترێت: أَبو الْحَكَـــم؟" ئەویش عەرزی کرد: هۆزەکەم ئەگەر لە شتێکدا ناکۆکیان هەبوایە، دەهاتن بـۆلای منو، منیش حـوکمم دەکـرد لــە نێوانیانـدا، ئـیتر هـەردوولا بـە حوکمەکـە ڕازی دەبوون. پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێـت) فـەرمووی: "بەڕاسـتی کـارێکی باشو جوانە! ئەی منداڵت چی هەیە؟" ئەویش عەرزی کـرد: (شُرَيْح)و (مُسْـــلِم)و (عَبْدُالله). فـەرمووی: "کامیـان گەورەترینیانـە؟" منـیش عـەرزم کـرد: (شُـــرَيْح). فەرمووی: "دەی تۆ (أَبو شُرَيْح)یت".[3]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٩٢ / بە ژمارە: ٥٨٥٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٨٧ / بە ژمارە: ٢١٣٩.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٠٦ / بە ژمارە: ٤٩٥٤.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٠٦ / بە ژمـارە: ٤٩٥٥، وسُنَنُ النَّسَائِيِّ / ٨ / ٢٢٦ / بـە ژمارە: ٥٣٨٧. شـێخی (ابْنُ الْمُلَقِّـــن) فەرموویـەتی: ئیمـامی (أَبـــو دَاوُد)و (نَسَـــائِيّ)و (حَاكِم)یش ڕیوایەتیان کردوەو، شێخی (ابْنُ حِبَّان)یش بە (صَحِيْح)ی داناوە. بڕوانە: تُحْفَةُ الْمُحْتَاجِ إِلَى أَدِلَّةِ الْمِنْهَـــاج / ٢ / ٥٧٠ / بـە ژمـارە: ١١٦٦. هـەروەها شـێخی (ابْـــنُ

ئیمامی (أَبو دَاوُد) فەرموویەتی: هەروەها پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) ناوەکانی (عَاصِي)و (عَزِيز)و (عَتَلَة)و (شَيْطَان)و (حَكَم)و (غُـراب)و (حُبَـاب)ی گۆڕیوەو، (شِهَاب)ی ناوناوە (هِشَام)و، (حَرْب)یشی ناوناوە (سِلْم)و، (مُضْطَجِع)ی ناوناوە (مُنْبَعِث)و، ئەو زەویەش کە ناوی (عَفِرَة) بوە، ئەو ناوی ناوە (خَضِـرَة)و، دۆڵی (ضَلَالَة)ی ناوناوە: دۆڵی (هُدَى)و، (بَنُو الزِّنْيَة)ی ناوناوە (بَنُو الرِّشْدَة)و، (بَنُو مُغْوِيَة)شی ناوناوە (بَنُو رِشْدَة).

ئیمامی (أَبو دَاوُد) فەرموویەتی: ڕشتەکانیانم نەهێناوە لەبەر ئەوە درێژنەبێتەوە.[1]

منیش دەڵێم: شێخی (ابْنُ مَاكُولا) وشەی (عَتْلَة)ی بەو جۆرە خوێندوەتەوەو، فەرموویەتی: شێخ (عَبْدُالْغَنِيّ) بە (عَتَلَة) خوێندویەتیەوە، پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) ئەم ناوەی گۆڕیوە بە (عُتْبَة)، وەکو (عُتْبَة)ی کوڕی (عَبْدُ السُّلَمِيّ).

## دروستە ناو کورت بکرێتەوە، ئەگەر خاوەنەکەی پێی ناخۆش نەبێت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە حەدیسی (صَـحِيْح)دا لە چەندین ڕێگەوە، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) ناوی کۆمەڵێك لە هاوەڵانی کورت کردۆتەوە. یەکێك لەوانە ئەوەیە کە بە (أَبو هُرَيْرَة)ی فەرموە: (يَا أَبَا هِرّ)[2]و، بە دایکە (عَائِشَة)شی فەرموە: (يَا عَائِش)[3]و، بە (أَنْجَشَة)شی فەرموە: (يَا أَنْجَش).[1]

---

عَلاّن)یش فەرموویەتی: حافظی عێراقیش بە (صَحِيْح)ی داناوە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٦ / ١٢٧.

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٠٧.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ١٠٩ / بە ژمارە: ٢٨١.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٣٧٤ / بە ژمارە: ٣٥٥٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٨٩٦ / بە ژمارە: ٢٤٤٧.

لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)یشدا هاتوە، کە پێغەمبەری خـوا (دروودی خوای لەسەر بێت) بە (أُسَامَةَ)ی فـەرموە: (یَا أُسَیْم).[2]و، بـە (مِقْــدَام)یشـی فـەرموە: (یَــا قُدَیْم).[3]

## باسی نەهی کردن لە بەکارهێنانی ئەو نازناوانەی، کە خاوەنەکانیان پێیان ناخۆشە

خوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿وَلَا تَنَــابَزُوا بِالْأَلْقَــابِ﴾ [الْحُجُـرَات: ١١] واتـە: {نازناوی خراپو ناشیرین بۆ یەکتر بەکار مەهێنن}.

زانایان یەکدەنگ لـەسەر ئەوەی، کە حەرامە نازناوێك دابنرێت بـۆ کەسـێكو، ئەویش پێی ناخۆش بێت. ئیتر ئایا سـیفەتی کەسـە خـۆی بێـت، وەکـو (أَعْمَـــش)و (أَجْلَح)و (أَعْمَی)و (أَعْرَج)و (أَحْوَل)و (أَبْرَص)و (أَشَجّ)و (أَصْــفَر)و (أَحْــدَب)و (أَصَمّ)و (أَزْرَق)و (أَفْطَس)و (أَشْتَر)و (أَثْرَم)و (أَقْطَع)و (زَمِن)و (مُقْعَد)و (أَشَلّ)، یان سیفەتی باوکی یان دایکی، یان هەر شتێکی تر بێت، کە ئەو پێی ناخۆش بێت.[4]

---

(١) بڕوانە: صَحِیْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٩١ / بە ژمارە: ٥٨٤٩.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْیَوْمِ وَاللَّیْلَة (ابْنُ السُّــنِّيّ) / ١٩٦ / بـە ژمـارە: ٤١١. حەدیسـێکی لاوازە. بڕوانە: عُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّي / ٤٦٤.

(٣) بڕوانە: عَمَلُ الْیَوْمِ وَاللَّیْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٨٩ / بە ژمـارە: ٣٩٣. ڕشـتەکەی زۆر لاوازە. بڕوانە: عُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّي / ٤٤٦ - ٤٤٨.

(٤) (أَعْمَش) واتە: چاو کزی چاوفرمێسکاوی. (أَجْلَح) واتە: سەرڕووتاو. (أَعْمَی) واتە: کوێرو نابینا. (أَعْرَج) واتە: شەلو پێلـەنگ. (أَحْوَل) واتە: خێلو چاولار. (أَبْرَص) واتە: بەڵەکاوی. (أَشَجّ) واتە: نێوچاوان قلێشاو. (أَصْفَر) واتە: زەردۆڵ. (أَحْدَب) واتە: کووڕو پشت چەماو. (أَصَمّ) واتە: گوێ گران. (أَزْرَق) واتە: شینکە. (أَفْطَس) واتە: لـووت پـانو لـووت فـش. (أَشْتَر) واتە: پێڵووی چاو هەڵگەڕاو. (أَثْرَم) واتە: دان شـکاو. (أَقْطَــع) واتـە: بـاڵ قرتـاو.

هەروەها یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە دروستە کەسێك -بۆ ناسینەوە- ئەو جۆرە نازناوەی بۆ بەکار بهێنرێت، ئەگەر کەسی بەرامبەر تەنها بەو جۆرە دەیناسیەوە.

جا بەڵگەکانی ئەم باسە گەلێك زۆرو مەشهورن، منیش لەبەر درێژنەبوونەوە باسم نەکردونو، لەبەر مەشهووریان پێویستیان بە باسکردن نیە.

## دروستەو سونەتیشە ئەو نازناوە بەکاربهێنرێت، کە خاوەنەکەی پێی خۆشە

یەکێك لەوانە ئیمامی (أَبو بَكْر)ی (صِـدِّيْق)ـە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ناوی (عَبْدُالله)ی کوڕی (عُثْمَان)ـەو، نازناویشی (عَتِيْق)ـە.

ئەمەش ئەو بۆچوونە دروستەیە، کە زۆربەی زانایانی فەرموودەناسانو شارەزایانی سیرەو مێژوو، غەیری ئەوانیشی لەسەرە.

وتراویشە: ناوی (عَتِيْق)ـە. زانای پایەبەرز (أَبو الْقَاسِم)ی (ابْـنُ عَسَـاكِر) لە کتێبی (الْإِشْرافُ عَلَى مَعْرِفَةِ الْأَطْرَاف)دا باسی ئەم بۆچوونەی کردوە. جا بۆچوونە ڕاستەکە ئەوەی یەکەمیانە.

زانایانیش یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە (عَتِيْق) نازناوێکی باشو چاکەو، بەڵام ڕای جیاوازیان هەیە سەبارەت بە ناونانی ئیمامی (أَبو بَكْر) بەم نازناوە:

---

(زَمِن) واتە: دەردەدارو ناتەواو. (مُقْعَد) واتە: گلۆڵەو لەپێ کەوتوو. (أَشَلّ) واتە: گۆجو شەلەپەتە.

جا بۆ زانیاری لەسەر ئەو کەسانەی ئەم جۆرە نازناوانەیان بۆ بەکارهێنراوە، بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٦ / ١٣٥ - ١٣٦.

لە چەند ڕێگەیەکەوە بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «أَبُو بَكْرٍ عَتِيقُ اللَّهِ مِنَ النَّارِ». واتە: "ئیمامی (أَبُو بَكْـــر) ڕزگـارکراوی خـوای گەورەیـە لـە ئاگری دۆزەخ". ئیتر لەو ڕۆژەوە ناونرا بە (عَتِيْق) (واتە: ئازادکراو).[1]

(مُصْعَب)ی کوڕی (زُبَيْر)و، غەیری ئەویش لە نەسەبناسان فەرموویانە: بۆیە پێی وتراوە (عَتِيْق) (واتە: جوان)، چونکە لە نەسەبو ڕەچەڵەکیدا شتێکی تێـدا نـەبوە، کە پێی عەیبدار بکرێت.

هەروەها شتی تریش وتراوەو، خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

یەکێکی تر لەو جۆرە نازناوە بریتیە لــە (أَبُــو تُــرَاب)، کـە نازنـاوی ئیمـامی (عَلِيّ)ی کوڕی (أَبُو طَالِب)ــە (خوای لێ ڕازی بێت)و، کونیەکەشی (أَبُو الْحَسَن)ــە.

لـە حەدیسی (صَحِيْح)دا هاتوە، کـە پێغەمبــەری خـوا (دروودی خـوای لەســەر بێـت) بینیوێتی ئیمامی (عَلِيّ) لە مزگەوتدا خەوتوەو، تۆزی لەسەر نیشتوە. جـا دوو جـار پێی فەرموە: هەستە ئەی (أَبُو تُرَاب). ئیتر ئەم نازناوە چاکو جوانەی پێوە لکا.

ئەم حەدیسەمان لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا بۆ ڕیوایەت کـراوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَهْل)ی کوڕی (سَعْد)ــەوە (خوای لێ ڕازی بێت). جـا (سَهْل)

---

(١) ئیمامی تەوەوی نەیفەرموە ئەم حەدیسەی لە چی سەرچاوەیەکدا بۆ ڕیوایـەت کـراوە! جـا بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٦١٦ / بە ژمارە: ٣٦٧٩. شێخی (هَيْثَمِيّ)یش حەدیسێکی بـە هەمان مانا هێناوەو، پاشان فەرموویەتی: ئیمامی (بَزَّار) ڕیوایەتی کردوەو، ئیمامی (طَبَرَانِيّ)ش دەقێکـی تـری هاوشـێوەی ڕیوایـەت کـردوەو، کەسـەکانی ڕشـتەی گێڕانـەوەی هـەردوو ڕیوایەتەکەش کەسانی متمانەدارن. بڕوانە: مَجْمَعُ الزَّوَائِد / ٩ / ٤٠ / بە ژمارە: ١٤٢٨٩.

فەرموویەتی: ئەمە خۆشەویستترینی ناوەكانی ئیمامی (عَلِـيّ) بـوە بـەلای خۆیـەوە، زۆریشی پیٚ خۆشبوە كە بەو ناوەوە بانگ بكریٚت.[1]

جا ئەمە دەقی ڕیوایەتەكەی ئیمامی بوخاریە.

یەكێكی تر لـەو نازناوانە بریتیە لـە (ذُو الْيَـدَيْن)، كـە نـاوی (خِرْبَـاق) بـوەو، دەستەكانی هەندێك درێژبوون.

لـە حەدیسی (صَحِيْح)دا هاتوە، كە پێغەمبەری خوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) بـە (ذُو الْيَدَيْن) بانگی دەكردو، ناویشی (خِرْبَاق) بوە. ئیمـامی بوخـاری بـەم دەقـە لـە سەرەتاكانی (كِتَابُ الْبِرِّ وَالصِّلَة)دا ڕیوایەتی كردوە.[2]

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣١٦ / بە ژمارە: ٥٩٢٤، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٨٧٤ / بە ژمارە: ٢٤٠٩.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٤٩ / بە ژمارە: ٥٧٠٤. هەروەها ئیمـامی موسـلیمیش ڕیوایەتی كردوە: بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤٠٣ / بە ژمارە: ٥٧٣.

## دروسته کەسێك کونیەی هەبێتو، سونەتیشە کونیە بۆ کەسانی گەورەو پایەبەرز بەکار بهێنرێت

ئەم باسە لەوە مەشـهورترە کـە ئێمـە شـتێکی لـەبارەوە نقـڵ بکـەین. چـونکە خوێندەوارو نەخوێندەوار هاوبەشن لە ئاگا لێبوونی بەڵگەکانیدا.

ئەدەبیش وەهایە، کە کەسانی پایەبەرزو ئەوانەش نزیکی ئەوانن بە کونیـە بـانگ بکرێن. بە هەمان شێوە ئەگەر نامەشیان بۆ بنوسێت. بە هەمان شێوە ئەگەر شتێکیان لێوە بگێڕدرێتەوە. بۆ نموونە بڵێت: شێخ یان پێشەوای پایەبەرز (أَبُـو فُـلان)، کـە فلانی کوڕی فلان بۆی گێڕاینەوە، یان شتێکی لەو جۆرە.

ئەدەبیش وەهایە کە پیاو کونیەی خۆی لە کتێبی خۆیـدا یـان لـە شـتێکی تـردا نەنوسێت، مەگەر ئەو کاتەی کە تەنها بە کونیەکەی ناسرابێت، یان کونیەکـەی لـە ناوەکەی مەشهورتر بێت.

زانای پایەبەرزی شارەزا لە زمانی عـەرەبی (أَبو جَعْفَر)ی (نَحَّاس) فەرموویـەتی: ئەگـەر کەسـێك کونیەکـەی لـە ناوەکـەی مەشـهورتر بـوو، بـا کونیەکـەی بـۆ بەکاربهێنرێت، بۆ کەسانی هاووێنەو هاوئاستی خۆی. بەڵام بۆ کەسـانی گـەورەترو بەرزتر، با ناوەکەی بەکاربهێنرێتو، پاشان بوترێت: ناسراو بە (أَبو فُلان).

## بەکارهێنانی کونیە بۆ پیاوێك بەناوی گەورەترینی منداڵەکانیەوە

پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) کونیەی (أَبو الْقَاسِم)ی بۆ بەکارهێنراوە، بەناوی (قَاسِم)ی کوڕیەوە، کە گەورەترینی منداڵەکانی بوە.

هەروەها لەم باسەدا ئەو حەدیسەی (أَبو شُرَيْح)یش هاتوە، کە پێشـتر لـە باسـی (**سونەتە ناو بگۆڕدرێت بۆ ناوی باشتر**)دا هێنامان.

## بەکارهێنانی کونیە بۆ پیاوێك بەناوی غەیری منداڵەکانی خۆیەوە

ئەم باسە باسێکی فراوانەو، ئەو کەسانەش کە ئەم جۆرە کونیانەیان بۆ بەکارهێنراوە هێندە زۆرن لە ژمارە نایەن‌و، بەکارهێنانەکەشی هیچ خراپەیەکی تێدا نیە.

## بەکارهێنانی کونیە بۆ ئەو کەسەی منداڵی نەبووە، بەکارهێنانیشی بۆ منداڵ

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، لە هەموو خەڵکی ڕەوشتی جوانترو شیرینتر بوو. منیش برایەکم هەبوو، پێی دەوترا (أَبو عُمَيْر) -ڕاوی حەدیسەکە فەرموویەتی: وابزانم (أَنَس) فەرمووی: براکەم لە شیر بڕابووەوە-، جا هەر کاتێك پێغەمبەری خوا تەشریفی بهێنایە بۆلای، دەیفەرموو: «يَا أَبَا عُمَيْرٍ، مَا فَعَلَ النُغَيْرُ». واتە: "ئەی (أَبو عُمَيْر)، باڵندە بچووکەکە چی کرد؟". چونکە براکەم باڵندەیەکی بچووکی هەبوو، گەمەی پێدەکرد.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە بە چەند ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و لە غەیری ئەویشدا، لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، هەموو هاوڕێکانم کونیەیان هەیە. پێغەمبەریش فەرمووی: دەی تۆش با کونیەت هەبێت بەناوی

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٩١ / بە ژمارە: ٥٨٥٠، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٩٢ / بە ژمارە: ٢١٥٠.

(عَبْدُالله)ی کوڕتەوە. ڕاوی حەدیسەکە فەرموویەتی: مەبەستی هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالله)ی کوڕی (زُبَيْر)ە، کە خوشکەزای بوەو، کوڕی (أسْمَاء)ی کچی ئیمامی (أَبو بَكْر) بوە. بۆیە ئیتر بە دایکە (عَائِشَة) دەوترا: (أُمُّ عَبْدِالله).[1]

منیش دەڵێم: لێکدانەوەی دروستو ناسراو بۆ حەدیسەکە هەر ئەمەیە.

سەبارەت بەوەش کە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا بۆمان ڕیوایەت کراوە، لە دایکە (عَائِشَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: منداڵێکم لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لەبارچوو، پێغەمبەریش ناوی لێنا: (عَبْدُالله)و، (أُمُّ عَبْدِالله)شی کرد بە کونیە بۆم.[2] ئەوە حەدیسێکی لاوازە.[3]

هەروەها لە هاوەڵانیشدا چەند کۆمەڵێك هەبوون، بەر لەوەی منداڵیان هەبێت، کونیەیان بۆ بەکارهێنراوە. وەکو (أَبو هُرَيْرَة)و، {(أَنَس)ی کوڕی (مَالِك)، کە پێی وتراوە (أَبو حَمْزَة)}و، خەڵکانێکی لە ژمارەنەهاتووش لە هاوەڵانو شوێنکەوتوانو کەسانی دوای ئەوانیش. وە ئەم کارەش هیچ ناپەسەندیەکی تێدا نیە. بەڵکو کارێکی باشو پەسەندە بەو مەرجەی کە پێشتر باسمان کرد (ئەویش ئەوەبوو، کە نابێت درۆی تێدابێتو، لەسنووردەرچوونیشی تێدابێت).

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧١١ / بە ژمارە: ٤٩٧٠.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٩٩ / بە ژمارە: ٤١٧.

(٣) کەسێك لە ڕشتەکەیدایە، بەناوی (دَاوُد)ی کوڕی (مُحَبَّر). هەندێك لە زانایان بە درۆزنیان داناوە. بۆیە دەکرێت بوترێت: حەدیسێکی (مَوْضُوْع)و هەڵبەستراوە. بڕوانە: التَّلْخِيْصُ الْحَبِيْر / ٤ / ٢٧٠ / لەدوای حەدیسی ژمارە: ٤٢٢٠، وعُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّي / ٤٧٢ – ٤٧٣.

## باسی نەهی کردن لە بەکارهێنانی کونیەی (أَبُو الْقَاسِم)

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە کۆمەڵێك لە هاوەڵانەوە -لەناویاندا (جَابِر)و (أَبُو هُرَيْرَة) (خوایان لێ ڕازی بێت)-، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «سَمُّوا بِاسْمِيْ، وَلا تُكَنُّوا بِكُنْيَتِي».[1] واتە: "ناوەکەم بکەن بەناو بۆ خۆتان، بەڵام کونیەکەم بەکارمەهێنن".

منیش دەڵێم: زانایان سێ بۆچوونی جیاوازیان هەیە سەبارەت بە دروستی بەکارهێنانی کونیەی (أَبُو الْقَاسِم):

١) ئیمامی (شَافِعِيّ) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)و ئەوانەش هاوبۆچوونی ئەون پێیان وایە کە حەڵاڵ نیە بۆ هیچ کەسێك (أَبُو الْقَاسِم) بکات بە کونیە بۆ خۆی، ئیتر ناوی (مُحَمَّد) بێت یان ناوێکی تری هەبێت.

جا لەو هاوەڵانەمان کە ئەم بۆچوونەیان لە ئیمامی (شَافِعِيّ)ـەوە گێڕاوەتەوە: پێشەوایانی پایەبەرزو متمانەدارو شەرعزانو فەرموودەناس (أَبُو بَكْر)ی (بَيْهَقِيّ)و، (أَبُو مُحَمَّد)ی (بَغَوِيّ) لە سەرەتای (كِتَابُ النِّكَاح)ی کتێبی (التَّهْذِيْب)داو، (أَبُو الْقَاسِم)ی (ابْنُ عَسَاكِر) لە (تَارِيْخُ دِمَشْق)دا.

٢) بۆچوونی دوەم بریتیە لە مەزهەبی ئیمامی (مَالِك) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت): کە پێی وایە دروستە (أَبُو الْقَاسِم) بکرێت بە کونیە بۆ ئەو کەسەی ناوی (مُحَمَّد)ەو، بۆ ئەو کەسەش کە ناوێکی تری هەیە. ئەو نەهیەش کە هاتوە تایبەتی کردوە بە کاتی ژیانی پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت).

٣) بۆچوونی سێیەم: پێی وایە کە دروست نیە (أَبُو الْقَاسِم) بۆ کەسێك بەکاربهێنرێت کە ناوی (مُحَمَّد)ە، بەڵام بۆ کەسانی تر دروستە.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٣٠١ / بە هەردوو ژمارە: ٣٣٤٥ و ٣٣٤٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٨٣ - ١٦٨٤ / بە هەردوو ژمارە: ٢١٣٣ و ٢١٣٤.

پێشەوای پایەبەرز (أَبو الْقَاسِم)ی (رَافِعِيّ) -کە یەکێکە لە هاوەڵاندروست کردنمان- فەرموویەتی: لەوە دەچێت ئەم بۆچوونەی سێیەمیان لە دوانەکەی تر دروستر بێت. چونکە خەڵکی لە هەموو سەردەمانێکدا ئەو کونیەیان بەکارهێناوەو، کەسیش ئینکاری لێ نەکردوە.

جا ئەوەی کە خاوەنی ئەم بۆچوونە فەرموویەتی، سەرپێچیەکی ئاشکرای تێدایە بۆ دەقی حەدیسەکە.

سەبارەت بەوەش کە خەڵکی بەشێوەیەکی گشتی کردویانەو، ئەو کەسانەش ئەو کونیەیان بۆ خۆیان هەڵبژاردوەو، ئەوانەش بۆیان بەکارهێناون بریتی بوون لە پێشەوایانی ناودارو، زانایانی ئەهلی (حَلّ)و (عَقْد)و، ئەوانەی کە خەڵکی لە بابەتە گرنگ‌و سەرەکیەکانی ئایندا شوێنیان دەکەون، ئەوە پشتگیری مەزهەبەکەی ئیمامی (مَالِك)ی تێدایە، کە بەکارهێنانی ئەو کونیەیە بەرەهایی دروستە. بەمەش ئەو زانایانە وا لە نەهیەکە تێگەیشتون، کە تایبەتە بە ژیانی پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، وەکو مەشهورە کە هۆکاری نەهی کردنەکە ئەوە بوە، کە یەهودیەکان کونیەی (أَبو الْقَاسِم)یان بۆ خۆیان بەکار دەهێناو، بە مەبەستی ئازاردانی پێغەمبەریش یەکتریان پێ بانگ دەکرد. ئەم مانایەش ئێستە نەماوە. خواش لە هەموو کەس زاناترە.

## دروستە کەسی کافرو بیدعەکارو تاوانبار بە کونیە ناوبرێن، ئەگەر تەنها بەوە دەناسرانەوە، یان ناوبردنیان ترسی ئاشوبو فیتنەی لێ دەکرا

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِيْ لَهَبٍ﴾ [الْمَسَد: ١] واتە: {هەردوو دەستەکانی (أَبو لَهَب) لەناو بچن‌و بفەوتێن}. ناویشی (عَبْدُ الْعُزَّى) بوە.

وتراوه: بۆیه به کونیه باسکراوه. چونکه بەوه ناسراوه.

وتراویشه: لەبەر خراپی ناوەکەی بوە، کە کراوە بە بەندەی بتێك (عَبْدُ الْعُزَّى).

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أسَامَةَ)ی کوڕی (زَیْد)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) سواری گوێدرێژێك بوو، بۆئەوەی بچێتە عیادەو سەردانی هاوەڵی خۆشەویست (سَعْد)ی کوڕی (عُبَادَة) (خوای لێ ڕازی بێت). ئیتر حەدیسەکەی باس کردو، باسی ئەوەشی کرد کە پێغەمبەر لە ڕێگەدا بەلای (عَبْدُالله)ی کوڕی (أُبَيّ)ی کوڕی (سَلُوْل)ی دووڕوودا تێپەڕی. پاشان تەشریفی برد هەتا چوە ژوورەوە بۆلای (سَعْد)ی کوڕی (عُبَادَة)و، پێی فەرموو: "ئەی سەعد، گوێت لێ نەبوو (أبو حُبَاب) چی دەوت؟" -کە مەبەستی (عَبْدُالله)ی کوڕی (أُبَيّ) بوو-، ئا وەها وەهای دەوت..... ئیتر تەواوی حەدیسەکەی باس کرد.[1]

منیش دەڵێم: لە حەدیسدا چەندین جار کونیەی (أبو طَالِب) هاتوەو، ناویشی (عَبْدُ مَنَاف) بوە.

لە حەدیسی (صَحِیْح)یشدا هاتوە، کە ئەمە گۆڕی (أبو رِغَال)ە.[2]

هەروەها هاووێنەکانی ئەمانە گەلێك زۆرن. بۆ هەمووشیان دەبێت ئەو مەرجە هاتبێتەجێ کە لە ناونیشانی باسەکەدا باسمان کرد. خۆ ئەگەر مەرجەکە نەهاتبوەجێ، ئەوا نابێت لە ناوەکەی زیاتر بوترێت. وەکو بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٦٦٣ / بە ژمارە: ٤٢٩٠، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٤٢٢ / بە ژمارە: ١٧٩٨.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أبِيْ دَاوُد / ٢ / ١٩٨ / بە ژمارە: ٣٠٨٨، والْمُعْجَمُ الْأَوْسَط / ٣ / ١٥٨ / بە ژمارە: ٢٧٨٨، وسُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٤ / ١٥٦ / بە ژمارە: ٧٤٤٢.

لە یەکێك لە نامەکانیدا نوسیبووی: "لە (مُحَمَّد)ی بەندەو پێغەمبەری خواوە، بۆ (هِرَقْل)".[1] وەك دەبینرێت تەنها بە ناوەکەی ناوی بردوەو، کونیەی بۆ بەکار نەهێناوەو، نازناوی پاشای ڕۆمیشی بۆ بەکار نەهێناوە، کە قەیصەرە.

هەروەها هاوویّنەکانی ئەمەش گەلێك زۆرن‌و، ئێمەش -وەکو موسوڵمان- فەرمانمان پێکراوە کە ڕەق‌و زبر بین لەگەڵیاندا. بۆیە نابێت کونیە یان عیبارەتێکی ناسکیان بۆ بەکار بهێنین‌و، ناشبێت قسەی نەرمیان لەگەڵدا بکەین‌و، ناشبێت خۆشەویستی‌و دۆستایەتیان بۆ دەرببڕین.

## دروستە کونیەی (باوکی فلان) بۆ پیاوو، (دایکی فلان) بۆ ژن بەکار بهێنرێت، ئیتر فلانەکە نێرینە بێت یان مێیینە

بزانە کە هەموو ئەمانە هیچ ڕێگریەکیان لەسەر نیەو، کۆمەڵێکی زۆر لە پێشەوایانی (سَلَف)ی ئەم ئومەتە، لە هاوەڵان‌و شوێنکەوتوان‌و، خەڵکانی دواتریش کونیەی (أَبو فُلانَة)یان هەبوە.

یەکێك لەوانە ئیمامی (عُثْمَان)ی کوڕی (عَفَّان)ـە، کە سێ کونیەی هەبوە: (أَبُوْ عَمْرو)و (أَبُوْ عَبْدِالله)و (أَبُوْ لَيْلَى).

یەکێکیش لەوانە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ الدَّرْدَاء)و، ژنەکەیەتی -واتە: (أُمُّ الدَّرْدَاء)ی گەورە-، کە یەکێك بوە لە ژنەهاوەڵان‌و، ناویشی (خَيْرَة) بوە. هەروەها ژنی دوەمیشی کە (أُمُّ الدَّرْدَاء)ی بچووکە، ناوی (هُجَيْمَة) بوەو، ئافرەتێکی پایەبەرزی قەدرگرانی شەرعزانی زۆر ژیری ڕێزداری شوێنکەوتوان بوە.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٧ / بە ژمارە: ٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٣٩٣ / بە ژمارە: ١٧٧٣.

یەکێکیش لەوانە (أَبُوْ لَيْلَى)ی باوکی زانای پایەبەرز (عَبْدُالرَّحْمَن)ی کوڕی (أَبُوْ لَيْلَى)یە، کە ژنەکەشی پێی وتراوە (أُمُّ لَيْلَى)و، خۆیشیو ژنەکەشی هاوەڵی خۆشەویستی پێغەمبەری خوا بوون.

یەکێکیش لەوانە: هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ أُمَامَة)یە. هەروەها کۆمەڵێکی تریش لە هاوەڵان. لەوانە: (أَبُوْ رَيْحَانَة)و، (أَبُوْ رِمْثَة)و، (أَبُوْ رِيْمَة)و، (أَبُوْ عَمْرَة) (بَشِيْر)ی کوڕی (عَمْرو)و، (أَبُوْ فَاطِمَة)ی (لَيْثِيّ)، کە وتراوە: ناوی (عَبْدُالله)ی کوڕی (أُنَيْس) بووەو، (أَبُوْ مَرْيَم)ی (أَزْدِيّ)و، (أَبُوْ رُقَيَّة) (تَمِيْم)ی (دَارِيّ)و، (أَبُوْ كَرِيْمَة) (مِقْدَام)ی کوڕی (مَعْدِ يَكْرِب)، کە هەموو ئەمانە هاوەڵی خۆشەویستی پێغەمبەری خوا بوون.

لە شوێنکەوتوانیش (أَبُوْ عَائِشَة) (مَسْرُوْق)ی (أَجْدَع)و، خەڵکانێکی زۆریش، کە لەژمارە نایەن.

ئیمامی (سَمْعَانِيّ) لە کتێبی (الْأَنْسَاب)دا فەرموویەتی: بۆیە پێی وتراوە (مَسْرُوْق). چونکە کەسێك بە منداڵی دزیویەتیو، پاشان دۆزراوەتەوە.[1]

هەروەها لە چەند حەدیسێکی (صَحِيْح)یشدا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا (خوای لێ ڕازی بێت) کونیەی (أَبُو هُرَيْرَة)ی بۆ ئەو هاوەڵە خۆشەویستە بەکارهێناوە.[2]

* * * * *   * * * * *   * * * * *

(١) بڕوانە: الْأَنْسَاب / ١٣ / ٤٢٧. لە نیسبەتی (هَمَذَانِيّ)دا / بە ژمارە: ٥٢٦٤.

(٢) وەکو ئەوەی کە فەرموویەتی: «أَيْنَ كُنْتَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ». بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ١٠٩ / بە ژمارە: ٢٧٩، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٢٨٢ / بە ژمارە: ٣٧١.

بزانە -کە ئەگەر خوای گەورە بیـەوێت- ئـەم کتێبـە چـەند باسـێکی پـەرت‌و بلاوی ئەو زیکرو دوعایانەی تێدا باس دەکەم -کە ئەگەر خوای گـەورە بیـەوێت- سوودی زۆر گەورەیان دەبێت‌و، ڕێسایەکی دیاریکراویشیان نیە، تا ئێمـە بەهۆیـەوە ڕێکخستن‌و ڕیزبەندیەکی تایبەتیان بۆ بکەین. تەوفیقیش تەنها بە دەستی خوایە.

## سونەتە لەکاتی بیستنی مژدەی دڵ خۆشکەردا سوپاس‌و ستایشی خوای گەورە بکرێت

بزانە کە ئەو کەسەی، نازو نیعمەتێکی ئاشکرا ڕووی تێکردەوە، یان نەگبـەتی‌و نەهاتیەکی ئاشکرای لـەکۆڵبوەتەوە، سونەتە سـەجدەیەك بـات بـۆ شـوکرانەبژێری خوای گەورەو، سوپاس‌و ستایشی بکات بەو جۆرەی کە شایستەی ئەوە.

ئەو حەدیس‌و فەرمایشتانەش کە لـەو بارەوە هاتون، گەلێك زۆرو مەشهورن.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لـە زانـای پایەبـەرز (عَمْـرو)ی کوڕی (مَیْمُوْن)ـەوە، دەربارەی شەهیدبوونی ئیمامی (عُمَـر)ی کـوری (خَطَّـاب) (خوای لێ ڕازی بێت)، لـەو حەدیسە درێژەدا کە باسی شوراو ڕاوێژ دەکات، هـاتوە کـە ئیمامی (عُمَر) (خوای لێ ڕازی بێت) (عَبْدُالله)ی کوڕی نارد بۆلای دایکە (عَائِشَة) (خـوای لێ ڕازی بێت)، تا داوای مۆڵەتی لێ بکات، کە ئەمیش لـەگەڵ دوو ڕەفیقەکەیدا (واتـە: پێغەمبەرو ئیمامی أَبو بَكْر) ئەسپەردەی خاك بکرێت. جا کـە (عَبْـدُالله) گەڕایـەوە، ئیمامی (عُمَر) فەرمووی: "چی خەبەرێکت پێیە؟" ئەویش عەرزی کرد: "ئەوەی کـە جەنابت پێت خۆشە، ئەی پێشەوای ئیمانداران. دایکە (عَائِشَة) مۆڵەتی دا کە لـەوێ ئەسپەردە بکرێیت". ئیمـامی (عُمَر)یـش فـەرمووی: "سـوپاس‌و سـتایش بـۆ خـوای گەورە، هیچ شتێك لـەوە گرنگتر نەبوو بەلامەوە".[1]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٣٥٣ / بە ژمارە: ٣٤٩٧.

## ئەگەر کەسێك گوێی لە قوقەی کەڵەشێرو، سەڕینی گوێدرێژو، وەڕینی سەگەوە بوو چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێـت)، ئەویش لـە پێغەمبەری خواوە (درورودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویـەتی: «إِذَا سَمِعْتُمْ نُهَاقَ الْحَمِيرِ، فَتَعَـوَّذُوا بِـاللهِ مِـنَ الشَّيْطَانِ، فَإِنَّهَا رَأَتْ شَيْطَاناً، وَإِذَا سَمِعْتُمْ صِيَاحَ الدِّيَكَةِ، فَاسْأَلُوا اللهَ مِنْ فَضْلِهِ، فَإِنَّهَا رَأَتْ مَلَكاً».[1] واتە: "ئەگەر گوێتان لـە سـەڕینی گوێدرێـژەوە بـوو، پـەنا بـەخوای گەورە بگرن لـە شەیتان. چونکە گوێدرێژەکە چاوی بە شـەیتانێك کـەوتوە. ئەگـەر گوێشتان لە قووقەی کەڵەشێرەوە بوو، داوای فـەزڵو بەخشـش لـەخوای گـەورە بکەن. چونکە کەڵەشێرەکە چاوی بە فریشتەیەك کەوتوە".

بۆشمـان ڕیوایـەت کـراوە لـە (سُـــنَن)ی ئیمـامی (أَبُـــو دَاوُد)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ی کـوڕی (عَبْـــدُالله)ـــەوە (خـوا لـە هـەردووکیان ڕازی بێـت)، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درورودی خوای لەسەر بێت) فەرموویـەتی: «إِذَا سَمِعْتُمْ نُبَاحَ الْكِلَابِ وَنَهِيْقَ الْحَمِيْرِ بِاللَّيْلِ، فَتَعَوَّذُوا بِاللهِ، فَإِنَّهُنَّ يَرَيْنَ مَا لَا تَرَوْنَ».[2] واتە: "ئەگەر بە شەودا گوێتان لـە وەڕینی سەگو سەڕینی گوێدرێژەوە بوو، پـەنا بـەخوا بگـرن. چونکە ئەوان شتێك دەبینن، کە ئێوە نایبینن".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٢٠٢ / بە ژمارە: ٣١٢٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٩٢ / بە ژمارە: ٢٧٢٩.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٤٨ / بە ژمـارە: ٥١٠٣. ئیمـامی (حَـاكِم) فەرموویـەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە لەسەر مەرجی ئیمامی موسلیم. ئیمامی (بَغَـوِيّ)ش فەرموویـەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّـحِيْحَيْن / ٤ / ٣١٦ / بـە ژمارە: ٧٧٦٢، وشَرْحُ السُّنَّة لِلْبَغَوِيّ / ١١ / ٣٩٢.

## ئەگەر کەسێك چاوی بە ئاگر کەوت چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە (عَمْرو)ی کوڕی (شُعَيْب)ـەوە، ئەویش لە باوکیەوەو، ئەویش لە باپیرەیـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە فەرموویەتی: پێغەمبـەری خـوا (درودی خوای لەسـەر بێت) فەرموویـەتی: «إِذَا رَأَيْـتُمُ الْحَرِيْقَ، فَكَبِّرُوا، فَإِنَّ التَّكْبِيْرَ يُطْفِئُهُ».[1] واتە: "ئەگـەر ئاگرتـان بینـی، (اللهُ أَكْبَـر) بکەن. چونکە کردنی (اللهُ أَكْبَر) ئاگرەکە دەیکوژێنێتەوە".

سونەتیشە لـەگەڵ ئەوەدا دوعای خەم‌و خەفەت‌و ئەو دوعایانـەی تـریش بکـات کە پێشـتر لــە ((**کتێبـی زیکرەکـانی کـارە پێشـهاتەکان‌و، ئەوانـەی کـاتی بـەڵاو نەهامەتی**))دا باسمان کردن.

## ئەگەر کەسێك لە کۆڕێك هەستا چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و لە غەیری ئەویشدا، لــە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبـەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، فەرموویەتی: «مَنْ جَلَسَ فِي مَجْلِسٍ، فَكَثُرَ فِيْهِ لَغَطُـهُ، فَقَالَ قَبْلَ أَنْ يَقُومَ مِنْ مَجْلِسِهِ ذَلِكَ: "سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَـهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ، وَأَتُوبُ إِلَيْكَ"، إِلاَّ غُفِرَ لَهُ مَا كَانَ فِيْ مَجْلِسِهِ ذَلِـكَ». واتـە: "ئـەو کەسەی لە کۆڕێدا دابنیشێت‌و، بەر لەوەی هەستێت، بڵێت: (پـاکی‌و بێگـەردی‌و سوپاس‌و ستایش بۆ خوای گەورە، شایەتی دەدەم کە هیچ پەرسـتراوێکی ڕاستەقینە

---

(١) بڕوانـە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّـنِّيّ) / ١٤٦ / بـە ژمـارە: ٢٩٤. شـێخی (مُنَـاوِيّ) فەرموویەتی: ڕشتەکەی لاوازە، بەڵام پاڵپشتی هەیە. بۆیە ئیمامی (سُيُوْطِيّ) هێمای (حَسَن)ی بۆ داناوە. بڕوانە: فَيْضُ الْقَدِيْر / ١ / ٣٦٠.

نیە بێجگە لە جەنابت، داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم‌و، بە پەشیمانیەوە دێمە خزمەتت) ئەوا خوای گەورە لە هەموو ئەو هەڵەو قسە خراپانەی دەبوورێت، کە لەو کۆڕەدا کردوونی".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُوْ دَاوُد)و لە غەیری ئەویشدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو بَرْزَة)وە -کە ناوی (نَضْلَة)یە- (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەو فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) لە کۆتایی دانیشتن‌و کۆڕەکانیدا (یان لە کۆتایی تەمەنیدا) ئەگەر بیویستایە لە کۆڕێك هەستێت، دەیفەرموو: «سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ، وَأَتُوبُ إِلَيْكَ». جا پیاوێك عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، تۆ فەرمایشتێك دەکەیت، کە پێشتر نەتکردوە! ئەویش فەرمووی: "ئەو فەرمایشتە دەبێتە کەفارەتی ئەوەی لەو کۆڕەدا ڕوویداوە".[2]

ئیمامی (حَاكِم)یش لە کتێبی (الْمُسْتَدْرَك)دا ئەم حەدیسەی لە ڕێگەی دایکە (عَائِشَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت) ڕیوایەت کردوەو، فەرموویەتی: ڕشتەکەی (صَحِيْح).[3]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبی (حِلْيَةُ الْأَوْلِيَاء)دا، لە ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەو کەسەی پێی خۆشە بە تەواوترین پێوانە پاداشت دەست بخات، با لە کۆتایی دانیشتنیدا لە کۆڕێك، یان لە کاتی هەستانیدا بڵێت: ﴿سُبْحانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ، وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ [الصَّافات: ١٨٠ - ١٨٢] واتە: {پەروەردگاری تۆ -کە پەروەردگاری هێزو

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٩٤ / بە ژمارە: ٣٤٣٣.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٨١ / بە ژمارە: ٤٨٥٩.

(٣) بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٦٧٤ / بە ژمارە: ١٨٢٧.

تواناو دەسەڵاتە- پاكو خاوێنە لــەوەی ئــەوان وەســفداری دەكــەن. ســڵاویش لــە پێغەمبەرەكان بێتو، سوپاسو ستایشیش بۆ خوای پەروەردگاری هەموو عالـەم}.[1]

## باسی پاڕانەوەی كەسێك لە كۆڕێكدا بۆ خۆیو بۆ ئەوانەشی لەگەڵیدان

بۆمــان ڕیوایــەت كــراوە لــە كتێبەكــەی ئیمــامی (تِرْمِــذِيّ)دا، لــە هــاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووكیان ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: كــەم جــار پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) لــە كۆڕێــك هەڵدەســتا، تــا بــەم دوعایانــە نەپاڕایەتەوە بۆ هاوەڵەكانی: «اللَّهُمَّ، اقْسِمْ لَنَا مِنْ خَشْيَتِكَ مَا يَحُــولُ بَيْنَنَــا وَبَــيْنَ مَعَاصِيْكَ، وَمِنْ طَاعَتِكَ مَا تُبَلِّغُنَا بِهِ جَنَّتَكَ، وَمِنَ الْيَقِينِ مَا تُهَوِّنُ بِهِ عَلَيْنَــا مَصَــائِبَ الدُّنْيَا، اللَّهُمَّ، مَتِّعْنَا بِأَسْمَاعِنَا وَأَبْصَارِنَا وَقُوَّتِنَا مَا أَحْيَيْتَنَا، وَاجْعَلْهُ الْوَارِثَ مِنَّا، وَاجْعَلْ ثَأْرَنَا عَلَى مَنْ ظَلَمَنَا، وَانْصُرْنَا عَلَى مَنْ عَادَانَا، وَلا تَجْعَلْ مُصِيبَتَنَا فِي دِينِنَا، وَلا تَجْعَلِ الدُّنْيَا أَكْبَرَ هَمِّنَا، وَلا مَبْلَغَ عِلْمِنَا، وَلا تُسَلِّطْ عَلَيْنَا مَنْ لا يَرْحَمُنَــا». واتــە: "خوایــە ئەوەندە ترسی خۆت بخــەرە نێــو دڵــەكانمان، كــە ببێتــە بەربەســت لــەنێوان ئێمــەو بێفەرمانی تۆدا. ئەوەندەش گوێڕایــەڵی خۆتمــان پــێ ببەخشــە، كــە بــەهۆی ئــەوەوە بمانگەیەنێتە بەهەشت. ئەوەندەش یەقینو دڵنیاییمان پێ ببەخشە، كە بەهۆی ئــەوەوە بــەڵاو كارەســاتەكانی دنیامــان لــەلا ســووكو ئاســان بكــەیت. خوایــە، ئەوەنــدەی دەمانژێنیت توانای بیستنو بینینو هێزی دینداریمان پێ ببەخشەو، بیانكە بە میراتگری سەرجەم تواناكانی تری لاشەمانو، با تاوەكو دەژێین ئەو هێزانەمان بمێنێت، تۆڵەشمان لەو كەسانە بۆ بسێنەرەوە، كە ستەمیان لێكردووینو، پشتیوانیشمان بكەو ســەرمان بخە بەسەر ئەو كەسانەی دژایەتیمان دەكەن. تووشــی بــەڵاو كارەســاتمان مەكــە لــە

---

(١) بڕوانە: حِلْيَةُ الْأَوْلِيَاءِ وَطَبَقَاتُ الْأَصْفِيَاء / ٧ / ١٢٣. ڕشتەكەی لاوازەو، بە (مُرْسَل)یش لە ڕێگەی ئیمامی (شَعْبِيّ)ـەوە لە پێغەمبەری خواوە ڕیوایەت كراوە. بڕوانــە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٣٠٦، والْفُتُوحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٦ / ١٧٠.

ئاینەکەماندا، دنیاش مەکە بە ئومێدی هەرە گەورەمانو بە ئەوپەڕی هیواو ئاواتمان، کەسێکیش مەکە بە دەسەڵاتدار بەسەرمانەوە، کە بەزەیی پێماندا نەیەتەوە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

## هەستان لە کۆڕێك بەر لەوەی زیکری خوای گەورە بکرێت ناپەسەندە

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و لە غەیری ئەویشدا، بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، فەرموویەتی: «مَا مِنْ قَوْمٍ يَقُوْمُوْنَ مِنْ مَجْلِسٍ، لا يَذْكُرُونَ اللهَ تَعَالَى فِيْهِ، إِلاَّ قَامُوا عَنْ مِثْلِ جِيْفَةِ حِمَارٍ، وَكَانَ لَهُمْ (عَلَيْهِمْ) حَسْرَةً».[2] واتە: "هەر کۆمەڵێك لە کۆڕێك هەستنو، زیکری خوایان تێدا نەکردبێت، وەکو ئەوە وەهایە کە لەسەر لاکی گوێدرێژێکی بۆگەنکردوو هەستابنەوەو، دواتریش دەبێتە مەراقو پەشیمانی بۆیان".

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ قَعَدَ مَقْعَداً لَمْ يَذْكُرِ اللهَ تَعَالَى فِيْهِ، كَانَتْ عَلَيْهِ مِنَ اللهِ تِرَةٌ، وَمَنْ اضْطَجَعَ مَضْجَعاً لا يَذْكُرُ اللهَ تَعَالَى فِيْهِ، كَانَتْ عَلَيْهِ مِنَ اللهِ تِرَةٌ».[3] واتە: "ئەو کەسەی لە جێگەیەکدا دابنیشێتو، زیکری خوای تێدا نەکات، دواتر لەلای خوا بۆی دەبێت بە خەفەتو پەشیمانی. ئەو کەسەش لە جێگەیەکدا

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٢٨ / بە ژمارە: ٣٥٠٢.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٨٠ / بە ژمارە: ٤٨٥٥.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٨٠ / بە ژمارە: ٤٨٥٦. ئیمامی نەوەوی پێشتر ئەم حەدیسەی هێناو، فەرمووی ڕشتەکەی جوانە.

ڕاکشێت‌و، زیکری خوای تێدا نەکات، دواتر لەلای خوا بۆی دەبێت بە خەفەت‌و پەشیمانی ".

منیش دەڵێم: (تِرَة) واتە: نوقسانی. وتراویشە: دەرەنجامی خراپ. دەشکرێت بەمانای (حەسرەت‌و پەشیمانی) بێت، وەکو لە ڕیوایەتەکەی تردا هاتوە.

لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)شدا بۆمان ڕیوایەت کراوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَا جَلَس قَوْمٌ مَجْلِساً لَمْ يَذْكُرُوا اللهَ تَعَالَى فِيْهِ، ولَمْ يُصَلُّوا عَلَى نَبِيِّهمْ فِيْهِ، إِلاَّ كَانَ عَلَيْهِمْ تِرَةً، فَإِنْ شَاءَ عَذَّبَهُمْ، وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُم». واتە: "هەر کۆمەڵێك لە جێگەیەکدا دابنیشن‌و، زیکری خوای تێدا نەکەن‌و، صەلاواتیش لەسەر پێغەمبەری خوا نەدەن، دانیشتنەکەیان دەبێتە پەشیمانی‌و خەفەت لەسەریان. جا ئەگەر خوای گەورە بیەوێت سزایان دەدات‌و، ئەگەر بیشیەوێت لێیان خۆش دەبێت".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

## باسی زیکر کردن بەدەم ڕێ کردنەوە

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَا مِنْ قَوْمٍ جَلَسُوا مَجْلِساً لَمْ يَذْكُرُوا اللهَ -عَزَّ وَجَلَّ- فِيْهِ، إِلاَّ كَانَتْ عَلَيْهِمْ تِرَةٌ، وَمَا سَلَكَ رَجُلٌ طَرِيْقاً لَمْ يَذْكُرِ اللهَ -عَزَّ وَجَلَّ- فِيْهِ،

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٦١ / بە ژمارە: ٣٣٨٠. لە نوسخە بەچاپگەیەنراوەکاندا نوسراوە: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.

إِلاَّ كانَتْ عَلَيْهِ تِرَةٌ».[1] واتە: "هەر کۆمەڵێك لـە جێگەیەکـدا دابنیشـنو، زیکـری خوای تێدا نەکەن، دانیشتنەکەیان دەبێتە دەرەنجامی خراپو لێـی پـەشمان دەبنـەوە. ئەو کەسەش بەرێگەیەکدا بڕواتو، زیکری خـوای تێـدا نـەکات، ئـەو ڕۆیشـتنەی دەبێتە دەرەنجامی خراپو لێی پەشیمان دەبێتەوە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)و لـە (دَلائِلُ النُّبُـوَّة)ی ئیمامی (بَيْهَقِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو أُمَامَة)ی (بَاهِلِيّ)ـەوە (خـوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: جوبرەئیل تەشریفی هێنا بۆ خزمەتی پێغەمبـەری خـوا (درووودی خوای لەسەر بێت)، ئەویش لـە غەزای (تَبُوك)دا بوو، پێی فـەرموو: {ئـەی مُحَمَّد، وەرە ئامادەبە لـەسەر تەرمی هاوەڵی خۆشەویست (مُعَاوِيَة)ی کوڕی (مُعَاوِيَة)ی (مُزَنِيّ)}. پێغەمبەریش تەشریفی هێنایە دەرەوەو، جوبرەئیلیش لـەگەڵ حەفتا هەزار (٧٠٠٠٠) فریشتەدا دابەزینو، باڵی ڕاستی خستە سەر چیاکانو، ئـەوانیش ملکـەچ بـوونو نزمبوونەوە، بـاڵی چەپیشـی خسـتە سـەر زەویـەکانو، ئـەوانیش ملکـەچ بـوونو نزمبوونەوە، هەتا پێغەمبەر چاوی بە هەردوو شاری پیرۆزی (مَكَّة)و (مَدِيْنَة) کەوت. ئەوجا پێغەمبەرو جوبرەئیلو فریشتەکان نوێژیان لـەسەر کـرد. جـا کـە لێبوویـەوە، فەرمووی: "ئەی جوبرەئیل، بەچی (مُعَاوِيَة) گەیشتۆتە ئەم پایە؟" ئـەویش فـەرمووی: بە خوێندنی سـورەتی ﴿قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ﴾ بەڕاوەسـتانو، بەدانیشـتنو، بەسـواریو، بەپیادە.[2]

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٩٣ / بە ژمـارە: ١٧٩. ڕشـتەکەی لاوازە. بـەڵام دەقی حەدیسەکە بەهۆی بوونی پاڵپشتەوە (صَحِيْح)ـە. بڕوانە: عُجَالَةُ الرَّاغِـبِ الْمُتَمَنِّـي / ٢٣١ - ٢٣٢.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٩٤ / بە ژمـارە: ١٨٠، ودَلائِلُ النُّبُوَّة (الْبَيْهَقِيّ) / ٥ / ٢٤٦. حەدیسـێکی زۆر لاوازە. بڕوانـە: مَجْمَـعُ الزَّوَائِـد / ٣ / ٣٧ - ٣٨ / بـە ژمارەکانی: ٤١٩٧ - ٤١٩٩، وعُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّي / ٢٣٢ - ٢٣٦.

## ئەگەر کەسێك تووڕە بوو چی بڵێت؟

خوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ [آل عِمْرَان: ١٣٤] واتە: {ئەوانەی ڕقی خۆیان دەخۆنـەوەو، لـە خـەڵکی دەبوورنو، خوای گەورەش چاکەکارانی خۆش دەوێت}.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَإِمَّا يَنْزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ العَلِيمُ﴾ [فُصِّلَت: ٣٦] {ئەگەر وەسوەسەو خەیاڵاتێك لە شەیتانەوە ڕووی لـە دڵت کرد، پەنا بەخوا بگرە، چونکە بەڕاستی ئەو بیسەرو زانایە}.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هـاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە پێغەمبـەری خـوا (دروودی خـوای لەسەر بێت) فەرموویـەتی: «لَيْسَ الشَّدِيدُ بِالصُّرَعَةِ، إِنَّمَا الشَّدِيدُ الَّذِي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الْغَضَبِ».[1] واتە: "کەسی ئازا بە زۆرانبازی نیە، کە کەس دەرەقـەتی نەیـەو نەیـدا بەزەویدا، بەڵکو کەسی ئازا ئەو کەسەیە، کە لەکاتی تووڕەبووندا جڵەوی نەفسـی خۆی بەدەستە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هـاوەڵی خۆشەویسـت (ابْنُ مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خـوای لەسـەر بێت) فەرموویەتی: «مَا تَعُدُّونَ الصُّرَعَةَ فِيْكُمْ؟». واتە: "لـەناو خۆتاندا کێ بە زۆرانباز دادەنێن؟" ئێمەش عـەرزمان کـرد: (ئـەو کەسـەی کـە پـاوان نایـدەن بەزەویـدا). پێغەمبەریش فەرمووی: «ئەوە نیە، بەڵکو ئەو کەسـەیە، کـە لـەکاتی تووڕەبوونـدا جڵەوی نەفسی خۆی بەدەستە».[2]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٦٧ / بە ژمارە: ٥٧٦٣، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠١٤ / بە ژمارە: ٢٦٠٩.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠١٤ / بە ژمارە: ٢٦٠٨.

منیش دەڵێم: (صُرَعَة) بە (ضَمَّة)ی صادو، بە فەتحەی دالەکەیە. کە بریتیە لەو کەسەی، زۆرجار خەڵکی بەزەویدا دەدات (دەنێتە ژێر). ئەمیش وەکو هەردوو وشەی (هُمَزَة)و (لُمَزَة) وەهایە، کە ئەو کەسەیە تانەوتەشەر لە خەڵکی زۆر دەدات.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (مُعَاذ)ی کوڕی (أَنَس)ی (جُهَنِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، فەرموویەتی: «مَنْ كَظَمَ غَيْظاً، وَهُوَ قَادِرٌ عَلَى أَنْ يُنَفِّذَهُ، دَعَاهُ اللهُ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَلَى رُؤُوسِ الْخَلاَئِقِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُخَيِّرَهُ مِنَ الْحُورِ مَا شَاءَ». واتە: "ئەو کەسەی ڕقی خۆی بخواتەوەو، تواناشی هەبێت ڕقەکەی بە کەسێك بڕێژێت، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا لەبەرچاوی هەموو خەڵکی بانگی دەکات، هەتا سەرپشکی بکات لە حۆریەکانی بەهەشت کامەیانی دەوێت هەڵیبژێرێت بۆ خۆی".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (سُلَيْمَان)ی کوڕی (صُرَد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (دروودی خوای لەسەر بێت) دانیشتبووم، دوو پیاویش قسەیان بەیەکتر دەوت، یەکێکیان دەموچاوی سوور هەڵگەڕاو، دەمارەکانی لاملیشی هەڵاوسانو فوویان تێبوو، پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: «إِنِّي لَأَعْرِفُ كَلِمَةً، لَوْ قَالَهَا، لَذَهَبَ عَنْهُ مَا يَجِدُ، لَوْ قَالَ: "أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ" ذَهَبَ عَنْهُ مَا يَجِدُ». واتە: "من فەرمایشتێك دەزانم، ئەگەر ئەو کەسە بیڵێت، تووڕەییو ناڕەحەتیەکەی نامێنێت. فەرمایشتەکەش ئەمەیە: (أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٦٢ / بە ژمارە: ٤٧٧٧، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٣٧٢ / بە ژمارە: ٢٠٢١، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٤٠٠ / بە ژمارە: ٤١٨٦.

الرَّجِيمِ)". جا هاوەڵان بە کابرای تووڕەیان فەرموو: "پێغەمبەری خـوا (دروودی خـوای لەسەر بێت) فەرمووی: با (أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ) بکات. کـابراش وتـی: بـۆ من شێتم؟!"[1]

هەروەها مانای ئەم حەدیسەشمان لە هـەردوو کتێبەکـەی ئیمـامی (أَبُــو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا بۆ ڕیوایەت کراوە، لـە ڕێگەی زانای پایەبەرز (عَبْــدُالرَّحْمَن)ی کـوڕی (أَبُوْ لَيْلَى)وە، ئەویش لـە هاوەڵی خۆشەویست (مُعَاذ)ی کوڕی (جَبَل)ـەوە (خـوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لـە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت).[2]

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: ئەمە حەدیسێکی (مُرْسَل)ـە. مەبەستی ئەوەیە، کە (عَبْدُالرَّحْمَن) بە خزمەتی (مُعَاذ) نەگەیشتوە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّــنِّيّ)دا، لــە (عَائِشَـــة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا (دروودی خوای لەسەر بێت) تەشریفی هێنایە ژوورەوە بۆلامو، منیش لــەو کاتــەدا تـووڕە بـووم، ئەویش دەستی هێناو، لالووتی گرتمو، پرواندی‌و، پاشان فەرمووی: «يَـا عُــوَيْشُ، قُوْلِيْ: اللَّهُمَّ، اغْفِرْ لِيْ ذَنْبِيْ، وَأَذْهِبْ غَيْظَ قَلْبِيْ، وَأَجِرْنِيْ مِنَ الشَّــيْطَانِ».[3] واتـە: "ئەی (عَائِشَة)، بڵێ: خوایە لـە تاوانم خۆشبەو، ئەم ڕق‌و تووڕەییەی دڵم لابەو، لـە شەیتانیش بمپارێزە".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١١٩٥ / بە ژمارە: ٣١٠٨، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠١٥ / بە ژمارە: ٢٦١٠.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٦٣ / بە ژمارە: ٤٧٨٠، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٠٤ / بـە ژمارە: ٣٤٥٢.

(٣) بڕوانـە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّــنِّيّ) / ٢١٦ / بـە ژمـارە: ٤٥٥. حـافظـی عێراقـی فەرموویەتی: ڕشتەکەی لاوازە. بڕوانـە: الْمُغْنِيْ عَنْ حَمْلِ الْأَسْفَار / ١ / ٢٩٦ / بـە ژمـارە: ١١٢٩.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَطِيَّة)ی کوڕی (عُرْوَة)ی (سَعْدِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِنَّ الْغَضَبَ مِنَ الشَّيْطَانِ، وَإِنَّ الشَّيْطَانَ خُلِقَ مِنَ النَّارِ، وَإِنَّمَا تُطْفَأُ النَّارُ بِالْمَاءِ، فَإِذَا غَضِبَ أَحَدُكُمْ، فَلْيَتَوَضَّأْ».[1] واتە: "تووڕەبوون لە شەیتانەوەیەو، شەیتانیش لە ئاگر دروستکراوەو، ئاگریش تەنها بە ئاو دەکوژێتەوە. جا ئەگەر یەکێك لە ئێوە تووڕەبوو، با دەستنوێژ بگرێت".

## ئەگەر کەسێك کەسێکی خۆشویست، سونەتە پێی بڵێت، کە خۆشی دەوێت، سونەتە کەسی بەرامبەریش وەڵامی بداتەوە

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (مِقْدَام)ی کوڕی (مَعْدِيكَرِب)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «إِذَا أَحَبَّ الرَّجُلُ أَخَاهُ، فَلْيُخْبِرْهُ أَنَّهُ يُحِبُّهُ». واتە: "ئەگەر پیاوێك برایەکی ئاینی خۆی خۆشویست، با پێی ڕابگەیەنێت، کە خۆشی دەوێت".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[2]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٦٤ / بە ژمارە: ٤٧٨٤. ئیمامی (أَبو دَاوُد) هیچی لەبارەی ئەم حەدیسەوە نەفەرموە. ئەمەش وا دەگەیەنێت، کە بۆ بەڵگەهێنانەوەو پشت پێ بەستن بشێت.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٥٤ / بە ژمارە: ٥١٢٤، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٥٥٩ / بە ژمارە: ٢٣٩٢.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پیاوێك لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بوو (دروودی خوای لەسەر بێت)، پیاوێکیش بەوێدا تێپەڕی‌و، ئەویش وتی: "پێغەمبەری خوا، بەڕاستی ئەو پیاوەم خۆش دەوێت". پێغەمبەریش پێی فەرموو: "ئاگادارت کردۆتەوە؟" ئەویش عەرزی کرد: "نەخێر". پێغەمبەریش فەرمووی: "دەی ئاگاداری بکەرەوە". ئیتر ئەویش کەوتە شوێنی پیاوەکەو، پێی وت: "من لەبەر خاتری خوا تۆم خۆش دەوێت". پیاوەکەش وتی: "ئەو کەسەش تۆی خۆش بوێت، کە تۆ منت لەبەر خاتری ئەو خۆش دەوێت".[١]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (نَسَائِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (مُعَاذ)ی کوڕی (جَبَل)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) دەستی گرت‌و، فەرمووی: «يَا مُعَاذُ، وَاللهِ إِنِّي لَأُحِبُّكَ، أُوْصِيْكَ يَا مُعَاذُ، لا تَدَعَنَّ فِيْ دُبُرِ كُلِّ صَلاةٍ أَنْ تَقُولَ: اللَّهُمَّ، أَعِنِّيْ عَلَى ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ».[٢] واتە: "ئەی (مُعَاذ)، سوێند بەخوا من بەڕاستی تۆم خۆش دەوێت، جا وەسێتت بۆ دەکەم، کە لەدوای هەموو نوێژەکانەوە واز لەم زیکرە نەهێنیت: خوایە یارمەتیم بدە لەسەر زیکری خۆت‌و لەسەر شوکرانەبژێری خۆت‌و، لەسەر بەندایەتی بۆ کردنت بە شێوەیەکی جوان".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٥٤ / بە ژمارە: ٥١٢٥. ئیمامی (حَاكِم)یش ڕیوایەتی کردووە، فەرموویەتی: ڕشتەکەی (صَحِيْح)ە. بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ٤ / ١٨٩ / بە ژمارە: ٧٣٢١.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٧٥ / بە ژمارە: ١٥٢٢، وسُنَنُ النَّسَائِيِّ / ٣ / ٥٣ / بە ژمارە: ١٣٠٣. ئیمامی نەوەوی پێشتر فەرمووی: ڕشتەکەی (صَحِيْح)ەو، ئیمامی (حَاكِم)یش فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ە لەسەر مەرجی بوخاری‌و موسلیم. بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٤٠٧ / بە ژمارە: ١٠١٠.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِــذِيّ)دا، لــە شــوێنکەوتووی پایەبەرز (یَزِیْد)ی کوڕی (نَعَامَة)ی (ضَبِيّ)ــەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کــە فەرموویــەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویــەتی: «إِذَا آخَى الرَّجُــلُ الرَّجُــلَ، فَلْيَسْأَلْهُ عَنِ اسْمِهِ وَاسْمِ أبيه وَمِمَّنْ هُوَ، فَإِنَّه أَوْصَــلُ لِلْمَــوَدَّةِ».[1] واتــە: "ئەگــەر کەسێك ویستی ببێتە براو هاوڕێی کەسێك، با پرسیاری ناوی خۆیو ناوی باوکی لێ بکاتو، لێشی بپرسێك کە لە چی هۆزو عەشــرەتێکە، چــونکە ئــەم پرســیارکردنە زیاتر دەبێتە هۆی پەیدابوونی خۆشەویستی".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (غَرِیْب)ــەو، ئێمەش تــەنها لەم ڕێگەیەوە ئاگامان لێیەتی. هەروەها فەرموویــەتی: واش نــازانین کــە (یَزِیْــد)ی کــوڕی (نَعَامَة) حەدیســی لــە پێغەمبــەری خــواوە بیســتبێت. دیســان فەرموویــەتی: حەدیسێکی وەکو ئەم حەدیسەش لە هاوەڵی خۆشەویســت (ابْنُ عُمَر)ەوە ڕیوایــەت کراوە، ئەویش لـە پێغەمبەرەوە. بەڵام ڕشتەکەی (صَحِیْح) نیە.

منیش دەڵێم: بۆچوونی جیاواز هەیە سەبارەت بــە هــاوەڵێتی (یَزِیْــد)ی کــوڕی (نَعَامَة):

زانای پایەبەرز (عَبْدُالرَّحْمَن)ی کوڕی (أَبو حَاتِم) فەرموویەتی: هاوەڵ نیە. ئەوجا فەرموویەتی: ئیمامی بوخــاری وای هێنــاوە کــە هاوەڵــە. پاشــان فەرموویــەتی: ئــەو بۆچوونە بە هەڵە دانراوە.[2]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٥٩٩ / بە ژمارە: ٢٣٩٢.

(٢) بڕوانە: الْجَرْحُ وَالتَّعْدِيْل (لابْنِ أَبِي حاتِمِ الرَّازِيّ) / ٩ / ٢٩٢ / بە ژمارە: ١٢٤٧. شــێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ئەو فەرمایشتەی زانای پایەبــەرز (عَبْــدُالرَّحْمَن)ی کــوڕی (أَبــو حَاتِم) جێگەی سەرنجە، کە فەرموویەتی: "ئیمامی بوخاری وای هێناوە کە (یَزِیْد)ی کــوڕی (نَعَامَة) هاوەڵە". چونکە ئیمامی (تِرْمِذِيّ) لـە کتێبی (الْعِلَل)دا فەرموویەتی: دەربــارەی ئــەم حەدیسە پرسیارم لـە ئیمامی بوخاری کرد، ئەویش فەرمووی: "حەدیسێکی (مُرْسَــل)ــە".

## ئەگەر کەسێکی بینی، تووشی نەخۆشی، یان بەڵایەك بووبوو چی بڵێت؟

بۆمـان ڕیوایـەت کـراوە لـە کتێبەکـەی ئیمـامی (تِرْمِــذِيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ رَأَى مُبْتَلىً، فَقَالَ: "الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِيْ عَافَـانِيْ مِمَّا ابْتَلاكَ بِهِ، وَفَضَّلَنِيْ عَلَى كَثِيْرٍ مِمَّنْ خَلَقَ تَفْضِيلاً" لَمْ يُصِبْهُ ذَلِكَ الْـبَلاءُ». واتـە: "ئەو کەسەی چاوی بە کەسێکی دەردەدارو لێقەوماو بکەوێت‌و، بڵێت: (سـوپاس‌و ستایش بۆ ئەو خوایەی، منی سەلامەت کردوە لەوەی تۆی پـێ دەردەدارو گـیرۆدە کردوەو، فەزڵیشی داوم بەسەر زۆرێـك لەوانـەی دروسـتی کـردوون)، ئـیتر ئـەو بەڵایەی تووش نابێت".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە ئیمـامی (عُمَــر)ی کوڕی (خَطَّاب)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، فەرموویـەتی: «مَنْ رَأَى صَاحِبَ بَلاءٍ، فَقَالَ: "الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِيْ عَافَانِيْ مِمَّا ابْتَلاكَ بِهِ، وَفَضَّلَنِيْ عَلَى كَثِيْرٍ مِمَّنْ خَلَقَ تَفْضِيلاً" إِلاَّ عُوْفِيَ مِنْ ذَلِكَ الْبَلاءِ كَائِناً مَا كَـانَ، مَـا عَاشَ». واتە: "ئەو کەسەی چاوی بـە کەسـێکی دەردەدارو لێقـەوماو بکـەوێت‌و، بڵێت: (سوپاس‌و ستایش بۆ ئەو خوایەی، منی سەلامەت کـردوە لـەوەی تـۆی پـێ دەردەدارو گیرۆدە کـردوەو، فەزڵیشـی داوم بەسـەر زۆرێـك لەوانـەی دروسـتی کردوون)، هەتا ماوە لەو بەڵایە سەلامەت دەبێت، با بەڵاکە هەرچیش بێت".

---

وەکو بڵێیت: ئیمامی بوخاری (يَزِيْد)ی کوڕی (نَعَامَة)ی بە هاوەڵ دانەناوە. بڕوانە: تَهْذِيْبُ التَّهْذِيْب / ١١ / ٣٦٤. هەروەها بڕوانە: عِلَلُ التِّرْمِذِيِّ الْكَبِيْر / ٣٣٠ / لەسەر حەدیسی ژمارە: ٦١٢.

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٩٣ / بە ژمارە: ٣٤٣٢.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) ڕشتەکەی بە لاواز داناوە.[1]

منیش دەڵێم: زانایانی هاوەڵانمان‌و غەیری ئەوانیش فەرموویانە: پێویستە کەسەکە ئەم زیکرە بە نهێنیو بە پەنهانی بڵێت، بەجۆرێك کە خۆی گوێی لێبێت‌و، کابرای توشبوو گوێی لێ نەبێت، نەوەکو دڵی بەو قسەیە ئازاری پێ بگات، مەگەر ئەوەی تووشی بوە تاوان بێت، ئەو کاتە هیچی تێدا نیە کە گوێشی لێبێت، بە مەرجێك ترسی ئەوەی نەبێت، کە بەهۆی ئەو زیکرەوە تووشی ئاشووب‌و فیتنە ببێت. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِـذِيّ / ٥ / ٤٩٣ / بە ژمارە: ٣٤٣١. بەڵام حەدیسەکەی پێشوو پاڵپشتی دەکات.

## ئەگەركەسێك پرسیاری حاڵی خۆی، یان خۆشەویستێکی لێکرا، سونەتە لەگەڵ ئەوەی کە وەڵام دەداتەوە، سوپاس و ستایشی خوای گەورەش بکات، ئەگەر وەڵامەکەی هەواڵی باش و خۆشی تێدابوو

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە لەکاتی ئازارو نەخۆشی لەدنیا دەرچوونی پێغەمبەری خوادا (درودی خوای لەسەر بێت) ئیمامی (عَلِيّ) (خوای لێ ڕازی بێت) لە ماڵی پێغەمبەر تەشریفی هێنایە دەرەوە. جا هاوەڵان عەرزیان کرد: "ئەی باوکی حەسەن، پێغەمبەری خوا چۆنە؟" ئەویش فەرمووی: "سوپاس بۆ خوای گەورە، باشە".[1]

## ئەگەر کەسێك چوو بۆ بازاڕ چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و لە غەیری ئەویشدا، لە ئیمامی (عُمَر)ی کوڕی (خَطَّاب)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، فەرموویەتی: «مَنْ دَخَلَ السُّوقَ، فَقَالَ: "لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِيْ وَيُمِيْتُ، وَهُوَ حَيٌّ لا يَمُوْتُ، بِيَدِهِ الْخَيْرُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيْرٌ" كَتَبَ اللهُ لَهُ أَلْفَ أَلْفِ حَسَنَةٍ، وَمَحَا عَنْهُ أَلْفَ أَلْفِ سَيِّئَةٍ، وَرَفَعَ لَهُ أَلْفَ أَلْفِ دَرَجَةٍ».[2] واتە: "ئەو کەسەی بچێتە بازاڕەوەو، بڵێت: (هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە خوای تاك و تەنها، کە شەریکی نیەو، هەموو موڵك و سامان و دەسەڵاتێك هی ئەوەو، هەموو ستایشێکیش هەر شایستەی ئەوەو، ژیان و مردن بەدەستی ئەوەو، خۆیشی زیندوەو نامرێت و، هەموو خەیرێکیش بەدەستی ئەوەو، تواناشی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە)، خوای گەورە یەك ملیۆن

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣١١ / بە ژمارە: ٥٩١١.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٩١ / بە ژمارە: ٣٤٢٨.

چاکەو خەیری بۆ دەنوسێتو، یەك ملیۆن خراپەو تاوانیشی لێ دەسڕێتەوەو، یەك ملیۆن پلەش پلەی بەرز دەکاتەوە".

ئیمامی (حَاكِم) لە کتێبی (الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن)دا، لە چەندین ڕێگەوە ئەم حەدیسەی ڕیوایەت کردوەو، لە هەندێك لە ڕێگەکانەوە ئەمەشی بۆ زیاد کردوە: "وَبَنَى لَهُ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ". واتە: (خوای گەورەماڵێکیشی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەکات). هەروەها لە یەکێك لە ڕێگەکانەوە ئەمەشی زیادە: ڕاویەکە فەرموویەتی: منیش هاتمەوە بۆ خۆراسانو، چووم بۆلای فەرمانڕەوا (قُتَيْبَة)ی کوڕی (مُسْلِم)و، پێم وت: دیاریەکم بۆ هێناویت. ئەوجا حەدیسەکەم بۆ گێڕایەوە. ئیتر (قُتَيْبَة)ی کوڕی (مُسْلِم) لەگەڵ دەستو پەیوەندەکانیدا بەسواری دەهات بۆ بازاڕو، ئەو زیکرەی دەکردو، پاشان دەگەڕایەوە.[1]

هەروەها ئیمامی (حَاكِم) ئەم حەدیسەی لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە ڕیوایەت کردوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت).

ئیمامی (حَاكِم) فەرموویەتی: لەم باسەدا حەدیس لەم هاوەڵانەوە ڕیوایەت کراوە: (جَابِر)و، (أَبُو هُرَيْرَة)و، (بُرَيْدَة)ی (أَسْلَمِيّ)و، (أَنَس). ئەوجا فەرموویەتی: نزیکترینیان لە مەرجەکانی ئەم کتێبەوە (واتە: کتێبی الْمُسْتَدْرَك) بریتیە لە حەدیسەکەی (بُرَيْدَة)، بە غەیری ئەم دەقە.[2]

ئەوجا حەدیسەکەی بە ڕشتەی خۆی لە (بُرَيْدَة)وە ڕیوایەت کردوە، کە ئەو فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) تەشریفی ببردایەتە ناو بازاڕ، دەیفەرموو: «بِسْمِ اللهِ، اللَّهُمَّ، إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَ هَذِهِ السُّوْقِ، وَخَيْرَ مَا فِيْهَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ مَا فِيْهَا. اللَّهُمَّ، إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أُصِيْبَ فِيْهَا يَمِيْناً فَاجِرَةً أَوْ

(١) بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٧٢١ / بە ژمارە: ١٩٧٤.

(٢) بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٧٢٣ / بە ژمارە: ١٩٧٦.

صَفْقَةً خَاسِرَةً».[1] واته: "بەناوی خواوە، خوایە من داوای خێرو بێری ئەم بـازاڕەت لێ دەکەم، خەیرو بێری ئەوەش کە تێیدایە. پەناشت پێ دەگرم، لـە شەڕو شۆڕی ئەم بازاڕەو، شەڕو شۆڕی ئەوەش کە تێیدایە. خوایە من پـەنات پـێ دەگـرم کـە تێـدا تووشی سوێندی درۆو کڕین‌و فرۆشتنی زەرەرمەند ببم".

## ئەگەر کەسێك بە شێوەیەکی شەرعی ژنی هێنابوو، یان شتێکی کڕیبوو، یان کارێکی کردبوو، سوننەتە پێی بوترێت: پێکاوتە (أَصَبْتَ)، یان چاکت کردوە (أَحْسَنْتَ)، یان شتێکی لەو جۆرەی پێ بوترێت

بۆمان ڕیوایەت کـراوە لــە صــەحیحی موسـلیمدا، لــە هـاوەڵی خۆشەویسـت (جَابِر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبــەری خـوا (درورودی خـوای لەسـەر بێـت)، پێی فـەرمووم: «ئـەی جـابر، ژنـت هێنـا؟». منـیش عـەرزم کـرد: "بـەڵێ". فەرمووی: «کچ یان بێوەژن؟». منیش عەرزم کرد: (بیوەژن، ئەی پێغەمبەری خـوا). ئەویش فەرمووی: «فَهَلاَّ جارِيَةً، تُلاعِبُها، وَتُلاعِبُكَ؟». واتە: «ئەی بۆ کچ نەبوو، تـا یاری لەگەڵدا بکەویت‌و، یاریشت لەگەڵدا بکات؟». یان فەرمووی: «تُضَــاحِكُهَا وتُضَاحِكُكَ». منیش عەرزم کرد: (عَبْدُالله) -مەبەستی باوکی خـۆی بـوە- وەفـاتی کردوەو، نۆ یان حەوت کچی بەجێ هێشتوەو، منیش پێم ناخۆشبوو کچێکی وەکـو خۆیــان بهێنمــە ناویــان‌و، حــەزم کـرد ئافرەتێـك بهێـنم، سەرپەرشـتیان بکـات‌و، پەروەردەیان بکات. پێغەمبەریش فەرمووی: «أَصَبْتَ». واتە: (پێکاوتە). ئیتر تەواوی حەدیسەکەی باس کرد.[2]

---

(١) بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٧٢٣ / بە ژمارە: ١٩٧٧.

(٢) بڕوانـە: صَحِيْحُ مُسْــلِم / ٢ / ١٠٨٧ - ١٠٨٨ / بـە ژمـارە: ٧١٥. هــەروەها ئیمـامی بوخاریش ڕیوایەتی کردوە. بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٤٨٩ / بە ژمارە: ٣٨٢٦.

## ئەگەر کەسێك تەماشای ئاوێنەی کرد چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْـنُ السُّـنِّيِّ)دا، لە ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەگەر پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، تەماشای ئاوێنەی بکردایە، دەیفەرموو: «الْحَمْد لِلَّهِ، اللَّهُمَّ، كَمَا حَسَّـنْتَ خَلْقِـيْ فَحَسِّنْ خُلُقِيْ».[1] واتە: "سوپاس و ستایش بۆ خوا، خوایە وەکو بەشێوەیەکی جوان دروستت کردووم، هەروا ڕەوشت و ئاکاریشم جوان بکە".

هەروەها ئەم حەدیسەمان بە زیادەیەکەوە لەو کتێبەدا بۆ ڕیوایەت کراوە، لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيِّ)دا، لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە، کە ئەگەر پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، لە ئاوێنەدا تەماشای خۆی بکردایە، دەیفەرموو: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي سَوَّى خَلْقِيْ، فَعَدَلَهُ، وَكَرَّمَ صُورَةَ وَجْهِيْ، فَحَسَّنَهَا، وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ».[3] واتە: "سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی، کە بە ڕێك و پێکی دروستی کردووم و، ڕێزی لە وێنەی ڕوخسارم ناوە و، بەجوانی دروستی کردوە و، کردووشمی بە یەکێك لە موسوڵمانان".

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٨٥ – ٨٦ / بە ژمارە: ١٦٣. ڕشتەکەی زۆر لاوازە. بڕوانە: عُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّي / ٢١٧.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٨٦ – ٨٧ / بە ژمارە: ١٦٤. زیادەکەش لە ڕیوایەتەکەی (ابْنُ عَبَّاس)دا بەم جۆرەیە: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي حَسَّنَ خَلْقِي وَخُلُقِي، وَزَانَ مِنِّي مَا شَانَ مِنْ غَيْرِي». حەدیسێکی زۆر لاوازە، ئەگەر (مَوْضُوْع)یش نەبێت. بڕوانە: مَجْمَـعُ الزَّوَائِد / ٥ / ١٧٠ – ١٧١ / بە ژمارە: ٨٨٧٥، وإِتْحَافُ الْخِيْرَةِ الْمَهَرَة / ٤ / ٥٢٣ / بە ژمارە: ٤٠٦٦.

(٣) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٨٧ / بە ژمارە: ١٦٥. ڕشتەکەی زۆر لاوازە. بڕوانە: عُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّي / ٢١٨ – ٢١٩.

## ئەوەی لەکاتی گرتنی کەڵەشاخدا دەوترێت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ قَرَأَ "آيَةَ الْكُرْسِيِّ" عِنْدَ الْحِجَامَةِ، كَانَتْ لَهُ مَنْفَعَةُ حِجَامَتِهِ».[1] واتە: "ئەو کەسەی لەکاتی گرتنی کەڵەشاخدا (آيَةُ الْكُرْسِيّ) بخوێنێت، سوودی کەڵەشاخەکەی دەست دەکەوێت".

## ئەگەر کەسێك گوێی زرنگایەوە چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو رَافِع)ی (مَوْلَى)ی پێغەمبەری خواوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا طَنَّتْ أُذُنُ أَحَدِكُمْ فَلْيَذْكُرْنِي، وَلْيُصَلِّ عَلَيَّ، وَلْيَقُلْ: ذَكَرَ اللهُ بِخَيْرٍ مَنْ ذَكَرَنِي».[2] واتە: "ئەگەر گوێی یەکێك لە ئێوە زرنگایەوە، با ناوی من بباتو، صەلاواتم لەسەر بداتو، بشڵێت: (خوای گەورە بە چاکە باسی ئەو کەسە بکات، کە باسی من دەکات)".

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٨٨ / بە ژمارە: ١٦٧. ڕشتەکەی لاوازە. بڕوانە: عُجَالَةُ الرَّاغِب الْمُتَمَنِّي) / ٢٢١.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٨٧ / بە ژمارە: ١٦٦. شێخی (هَيْثَمِيّ) فەرموویەتی: ئیمامی (طَبَرَانِيّ) لە هەرسێ (مُعْجَم)ـەکەیدا ڕیوایەتی کردووەو، ڕشتەی ڕیوایەتەکەی (الْمُعْجَمُ الْكَبِيْر) ڕشتەیەکی (حَسَن)ـە. بەڵام ئیمامی سەخاوی بە لاوازی داناوەو، فەرموویەتی: سەیرە، کە شێخی (ابْنُ خُزَيْمَة) لە صەحیحەکەی خۆیدا هێناویەتی. بەڵکو شێخی (ابْنُ الْجَوْزِيّ)و هەندێك لە زانایان بە (مَوْضُوْع)یشیان داناوە. بەڵام شێخی (مُنَاوِيّ) پێی وایە، کە حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە. بڕوانە: مَجْمَعُ الزَّوَائِد / ١٠ / ١٣٨ / بە ژمارە: ١٧١٤٢، والْقَوْلُ الْبَدِيْع / ٤٢٢ - ٤٢٤، والْفَيْضُ الْقَدِيْر / ١ / ٣٩٩، وكَشْفُ الْخَفَاء / ١ / ١١٧ - ١١٨ / بە ژمارە: ٢٩٢.

# ئەگەر کەسێك قاچی سڕ بوو چی بلێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە (هَيْثَم)ی کوڕی (حَنَش)ـەوە، کە فەرموویەتی: لە خزمەتی هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالله)ی کوڕی ئیمامی (عُمَر)دا بووین، ئەویش قاچی سڕ بوو، جا پیاوێك عەرزی کرد: "ناوی خۆشەویستترین کەس بەلای خۆتەوە بهێنە" ئەویش فەرمووی: (يَا مُحَمَّدُ)، ئیتر کە هەستایەوە، وەکو لە پەتو پێبەند بەربووبێت وەهابوو.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە زانای پایەبەرزی شوێنکەوتوان (مُجَاهِـد)ەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێك لە خزمەتی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)دا قاچی سڕ بوو، ئەویش پێی فەرموو: "ناوی خۆشەویستترین کەس بەلای خۆتەوە بهێنە" پیاوەکەش وتی: (مُحَمَّدُ)، ئیتر سڕبوونەکەی لاچوو.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە زانای پایەبەرز (إِبْرَاهِيْم)ی کوڕی (مُنْذِر)ی (حِزَامِيّ)ـەوە -یەکێکە لەو مامۆستایانەی ئیمامی بوخاری، کە لە صەحیحەکەیدا حەدیسی لێوە ڕیوایەت کردوە- ئەو فەرموویەتی:

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٨٩ / بە ژمارە: ١٧٠. هەندێك کەس ئەم حەدیسەیان بە لاواز داناوە، بەلاّم کەسێك بەناوی (مَجْدِيْ غَسَّان مَعْرُوف)ـەوە کتێبێکی تایبەتی لەسەر داناوە، بە ناونیشانی: {الْقَوْلُ الْفَصْلُ الْمُسَدَّدُ فِيْ صِحَّةِ حَدِيْثِ (يَا مُحَمَّدُ)}، تێیدا سەلماندوویەتی، کە حەدیسێکی صەحیحە.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٨٨ - ٨٩ / بە ژمارە: ١٦٩. حەدیسێکی زۆر لاوازە، ئەگەر (مَوْضُوْع)یش نەبێت. چونکە کەسێك لە ڕشتەکەیدایە، بەناوی (غِيَاث)ی کوڕی (إِبْرَاهِيْم)، زۆربەی زانایان بە لاوازیان داناوە، بەڵکو هەندێکیان تۆمەتباریشیان کردوە بە درۆ کردن. بڕوانە: لِسَانُ الْمِيْزَان (لِلْعَسْقَلانِيّ) / ٦ / ٣١١ / بە ژمارە: ٦٠٠٢.

خەڵکی شاری (مَدِيْنَة)ی پیرۆز سەرسامن بە جوانی ئەو دێڕە هۆنراوەی شاعیری ناودار (أَبو الْعَتَاهِيَة)، کە فەرموویەتی:

وَتَخْدَرُ فِيْ بَعْضِ الْأَحَايِيْنِ رِجْلُـــهُ     فَإِنْ لَمْ يَقُلْ "يَا عُتْبُ" لَمْ يَذْهَبِ الْخَدَرُ[1]

واتە: لە هەندێك کاتدا قاچی سڕ دەبێت، جا ئەگەر نەڵێت: "ئەی عُتْبَــة" سڕبوونەکەی ناڕوات و لاناچێت.

## دروستە کەسێك دوعا لەو کەسە بکات، کە ستەمی لە موسوڵمانان، یان تەنها لە ئەو کردوە

بزانە کە ئەم باسە زۆر فراوانەو، سەبارەت بە دروستی ئەم کارەش چەندین دەقی قورئان و سونەت و کردەوەی (سَلَف)و (خَلَف)ی ئەم ئومەتە هاتون. خوای گەورەش لە چەندین جێگەی زانراوی قورئانی پیرۆزدا هەواڵی ئەوەی داوە، کە پێغەمبەرەکان (درودی خوایان لەسەر بێت) دوعایان لە کافرو بێباوەڕەکان کردوە.[2]

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا، لە ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) لە ڕۆژی (الْأَحْزَاب)دا فەرمووی: «مَلأَ اللهُ قُبُورَهُمْ وَبُيُوتَهُمْ نَاراً، كَمَا شَغَلُونَا عَنِ الصَّــلاةِ الْوُسْطَى».[1] واتە: "خوای گەورە گۆڕو ماڵەکانیان پڕ بکات لە ئاگر، وا مەشغوڵیان کردین و، نوێژی عەسرمان ڕۆیشت".

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٩٠.

(٢) خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَقَالَ نُوحٌ رَبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا﴾ [نُوْح: ٢٦].

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٠٧١ / بە ژمارە: ٢٧٧٣، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤٣٦ / بە ژمارە: ٦٢٧.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە چەند ڕێگەیەکەوە، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) دوعای لەو خەڵکانە کردوە کە قورئانخوێنەکانیان شەهید کردو، مانگێك بەردەوام دوعای لێ دەکردن‌و، دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ الْعَنْ رِعْلاً وَذَكْوَانَ وَعُصَيَّةَ».[1] واتە: "خوایە ئەم سێ هۆزە لە ڕەحمەتی خۆت دووربخەرەوە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، لەو حەدیسە درێژەی، سەبارەت بە چیرۆکەکەی (أَبو جَهْل)و هاوەڵە قورەیشیەکانی هاتوە، کاتێك پزانگی حوشترە سەربڕاوەکەیان خستە سەر پشتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەویش دوعای لێ کردن‌و، سێ جار فەرمووی: «اللَّهُمَّ، عَلَيْكَ بِقُرَيْشٍ». واتە: "خوایە بێباوەڕەکانی قورەیش بفەوتێنە". پاشان فەرمووی: «اللَّهُمَّ، عَلَيْكَ بِأَبِيْ جَهْلٍ، وَعُتْبَةَ بْنِ رَبِيْعَةَ.... هەتا هەر نۆ کەسەکەی ناو برد». ئیتر تەواوی حەدیسەکەی باس کرد.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) ئەم دوعایەی دەکرد: «اللَّهُمَّ، اشْدُدْ وَطْأَتَكَ عَلَى مُضَرَ. اللَّهُمَّ، اجْعَلْهَا عَلَيْهِمْ سِنِيْنَ كَسِنِيِّ يُوسُفَ».[1] واتە: "خوایە بە توندی هۆزی (مُضَر) بگرەو، سزایان بدەو، لەناویان ببە. خوایە با لەناوبردنەکەیان بە قات‌و قڕی‌و گرانی‌و

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٥٠٠ / بە ژمارە: ٣٨٦٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤٦٦ / بە ژمارە: ٦٧٥.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٩٤ / بە ژمارە: ٢٣٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٤١٨ / بە ژمارە: ١٧٩٤.

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٣٤١ / بە ژمارە: ٩٦١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤٦٧ / بە ژمارە: ٦٧٥.

وشكەساڵی بێت، وەکو گرانیو وشکەساڵیەکانی سەردەمی حەزرەتی (یُوْسُف) (دروودی خوای لەسەر بێت)".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَلَمَة)ی کوڕی (أَكْوَع)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پیاوێك لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بە دەستی چەپی نانی دەخوارد، ئەویش پێی فەرموو: (بە دەستی ڕاستت بخۆ). پیاوەکەش وتی: ناتوانم. پێغەمبەریش فەرمووی: (دەی با هەر نەتوانیت). جا خۆبەگەورەزانین ڕێگەی پێ نەدا. (سَلَمَة) فەرمووی: ئیتر لەو کاتە بەدواوە ئەو پیاوە نەیتوانی دەستی ڕاستی بەرز بکاتەوە بۆ دەمی.[1]

منیش دەڵێم: ئەو پیاوە بریتیە لە (بُسْر)ی کوڕی (رَاعِي الْعَيْر)ی (أَشْجَعِيّ)، کە یەکێك بوە لە هاوەڵان.

ئەم حەدیسە ئەوەی تێدایە، کە دروستە دوعا لەو کەسە بکرێت، کە سەرپێچی حوکمی شەرعی دەکات.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ی کوڕی (سَمُرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: خەڵکی شاری کوفە لای ئیمامی (عُمَر) (خوای لێ ڕازی بێت) شکاتیان لە هاوەڵی خۆشەویست (سَعْد)ی کوڕی (أَبو وَقَّاص) کرد (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە فەرمانڕەوایی لای بردو، کەسێکی تری خستە جێگەکەی..... ئیتر حەدیسەکەی باس کرد، هەتا فەرمووی: ئیمامی (عُمَر) پیاوێك یان چەند پیاوێکی لەگەڵ (سَعْد)دا نارد بۆ کوفە، تا هەواڵی (سَعْد) بپرسن. جا هیچ مزگەوتێك نەما، کە پرسیاری (سَعْد)ی تێدا نەکرێتو، خەڵکی مزگەوتەکەش هەر وەسفو ستایشیان دەکرد. هەتا چوە مزگەوتی هۆزی (بَنُو عَبْس)ـەوە، پیاوێك لەوان هەستایەوە، کە پێی

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٥٩٩ / بە ژمارە: ٢٠٢١.

دەوترا: (أُسَامَة)ی کوڕی (قَتَادَة)و، کونیەکەی (أَبو سَعْدَة) بوو، وتی: مادام تۆ پرسیارمان لێ دەکەیتو قسەمان وەردەگریت، دەی بزانە کە (سَعْد) لەگەڵ هیچ پۆلە چەکدارێکدا دەرناچێت بۆ شەڕو، دەستکەوتیش بە یەکسانی دابەش ناکاتو، لە قەزیەو بڕیارەکانیشدا دادپەروەر نیە.

(سَعْد)یش فەرمووی: دەی بەخوا منیش سێ دوعا دەکەم: خوایە ئەگەر ئەم بەندەی تۆ درۆ دەکاتو، ڕووپامایی دەکاتو بەشوێن ناوو ناوبانگدا دەگەڕێت، تۆش تەمەنی درێژ بکەو، بە هەژاریش بیژێنەو، تووشی فیتنەشی بکە.

جا دواتر ئەو (أُسَامَة) ناوە دەیوت: پیرێکی گیرۆدەو عەودالم، دوعاکەی (سَعْد) پێکاومی.

ئەو کەسەش کە حەدیسەکەی لە (جَابِر)ی کوڕی (سَمُرَة)وە ڕیوایەت کردوە، کە بریتیە لە (عَبْدُالْمَلِك)ی کوڕی (عُمَيْر)، فەرموویەتی: منیش لەم دواییانەدا ئەو (أُسَامَة) ناوەم بینی، کە لەپیریدا برۆکانی هاتبوونە سەر چاوەکانیو، دەچووە سەر ڕێگای کچانو، دەستی پێدا دەهێنانو، لاشەیانی دەگوشی.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عُرْوَة)ی کوڕی (زُبَيْر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە (أَرْوَى)ی کچی (أَوْس) -وتراویشە: أُوَيْس- لای (مَرْوَان)ی کوڕی (حَكَم) شکاتی لە هاوەڵی خۆشەویست (سَعِيْد)ی کوڕی (زَيْد) کرد (خوای لێ ڕازی بێت)، ئیدیعای ئەوەی کرد کە (سَعِيْد) بەشێك لە زەویەکی ئەوی بردوە بۆ خۆی. (سَعِيْد)یش (وکو پرسیارێکی نکوڵیکاری) فەرمووی: "من بەشێك لە زەویەکەی ئەوم بردوە، دوای ئەو فەرمایشتەی، کە لە پێغەمبەری خوام بیستوە (دروودی خوای لەسەر بێت)؟!". (مَرْوَان)یش لێی پرسی: چیت لە پێغەمبەری خوا بیستوە؟ ئەویش فەرمووی: لە

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٦٢ / بە ژمارە: ٧٢٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٣٤ / بە ژمارە: ٤٥٣.

پێغەمبەری خوام بیستوە، کە فەرموویەتی: «مَنْ أَخَذَ شِبْراً مِنَ الْأَرْضِ ظُلْماً، طُوِّقَهُ إِلَى سَبْعِ أَرَضِيْنَ». واتە: "ئەو کەسەی بستێك زەوی بە زوڵمو ستەم ببات بۆ خۆی، هەتا هەر حەوت چینی زەوی دەکرێت بە تەوقو دەکرێتە ملی". (مَرْوَان)یش پێی وت: دەی ئیتر منیش دوای ئەمە داوای بەڵگەو شایەتت لێ ناکەم. ئەوجا (سَعِيْد) فەرمووی: "خوایە ئەگەر ئەو ژنە درۆ دەکات، تۆش چاوەکانی کوێر بکەو، لە زەویەکەی خۆشیدا بیکوژە". جا (عُرْوَة) دەفەرموێت: ئەو ژنە نەمرد، هەتا چاوەکانی کوێر بوونو، لە زەویەکەی خۆیدا ڕێی دەکردو، کوتوپڕ کەوتە ناو چاڵێکەوەو، مرد.[1]

## باسی خۆبەری کردن لە کەسانی بیدعەکارو خراپەکار

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە زانای پایەبەرز (أَبُو بُرْدَة)ی کوڕی هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو مُوْسَى)ی (أَشْعَرِيّ)ـەوە، کە فەرموویەتی: (أَبُو مُوْسَى) (خوای لێ ڕازی بێت)، تووشی ئازارێکی سەخت بوو، بەهۆیەوە لەهۆشی خۆی چووبوو، لەو کاتەشدا سەری لە چاکی خێزانەکەی خۆیدا بوو[1]، جا خێزانەکەی دەستی کرد بە هاوار هاوارو، (أَبُو مُوْسَى)ش نەیدەتوانی هیچ شتێك بفەرموێت. پاشان کە هۆشی هاتەوە، فەرمووی: "من بەریم لەو کەسەی

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١١٦٨ / بە ژمارە: ٣٠٢٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٢٣١ / بە ژمارە: ١٦١٠.

(١) واتە: دایکی (أَبُو بُرْدَة) کە پێی وتراوە (أُمُّ عَبْدِالله)ی کچی (أَبُو دَوْمَة)و، وتراوە ناوی (صَفِيَّة)ی کچی (دَمُوْن) بوە. بڕوانە: فَتْحُ الْبَارِي / ٣ / ١٦٥، وَعُمْدَةُ الْقَارِي / ٨ / ٩٣.

پێغەمبەری خوا خۆی لێ بەری کردوە. چونکە پێغەمبەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێت) خۆی بەری کردوە لەم سێ کەسە: (الصَّالِقَة)و (الْحَالِقَة)و (الشَّاقَّة)".[1]

منیش دەڵێم:

- (الصَّالِقَة): ئەو کەسەیە، کە بە دەنگی بەرز هاوار دەکاتو دەقیژێنێت.
- (الْحَالِقَة): ئەو کەسەیە، کە لەکاتی لێقەوماندا قژی خۆی دەبڕێت.
- (الشَّاقَّة): ئەو کەسەیە، کە لەکاتی لێقەوماندا یەخەی خۆی دادەدڕێت.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە زانای پایەبـەرز (يَحْيَـــى)ی کوڕی (يَعْمَر)ەوە، کە فەرموویەتی: عەرزی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)م کـرد (خوای لە هـەردووکیان ڕازی بێـت): "ئـەی بـاوکی (عَبْـــدُالرَّحْمَن)، خـەڵکێك لای ئێمـە دەرکەوتوونو، قورئان دەخوێننو، بە قسەی بەتاڵی خۆیان دەڵـێن: "قـەزاو قـەدەر نیەو، زانستو قەدەری خواش لەکاتی پەیدابوونو ڕوودانی شتەکەدا پەیدا دەبێت" (پەنا بەخوا). (ابْنُ عُمَر)یش فەرمووی: "ئەگەر گەیشتیت بەوانە، خەبەریان پێ بدە، کە من لەوان بەریمو، ئەوانیش لە من بەرین".[2]

منیش دەڵێم: ئەو گومڕایانە درۆ دەکەن. بەڵکو خوای گەورە لەپێش دروسـت کردنی هەموو دروستکراوەکانەوە زانیاری لەبارەیانەوە هەبوە.

## ئەگەر کەسێك دەستی کرد بە لابردنی خراپەیەك چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبـەری خـوا

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤٣٦ / بە ژمارە: ١٢٣٤، وصَحِيْحُ مُسْـلِم / ١ / ١٠٠ / بە ژمارە: ١٠٤.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٦ / بە ژمارە: ٨.

(دروودی خوای لەسەر بێت) لە ڕۆژی فەتحدا تەشریفی هێنایە شاری (مَكَّة)ی پیرۆزەوەو، لەو کاتەدا سێ سەدو شەست (٣٦٠) بت لە دەوری کەعبەی پیرۆزدا هەبوون. ئیتر ئەویش بە دارێك، کە بەدەستیەوە بوو، لێی دەدانو، دەیفەرموو: ﴿جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا﴾ [الإسْرَاء: ٨١] واتە: {بەرنامەی ڕاستی ئیسلام هاتو، بەرنامی پوچەڵ لەناوچوو، بەڕاستی بەرنامەی پووچەڵ هەر زوو لەناوچوە}، ﴿جَاءَ الْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ الْبَاطِلُ وَمَا يُعِيدُ﴾ [سَبَأ: ٤٩] واتە: {بەرنامەی ڕاستی ئیسلام هاتو، بەرنامەی پووچەڵیش شتێکی پێ نیە تا بیخاتەڕوو، یان لەدوای لەناوچوون بیگەڕێنێتەوە}.[1]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٥٦١ / بە ژمارە: ٤٠٣٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٤٠٨ / بە ژمارە: ١٧٨١.

## ئەگەر کەسێك زمانی ڕاهاتبوو لەسەر قسەی خراپ چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو کتێبەکەی ئیمامی (ابْنُ مَاجَه)و شـێخی (ابْـــنُ السُّنِّيِّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (حُذَيْفَة)وە (خوای لێ ڕازی بێـت)، کە فەرموویـەتی: سکاڵای خراپگۆیی زمانم بردە خزمەتی پێغەمبـەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت)، ئەویش فـەرمووی: «أَيْنَ أَنْتَ مِنَ الاسْتِغْفارِ؟ إِنِّيْ لَأَسْتَغْفِرُ اللهَ -عَزَّ وَجَلَّ- كُلَّ يَـــوْمٍ مَائَةَ مَرَّةٍ».[1] واتە: "لەگەڵ داوای لێخۆشبوونکردندا چۆنیت؟ بەڕاستی من هـەموو ڕۆژێك سەد (١٠٠) جار داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە دەکەم".

## ئەگەر کەسێك ولاخەکەی سەرسمی دا چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمـامی (أَبُـــو دَاوُد)دا، لــە شـوێنکەوتووی بەناوبانگ (أَبو الْمُلَيْح)ـەوە، ئەویش لە (پیاوێکەوە)، کە فەرموویەتی: "جارێـك لــە پشتی پێغەمبەری خواوە سوار بووبووم، جـا ولاخەکـەی سـەرسمی داو، منیش وتم: (تَعِسَ الشَّيْطَانُ)". پێغەمبەری خواش (دروودی خـوای لەسـەر بێت) فـەرمووی: "مـەڵێ: (تَعِسَ الشَّيْطَانُ). چونکە ئەگەر وا بڵێیت، شەیتان خۆی گەورە دەکات، هەتا وەکو خانوویەکی لێ دێتو، دەشڵێت: ئەو سەرسمدانە بەهۆی هێـزی منـەوە بـوە. بـەڵام بڵـێ: (بِسْمِ اللهِ). چـونکە ئەگـەر وات وت، ئـیتر بچـووك دەبێتـەوە، هـەتا وەکـو مێشێکی لێ دێت".[2]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٢٥٤ / بە ژمارە: ٣٨١٧، عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيِّ) / ١٧٦ / بە ژمارە: ٣٦٢. ئیمـامی (حَاكِم) فەرموویـەتی: ڕشـتەکەی (صَـحِيْح)ـە لەسـەر مەرجی ئیمامی بوخاریو موسلیم. بەڵام بەلای ئیمـامی (بُوْصِيْرِيّ)ـەوە ڕشـتەکەی لاوازە. بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٦٩١ / بە ژمارە: ١٨٨٢، وَمِصْبَاحُ الزُّجَاجَة / ٤ / ١٣٤.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧١٤ / بە ژمارە: ٤٩٨٢.

منیش دەڵێم: ئیمامی (أَبُو دَاوُد) ئەم حەدیسەی بەم جۆرە لـە (أَبُو الْمُلَيْح)ـەوە ڕیوایەت کردوە، ئەویش لە (پیاوێکەوە)، کە لە پاشکۆو پشتی پێغەمبەری خواوە سوار بوە.

هەروەها ئەم حەدیسەمان لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)شدا بۆ ڕیوایەت کراوە[1]، لە ڕێگەی (أَبُو الْمُلَيْح)ـەوە، ئەویش لە باوکیەوە -کە یەکێك بوە لە هاوەڵان-و، بەپێی بۆچوونی دروستو مەشهوریش ناوی (أُسـامة) بوە. هەروەها چەند بۆچوونێکی تریش لەم بارەوە هاتوون.

جا هەردوو ڕیوایەتەکەش (صَحِيْح)و (مُتَّصِل)ن. چونکە ئەو پیاوە نەناسراوەی ڕیوایەتەکەی (أَبُو دَاوُد)یش هەر هاوەڵی پێغەمبەرەو، هاوەڵانیش (خوایان لێ ڕازی بێت) هەموویان دادپەروەرنو، نەناسرانیشیان هیچ زیانێکی نیە.

سەبارەت بە وشەی (تَعِسَ)ش وتراوە: واتە: تیاچوو. وتراویشە: کەوت. وتراویشە: سەرسمی دا. وتراویشە: شەڕی پێوە بلکێت.

جا بە کەسرەو بە فەتحەی عەینەکەش هاتوەو، فەتحەکەی مەشهورترەو، شێخی (جَوْهَرِيّ)ش لە (صِحَاح)ـەکەیدا هەر ئەوی باس کردوە.

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٤٠ / بە ژمارە: ٥٠٩.

## ئەگەر فەرمانڕەوای شارێك مرد، سوننەتە گەورەی شارەكە وتار بۆ خەڵكەكە بدات و، ئامۆژگاریان بكات و، فەرمانیان پێ بكات بە ئارام گرتن و، خۆ ڕاگرتن و، مانەوە لەسەر ئەوەی كە پێشتر لەسەری بوون

بۆمان ڕیوایەت كراوە لەو حەدیسە (صَحِيْح)ـە مەشهورەی، كە سەبارەت بە وتارەكەی ئیمامی (أَبُو بَكْر)ی (صِدِّيْق) هاتوە، لە ڕۆژی وەفاتی پێغەمبەری خوادا (دروودی خوای لەسەر بێت)، كە ئەو فەرمووی: "ئەو كەسەی پێشتر (مُحَمَّد)ی پەرستوە، ئەوا بەڕاستی (مُحَمَّد) وەفاتی كرد، ئەو كەسەش خوای پەرستوە، ئەوا خوا زیندوەو، نامرێت".[1]

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (جَرِيْر)ی كوڕی (عَبْدُالله)ەوە، كە ئەو ڕۆژەی هاوەڵی خۆشەویست (مُغِيْرَة)ی كوڕی (شُعْبَة) وەفاتی كرد، كە لەو كاتەدا فەرمانڕەوای هەردوو شاری (بَصْرَة)و (كُوْفَة) بوە. (جَرِيْر) هەستایە سەرپێ‌و، سوپاس‌و ستایشی خوای گەورەی كردو، فەرمووی: لەو خوایە بترسن كە تاكو تەنهایەو هاوبەشی نیەو، بە ویقارو لەسەرخۆ بن، هەتا فەرمانڕەوایەكتان بۆ دێت. چونكە هەر ئێستە بۆتان دێت.[2]

---

(١) بروانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤١٩ / بە ژمارە: ١١٨٥.

(٢) بروانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٣١ / بە ژمارە: ٥٨. ئەم حەدیسەم لە صەحیحی موسلیمدا نەبینیەوە!!

## باسی دوعا کردنی کەسێك بۆ ئەو کەسەی چاکەیەکی لەگەڵدا کردوە، یان چاکەیەکی لەگەڵ هەموو خەڵکدا یان لەگەڵ کۆمەڵە خەڵکێکدا کردوەو، ستایش کردنیو، هاندانی لەسەر ئەو کارە

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالله)ی کوڕی (عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) ویستی تەشریف ببات بۆ سەرئاو کردن، منیش ئاوم بۆ ئامادە کرد، جا کە تەشریفی هێنایە دەرەوە، فەرمووی: "کێ ئەم ئاوەی داناوە؟" ئیتر خەبەری پێدرا. ئەویش فەرمووی: "خوایە شارەزای بکەیت". ئیمامی بوخاری ئەمەشی بۆ زیاد کردوە: "لە ئاین شارەزای بکەیت ".[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو قَتَادَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، لەو حەدیسە درێژە گەورەیەدا، کە داگرەوەیە بەسەر چەندین موعجیزەی پێغەمبەری خوادا (دروودی خوای لەسەر بێت)، (أَبُو قَتَادَة) فەرموویەتی: جا پێغەمبەری خوا هەر بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن، هەتا شەو نیوە بوو، منیش لە تەنیشتی بوومو، پێغەمبەریش خەوەنوچکە دەیبردەوەو، لەسەر وڵاخەکەی لاربوویەوە، منیش هاتمە نزیکیو -بێ ئەوەی خەبەری بکەمەوە- خۆم داوە بەری هەتا لەسەر وڵاخەکە ڕاست بوویەوە. پاشان هەر بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن، هەتا زۆربەی شەو بەسەرچوو، جارێکی تریش لەسەر وڵاخەکەی لاربوویەوەو، منیش هاتمە نزیکیو -بێ ئەوەی خەبەری بکەمەوە- خۆم داوە بەری هەتا لەسەر وڵاخەکە ڕاست بوویەوە. پاشان هەر بەردەوام بوو هەتا کۆتایی بەرەبەیان، ئەوجا زیاتر لە دوو جارەکەی یەکەم لاربوویەوە، هەتا خەریکبوو بکەوێتە خوارەوە، منیش

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٦٦ / بە ژمارە: ١٤٣، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٩٢٧ / بە ژمارە: ٢٤٧٧.

هاتمە نزیکیو، خۆم داوە بەری. ئـەوجا پێغەمبـەری خـوا سـەری بـەرز کـردەوەو، فەرمووی: "ئەوە کێیە؟" منیش عەرزم کرد: (أَبُو قَتَادَةَ)م. فـەرمووی: "لـە کەیـەوە لەگـەڵ منـدا ڕێ دەکـەیت؟" منـیش عـەرزم کـرد: هـەر لـە سـەرەتای شـەوەوە لەخزمەتتدام. ئەویش فـەرمووی: «حَفِظَكَ اللَّهُ بِمَا حَفِظْتَ بِهِ نَبِيَّـهُ». واتـە: "خـوا بتپارێزێت، بەهۆی ئەوەی کە پێغەمبەرەکەیت پاراست". ئیتر تەواوی حەدیسـەکەی باس کرد.[1]

بۆشمـان ڕیوایـەت کـراوە لـە کتێبەکـەی ئیمـامی (تِرْمِـذِيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (أُسَامَة)ی کوڕی (زَيْد)ەوە (خوا لـە هـەردووکیان ڕازی بێـت)، ئـەویش لـە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویـەتی: «مَنْ صُنِعَ إِلَيْهِ مَعْرُوفٌ، فَقالَ لِفاعِلِهِ: "جَزَاكَ اللهُ خَيْراً"، فَقَدْ أَبْلَغَ فِي الثَّنَاءِ». واتە: "ئەو کەسەی چـاکەیەکی لەگەڵدا بکرێتو، بە چاکەکەرەکە بڵێت: (خوا پاداشتی خـەیرت بداتـەوە)، ئـەوە ئەوپەڕی ستایشی بەجێهێناوە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (نَسَائِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)و لـە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویسـت (عَبْدُاللّه)ی کـوڕی (أَبُو رَبِيْعَة)وە (خـوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبـەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) چـل هـەزار (درهەم)ی لێ قەرز کردم، جا کەماڵێ دەستکەوتێکی بۆ هات، دای بـە مـن (واتـە قەرزەکەی دامەوە)و، فەرمووی: «بَارَكَ اللهُ لَكَ فِيْ أَهْلِكَ وَمَالِكَ، إِنَّمَا جَزَاءُ السَّلَفِ

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤٧٢ / بە ژمارە: ٦٨١.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٣٨٠ / بە ژمارە: ٢٠٣٥.

الْحَمْدُ وَالْأَدَاءُ».[1] واتـه: "خـوا بەرەکـەت بخاتـە خێـزانو ماڵەکەتـەوە. بەڕاسـتی پاداشتی قەرز تەنها بریتیە لە ستایشی خاوەنەکەی، دانەوەی قەرزەکەی".

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هـاوەڵی خۆشەویست (جَرِيْر)ی کـوڕی (عَبْدُاللهِ)ی (بَجَلِـيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە فەرموویەتی: لەسەردەمی نەفامیدا خانوویەکی هۆزی (خَثْعَم) هـەبوو، پێـی دەوتـرا: (الْكَعْبَةُ الْيَمَانِيَّة)و، پێیشی دەوتـرا: (ذُو الْخَلَصَة). پێغەمبـەری خـواش (درودی خوای لەسەر بێت) پێی فەرمووم: "ئەوە بـۆ دڵـو دەروونم ئاسـودە ناکـەیت‌و (ذُو الْخَلَصَـــة)م لـەکۆڵ ناکەیتــەوە؟". منـیش لـەگـەڵ سـەدو پـەنجا (١٥٠) سوارچـاکی هـۆزی (أَحْمَس)دا چووین بۆی‌و، کێی تێدابوو کوشتمان‌و، هاتینەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەرو، خەبەرمان پێدا. ئەویش دوعای بۆ ئێمەو، بۆ هۆزی (أَحْمَس)یش کرد.[2]

لـە ڕیوایەتێکیشدا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) پێـنج جـار دوعای بەرەکەتی بۆ ئەسپ‌و پیاوە جەنگاوەرەکانی هۆزی (أَحْمَس) کرد.[3]

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویسـت (ابْـــنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)،

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ النَّسَائِيّ / ٧ / ٣١٤ / بە ژمـارە: ٤٦٨٣، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ٨٠٩ / بـە ژمارە: ٢٤٢٤، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْـنُ السُّـنِّيّ) / ١٣٧ - ١٣٨ / بـە ژمـارە: ٢٧٧. حافظی عێراقی فەرموویەتی: ڕشتەکەی (حَسَن)ـە. بڕوانە: الْمُغْنِيْ عَنْ حَمْلِ الْأَسْـفَار / ١ / ٣٠٤ - ٣٠٥ / بە ژمارە: ١١٦٠.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٣٩٠ / بە ژمارە: ٣٦١١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٩٢٥ / بە ژمارە: ٢٤٧٦.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١١٠٠ / بە ژمارە: ٢٨٥٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٩٢٦ / بە ژمارە: ٢٤٧٦.

تەشریفی هێنا بۆلای ئاوی زەمزەمو، ئەوانیش ئاویان لێ دەگرتو، کاریان تێدا دەکرد. ئەویش فەرمووی: "کار بکەن، بەڕاستی ئێوە لەسەر کارێکی چاکن".[1]

## سونەتە کەسی دیاری بەخش بە دوعا کردن پاداشتی کەسی دیاری پێدراو بداتەوە، ئەگەر ئەو لەکاتی پێدانی دیاریەکەدا دوعای بۆ ئەم کردبوو

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە (عَائِشَةَ)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: مەڕێك بە دیاری هێنرا بۆ پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەویش فەرمووی: "دابەشی بکە". جا کە خزمەتکارەکە بەشە گۆشتەکانی دەبردو دەگەڕایەوە، دایکە (عَائِشَةَ) لێی دەپرسی: "ئەو خەڵکانەی گۆشتەکەت بۆ بردن چیان وت؟" خزمەتکارەکەش عەرزی دەکرد: وتیان: (خوا بەرەکەت بخاتە ناوتانەوە). دایکە (عَائِشَةَ)ش دەیفەرموو: "خوا بەرەکەتیش بخاتە ناو ئەوانەوە. بە هەمان قسەی خۆیان وەڵامیان دەدەینەوەو، پاداشتەکەشمان بۆ دەمێنێتەوە".[2]

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٥٨٩ / بە ژمارە: ١٥٥٤.
(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٣٨ / بە ژمارە: ٢٧٨. ڕشتەکەی (حَسَن)ـە. بڕوانە: عُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّي / ٣٣٣ - ٣٣٤.

## ئەگەر کەسێك دیاریەکی بۆ نێردراو، ئەویش لەبەر هۆکارێکی شەرعی دیاریەکەی ڕەد کردەوە، بۆ نموونە: کەسەکە خۆی دادوەر یان فەرمانڕەوا بوو، یان دیاریەکە گومانێکی تێدا بوو، یان لەبەر هەر هۆکارێکی تر، سونەتە عوزر بهێنێتەوە

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْـنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە هاوەڵی خۆشەویست (صَعْب)ی کـوڕی (جَثَّامة) (خوای لێ ڕازی بێـت)، کەرە وەحشیەکی پێشکەش بـە پێغەمبـەری خـوا کـرد، ئەویش لەو کاتەدا لـە ئیحرامدا بوو، جا پێغەمبـەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) بـۆی گەڕانـدەوەو، فـەرمووی: «ئەگـەر لـە ئیحرامـدا نەبووینایـە، لێمـان قبـوڵ دەکردیت».[1]

## ئەگەر کەسێك پیسی و چەپەڵیەکت لێ بکاتەوە چی پێ دەڵێیت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لـە زانـای پایەبـەرز (سَعِيْد)ی کوڕی (مُسَيِّب)ـەوە، ئەویش لە هاوەڵی خۆشەویسـت (أَبـو أَيُّـوْب)ی (أَنْصَارِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە دەسـتی بـردو، شـتێکی لـە ڕیشـی پـیرۆزی پێغەمبەری خوا کردەوە، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێـت) فەرمووی: «مَسَحَ اللَّهُ عَنْكَ يَا أَبَا أَيُّوبَ مَا تَكْرَهُ». واتە: "ئەی (أَبو أَيُّوْب)، خوا ئەو شتەت لێ بسڕێت، کە پێت ناخۆشە".[2]

---

(١) بڕوانـە: صَحِيْحُ مُسْـلِم / ٢ / ٨٥١ / بـە ژمـارە: ١١٩٤. هـەروەها ئیمـامی بوخـاریش ڕیوایەتی کردوە. بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٦٤٩ / بە ژمارە: ١٧٢٩.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٣٩ / بە ژمـارە: ٢٨١. ڕشـتەکەی زۆر لاوازە. بڕوانە: عُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّي / ٣٣٦.

له ڕیوایەتێکی تریشدا له (سَعِيْد)ی کوڕی (مُسَيِّب)ـەوه هاتوه، کـه (أَبو أَيُّوْب) شتێکی له پێغەمبەری خوا کردەوه، پێغەمبەری خواش (درودی خوای لەسەر بێت) دوو جار پێی فەرموو: «لَا يَكُنْ بِكَ السُّوءُ يَا أَبَا أَيُّوبَ، لَا يَكُنْ بِكَ السُّوءُ». واتـه: "ئـەی (أَبو أَيُّوْب)، یاخوا هەرگیز خراپەو پیسیت پێوه نەبێت".[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوه له کتێبەکەی شـێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لـه (عَبْدُاللّـه)ی کوڕی (بَكْر)ی (بَاهِلِيّ)ـەوه، که فەرموویەتی: ئیمـامی (عُمَـر) (خوای لێ ڕازی بێت) شتێکی له ڕیش یان له سەری پیاوێك کردەوه. پیاوەکەش وتی: "خـوا خراپـەت لێ لادات". ئیمامی (عُمَر)یش فەرمووی: "لەوەتەی موسوڵمان بووین خـوا خراپـەی لێ لاداوین. بۆیه یەگـەر لەلایـەن کەسـێکەوه شـتێك لـه لاشـەو جـلو بەرگەکـەت کرایەوه، به کەسەکه بڵێ: یاخوا خەیرت دەستگیر ببێت".[2]

---

(١) بڕوانه: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٣٩ - ١٤٠ / به ژماره: ٢٨٢. ئیمامی (حَاكِم) به (صَحِيْح)ی داناوه. بەڵام ڕشتەکەی لاوازه. چونکه (يَحْيَى)ی کـوڕی (عَـلاء)ی (رَازِيّ) تێدایه، که زۆربەی زانایان به لاوازیان داناوه. بڕوانه: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَـى الصَّـحِيْحَيْن / ٣ / ٥٢٣ / به ژمـاره: ٥٩٤٣، ومِيْزَانُ الاعْتِدَال / ٤ / ٣٩٧ / بـه ژمـاره: ٩٥٩١، وعُجَالَـةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّي / ٣٣٦ - ٣٣٧.

(٢) بڕوانـه: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّـنِّيّ) / ١٤٠ / بـه ژمـاره: ٢٨٣. ڕشـتەکەی لاوازه. چونکه (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (بَكْر) بەخزمەتی ئیمامی (عُمَر) نەگەیشـتوه. کەواتـه ڕشـتەکەی بچڕانی تێدایه. بڕوانه: عُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّي / ٣٣٧.

منیش دەڵێم: ئیمامی (ذَهَبِـيّ) فەرموویـەتی: (عَبْـدُالله) لـه سـەردەمی فەرمانڕەوایـەتی (هِشَام)ی کوڕی (عَبْدُالْمَلِك)دا لەدایك بوەو، له ساڵی (٢٨٠)ی کۆچیدا وەفاتی کـردوه. بڕوانه: سِيَرُ أَعْلَامِ النُّبَلاء / ٩ / ٤٥٠ - ٤٥١ / به ژماره: ١٧٠.

## ئەگەر كەسێك چاوی بە نۆبەرە كەوت چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: خەڵكی ئەگەر چاویان بە یەكەم بەروبووم بكەوتایە، دەیانهێنا بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، جا ئەویش ئەگەر وەریگرتایە، دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، بَارِكْ لَنَا فِيْ ثَمَرِنَا، وَبَارِكْ لَنَا فِيْ مَدِيْنَتِنا، وَبَارِكْ لَنَا فِيْ صَاعِنَا، وَبَارِكْ لَنَا فِيْ مُدِّنَا». واتە: "خوایە بەرەكەت بخەرە بەرووبوومو میوەهاتمانەوە، بەرەكەتیش بخەرە شارەكەمانەوە، بەرەكەتیش بخەرە پێوانەو مەنو مشتمانەوە". ئەوجا بانگی بچووكترین منداڵی خۆی دەكردو، ئەو بەروبوومەی دەدایە.[1]

دیسان لە ڕیوایەتێكی ئیمامی موسلیمدا هاتوە، كە فەرموویەتی "بَرَكَةً مَعَ بَرَكَةٍ"، پاشان دەیدا بە بچووكترینی ئەو منداڵانەی كە لە خزمەتیدا بوون.[2]

لە ڕیوایەتی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا هاتوە: دەیدا بە بچووكترین منداڵ كە بیبینیایە.[3]

لە ڕیوایەتێكی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)شدا لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت) هاتوە، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوام بینیوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، كە ئەگەر نۆبەرەیەكی بۆ بهێنرایە، دەیخستە سەر چاوەكانیو، پاشان دەیخستە سەر لێوەكانیو، دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، كَمَا أَرَيْتَنا أَوَّلَهُ، فَأَرِنَا آخِرَهُ». واتە: "خوایە وەكو نۆبەرەو سەرەتاكەیت پیشانداین، دوابەرو كۆتاییەكەشیمان پیشان بدە". پاشان دەیدا بەو منداڵانەی كە لە خزمەتیدا بوون.[1]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ١٠٠٠ / بە ژمارە: ١٣٧٣.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ١٠٠٠ / بە ژمارە: ١٣٧٣.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٠٦ / بە ژمارە: ٣٤٥٤.

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٣٩ / بە ژمارە: ٢٨٠. ڕشتەكەی زۆر لاوازە. بڕوانە: عُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّي / ٣٣٥.

## سونەتە ئامۆژگاری بە کورتی بکرێت‌و، زانستیش بە کەمی بدرێت

بزانە کە ئەو کەسەی ئامۆژگاری کۆمەڵێك دەکات، یان زانستێکیان فێر دەکات، سونەتە هەوڵ بدات بە کورتی بێت‌و، ئەوەندە درێژی نەکاتەوە، کە ماندوویان بکات، نەوەکو بێزار بن‌و، شیرینی‌و گەورەیی ئامۆژگاری‌و زانستەکە لە دڵیاندا نەمێنێت. هەروەها نەوەکو وایان لێ بێت، کە ڕقیان لە زانست‌و لە بیستنی خەیر ببێتەوە، بەمەش تووشی بێشەرعی ببن.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە زانای پایەبەرزی شوێنکەوتوان (شَقِيْق)ی کوڕی (سَلَمَة)وە، کە فەرموویەتی: هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد) (خوای لێ ڕازی بێت) هەموو ڕۆژێکی پێنج شەمە ئامۆژگاری دەکردین‌و، شتی دەهێنایەوە بیرمان. جا پیاوێك عەرزی کرد: "ئەی (أَبُو عَبْدِالرَّحْمَن)، حەزم دەکرد هەموو ڕۆژێك ئامۆژگاریت بکردینایە". ئەویش فەرمووی: ئەوەی کە ڕێگریم لێ دەکات، ئەوەتان بۆ بکەم، ئەوەیە کە پێم ناخۆشە ماندووتان بکەم. منیش هەر بەو جۆرە ئامۆژگاریتان دەکەم، کە پێغەمبەری خوا ئامۆژگاری ئێمەی پێ دەکرد، لە ترسی ئەوەی کە تووشی بێتاقەتی نەبین.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَمَّار)ی کوڕی (يَاسِر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە دەیفەرموو: گوێم لە پێغەمبەری خواوە بوو (درودی خوای لەسەر بێت)، کە دەیفەرموو: «إِنَّ طُولَ صَلاةِ الرَّجُلِ وَقِصَرَ خُطْبَتِهِ مَئِنَّةٌ مِنْ فِقْهِهِ، فَأَطِيْلُوا الصَّلاةَ واقْصِرُوا الخُطْبَةَ».[1] واتە: "بەڕاستی درێژی نوێژی کەسێك‌و کورتی وتارەکەی نیشانەو بەڵگەن لەسەر

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٣٩ / بە ژمارە: ٧٠، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢١٧٣ / بە ژمارە: ٢٨٢١.

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٥٩٤ / بە ژمارە: ٨٦٩.

شارەزایی‌و شەرعزانی ئەو کەسە. دەی کەوابوو ئێوەش نوێژەکانتان درێژ بکەنەوەو، وتارەکانتان کورت بکەنەوە".

منیش دەڵێم: (مَئِنَّة) واتە: نیشانەو بەڵگەی شارەزایی‌و شەرعزانی کەسەکەیە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە زانای پایەبەرز (ابْنُ شِهَاب)ی (زُهْرِيّ)ـەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر کۆڕ درێژە بکێشێت، بەشی شەیتانی تێ دەکەوێت.[1]

## فەزڵ‌و گەورەیی ڕێنموویی کردن بۆ چاکەو، هەڵنان لەسەری

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَتَعاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى﴾ [الْمَائِدَة: ٢] واتە: {پشتیوان‌و هاوکاری یەکتربن لەسەر چاکەکاری‌و لەخواترسان}.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ دَعا إِلَى هُدَىً، كَانَ لَهُ مِنَ الْأجْرِ مِثْلَ أُجُوْرِ مَنْ تَبِعَهُ، لا يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أُجُوْرِهِمْ شَيْئاً، وَمَنْ دَعَا إِلَى ضَلالَةٍ، كَانَ عَلَيْهِ مِنَ الْإِثْمِ مِثْلُ آثَامِ مَنْ تَبِعَهُ، لا يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ آثَامِهِمْ شَيْئاً».[2] واتە: "ئەو کەسەی بانگی خەڵکی بکات بۆسەر ڕێگەی ڕاست، هاوێنەی پاداشتی ئەو کەسانەی دەست دەکەوێت کە شوێنی دەکەون، بێ ئەوەی هیچێك لە پاداشتی شوێنکەوتوەکانی کەم بکاتەوە. ئەو کەسەش بانگی خەڵکی بکات بۆ گومڕایی، هاوێنەی تاوانی ئەو کەسانەی

(١) ئیمامی نەوەوی نەیفەرموە لە کوێوە بۆی ڕیوایەت کراوە! بەڵام بڕوانە: حِلْيَةُ الْأوْلِيَاء / ٣ / ٣٦٦، والْجامِعُ لِأخْلاقِ الرَّاوِيْ وَآدابِ السّامِعِ (لِلْخَطِيْبِ الْبَغْدَادِيّ) / ٢ / ١٢٨.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٦٠ / بە ژمارە: ٢٦٧٤.

دەکەوێتە سەر کە شوێنی دەکەون، بێ ئەوەی هیچێك لە تـاوانی شـوێنکەوتوەکانی کەم بکاتەوە".

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو مَسْعُوْد)ی (أَنْصَـــارِيّ) (بَــدْرِيّ)ــەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویـەتی: «مَنْ دَلَّ عَلَى خَيْرٍ، فَلَهُ مِثْــلُ أَجْرِ فَاعِلِهِ».[1] واتە: "ئەو کەسەی چـاکەیەك پیشـانی کەسـێك بـدات، هاوویـنـەی پاداشتی بکەری چاکەکەی دەست دەکەوێت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هـاوەڵی خۆشەویست (سَهْل)ی کوڕی (سَعْد)ەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، کـە پێغەمبــەری خـوا (دروودی خوای لەسەر بێت) بە ئیمامی (عَلِيّ) فـەرموو: «فَوَاللهِ لَأَنْ يَهْدِيَ اللهُ بِكَ رَجُــلاً وَاحِداً، خَيْرٌ لَكَ مِنْ حُمْرِ النَّعَمِ».[2] واتە: "سوێن بەخوا، ئەگەر خـوا بـەهۆی تـۆوە هیدایـەتی پیاوێـك بـدات، بـۆ تـۆ باشـترە لـە حوشـترە سـوورە (کـە باشـترینو گرانبەهاترینی حوشترە بەلای عەرەبەکانەوە)".

لە حەدیسی صەحیحیشدا هاتوە کە پێغەمبــەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) فەرموویـەتی: «وَاللهُ فِيْ عَوْنِ الْعَبْدِ، مَا كَانَ الْعَبْدُ فِيْ عَوْنِ أَخِيْهِ».[3] واتـە: "خـوای گەورە لە پشتیوانی بەندەی خۆیدایە، تا ئەو لە پشتیوانی برای خۆیدا بێت".

ئەو حەدیسانەش سەبارەت بەم باسە هاتون زۆرنو، لە کتێبە صەحیحەکانیشـدا مەشهورن.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٥٠٦ / بە ژمارە: ١٨٩٣.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٠٩٦ / بە ژمارە: ٢٨٤٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٨٧٢ / بە ژمارە: ٢٤٠٦.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٧٤ / بە ژمارە: ٢٦٩٩.

## ئەگەر کەسێك داوای زانستێکی لێ کراو، شارەزایی لەبارەیەوە نەبوو، بەڵام دەیزانی کە کەسێکی تر دەیزانێت، باشتر وایە داواکەرەکە ڕێنموویی بکات بۆلای ئەو کەسە

سەبارەت بەم باسەش هەمان ئەو حەدیسە صەحیحانە هاتوون، کە لە باسەکەی پێشوودا هێنران.

هەروەها حەدیسی (الدِّيْنُ النَّصِيْحَة)شی لەبارەوە هاتوە، چونکە ئەم کارەش هەر ئامۆژگاریو دڵسۆزیە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە شوێنکەوتووی پایەبەرز (شُرَيْح)ی کوڕی (هَانِيء)ەوە، کە فەرموویەتی: هاتم بۆ خزمەتی دایکە (عَائِشَة) (خوای لێ ڕازی بێت)، تا پرسیاری لێ بکەم دەربارەی دەستهێنان بەسەر (خُفّ)دا، ئەویش فەرمووی: بچۆ بۆ خزمەتی ئیمامی (عَلِيّ)ی کوڕی (أَبو طَالِب) (خوای لێ ڕازی بێت)و، پرسیار لەو بکە. چونکە ئەو لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (دروودی خوای لەسەر بێت) سەفەری دەکرد. جا ئێمەش چووین بۆ خزمەتیو، پرسیارمان لێ کرد..... ئیتر حەدیسەکەی باس کرد.[1]

ئەو حەدیسە درێژەشمان بۆ ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، کە سەبارەت بە چیرۆکەکەی شوێنکەوتووی پایەبەرز (سَعْد)ی کوڕی (هِشَام)ی کوڕی (عَامِر) هاتوە، کاتێك ویستویەتی پرسیار بکات دەربارەی نوێژی (وِتْر)ی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت). جا هاتوە بۆ خزمەتی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)و، لەوبارەوە پرسیاری لێ کردوە، ئەویش فەرموویەتی: "ئایا ڕێنموویت

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٢٣٢ / بە ژمارە: ٢٧٦.

نەکەم بۆلای زاناترین کەسی سەر زەوی بە نوێژی (وِتْر)ی پێغەمبەری خـوا (دروودی خوای لەسەر بێت)؟" (سَعْد)یش لێی پرسیوە: "ئەو کەسە کێیە؟" ئەویش فەرموویـەتی: " ئەو کەسە دایکە (عَائِشَـــةَ)یـە، بچـۆ بـۆ خزمـەتیو، پرسـیاری لێ بکـە"..... ئـیتر حەدیسەکەی باس کرد.[1]

بۆشمـان ڕیوایـەت کـراوە لـە صـەحیحی بوخاریـدا، لـە (عِمْـرَان)ی کـوڕی (حِطَّان)ـەوە، کە فەرموویەتی: دەربارەی ئاوریشم پرسیارم لە دایکـە (عَائِشَة) کـرد (خوای لێ ڕازی بێـت)، ئەویش فەرمووی: "بچۆ بۆ خزمەتی هاوەڵی خۆشەویست (ابْـــنُ عَبَّاس)و، لـەو بپرسە". ئەویش فەرمووی: "لـە هاوەڵی خۆشەویســت (ابْـــنُ عُمَـــر) بپرسە". منیش پرسیارم لـە (ابْنُ عُمَر) کرد، ئەویش فەرمووی: (أَبُو حَفْص) هـەواڵی پێدام --مەبەستی ئیمـامی (عُمَر)ی کـوری (خَطَّـــاب)ـــە- (خـوای لێ ڕازی بێـت)، کـە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویـەتی: «إِنَّمَا يَلْبَسُ الْحَرِيرَ فِي الـــدُّنْيا مَنْ لا خَلاقَ لَهُ فِي الْآخِرَةِ».[2] واتە: "تەنها ئەو کەســە لـــە دنیـادا ئاوریشـم لـەبـەر دەکات، کە لـە ڕۆژی دواییدا ئاوریشمی دەست ناکەوێتو لـە چارەی نەنوسراوە".

هەروەها حەدیسە صەحیحەکانی هاووێنەی ئەمانەش زۆرو مەشهورن.

## ئەگەر کەسێك بانگ بکرێت بۆ کارکردن بە حوکمی خوای گەورە، چی بلێت؟

ئەگەر کەسێك بە کەسێکی تری وت: لـە نێـوان مـنو تـۆدا کتێبـی خـوا، یـان سونەتی پێغەمبەری خوا، یان فەرمایشتی زانایانی موسوڵمانان، یان شتێکی لـەو جۆرە هەیە. یان پێی وت: لـەگەڵمدا وەرە بۆلای حاکمی موسوڵمانان، یان بۆلای مـوفتی،

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥١٢ – ٥١٣ / بە ژمارە: ٧٤٦.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢١٩٤ / بە ژمارە: ٥٤٩٧.

بۆ یەکلایی کردنەوەی ناکۆکیەکەی نێوانمان، یان شتێکی لەو جۆرە، ئەوا دەبێت کەسی دوەم بڵێت: (سَمِعْنا وَأطَعْنا)، یان (سَمْعاً وَطَاعَةً)، یان (نَعَمْ وَكَرَامَـةً)، یان شتێکی لەو جۆرە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا كانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أنْ يَقُولُوا سَمِعْنا وَأطَعْنا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ [النُّور: ٥١] واتە: {بەڕاستی ئەگەر باوەڕداران باگێشت بکرێن بۆلای بەرنامەی خواو پێغەمبەرەکەی، تا بڕیار بدات لە نێوانیاندا، قسەی ئەوان هەر ئەوەیە، کە دەڵێن: (سَمِعْنا وَأطَعْنا) واتە: "بڕیارەکەمان بیستو گوێڕایەڵیشی بووین"، جا بەڕاستی هەر ئەو باوەڕدارانە براوەو سەرکەوتوون}.

## باسێك: {ئەگەر کەسێك ئامۆژگاریەکی ڕووتێکرا چی بڵێت؟}

ئەگەر کەسێك کێشەو ناکۆکی لەگەڵ کەسێکی تردا بەرپا کردو، پێی وت: (تەقوای خوای گەورەت هەبێت)، یان (لە خوای گەورە بترسە)، یان (ئاگات لە خوا بێت)، یان (بزانە کە خوای گەورە ئاگای لێتە)، یان (بزانە ئەوەی دەیڵێیت، لەسەرت دەنوسرێتو، لەسەری موحاسەبە دەکرێیت)، یان پێی وت: (خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُحْضَراً﴾ [آل عِمْرَان: ٣٠] واتە: {لەو ڕۆژەدا -کە ڕۆژی قیامەتە- هەموو نەفسێك چی چاکەیەکی کردبێت لە بەردەمی خۆیدا دەیبینێتەوە})، یان فەرموویەتی: ﴿وَاتَّقُوا يَوْماً تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللهِ﴾ [الْبَقَرَة: ٢٨١] واتە: {لەو ڕۆژە بترسن، کە تێیدا دەگەڕێنرێنەوە بەردەستی لێپرسینەوەی خوای گەورە}، یان ئایەتی لەم جۆرەی بۆ خوێندەوە، یان هەر ڕستەو تەعبیرێکی تری لەو جۆرەی بەکارهێنا. ئەوا دەبێت کەسی دوەم بە ئەدەبەوە وەڵامی بداتەوەو، پێی بڵێت: (سَمْعاً وَطَاعَةً)، یان (دوا لە خوا دەکەم، کە موەفەقم بکات بۆ ئەو کارە)، یان (داوای سۆزو بەزەیی لە خوای بەخشندە دەکەم). ئەوجا بە

نەرمو نیانی قسە لەگەڵ ئەو کەسەدا بکات، کە وای پیٚ وتوە. هەروەها با زۆریش وریاو بەپارێز بێت لە بەکارهێنانی ڕستەو تەعبیردا. چونکە زۆرێك لە خەڵکی لەو کاتەدا قسەی ناشایستە دەکەن‌و، ڕەنگە هەندێکیشیان شتێك بڵێن، کە کوفر بێت.

بە هەمان شێوە ئەگەر هاوڕێیەك بە هاوڕێیەکی خۆی وت: ئەمەی تۆ کردت پێچەوانەی سونەتی پێغەمبەری خوایە (دروودی خوای لەسەر بێت)، یان شتێکی لەو جۆرەی پیٚ وت، ئەوا نابێت لە وەڵامدا پێی بڵێت: (من خۆم بە حەدیسەوە نابەستمەوە)، یان (من کار بە حەدیس ناکەم)، یان هەر عیبارەتێکی تری ناشیرینی لەو جۆرە. ئیتر باوەکو حەدیسەکە بە ڕواڵەت کاریشی پیٚ نەکرێت، لەبەر تەخصیص، یان تەئویل، یان شتێکی لەو جۆرە. بەڵکو ئەگەر وابوو، با پێی بڵێت: ئەو حەدیسە تەخصیص کراوە، یان تەئویل کراوە، یان بە کۆدەنگی زانایان کار بە ڕواڵەتەکەی ناکرێت، یان با شتێکی لەو جۆرەی پیٚ بڵێت.

## باسی وەڵام نەدانەوەی نەفامان‌و پشت هەڵکردن لێیان

- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ﴾ [الأعْرَاف: ١٩٩] واتە: {کارو ڕەوشتی جوانی خەڵکی قبوڵ بکەو، فەرمانیش بە چاکە بکەو، خۆت لە نەفامان لادەو پشتیان تیٚ بکە}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا سَمِعُوا اللَّغْوَ أَعْرَضُوا عَنْهُ وَقَالُوا لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِي الْجَاهِلِينَ﴾ [القَصَص: ٥٥] واتە: {ئەگەر قسەی پڕوپووچیش لە خەڵکی ببیستن، خۆیانی لیٚ تێناگەیەنن‌و گوێی تیٚ نادەن‌و، دەڵێن: پاداشتی چاکەی کردەوەی خۆمان بۆ خۆمان‌و، پاداشتی خراپەی کردەوەی خۆشتان بۆ خۆتان، ئێمە خۆمان بە وەڵامدانەوەی ئێوەوە خەریك ناکەین‌و، بەشوێن هاوڕێیەتی‌و دۆستایەتی نەفامانیشدا ناگەڕێین}.

- هەروەها فەرموویەتی: ﴿فَأَعْرِضْ عَمَّنْ تَوَلَّى عَنْ ذِكْرِنا﴾ [النجم: ٢٩] واتە: {دەی تۆش خۆت لادە لەو کەسەی پشتی کردۆتە بەرناکەی ئێمە}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿فَاصْفَحِ الصَّفْحَ الجَمِيلَ﴾ [الحِجر: ٨٥] واتە: {دەی تۆش بەشێوەیەکی جوانو ڕێكوپێك چاوپۆشیان لێ بکە}.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللہ)ی کوڕی (مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لە ڕۆژی (حُنَـيْن)دا لە دابەشکردنی دەستکەوتەکاندا بەشی زیادی دا بە هەندێك لە گەورە پیاوەکانی عەرەب. جا پیاوێك وتی: "سوێند بەخوا ئەم دابەشکردنە دادپەروەری تێدا نەکراوەو، لەبەر خاتری خواش نەبوە!!!" منیش وتم: "سوێند بەخوا ئەم قسە بۆ پێغەمبەری خوا دەگێڕمەوە (دروودی خوای لەسەر بێت)". جا هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەرو، قسەی کابرام بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەریش ڕەنگی دەموچاوی گۆڕا، هەتا وەکو بۆیەی سووری لێهات، پاشان فەرمووی: «جا کێ دادپەروەر دەبێت، ئەگەر خواو پێغەمبەرەکەی دادپەروەر نەبن؟!». ئەوجا فەرمووی: «ڕەحمەتی خوا لە حەزرەتی (مُوْسَـى)، کە لەمەش زیاتر ئازار دراو، ئەو هەر صەبرو ئارامی گرت».[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْـنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: (عُيَيْنَة)ی کوڕی (حِصْن)ی کوڕی (حُذَيْفَة) گەڕایەوەو، لای (حُرّ)ی کوڕی (قَـيْس)ی برازای مایەوە -کە یەکێك بوو لەو کەسانەی ئیمامی (عُمَر) لەخۆی نزیکی دەکردنەوە-. جا کەسانی کۆڕو ڕاوێژی ئیمامی (عُمَر) بریتی بوون لە قورئانزانەکان، چی ئەوانەی گەورەو بەتەمەن بوون، یان ئەوانەی کە گەنجو لاو بوون. جا (عُيَيْنَة) بە برازاکەی وت:

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١١٤٨ / بە ژمارە: ٢٩٨١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٧٣٩ / بە ژمارە: ١٠٦٢.

"برازاکەم، لای ئەم فەرمانڕەوایە ڕێزو حورمەتێکت هەیە، داوای مۆڵەتی لێ بکە، با ببینم". ئەویش داوای مۆڵەتی بۆ کردو، ئیمامی (عُمَر)یش ڕێگەی پێدا. جا کە چوە ژوورەوە، وتی: "هێی، کوڕی (خَطَّاب)، سوێند بەخوا بەخششی زۆرمان پێ نادەیتو، دادپەروەرانەش حوکم ناکەیت لە ناوماندا!!!!" ئیمامی (عُمَر)یش تووڕەبوو، هەتا ویستی پەلاماری بدات، (حُرّ)یش عەرزی کرد: ئەی فەرمانڕەوای ئیمانداران، خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی خۆی فەرموە: ﴿خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ﴾، جا ئەمەش یەکێکە لە نەفامەکان.

(ابْنُ عَبَّاس) دەفەرموێت: سوێند بەخوا کە ئایەتەکەی خوێندەوە، ئیمامی (عُمَر) لێی تێنەپەڕیو، چونکە بەڕاستی کەسێکی زۆر هەڵوێستەکەر بوو لە بەرامبەر کتێبەکەی خوای گەورە (واتە: کاری پێ دەکردو، لێی تێنەدەپەڕی).[1]

## باسی ئامۆژگاری کردنی کەسێك بۆ کەسێك، کە لە خۆی گەورەتر بێت

ئەو حەدیسەی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ی لەبارەوە هاتوە، کە سەبارەت بە چیرۆکەکەی ئیمامی (عُمَر) هاتبوو، لە باسەکەی پێشوودا.

بزانە کە ئەم باسە لەو باسانەیە کە بایەخپێدانی دووپاتکراوەتەوە. بۆیە دڵسۆزیو ئامۆژگاریو فەرمان کردن بە چاکەو، نەهی کردن لە خراپە واجبە بۆ هەموو بچووكو گەورەیەك، ئەگەر زیاتر گومانی وەها نەبوو، کە لە ئامۆژگاری کردنەکەی خراپە پەیدا دەبێت.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ [النّحل: ١٢٥] واتە: {بە حیکمەتو بە شێوازی گونجاو

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٧٠٢ / بە ژمارە: ٤٣٦٦.

به ئامۆژگاری جوان خەڵکی بۆ بەرنامەو ڕێگای پەروەردگارت بانگ بکەو، بە جوانترین شێوەش موناقەشەو گفتوگۆیان لەگەڵدا بکە}.

هەروەها گەلێك حەدیسی تری هاوێنەی ئەمانە هاتوون، کە لە زۆریدا لە ژمارە نایەن.

ئەوەش کە خەڵکانێکی زۆر وازیان لەو کارە هێناوە دەرهەق بە کەسانی پلەبەرز، بە خەیاڵی خۆیان شەرمیان لێ دەکەن، ئەوە هەڵەیەکی ئاشکراو ڕاشکاوەو، نەزانینێکی ناشیرینو بێزراوە. چونکە بەڕاستی ئەوە شەرم نیە. بەڵکو کزیو لاوازیو نەتوانکاریە. چونکە شەرم هەمووی خەیرەو، شەرمیش تەنها خەیر دەهێنێت، کەچی ئەم کارە خراپە دەهێنێت. بۆیە بە شەرم دانانرێت. شەرمیش بەلای زانا خواناسەکانو پێشەوا لێکۆڵەرەوەکانەوە بریتیە لە ڕەوشتێك، کە هۆکارە بۆ وازهێنان لە خراپەو، ڕێگرە لە کەمتەرخەمی دەرهەق بە خاوەن ماف.

ئەمەش واتای ئەو فەرمایشتەی خواناسی گەورە شێخ (جُنَيْد)ە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە لە ڕیسالەی (قُشَيْرِيّ)دا بۆمان ڕیوایەت کراوە، کە ئەو فەرموویەتی: "شەرم بریتیە لە بینینی نازو نیعمەتەکانو، بینینی کەمتەرخەمیەکان، کە لە نێوانیاندا حاڵەتێك پەیدا دەبێت، پێی دەوترێت: شەرم".

سوپاس بۆ خوا، کە ئەم مەسەلەم لە سەرەتای شەرحی صەحیحی موسلیمدا بە درێژی ڕوونکردۆتەوە. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## باسی فەرمان کردن بە پابەندبوون بە پەیمانو بەڵێنەوە

- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَوْفُوا بِعَهْدِ اللهِ إِذَا عَاهَدْتُمْ﴾ [النّحل: ٩١] واتە: {ئەگەر پەیمانتان بەخوای گەورە دا، وەفای پێ بکەنو مەیشکێنن}.

- هەروەها فەرموویـەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِيْنَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ﴾ [الْمَائِدَة: ١] واتـه: {ئەی ئەو کەسـانەی باوەڕتـان بـەخواو پێغەمبەرەکـەی هێنـاوە، وەفـا بـەو پەیمانانە بکەن، کە بەخواو بە خەڵکیتان داون}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْؤُولاً﴾ [الإِسْـرَاء: ٣٤] واتە: {وەفا بکەن بەو پەیمانـەی داوتانـە، بیبەنەسـەرو مەیشـکێنن، چـونکە بەڕاستی پەیمان لێپرسینەوەی لەسەرە}.

جا ئایەتەکانی قورئـانی پـیرۆز لـەم بـارەوە زۆرن، لـە توندترینیان بریتیـە لـەم فەرمایشتەی خوای گـەورە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لا تَفْعَلُونَ * كَبُرَ مَقْتاً عِنْدَ اللَّهِ أَنْ تَقُولُوا مَا لا تَفْعَلُونَ﴾ [الصَّفّ: ٢ - ٣] واتە: {ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان بەخواو بە پێغەمبەرەکەی هێناوە، بۆچی شتێك دەڵێن‌و، کاری پیێ ناکـەن؟ بەڕاسـتی زۆر جێگەی تووڕەییە لای خوای گەورە، کە شتێك بڵێن‌و، کاری پیێ نەکەن}.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێـت)، کـە پێغەمبـەری خـوا (درووودی خـوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلاَثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ».[1] واتە: "نیشانەی کەسی مونافیق‌و دووڕوو سـێ شـتە: ئەگـەر قسـە بکات، درۆ دەکات، ئەگەر بەڵێنیش بدات، پێچەوانەی بەڵێنەکەی دەکات، ئەگـەر شتێکیشی پیێ بسپێردرێت‌و متمانەی پیێ بکرێت، ناپاکی‌و خیانەت دەکات".

لـە ڕیوایەتێکدا ئەمەشی بۆ زیاد کـردوە: «وَإِنْ صَـامَ، وَصَـلَّى، وَزَعَـمَ أَنَّـهُ مُسْـلِمٌ».[1] واتـە: "بـاوەکو ڕۆژووش بگرێـت‌و، نوێـژیش بکـات‌و، خۆیشـی بـە موسوڵمان دابنێت".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢١ / بە ژمـارە: ٣٣، وصَـحِيْحُ مُسْـلِم / ١ / ٧٨ / بـە ژمارە: ٥٩.

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٧٨ / بە ژمارە: ٥٩.

هەروەها حەدیسێکی زۆر بە هەمان مانا هاتوون، بەڵام ئەوەندە بەسە.

زانایانیش کۆدەنگن لەسەر ئەوەی، کە ئەو کەسەی بەڵێنی شتێك دەدات بە کەسێکی ترو، شتەکەش نەهی لێ نەکراوە، دەبێت بەڵێنەکەی بەجێ بهێنێت. جا ئەو بەجێهێنانە واجبە یان سونەت؟ ئەوە بۆچوونی جیاوازیان لەبارەیەوە هەیە:

ئیمامی (شَافِعِيّ)و (أَبُو حَنِيْفَة)و زۆربەی زانایان وای بۆچوون کە سونەتە. بۆیە ئەگەر نەیکات، ئەوە فەزڵێو چاکەیەکی لەدەست دەرچووەو، کارێکی زۆر ناپەسەندی ئەنجام داوە، بەڵام تاوانبار نابێت.

کۆمەڵێکیش وای بۆچوون کە واجبە. پێشەوای پایەبەرز (أَبُو بَكْر)ی (ابْنُ الْعَرَبِيّ) (مَالِكِيّ) فەرموویەتی: پایەبەرزترینی ئەو زانایانەی کە ئەم بۆچوونەیان هەیە بریتیە لە پێشەوای پایەبەرز (عُمَر)ی کوڕی (عَبْدُالْعَزِيْز).

هەروەها فەرموویەتی: زانا مالیکیەکان بۆچوونێکی تریان هەیە، ئەویش ئەوەیە کە: ئەگەر بەڵێنەکە پەیوەندی بە هۆکارێکەوە هەبوو، وەکو ئەوەی کە وتبێتی: (ژن بهێنەو، ئەوەندە بۆ تۆ)، یان (سوێند بخۆ، کە قسەم پێ نەڵێیت، ئەوەندە بۆ تۆ)، یان شتێکی لەو جۆرە، ئەوە واجبە بەجێی بهێنێت. بەڵام ئەگەر بەڵێنێکی ڕەها بوو، ئەوە واجب نیە بەجێی بهێنێت.

جا ئەو زانایانەی کە بە واجبیان دانەناوە، بەڵگەیان بەوە هێناوەتەوە، کە بەڵێن لە مانای بەخشین دایەو، بەخشینیش بەلای زۆربەی زانایانەوە بە وەرگرتن نەبێت پێویست نابێت. بەڵام بەلای زانا مالیکیەکانەوە بەر لە وەرگرتنیش هەر پێویست دەبێت.

## ئەگەر کەسێك ماڵێك یان شتێكی خستە بەردەست کەسێكی تر -وەكو دیاری-، ئەوا سوننەتە كەسی دووەم دوعای خەیری بۆ بكات

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاری‌و لە غەیری ئەویشدا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە فەرموویـەتی: کاتێـك هاوەڵـە كۆچەریەكان هاتنە شاری (مَدِيْنَة)ی پیرۆزەوە، هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالرَّحْمَن)ی کوڕی (عَوْف) لای هاوەڵی خۆشەویست (سَعْد)ی کـوڕی (رَبِيْع) مایـەوە، ئـەویش پێی فەرموو: "ماڵەكەی خۆمت لەگەڵدا بەش دەکـەم‌و، دەسـتیش لـە یـەكێك لـە ژنەكانم هەڵدەگرم بۆت". (عَبْـدُالرَّحْمَن)یـش فـەرمووی: "خـوا بەرەکـەت بخاتـە خێزان‌و ماڵەكەتەوە".[1]

## ئەگەر کافرێكی (ذِمِّيّ) چاکەی بەرامبەر موسوڵمانێك كرد، ئەو چی پێ بڵێت؟

بزانە كە دروست نیە دوعای لێخۆشبوون‌و ئەو شتانەی بۆ بكرێت، کـە نابێـت بۆ كەسانی كافر بكرێت. بەڵام دروستە دوعای هیدایەت‌و لەشساغی‌و سـەلامەتی‌و شتی لەو جۆرەی بۆ بكرێت.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لـە كتێبەكـەی شـێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: جارێك پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، داوای ئاوی کـردو، پیـاوێكی جوولەکـە ئـاوی بـۆ هێنـا،

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ١٩٨٣ / بە ژمارە: ٤٨٧٢، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٣٢٨ / بە ژمارە: ١٩٣٣.

پێغەمبەریش پێی فـەرموو: «جَمَّلَكَ اللهُ». واتـە: "خـوا هـەر بـەجوانی بتهێڵێتـەوە".
(أَنَس) دەفەرموێت: ئیتر ئەو پیاوە یەهودیە هەتا مرد مووی سپی بەخۆیەوە نەبینی.[1]

## ئەگەر كەسێك لە خودی خۆیدا، یان لە منداڵێكیدا، یان لە ماڵەكەیدا، یان لە هەر شتێكی تردا سیفەتێكی وەهای بینی، كە پێی سەرسام بێتو، ترسی ئەوەشی هەبوو، كە چاوی خۆی كاری لێ بكاتو، پێی زەرەرمەند ببێت، چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێـت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، كە فەرموویەتی: «الْعَيْنُ حَقٌّ».[2] واتە: "چاوی پیس حەقەو هەیـەو كاریگەریشی هەیە".

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لـە هـەردوو صـەحیحی بوخـاریو موسـلیمدا، لـە (أُمُّ سَلَمَة)ی دایكی ئیمانداراانەوە (خوای لێ ڕازی بێـت)، كە پێغەمبـەری خـوا (دروودی خـوای لەسەر بێت) لەماڵی ئەودا كچێكی بچووك (یان كەنیزەكێك)ی بینی، كە ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو، بۆیـە فـەرمووی: «اسْتَرْقُوا لَهَا، فإنَّ بِهَا النَّظْرَةَ». واتـە: "نوشـتەی بـۆ بكەن، چونكە چاو كاری لێ كردوە".[3]

---

(١) بڕوانـە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّـنِّيّ) / ١٤٣ / بـە ژمـارە: ٢٨٩. ڕشـتەكەی لاوازە. بڕوانە: عُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّي / ٣٤٢.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢١٦٧ / بە ژمارە: ٥٤٠٨، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧١٩ / بە ژمارە: ٢١٨٧.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢١٦٧ / بە ژمارە: ٥٤٠٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧٢٥ / بە ژمارە: ٢١٩٧.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «الْعَيْنُ حَقٌّ، وَلَوْ كَانَ شَيْءٌ سَابَقَ الْقَدَرَ، سَبَقَتْهُ الْعَيْنُ، وَإِذَا اسْتُغْسِلْتُمْ، فَاغْسِلُوا».[1] واتە: "چاوی پیس حەقەو کاریگەریشی هەیە. ئەگەر شتێکیش بکەوتایەتە پێش قەدەری خواوە، ئەوا چاو دەکەوتە پێشی. جا ئەگەر داوای خۆشۆردنتان لێکرا، خۆتان بشۆن".

منیش دەڵێم: زانایان فەرموویانە: (اسْتِغْسَال) ئەوەیە کە بە شێوەیەکی جوان بە کەسە چاوپیسەکە بوترێت: "بەئاو خۆت بشۆ" پاشان ئاوەکە بکرێت بەسەر کەسە چاو لێکراوەکەدا.

لە دایکە (عَائِشَة)وە هاتوە، کە فەرموویەتی: کاتی خۆی فەرمان دەکرا بە کەسە چاوپیسەکە، کە دەستنوێژ بگرێت، پاشان کەسە چاو لێکراوەکە بە ئاوی دەستنوێژەکەی ئەو خۆی بشوات.

ئیمامی (أَبُو دَاوُد) ئەم فەرمایشتەی ڕیوایەتی کردوە بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح) لەسەر مەرجی ئیمامی بوخاریو موسلیم.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: کاتی خۆی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) پەنای بەخوا دەگرت لە جنۆکەو لە چاوی ئادەمیزاد، هەتا هەردوو سوورەتی ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾و، ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ دابەزین، جا کە ئەوان دابەزین، ئیتر ئەوانی دەخوێندو، وازی لە زیکرەکانی تر هێنا.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧١٩ / بە ژمارە: ٢١٨٨.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٤٠١ / بە ژمارە: ٣٨٣٠.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

هەروەها لە صەحیحی بوخاریدا ئەو حەدیسەی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)مان بۆ ڕیوایەت کراوە، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) دوعای پاراستنی دەکرد بۆ (حَسَن)و (حُسَيْن)و، دەیفەرموو: «أُعِيذُكُمَا بِكَلِماتِ اللهِ التَّامَّةِ مِنْ كُلِّ شَيْطانٍ وَهامَّةٍ، وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لامَّةٍ». واتە: "پەناتان دەدەم بە فەرمایشتە تەواوە پیرۆزەکانی خوای گەورە، لە هەموو شەیتانێك‌و، لە هەموو گیانلەبەرێکی خاوەن ژەهری کوشندەو، لە هەموو چاوێکی پیسی زیانبەخش ". هەروەها دەیفەرموو: «إِنَّ أَبَاكُمَا كَانَ يُعَوِّذُ بِهِمَا إِسْمَاعِيْلَ وَإِسْحَاقَ». واتە: "باوکتان (کە حەزرەتی ئیبراهیمە) ئەم دوعایەی دەکرد بۆ پاراستنی ئیسماعیل‌و ئیسحاقی کوڕی".[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە (سَعِيْد)ی کوڕی (حَكِيْم)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) بترسایە کە شتێك ببێت بە چاویەوە، دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، بَارِكْ فِيْهِ، وَلا تَضُرَّهُ». واتە: "خوایە بەرەکەتی تێ بخەو، زیانی پێ مەگەیەنە".[3]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٣٩٥ / بە ژمارە: ٢٠٥٨، وسُنَنُ النَّسَائِيّ / ٨ / ٢٧١ / بە ژمارە: ٥٤٩٤، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١١٦١ / بە ژمارە: ٣٥١١.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٢٣٣ / بە ژمارە: ٣١٩١.

(٣) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٠٧ / بە ژمارە: ٢٠٨. ڕشتەکەی بچڕانی تێدایەو لاوازە. چونکە (سَعِيْد)ی کوڕی (حَكِيْم) بە خزمەتی هاوەڵانیش نەگەیشتوە، چیجای پێغەمبەری خوا!!! کەواتە دوو کەس بەشوێن یەکدا لە ڕشتەکەی داکەوتوون، بۆیە حەدیسەکە حەدیسێکی (مُعْضَل)ـە بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٦ / ٢٦٨، وعُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّي / ٢٦٧.

ماوە کە بڵێین: لە تەواوی نوسخەکانی (أذْكَار)دا حەدیسەکە لە ڕێگەی (سَعِيْد)ی کوڕی (حَكِيْم)ـەوە ڕیوایەت کراوە. بەڵام لە نوسخە بەچاپ گەیەنراوەکانی کتێبەکەی

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْــنُ السُّــنِّيّ)دا، لــە هـاوەڵی خۆشەویست (أنَس)ــەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویـەتی: «مَنْ رأى شَيْئاً، فَأعْجَبَهُ، فَقالَ: "مَا شَاءَ اللَّهُ، لا قُوَّةَ إلاَّ بِالله" لَـمْ يَضُرَّهُ».[1] واتە: "هەر کەسێك شتێك ببینێتو، پێی سەرسام بێتو، بڵێت: (مَا شَاءَ اللَّهُ، لا قُوَّةَ إلاَّ بِاللهِ)، ئیتر هیچ زەرەرو زیانێکی پێ ناگەیەنێت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْــنُ السُّــنِّيّ)دا، لــە هـاوەڵی خۆشەویست (سَهْل)ی کوڕی (حُنَيْف)ــەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویـەتی: «إذَا رَأى أحَدُكُمْ مَا يُعْجِبُهُ فِيْ نَفْسِهِ أوْ مَالِهِ، فَلْيُبَرِّكْ عَلَيْهِ، فَإنَّ الْعَيْنَ حَقٌّ».[2] واتە: "ئەگـەر یـەکێك لــە ئێـوە لــە خودی خۆیدا یان لە ماڵەکەیدا شتێکی بینیو، پێی سەرسام بوو، با داوا بکات خوا بەرەکەتی تێ بخات. چونکە چاوی پیس حەقەو ڕاستە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْــنُ السُّــنِّيّ)دا، لــە هـاوەڵی خۆشەویست (عَامِر)ی کوڕی (رَبِيْعَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إذَا رَأى أحَدُكُمْ مِـنْ نَفْسِـهِ

---

شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا -کە ئیمامی نەوەوی حەدیسەکەی لێوە هێناوە- لە ڕێگـەی (حِزَام)ی کوڕی (حَكِيْم)ی کوڕی (حِزَام)ــەوە ڕیوایەت کراوە، کە یەکێکـە لــە شـوێنکەوتوان. جـا حەدیسەکە لەڕێگەی ئەمیشەوە هەر بچڕانی تێدایەو، حەدیسێکی (مُرْسَل)ــە.

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَــوْمِ وَاللَّيْلَــة (ابْــنُ السُّــنِّيّ) / ١٠٦ / بـە ژمـارە: ٢٠٧. کەسـێك لــە ڕشتەکەیدایە، ناسراوە بە (أبُو بَكْر)ی (هُذَلِيّ)، شـێخی (هَيْثَمِــيّ) لەبارەیـەوە فەرموویـەتی: کەسێکی زۆر لاوازە. بڕوانە: مَجْمَعُ الزَّوَائِد / ٥ / ١٠٩ / بە ژمارە: ٨٤٣٢.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٠٥ / بە ژمارە: ٢٠٥. ڕشتەکەی لاوازە. بـەڵام دەقی حەدیسەکە (صَحِيْح)ــە، چونکە لە چەندین ڕێگەی تـرەوە ڕیوایـەت کـراوە. بڕوانـە: عُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّي / ٢٦٤ - ٢٦٥.

وَمَالِهِ وَأخِيْهِ مَا يُعْجِبُهُ، فَلْيَدْعُ بِالْبَرَكَةِ».[1] واته: " ئەگەر یەکێك لە ئێوە لە خودی خۆیدا یان لە ماڵەکەیدا یان لە برایەکیدا شتێکی بینیو، پێی سەرسام بوو، با داوا بکات خوا بەرەکەتی تێ بخات".

پێشەوای پایەبەرز (قَاضِي حُسَيْن) -کە یەکێکە لە هاوەڵانمان- (رەحمەتی خوایان لێبێت) لە کتێبی (التَّعْلِيْقُ فِي الْمَذْهَب)دا فەرموویەتی: ڕۆژێك یەکێك لە پێغەمبەران (درودو سەلامی خوای لەسەر هەموویان بێت) سەیری ئومەتەکەی خۆی کردو، بە زۆری زانینو، پێیان سەرسام بوو. ئەوەبوو لە سەعاتێکدا حەفتا هەزار (٧٠٠٠٠) کەسیان لێ مرد. ئیتر خوای گەورەش وەحی بۆ کرد: "تۆ چاوت تێبڕین، ئەگەر کاتێ چاوت تێبڕین پەرژینت بکردنایە، تیانەدەچوون". ئەویش عەرزی کرد: "بەچی پەرژینیان بکەمو بیانپارێزم؟" خوای گەورەش وەحی بۆ کرد، کە بڵێت: (حَصَّنْتُكُمْ بِالْحَيِّ الْقَيُّوْمِ الَّذِيْ لا يَمُوتُ أَبَدَاً، وَدَفَعْتَ عَنْكُمُ السُّوءَ بِلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيمِ). واتە: "پەرژینتان دەکەمو دەتانپارێزم بەو خوایەی کە زیندووەو، چاودێرو پارێزەری هەموو شتێکەو، هەرگیز نامرێتو، خراپەو ناڕەحەتیشتان لێ لادەدەم بە زیکری (لا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيمِ)".[2]

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٠٦ / بە ژمارە: ٢٠٦. ڕشتەکەی لاوازە. بەڵام دەقی حەدیسەکە (صَحِيْح)ـە، چونکە لە چەندین ڕێگەی ترەوە ڕیوایەت کراوە. بڕوانە: عُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّي / ٢٦٥ - ٢٦٦.

(٢) شێخی (ابْنُ عَلاّن) فەرموویەتی: شێخی عەسقەلانی لە تەخریجی حەدیسەکانی (أذْكَار)دا فەرموویەتی: لە هاوەڵی خۆشەویست (صُهَيْب)ـەوە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) لە ڕۆژەکانی غەزای (حُنَيْن)دا لەدوای نوێژی بەیانیەوە لێوەکانو دەمی دەجوڵاندو شتێکی دەفەرموو، ئێمەش عەرزمان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، لەدوای نوێژی بەیانیەوە تا ئێستەش لێوەکانت دەجوڵێنیتو، پێشتریش شتی وات نەکردوە؟! ئەویش فەرمووی: "یەکێك لە پێغەمبەرەکانی پێش من، زۆری ئومەتەکەی سەرسامی کردبوو، بۆیە فەرمووی: (هیچ هێزێك -لەبەر زۆری- شەڕ لەگەڵ ئەمانەدا ناکاتو پەلاماریان نادات). جا خوای گەورە وەحیی بۆ کرد، تا ئومەتەکەی سەرپشك

جا ئەو کەسەی ئەم فەرمایشتەی (قَاضِي حُسَيْن)ی نوسیوەتەوە، خۆیشی فەرموویەتی: (قَاضِي حُسَيْن) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) عادەتی وابوو، ئەگەر سەیری قوتابیەکانی بکردایەو، بە دیمەنو شێوازی جوانیان سەرسام بوایە، بەم زیکرە پەرژینی دەکردن. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## ئەگەر کەسێك شتێکی بینی کە پێی خۆشبوو، یان شتێکی بینی کە پێی ناخۆش بوو، چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (ابْنُ مَاجَه)و شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، بە ڕشتەیەکی جوان (جَيِّد)، لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) شتێکی ببینیایە، کە پێی خۆش بێت، دەیفەرموو: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِيْ بِنِعْمَتِهِ تَتِمُّ الصَّالِحَاتُ». واتە: "سوپاسو ستایش بۆ ئەو خوایەی، کە بە لوتفو منەتی ئەو هەموو نازو نیعمەتە

---

بکات لەنێوان ئەم سێ شتەدا: یان برسێتی زاڵ دەکەم بەسەریاندا، یان دوژمن، یان مردن، ئەویش وەحیەکەی بۆ ئومەتەکەی گێڕایەوەو، سەرپشکی کردن لەنێوان سێ شتەکەدا، ئەوانیش عەرزیان کرد: سەبارەت بە زاڵ کردنی برسێتیو دوژمن، ئەوە لەتوانامانـدا نیەو بەرگەی ناگرین، بەڵام مردن قەیناکە. ئیتر ئەوەبوو لە سێ ڕۆژدا نەوەد هەزار (٩٠٠٠٠) کەسیان لێ مرد. ئەوجا پێغەمبەری خوا فەرمووی: منیش ئەمڕۆ دەڵێم: «اللّٰهُمَّ، بِكَ أُحَاوِلُ، وَبِكَ أُقَاتِلُ، وَبِكَ أُصَاوِلُ»".

شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ئەمە حەدیسێکی (صَحِيْح)ە، ئیمامی (أَحْمَد)و زانایانی تریش ڕیوایەتیان کردوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٣٣٣.

ئەوجا شێخی (ابْنُ عَلَّان) فەرمووی: ڕەنگە (قَاضِي حُسَيْن)یش ئاماژەی بەم چیرۆکە کردبێتو، ڕەنگە مەبەستی چیرۆکێکی تریش بووبێت، چونکە ئەو فەرمووی: "لە سەعاتێکدا حەفتا هەزار (٧٠٠٠٠) کەسیان لێ مرد". خواش لە هەموو کەس زانا ترە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٦ / ٢٧٠.

چاك‌و جوانه‌كان ته‌واو ده‌بن". ئه‌گه‌ر شتێكیشی ببینیایه‌، كه‌ پێی ناخۆش بێت، ده‌یفه‌رموو: «الْحَمْدُ لِلَّهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ».[1] واته‌: "سوپاس‌و ستایش بۆ خوای گه‌وره‌ له‌سه‌ر هه‌موو حاڵ‌و شێوازو بارودۆخێك".

ئیمامی (حَاكِم) فه‌رموویه‌تی: ئه‌م حه‌دیسه‌ ڕشته‌كه‌ی (صَحِيْح)ـه‌.[2]

## ئه‌گه‌ر كه‌سێك سه‌یری ئاسمانی كرد چی بڵێت؟

سونه‌ته‌ بڵێت: ﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ * رَبَّنَا إِنَّكَ مَنْ تُدْخِلِ النَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ * رَبَّنَا إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلْإِيمَانِ أَنْ آمِنُوا بِرَبِّكُمْ فَآمَنَّا رَبَّنَا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّئَاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ الْأَبْرَارِ * رَبَّنَا وَآتِنَا مَا وَعَدْتَنَا عَلَى رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ الْمِيعَادَ﴾ [آل عِمْرَان: ١٩١ - ١٩٤] واته‌: {ئه‌ی په‌روه‌ردگارمان، ئه‌مه‌ت بێهووده‌ دروست نه‌كردوه‌، تۆ پاك‌و بێگه‌ردیت، ده‌ی له‌ سزای ئاگر بمانپارێزه‌. ئه‌ی په‌روه‌ردگارمان، ئه‌و كه‌سه‌ی تۆ بیخه‌یته‌ ناو ئاگره‌وه‌، به‌ڕاستی سه‌رشۆڕت كردوه‌و، سته‌مكارانیش هیچ پشتیوان‌و پارمه‌تیده‌رێكیان نیه‌. ئه‌ی په‌روه‌ردگارمان، ئێمه‌ گوێمان له‌ بانگه‌رێكه‌وه‌بوو، بانگی خه‌ڵكی ده‌كرد بۆ باوه‌ڕهێنان‌و، ده‌یوت: باوه‌ڕ به‌ په‌روه‌ردگارتان بهێنن، ئێمه‌ش باوه‌ڕمان هێنا. ئه‌ی په‌روه‌ردگارمان، له‌ تاوانه‌كانمان خۆشبه‌و، كاره‌ خراپه‌كانمان بۆ په‌رده‌پۆش بكه‌و، له‌گه‌ڵ چاكه‌كاراندا بمانمرێنه‌. ئه‌ی په‌روه‌ردگارمان، ئه‌وه‌ی به‌ڵێنت پێدابووین له‌سه‌ر زمانی پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ت، پێمان ببه‌خشه‌و، له‌ ڕۆژی قیامه‌تیشدا سه‌رشۆڕو ڕیسوامان مه‌كه‌، به‌ڕاستی تۆ پێچه‌وانه‌ی به‌ڵێنی خۆت ڕه‌فتار ناكه‌یت}.

---

(١) بڕوانه‌: سُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٢٥٠ / به‌ ژماره‌: ٣٨٠٣، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٨٣ / به‌ ژماره‌: ٣٧٨.

(٢) بڕوانه‌: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٦٧٧ / به‌ ژماره‌: ١٨٤٠.

بەڵگەی ئەمەش بریتیە لەو حەدیسەی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس) (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا هێنراوە، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لەو کاتەدا وای دەفەرموو. وەکو پێشتریش باسمان کرد. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## ئەگەر کەسێك نیشانەی شوومی لە شتێکدا بەدی کرد چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (مُعَاوِيَّة)ی کوڕی (حَكَم)ی (سُلَمِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: عەرزی پێغەمبەری خوام کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، کەسانێك لە ئێمە بەردەوام ڕەشبینن‌و نوقلانەی خراپ لێ دەدەن!" پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: «ذَلِكَ شَيْءٌ يَجِدُونَهُ فِيْ صُدُورِهِمْ، فَلا يَصُدَّنَّهُمْ».[1] واتە: "ئەوە شتێکە لە دڵی خۆیاندا وای دەبینن‌و، ئەصڵێکیشی نیە. بۆیە با ڕێگریان لێ نەکات‌و ساردیان نەکاتەوە لە کارەکانیان".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)و لە غەیری ئەویشدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عُرْوَة)ی[2] کوڕی (عَامِر)ی (جُهَنِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٨١ / بە ژمارە: ٥٣٧.

(٢) لە هەندێك لە نوسخە بەچاپگەیەنراوەکانی کتێبی (أذْكَار)و لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)یشدا نوسراوە: (عُقْبَة)ی کوڕی (عَامِر). بەڵام وەکو هەندێك لە لێکۆڵەرەوەکانیش ئاماژەیان پێ داوە، ئەوە هەڵەیە، بەڵکو ڕاستەکەی ئەوەیە، کە حەدیسەکە لە ڕێگەی (عُرْوَة)ی کوڕی (عَامِر)ەوە ڕیوایەت کراوە، وەکو لەم سەرچاوانەی حەدیسدا هاتوە: مُصَنَّفُ ابْنِ أَبِيْ شَيْبَة / ٥ / ٣١٠ / بە ژمارە: ٨٥٧١، وسُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٤١٢ / بە ژمارە: ٣٩١٩، وسُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٨ / ١٣٩ / بە ژمارە: ١٦٢٩٨.

شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ڕای جیاواز هەیە سەبارەت بە هاوەڵێتی (عُرْوَة)ی کوڕی (عَامِر). ئەوجا فەرموویەتی: هەردوو زانای پایەبەرز (أَبُو أَحْمَد)ی (عَسْكَرِيّ)و

بێت)، کە فەرموویەتی: لەبارەی ڕەشبینیو لێدانی نوقڵانەی خراپەوە پرسیار لە پێغەمبەری خوا کرا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەویش فەرمووی: «أصْدَقُها الْفَأْلُ، وَلا يَرُدُّ مُسْلِماً، وَإِذَا رَأَيْتُمْ مِنَ الطِّيَرَةِ شَيْئاً تَكْرَهُونَهُ، فَقُولُوا: "اللَّهُمَّ، لا يَأْتِيْ بالْحَسَناتِ إلاَّ أَنْتَ، وَلا يَذْهَبُ بالسَّيِّئاتِ إلاَّ أَنْتَ، وَلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إلاَّ بِاللهِ"».[1] واتە: "ڕاستگۆترین نوقلانە لێدان بریتیە لە گەشبینیو نوقڵانە لێدانی باش، بۆیە نابێت ڕەشبینیو لێدانی نوقڵانەی خراپ موسوڵمان لە ئەنجامدانو ڕاپەڕاندنی کارەکەی بگەڕێنێتەوە. جا ئەگەر نیشانەی شوومیتان لە شتێکدا بینیو، لەبارەیەوە ڕەشبین بوون، بڵێن: (خوایە بێجگە لە جەنابت کەس چاکە ناهێنێتو، بێجگە لە جەنابیشت کەس خراپە لانادات‌و، هیچ هێزو توانایەکیش نیە بۆ خۆلادان لە خراپەو، بۆ کردنی چاکە بێجگە لە هێزی لوتفو پشتیوانی جەنابت) ".

## ئەوەی لەکاتی چوونە حەمامدا دەوترێت

وتراوە: سونەتە ناوی خوای گەورە بهێنرێتو، داوای بەهەشتی لێ بکرێتو، پەنای پێ بگیرێت لە ئاگر.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، بە ڕشتەیەکی لاواز، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی:

---

ئیمامی (بَيْهَقِيّ) پێیان وایە، کە ئەم حەدیسە حەدیسێکی (مُرْسَل)ـە. {واتە: (عُروَة) لە پێغەمبەری خوای نەبیستوە}. بڕوانە: الْإصَابَة فِيْ تَمْيِيْزِ الصَّحَابَة / ٤ / ٤٠٤ – ٤٠٥ / بە ژمارە: ٥٥٣٦.

شێخی (ابْنُ عَلاَّن)یش فەرموویەتی: ڕای جیاواز هەیە سەبارەت بە هاوەڵێتی (عُروَة)ی کوڕی (عَامِر). زانای پایەبەرز (ابْنُ أَبِيْ حَاتِم)یش لە ڕیزی متمانەدارانی شوێنکەوتواندا باسی کردوە. بەمەش ئەگەر (عُروَة) یەکێك بێت لە شوێنکەوتوان، ئەوا حەدیسەکە بە حەدیسێکی (مُرْسَل) دادەنرێت. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٦ / ٢٧٥.

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٤٤ – ١٤٥ / بە ژمارە: ٢٩٣.

پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «نِعْمَ الْبَيْتُ الْحَمَّامُ، يَدْخُلُهُ الْمُسْلِمُ، إِذَا دَخَلَهُ سَأَلَ اللهَ -عَزَّ وَجَلَّ- الْجَنَّةَ وَاسْتَعَاذَهُ (وَاسْتَعَاذَ بِهِ) مِنَ النَّارِ».[١]
واتە: "حەمام جێگەوماڵێکی باشە، کە موسوڵمان دەچێتە ناویەوە (چونکە خۆی تێدا دەشتوات‌و، خۆی خاوێن دەکاتەوە). جا ئەگەر موسوڵمانێك چوە ناو حەمامەوە، با داوای بەهەشت لەخوای گەورە بکات‌و، پەناشی پێ بگرێت لە ئاگری دۆزەخ". (خوا پەنامان بدات. آمین)

## ئەگەر کەسێك بەندەیەك، یان کەنیزەکێك، یان وڵاخێکی کڕی چی بڵێت‌و، ئەگەر قەرزێکیشی دایەوە چی بڵێت؟

سونەتە لەوەی یەکەمیاندا -کە کڕینەکەیە- پێشی سەری کۆیلە یان وڵاخە کڕاوەکە بگرێت‌و، بڵێت: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسأَلُكَ خَيْرَهُ وَخَيْرَ مَا جُبِلَ عَلَيْهِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهِ وَشَرِّ ما جُبِلَ عَلَيْهِ). واتە: " خوایە، من داوای خەیری ئەم شتەت لێ دەکەم‌و، داوای خەیری ئەو ڕەوشت‌و سیفەتانەشت لێ دەکەم کە لەگەڵ دروست کردنی ئەم شتەدا کراون بە بەشێك لە طەبیعەتی. پەناشت پێ دەگرم لە خراپەی ئەم شتەو، لە خراپەی ئەو ڕەوشت‌و سیفەتانەش کە لەگەڵ دروست کردنی ئەم شتەدا کراون بە بەشێك لە طەبیعەتی".

پێشتریش لە ((**کتێبی زیکرەکانی نیکاح**))دا ئەو حەدیسەمان هێنا، کە لە (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)و لە غەیری ئەویشدا لەم بارەوە هاتبوو.

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٥٤ / بە ژمارە: ٣١٥. وەکو ئیمامی نەوەوی فەرموویەتی: ڕشتەی ئەم حەدیسە لاوازە، چونکە وەکو ئیمامی (بُوْصِيْرِيّ)و ئیمامی (سَخَاوِيّ)ش فەرموویانە: کەسێکی لاوازی تێدایە، بەناوی (يَحْيَى)ی کوڕی (عُبَيْدُالله)ەوە. بڕوانە: إِتْحَافُ الْخِيْرَةِ الْمَهَرَةِ / ١ / ٢٩٩ - ٣٠٠ / بە ژمارە: ٥٠٥، والْمَقَاصِدُ الْحَسَنَة / ١ / ٧٠٠ / بە ژمارە: ١٢٥٥.

هەروەها سونەتە لە دانەوەی قەرزیشدا بە خاوەن قەرزەکە بڵێت: (بَارَكَ اللهُ لَكَ فِيْ أَهْلِكَ وَمَالِكَ، وَجَزَاكَ خَيْراً). واتە: "خوا بەرەکەت بخاتە خێزانو ماڵەکەتەوەو، پاداشتی خەیریشت بداتەوە".

## ئەگەر کەسێك لەسەر وڵاخ خۆی نەدەگرت چی بڵێتو، چی دوعایەکیشی بۆ بکرێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (جَرِيْر)ی کوڕی (عَبْدُالله)ی (بَجَلِـيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: سکاڵای ئەوەم بردە لای پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، کە ناتوانم لەسەر وڵاخ خۆم بگرم، ئەویش بەدەستی کێشای بەسەر سینەمداو، فەرمووی: «اللَّهُمَّ، ثَبِّتْهُ، وَاجْعَلْهُ هَادِياً مَهْدِيّاً».[1] واتە: "خوایە ڕاگیراوی بکەو، بیکە بە ڕێگەپیشاندەرو، هیدایەتیشی بدەو بیخەرە سەر ڕێگەی ڕاست".

## نابێت کەسی خوێندەوار یان کەسانی تریش شتێك بۆ خەڵکی باس بکەن، کە لێی تێنەگەن، یان ترسی ئەوەیان لێ بکرێت، کە ماناکەی بگۆڕنو، بە پێچەوانەی مەبەستەکەیەوە لێکی بدەنەوە

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ رَسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ﴾ [إبْرَاهِيْم: ٤] واتە: {ئێمە هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە بە زمانی گەلو هۆزەکەی خۆی نەبێت، تاوەکو بەرنامەو شەریعەتەکەی خوایان بۆ ڕوون بکەنەوە}.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٦٠ / بە ژمارە: ٥٧٣٩، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٩٢٥ / بە ژمارە: ٢٤٧٥.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، کە کاتێك هاوەڵی خۆشەویست (مُعَاذ) (خوای لێ ڕازی بێت) نوێژی جەماعەتی درێژ کردەوە، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) پێی فەرموو: «أفتَّانٌ أنْتَ، يَا مُعاذُ؟». [1] واتە: "ئەی (مُعاذ) تۆ دەتەوێت خەڵکی تووشی فیتنە بکەیتو لەنوێژی جەماعەت دووریان بخەیتەوە؟!".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: "شتێك بۆ خەڵکی باس بکەن، کە لێی تێبگەن، بۆ ئێوە پێتان خۆشە کە خواو پێغەمبەرەکەی بەدرۆ بخرێنەوە؟!". [2]

## دەکرێت کەسی زانا یان ئامۆژگاریکەر داوا لە ئامادەبوانی کۆڕەکەیان بکەن کە بێدەنگی ڕابگرن، تا بەباشی گوێی بۆ بگرنو لێی تێبگەن

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (جَرِيْر)ی کوڕی (عَبْدُالله)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لە حەجی ماڵئاواییدا پێی فەرمووم: "خەڵکیم بۆ بێدەنگ بکە". ئەوجا فەرمووی: «لا تَرْجِعُوا بَعْدِيْ كُفَّاراً، يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقابَ بَعْضٍ». [3] واتە: "لەدوای وەفاتی من (یان لەدوای جیابوونەوە لە من) کافر مەبنەوەو، خوێنی یەکتر بە حەڵاڵ بزانن (یان وەکو کافرەکان مەکەن) هەندێکتان بدەن لە گەردنی هەندێکی ترتان".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٤٩ / بە ژمارە: ٦٧٣، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٣٩ / بە ژمارە: ٤٦٥.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٥٩ / بە ژمارە: ١٢٧.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٥٦ / بە ژمارە: ١٢١، وصَحِيْحُ مُسْـلِم / ١ / ٨١ / بە ژمارە: ٦٥.

## ئەگەر کەسێکی پەیڕەولێکراو کارێکی دروستی کرد، کە بە ڕواڵەت نادروست بوو چی بلێت؟

بزانە کە کەسی زاناو مامۆستاو دادوەرو موفتیو شێخی پەروەردەکارو غـەیری ئەوانیش، لەو کەسانەی کـە پـەیڕەویان لێ دەکرێـتو، بۆچـوونیان وەردەگیرێـت، سونەتە خۆیان بەدوور بگـرن لـەو کـردارو گوفتـارو هەڵسوکەوتانـەی، کـە بـە ڕواڵەت ناحەقن، باوەکو لەسەر حەقیش بن تییدا. چونکە ئەگەر وا بکەن، خراپەی لێ پەیدا دەبێت.

- یەکێك لەو خراپانە ئەوەیە، کە زۆرێك لەو کەسانەی پێی دەزانن وا گومـان دەبەن، کە ڕواڵەتی ئەو کارە لە هەموو حاڵەتێکدا هەر دروستـەو، دواتـر دەبێت بە شەرعو بۆ هەتا هەتایە کاری پێ دەکرێت.
- خراپەیەکی تریشیان ئەوەیە، کە خەڵکی بەچـاوی کەموکورتیـەوە تەماشـای کەسەکە دەکـەنو، باوەڕیـان وای لێـدێت، کـە کەسـێکی کەموکورتـەو، زمانیانیشیانی لێ بەرەلا دەکەن.
- خراپەیەکی تریشیان ئەوەیە، کە خەڵکی گومانی خراپـی پـێ دەبـەنو، لێـی دووردەکەونەوەو، کەسانی تریشی لێ دوور دەخەنەوە، بۆ ئەوەی زانستی لێ وەرنەگرن.
- هـەروەها ڕیوایـەتو شایەتیدانشـی لێ وەرناگیرێـتو، کـار بـە فەتواشـی ناکرێتو، خەڵکیش مەیلیان نامێنێـت بـۆ وەرگرتنـی ئـەو زانسـتانەی کـە پێیەتی.

جا ئەمانە چەند خراپەیەکی ئاشکرا بوون، کـە پێویسـتە ئـەو کەسـە خـۆی لـە دانەدانەیان بەدوور بگرێت، چیجای هەموویان.

خۆ ئەگەر پێویستی بە یەکێك لەو کارانە هەبوو، لە واقیعیشدا لەسەر حەق بوو، ئەوا با بە ئاشکرا نەیکات. خۆ ئەگەر بە ئاشکرا کردی، یان خۆی ئاشکرا بوو، یان پێی وابوو کە بەرژەوەندی هەیە لە بەئاشکرا کردنیدا، تاوەکو بزانرێت کە دروستەو، حوکمی شەرع لەبارەیەوە چیە، ئەوا پێویستە بڵێت: (ئەمەی کە من کردم حەرام نیە. یان بۆیە کردم، تا بزانن حەرام نیە، ئەگەر بەم جۆرە بکرێت کە من کردم، ئەویش وەها وەهایەو، بەڵگەکەشی ئەوەو ئەوەیە).

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَهْل)ی کوڕی (سَعْد)ی (سَاعِدِيّ)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوام بینی (دروودی خوای لەسەر بێت) لەسەر مینبەر ڕاوەستابوو، (اللهُ أَكْبَر)ی دەکردو، خەڵکیش بەشوێنیدا (اللهُ أَكْبَر)یان دەکرد. ئەوجا قورئانی خوێندو، ڕکوعی بردو، خەڵکیش بەشوێنیدا ڕکوعیان برد. پاشان هەستایەوەو، ئەوجا گەڕایەوە دواوەو، لەسەر زەوی سەجدەی بردو، پاشان گەڕایەوە بۆ سەر مینبەرەکە، هەتا لە نوێژەکەی بوویەوە. ئەوجا ڕووی کردە خەڵکەکەو، فەرمووی: «أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا صَنَعْتُ هَذَا لِتَأْتَمُّوا، وَلِتَعَلَّمُوا صَلاَتِي». واتە: "ئەی خەڵکینە، بۆیە وام کرد، تا شوێنم بکەونو، فێری چۆنێتی نوێژ کردنیشم ببن".[1]

هەروەها گەلێك حەدیسی تریش سەبارەت بەم باسە هاتوون، یەکێك لەوانە حەدیسەکەی: «ئەوە (صَفِيَّة)یە».[2]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٣١٠ / بە ژمارە: ٨٧٥، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٨٦ / بە ژمارە: ٥٤٤.

(٢) ئیمامی بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردوە لە دایکی ئیمانداران (صَفِيَّة)ی کچی (حُيَيّ)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: جارێك پێغەمبەری خوا لە مزگەوتدا مابوویەوە بۆ (اعْتِكَاف)، منیش شەو هاتم بۆ خزمەتیو، هەندێك قسەم لە خزمەتیدا کردو،

لە صەحیحی بوخاریشدا هاتوە، کە جارێك ئیمامی (عَلِيّ) بە ڕاوەستانەوە ئاوی دەخواردەوەو، فەرمووی: "پێغەمبەری خوام بینیوە (درودی خوای لەسەر بێت) کە بەم جۆرەی دەکرد، ئێوە منتان بینی".[1] (واتە: بینیومە ئەویش بە ڕاوەستانەوە ئاوی خواردۆتەوە).

فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خواو هاوەڵاْنو شوێنکەوتوانیش لەم بارەیەوە لە کتێبە صەحیحەکاندا مەشهوورن.

---

پاشان هەستام بگەڕێمەوە، پێغەمبەریش هەستا لەگەڵما تا ڕەوانەم بکاتەوەو، لەو کاتەشدا ماڵمان لە خانوویەکی هاوەڵی خۆشەویست (أُسَامَة)ی کوڕی (زَيْـد)دا بوو، جا کە دەرچووین دوو پیاو لە پشتیوانان بەلاماندا تێپەڕینو، کە چاویان بە پێغەمبەری خوا کەوت ڕۆیشتنەکەیان تیژو خێرا کرد، پێغەمبەریش پێی فەرموون: "پەلە مەکەنو لەسەرخۆ بن، ئەوە (صَفِيَّة)ی کچی (حُيَيّ)ـە". جا ئەوانیش وتیان: "(سُبْحَانَ الله) ئەی پێغەمبەری خوا". پێغەمبەریش فەرمووی: «إِنَّ الشَّيْطَانَ يَجْرِي مِنَ الإِنْسَانِ مَجْرَى الدَّمِ، وَإِنِّي خَشِيتُ أَنْ يَقْذِفَ فِي قُلُوبِكُمَا سُوءًا -أَوْ قَالَ- شَيْئًا». واتە: بەڕاستی شەیتان لە لاشەی مرۆڤدا بەناو ڕێڕەوی خوێندا دەڕوات، منیش بەڕاستی ترسام خەیاڵێکی خراپ یان شتێك بخاتە دڵتانەوە. بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١١٩٥ / بە ژمارە: ٣١٠٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧١٢ / بە ژمارە: ٢١٧٥.

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢١٣٠ / بە ژمارە: ٥٢٩٢.

# ئەگەر كەسێكی پەیڕەولێكراو كارێكی لەو جۆرەی كرد، شوێنكەوتوەكانی چی پێ بڵێن؟

بزانە كە ئەگەر كەسێكی شوێنكەوتوو شتێكی لە مامۆستایەكی خۆی بینی، یان لە یەكێك لەو كەسانەی كە پەیڕەویان لێ دەكرێت‌و، شتەكەش لە ڕواڵەتدا خراپ بوو، ئەوا بۆی هەیە بە مەبەستی وەرگرتنی ڕێنموویی پرسیاری لێ بكات. جا ئەگەر بە لەبیرنەبوون كردبووی، ئەوا پێی دەزانێت‌و وازی لێ دەهێنێت، ئەگەر بە دەستی ئەنقەستیش كردبووی‌و، لە واقیعیشدا درووست بوو، ئەوە بۆی ڕوون دەكاتەوە.

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أسَامَةَ)ی كوڕی (زَيْد)ەوە (خوا لە هەردووكیان ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: جارێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لە ڕاوەستانی كێوی (عَرَفَة) گەڕایەوە، جا كە گەیشتە ئەو ڕێگەیەی حاجیەكان پێیدا تێدەپەڕین لە نێوان دوو كەژەكەدا، دابەزی‌و، دەستی بەئاو گەیاندو، پاشان دەستنوێژی گرت‌و، منیش عەرزم كرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، دەتەوێت نوێژ بكەیت؟". ئەویش فەرمووی: "نوێژ لە پێشتەوەیە".[1] واتە: لە (مُزْدَلِفَة) نوێژ دەكەین.

منیش دەڵێم: بۆیە (أسَامَة) وای فەرموو. چونكە گومانی وا بوو، كە پێغەمبەر نوێژی مەغریبی لەبیر چوە. چونكە بەر لە دەرچوونی پێغەمبەر كاتی نوێژی مەغریب هاتبوو.

هەروەها لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا ئەو فەرمایشتەی هاوەڵی خۆشەویست (سَعْد)ی كوڕی (أبو وَقَّاص)یشمان بۆ ڕیوایەت كراوە، كە عەرزی

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٦٥ / بە ژمارە: ١٣٩، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٩٣٤ / بە ژمارە: ١٢٨٠.

پێغەمبەری کردوە: "ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە چیە وا فلأنە کەست پەڕاند (و هیچت پێنەدا)؟!، سوێند بەخوا من بە کەسێکی ئیمانداری دەزانم".[1]

لە صەحیحی موسلیمیشدا هاتوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (بُرَيْـدَة)وە، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لە ڕۆژی فەتحی شاری (مَكَّـة)ی پیرۆزدا چەند نوێژێکی بە یەك دەستنوێژ کرد. ئیمامی (عُمَر)یش (خوای لێ ڕازی بێت) عەرزی کرد: "ئەمڕۆ شتێکت کرد، کە پێشتر نەتکردوە". پێغەمبەریش فەرمووی: "هەر بە دەستی ئەنقەست کردم، ئەی (عُمَر)".[2]

جا حەدیسی هاووێنەی ئەمانە گەلێك زۆرن‌و، لە کتێبە صەحیحەکانیشدا مەشهوورن.

## باسی هاندان لەسەر ڕاوێژ کردن

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ﴾ [آل عِمْرَان: ١٥٩] واتە: {لە کاروباری موسوڵماناندا پرس‌و ڕاوێژیان پێ بکە}.

حەدیسە صەحیحەکانیش لەمبارەوە گەلێك زۆرو مەشهوورن، بەڵام کە ئەم ئایەتە پیرۆزە هەبێت پێویست بە هیچ بەڵگەیەکی تر ناکات. چونکە ئەگەر خوای گەورە لە کتێبەکەی خۆیدا بە دەقێکی ڕوون فەرمان بە پێغەمبەرەکەی بکات کە دەبێت ڕاوێژ بکات -لەگەڵ ئەوەی کە تەواوترینی دروستکراوەکانیتی-، ئیتر دەبێت بۆ کەسانی تر چۆن بێت؟

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ١٨ / بە ژمارە: ٢٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ١٣٢ / بە ژمارە: ١٥٠.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٢٣٢ / بە ژمارە: ٢٧٧.

جا بزانە کە هەر کەسێك بیەوێت کارێك بکات، سونەتە لەوبارەوە ڕاوێژ بکات بەو کەسەی، کە متمانەی هەیە بە دینو شارەزاییو زیرەکیو دڵسۆزیو بەپارێزیو بەسۆزیەکەی.

هەروەها سونەتە ڕاوێژ بە کۆمەڵێکی زۆر لەو کەسانەش بکات، کە ئەو سیفەتانەیان هەیەو، پێیشیان بڵێت مەبەستی لەو کارە چیەو، بەرژەوەندیو زیانی کارەکەشیان بۆ ڕوون بکاتەوە، ئەگەر شتێکی لێ دەزانی.

ئەوجا دەبێت ئەو کەسانە زیاتر ڕاوێژ بکەن، کە سەرپەرشتیاری کاروباری گشتی دەکەن، وەکو سوڵتانو، دادوەرو، هاوڕێنەکانیان.

ئەو حەدیسە صەحیحانەش کە سەبارەت بە ڕاوێژ کردنی ئیمامی (عُمَــر)ی کوری (خَطَّاب) بە هاوەڵەکانیو، گەڕانەوەی بۆ فەرمایشتی ئەوان هاتون، گەلێك زۆرو مەشهوورن.[1]

پاشان سوودی ڕاوێژ کردن بریتیە لە قبووڵ کردنی بۆچوونی کەسە ڕاوێژپێکراوەکە، ئەگەر ئەو سیفەتانەی هەبوو کە باسمان کردن، بە مەرجێك ڕێنموونیەکەی هیچ خراپەیەکی تێدا نەبوو.

ئەوجا پێویستیشە لەسەر کەسە ڕاوێژپێکراوەکە چەندە دەتوانێت دڵسۆزی خۆی پیشان بداتو، بیرو هۆشی خۆی لەو بارەوە بخاتە کار.

چونکە بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (تَمِيْم)ی (دَارِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای

---

(١) یەکێك لەوانە حەدیسی تەشریف بردنەکەیەتی بۆ وڵاتی شام، کە لە ڕێگە خەبەریان پێدا، پەتاو نەخۆشی لە وڵاتی شامدا بڵاوبوەتەوە، ئەویش هاوەڵانی کۆکردەوەو پرسو ڕاوێژی پێ کردن، کە تەشریف ببات یان بگەڕێتەوە. بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٦٣ / بە ژمارە: ٥٣٩٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧٤٠ / بە ژمارە: ٢٢١٩.

لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «الدِّينُ النَّصِيحَةُ». واتە: "ئـاین بریتیـە لـە دڵسـۆزیو ئامۆژگاری". جا ئێمەش عەرزمان کرد: "دڵسۆزیو ئامۆژگاریە بـۆ کـێ؟" ئـەویش فەرمووی: «لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ وَلأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ». واتە: "بۆ خـواو، بـۆ کتێبەکـەیو، بـۆ پێغەمبەرەکـەیو، بـۆ پێشـەوایانی موسـوڵمانانو، بـۆ هـەموو موسوڵمانانیش".[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَـائِيّ)و (ابْـنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویـەتی: «الْمُسْتَشَارُ مُـؤْتَمَنٌ». واتـە: "کەسی ڕاوێژپێکراو جێگەی متمانەیە".[2]

## باسی هاندان لەسەر قسەی باش کردن

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَاخْفِضْ جَنَاحَكَ لِلْمُـؤْمِنِينَ﴾ [الْحِجْـر: ٨٨] واتـە: {باڵی سۆزو ڕەحمەت بۆ باوەڕداران ڕابخەو، لەگەڵیاندا بێنەفسانە مامەڵە بکە}.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هـاوەڵی خۆشەویست (عَدِيّ)ی کـوڕی (حَاتِم)ـەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «اتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِـقِّ تَمْـرَةٍ.

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٧٤ / بە ژمارە: ٥٥.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٥٥ / بە ژمـارە: ٥١٢٨، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ١٢٥ / بـە ژمارە: ٢٨٢٢، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَـه / ٢ / ١٢٣٣ / بـە ژمـارە: ٣٧٤٥. ئیمـامی (حَـاكِم) فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە لەسەر مەرجی بوخاریو موسلیم. بڕوانـە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ٤ / ١٤٥ / بە ژمـارە: ٧١٧٨. منـیش دەڵـێم: دەقـی حەدیسـەکەم لـە نوسخە بەچاپگەیەنراوەکانی (سُنَن)ـەکانی ئیمامی (نَسَائِيّ)دا نەبینیەوە!!!

فَمَنْ لَمْ يَجِدْ، فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ».[1] واته: "خۆتان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن، باوەکو بە لەتە خورمایەکیش بێت. جا ئەو کەسەی لەتە خورماکەی نەبوو، با بە قسەیەکی جوانو شیرین خۆی بپارێزێت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «كُلُّ سُلامَى مِنَ النَّاسِ عَلَيْهِ صَدَقَةٌ، كُلَّ يَوْمٍ تَطْلُعُ فِيْهِ الشَّمْسُ تَعْدِلُ بَيْنَ الاثْنَيْنِ صَدَقَةٌ، وَتُعِيْنُ الرَّجُلَ فِيْ دَابَّتِهِ، فَتَحْمِلُهُ عَلَيْهَا أَوْ تَرْفَعُ لَهُ عَلَيْها مَتاعَهُ صَدَقَةٌ. قَالَ: وَالْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ، وَبِكُلِّ خُطْوَةٍ تَمْشِيْها إِلَى الصَّلاةِ صَدَقَةٌ، وَتُمِيْطُ الْأَذَى عَنِ الطَّرِيْقِ صَدَقَةٌ».[2] واته: "هەموو ڕۆژێك کە خۆر هەڵدێت، هەموو یەکێك لە جومگەکانی لاشەی ئادەمیزاد خەیرو صەدەقەیەکیان لەسەرە: دادپەروەری بکەیت لە نێوان دوو کەسداو ناوبژیان بکەیتو یەکیان بخەیتەوەو صەدەقەیەکە، یارمەتی پیاوێك بدەیت تا سواری وڵاخەکەی ببێت، یان کۆڵو بارەکەی بۆ بار بکەیت صەدەقەیەکە، قسەیەکی خۆشو شیرین صەدەقەیەکە، بە هەموو هەنگاوێك کە دەینێیت بۆ نوێژ کردن صەدەقەیەکە، ئازارو زەحمەتێك لەڕێگەدا لاببەیت صەدەقەیەکە".

منیش دەڵێم: (سُلاَمَى) بریتیە لە یەکێك لە جومگەکانی ئەندامەکانی لاشەی ئادەمیزاد. جەمعەکەشی بریتیە لە (سُلامَيَات)، وەکو پێشتریش لە سەرەتاکانی کتێبەکەدا باسمان کرد.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٤١ / بە ژمارە: ٥٦٧٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٧٠٤ / بە ژمارە: ١٠١٦.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٠٩٠ / بە ژمارە: ٢٨٢٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٩٩ / بە ژمارە: ١٠٠٩.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبــو ذَرّ)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) پێی فەرمووم: «لا تَحْقِرَنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ شَيْئاً، وَلَوْ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْــهٍ طَلْــقٍ».[1] واتە: "هیچ کارێکی باش‌و چاك بە بچووك‌و کەمبایەخ مەزانە، باوەکو ئەوەش بێت کە بە ڕوویەکی کراوەو خۆشەوە بگەیت بە برایەکی دینی خۆت".

## سونەتە قسە بە ڕوونی بکرێت بۆ کەسی ڕووتێکراو

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)دا، لە (عَائِشَــةَ)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: فەرمایشتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) ڕوون‌و ئاشکرا بوو لە گەیاندنی مانادا، بەجۆرێك کە ئەو کەسەی دەیبیست لێی تێدەگەیشت.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە ئەگەر شتێکی بفەرموایە، سێبارەی دەکردەوە، هەتا لێی حاڵی ببن‌و، ئەگەر تەشریفیشی بهێنایە بۆلای کۆمەڵێك، سڵاوی لێ دەکردن‌و، سڵاوەکەشی سێبارەی دەکردەوە.[3]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٢٦ / بە ژمارە: ٢٦٢٦.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٧٦ / بە ژمارە: ٤٨٣٩. ئیمامی (تِرْمِــذِيّ)ش بە دەقێکی هاومانا ڕیوایەتی کردووە، فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٦٠٠ / بە ژمارە: ٣٦٣٩.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤٨ / بە ژمارە: ٩٥.

## باسی گەمەو گاڵتە کردن

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێـت)، کە پێغەمبەری خوا (درووودی خـوای لەسـەر بێت) بە برا بچووکەکەی ئەوی دەفەرموو: «يَا أَبَا عُمَيْرٍ، مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ؟».[1]

دیسان بۆمان ڕیوایـەت کـراوە لـە هـەردوو کتێبەکـەی ئیمـامی (أَبُـو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا، لـە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە پێغەمبـەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) بەوی فەرموە: «يَا ذَا الْأُذُنَيْنِ». واتە: "ئەی خاوەنی دوو گوێچکە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[2]

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لـە هـەردوو کتێبـی بوخـاریو موسـلیمدا، کـە پیاوێك هاتوەتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)و، عـەرزی کـردوە: "ئەی پێغەمبەری خوا، وڵاخێکم بدەرێ با سواری بم". پێغەمبەریش فـەرمووی: «إِنِّيْ حَامِلُكَ عَلَى وَلَدِ النَّاقَةِ». واتە: "بەچکە حوشترێکت دەدەمێ سواری بە". پیاوەکەش عەرزی کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، بەچکەی حوشتر چی پێ بکەم؟". پێغەمبـەریش فەرمووی: «وَهَلْ تَلِدُ الإِبِلَ إِلاَّ النُّوقُ؟». واتە: "ئەی بێجگە لە حوشتری مێینە هیچ شتێکی تر حوشتری نێرینەی دەبێت؟!". (واتە: هەموو حوشترێك -چی گەورە بێـت یان بچووك- هەر لە حوشتری مێینە پەیدا دەبێت).

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[1]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٩١ / بە ژمارە: ٥٨٥٠، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٩٢ / بە ژمارە: ٢١٥٠.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧١٩ / بە ژمـارە: ٥٠٠٢، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٣٥٨ / بـە ژمارە: ١٩٩٢.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: هاوەڵان عەرزی پێغەمبەریان کرد (دروودی خوای لەسەر بێت): ئەی پێغەمبەری خوا، بەڕاستی جەنابت گەمەو گاڵتەمان لەگەڵدا دەکەیت!!! (واتە: چۆن دەبێت جەنابت گەمەو گاڵتە بکەیت، کەچی نەهیت کردوە لە ئێمە کە بیکەین!) ئەویش فەرمووی: «إِنِّي لا أَقُوْلُ إِلاَّ حَقًّا». واتە: "من بێجگە لە قسەی ڕاست هیچی تر ناڵێم". (واتە: هەرچی بڵێم هەر ڕاستە).

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «لا تُمَارِ أَخَاكَ، وَلا تُمَازِحْهُ، وَلا تَعِدْهُ مَوْعِداً، فَتُخْلِفَهُ».[3] واتە: "چەندوچوونو مشتومڕ لەگەڵ برای خۆتدا مەکەو، گەمەو گاڵتەشی لەگەڵدا مەکەو، بەڵێنو مەوعیدیشی مەدەرێو، دواتریش بۆی جێبەجێ نەکەیت!!!".

زانایان فەرموویانە: گەمەو گاڵتەی نەهی لێ کراو ئەوەیە کە زیادەڕەوی تێدا بکرێتو، بەردەوامیش بکرێت، کە ئەم جۆرە دەبێتە هۆی پێکەنینی زۆرو، ڕەقبوونی دڵو، مرۆڤیش مەشغوڵ دەکات لە زیکری خواو، لە بیرکردنەوە لە بابەتە گرنگو

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧١٨ / بە ژمارە: ٤٩٩٨، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٣٥٧ / بە ژمارە: ١٩٩١.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٣٥٧ / بە ژمارە: ١٩٩٠. لە نوسخە بەچاپگەیەنراوەکاندا نوسراوە: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٣٥٩ / بە ژمارە: ١٩٩٥. ڕشتەکەی لاوازە. بڕوانە: الْمُغْنِي عَنْ حَمْلِ الْأَسْفَار / ١ / ٤٧٨ / بە ژمارە: ١٨١٧، وبُلُوْغُ الْمَرَام / ٤٥٣ / بە ژمارە: ١٥١٢.

سەرەکیەکانی ئاین‌و، لە زۆربەی کاتەکانیشدا سەردەکێشێت بۆ ئازاردانی دڵی یەکتری، ڕق‌و کینە پەیدا دەکات‌و، شکۆمەندی‌و ڕێزو ویقاریش ناهێڵێت.

سەبارەت بەو گاڵتەو گەپەش کە ئەم جۆرە شتانەی تێدا نیە، ئەوە ئەو گەمەو گاڵتە ڕەواو دروستەیە، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) کردوویەتی. ئەویش تەنها لە هەندێك حاڵەتی زۆر کەم‌و ناوازەدا دەیکرد، لەبەر بەرژەوەندیەکی تایبەتی‌و، لەبەر دڵ خۆش کردنی کەسی بەرامبەر، کە ئەم جۆرە گاڵتە کردنە بە هیچ جۆرێك ڕێگری لەسەر نیە. بەڵکو -ئەگەر بەم جۆرە بێت- سونەتە. بۆیە تۆش پشت بەمە ببەستە کە لە زانایانەوە بۆمان هێنایت‌و، خۆشمان لەم حەدیسانەوە تەحقیقمان کردو، حوکمەکەیمان ڕوون کردەوە. چونکە یەکێکە لەو جێگانەی کە ئاگا لێبوونیان زۆر پێویستە. تەوفیقیش تەنها بەدەستی خوایە.

## باسی شەفاعەت‌و تکا کردن

بزانە کە تکا کردن لای دەسەڵاتداران‌و لای کەسانی تریش هەر سونەتە، ئیتر چی خاوەن ماف بیکات یان ئەو کەسانەی کە ماف دەگەڕێننەوە بۆ خاوەنەکەی، بەمەرجێك تکا کردنەکە سەبارەت بە حەدێکی شەرعی، یان شتێکی وا نەبێت، کە دروست نەبێت وازی لێ بهێنرێت‌و دەستی لێ هەڵبگیرێت. وەکو تکا کردن لای ئەو کەسەی چاودێری منداڵ یان شێت، یان ماڵی وەقف، یان شتی لەو جۆرە دەکات، سەبارەت بە وازهێنان لە هەندێك لەو مافانەی کە لەژێر دەسەڵاتی ئەودان.

جا هەموو ئەم جۆرە تکا کردنانە حەرامن‌و، حەرامە کەسی تکاکار بیانکات‌و، حەرامیشە کەسی تکالێکراو قبوڵیان بکات‌و، حەرامیشە کەسی تر هەوڵیان تێدا بدات، ئەگەر زانی بەو جۆرەیە.

بەڵگەكانی هەموو ئەمانەی باسم كردن لە قورئانو لە سونەتو لە فەرمایشتی زانایاندا گەلێك زۆرو ئاشكران.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مَنْ يَشْفَعْ شَفَاعَةً حَسَنَةً يَكُنْ لَهُ نَصِيبٌ مِنْهَا وَمَنْ يَشْفَعْ شَفَاعَةً سَيِّئَةً يَكُنْ لَهُ كِفْلٌ مِنْهَا وَكَانَ اللهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ مُقِيتاً﴾ [النّساء: ٨٥] واتە: {ئەو كەسەی تكایەكی باش بكاتو هەوڵ بدات كەسێك بگاتە كارێكی خەیر، خۆیشی پاداشتی چاكی لەو تكا كردنەو لەو هەوڵدانە دەست دەكەوێت، ئەو كەسەش تكایەكی خراپ بكاتو هەوڵ بدات كەسێك بگاتە كارێكی خراپ، خۆیشی پاداشتی خراپی لەو تكا كردنەو لەو هەوڵدانە دەست دەكەوێت، خوای گەورەش ئاگادارو چاودێرو بەتوانایە بەسەر هەموو شتێكدا}.

- وشەی (مُقِيْت) واتە: بەتواناو بڕیاردەر لە چارەنووس (الْمُقْتَدِرُ وَالْمُقَدِّر). ئەمە لێكدانەوەی شارەزایانی زمانەو، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)و لە تەفسیرزانانی تریشەوە هێنراوە.
- هەندێكیش لە تەفسیرزانان فەرموویانە: (مُقِيْت) واتە: پاسەوانو پارێزەر (حَفِيْظ).
- وتراویشە: (مُقِيْت) ئەو كەسەیە كە ژیوارو ڕزقی هەموو گیانلەبەرانی لەسەرە.
- شێخی (كَلْبِيّ)ش فەرموویەتی: (مُقِيْت) ئەو كەسەیە كە پاداشتی چاكەو خراپە دەداتەوە.
- وتراویشە: (مُقِيْت) واتە: چاودێرو ئاگادار (شَهِيْد). كە ئەمیش هەر بۆ مانای پاسەوانو پارێزەر (حَفِيْظ) دەگەڕێتەوە.

وشەی (كِفْل)یش واتە: بەشو پشك.

سەبارەت بەو (شَفَاعَة)و تکا کردنەش کە لـە ئایەتەکـەدا باسـکراوە، زۆربـەی زانایان لـەسەر ئەوەن کە بریتیە لە تکا کردنی هەنـدێك لـە خـەڵکی بـۆ هەنـدێکی تریان.

وتراویشە (شَفَاعَة)ی (حَسَنَة) ئەوەیە: کە موسوڵمان ئیمانو باوەڕەکـەی خـۆی دووقات بکاتەوە، بەوەی کە شەڕ لـەگەڵ کافرو بێباوەڕەکاندا بکات.[1] خواش لـە هەموو کەس زانا ترە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (أَبُو مُوْسَى)ی (أَشْعَرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە فەرموویـەتی: ئەگەر کەسێکی خاوەن پێویستی بهاتایە بۆ خزمـەتی پێغەمبـەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت)، پێغەمبـەریش ڕووی دەکـردە ئـەو هاوەڵانـەی کـە لەخزمەتیـدا دانیشتبوونو، دەیفـەرموو: «اشْفَعُوا تُؤْجَرُوا، وَيَقْضِي اللَّهُ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ مَا أَحَبَّ». واتە: "تکای باش بکەن بۆ کەسانی نیازمەندو لێقەوماو، تا پاداشتی باشتان لای خوا دەسـت بکـەوێت، ئـەو بڕیـارەش خـوای گـەورە پێـی خۆشـە لەسـەر زمـانی پێغەمبەرەکەیەوە بۆتان ڕوون دەکاتەوە".

لـە ڕیوایەتێکشدا بەم جۆرە هاتوە: (مَا شَاءَ).[2]

لـە ڕیوایەتی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)یشدا بەم جۆرە هـاتوە: «اشْـفَعُوا إِلَيَّ لِتُـؤْجَرُوا، وَلْيَقْضِ اللهُ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ مَا شَاءَ». واتە: "لای مـن تکـای بـۆ بکـەن، تـا پاداشـتی

---

(١) نَقَلَ الْوَاحِدِيُّ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ –رَضِيَ اللهُ عَنْهُ–: أَنَّ الشَّفَاعَةَ الْحَسَنَةَ هِيَ أَنْ يَشْفَعَ إِيمَانُهُ بِـاللهِ بِقِتَالِ الْكُفَّارِ –أَيْ يَضُمُّهُ إِلَيْهِ– وَالشَّفَاعَةُ السَّيِّئَةُ أَنْ يَشْفَعَ كُفْرُهُ بِالْمَحَبَّةِ لِلْكُفَّارِ وَتَرْكِ إِيذَائِهِمْ.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٥٢٠ / بە ژمارە: ١٣٦٥، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٢٦ / بە ژمارە: ٢٦٢٧.

چاکەتان بدرێتەوەو، خوای گەورەش لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەیەوە ئەو بڕیارە دەدات، کە خۆی ویستویەتی".[1]

جا ئەم ڕیوایەتە مانای ڕیوایەتی هەردوو صەحیحەکە ڕوون دەکاتەوە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، سەبارەت بە چیرۆکەکەی (بَرِيرَة)و مێردەکەی. (ابْنُ عَبَّاس) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) بە (بَرِيرَة)ی فەرموو: «خۆزگە دەگەڕایتەوە بۆلای مێردەکەت». ئەویش عەرزی کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا جەنابت فەرمانم پێ دەکەیت؟" پێغەمبەریش فەرمووی: «تەنها تکا دەکەم». ئەویش عەرزی کرد: "دەی من پێویستم پێی نیە".[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: کاتێك (عُيَيْنَة)ی کوڕی (حِصْن)ی کوڕی (حُذَيْفَة)ی کوڕی (بَدْر) گەڕایەوە، لای (حُرّ)ی کوڕی (قَيْس)ی برازای مایەوە، کە یەکێك بوو لەو کەسانەی ئیمامی (عُمَر) لەخۆی نزیکی دەکردنەوە. (عُيَيْنَة) وتی: "ئەی برازاکەم، لای ئەم فەرمانڕەوایە ڕێزو حورمەتێکت هەیە، داوای مۆڵەتی لێ بکە، با ببینم". ئیمامی (عُمَر)یش ڕێگەی پێدا. جا کە چوە ژوورەوە، وتی: "هێی، کوڕی (خَطَّاب)، سوێند بەخوا بەخششی زۆرمان نادەیتێ‌و، بە دادپەروەریش حوکم ناکەیت لە ناوماندا!!!" ئیمامی (عُمَر)یش تووڕەبوو، هەتا ویستی پەلاماری بدات. (حُرّ)یش عەرزی کرد: ئەی فەرمانڕەوای ئیمانداران، خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی خۆی فەرموە: ﴿خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ﴾، جا ئەمەش یەکێکە لە نەفامەکان.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٥٥ / بە ژمارە: ٥١٣١.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٠٢٣ / بە ژمارە: ٤٩٧٩.

(ابْنُ عَبَّاس) دەفەرموێت: سوێند بەخوا کە ئایەتەکەی خوێندەوە، ئیمامی (عُمَر) لێی تێنەپەڕی. چونکە کەسێکی زۆر هەڵوێستەکەر بوو لە بەرامبەر کتێبەکەی خوای گەورە.[1]

## مژدە پێدان و پیرۆزبایی کردن سوننەتە

- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَنَادَتْهُ الْمَلَائِكَةُ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي فِي الْمِحْرَابِ أَنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَى﴾ [آل عِمْرَان: ٣٩] واتە: {جا جوبرەئیل بانگی حەزرەتی (زَكَرِيَّا)ی کردو، ئەویش لەو کاتەدا لە میحرابەکەدا ڕاوەستابوو نوێژی دەکرد، پێی فەرموو: خوای گەورە مژدەت دەداتی بە پێدانی کوڕێکی چاک بەناوی (يَحْيَى)وە}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَلَمَّا جَاءَتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَى﴾ [الْعَنْكَبُوت: ٣١] واتە: {لەکاتێکدا نێردراوەکانمان مژدەکەیان هێنا بۆ حەزرەتی (إِبْرَاهِيْم)}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ جَاءَتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَى﴾ [هُود: ٦٩] واتە: {بەڕاستی نێردراوەکانی ئێمە مژدەکەیان هێنا بۆ حەزرەتی (إِبْرَاهِيْم)}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلَامٍ حَلِيمٍ﴾ [الصَّافَّات: ١٠١] واتە: {ئێمەش مژدەی کوڕێکی بەئارامو خۆگرمان دا بە حەزرەتی (إِبْرَاهِيْم)}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿قَالُوا لَا تَخَفْ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَامٍ عَلِيمٍ﴾ [الذَّارِيَات: ٢٨] واتە: {میوانەکان بە حەزرەتی (إِبْرَاهِيْم)یان فەرموو: مەترسەو، مژدەی کوڕێکی زاناو شارەزاشیان پێدا}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿قَالُوا لَا تَوْجَلْ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَامٍ عَلِيمٍ﴾ [الْحِجْر: ٥٣] واتە: {میوانەکان بە حەزرەتی (إِبْرَاهِيْم)یان فەرموو: مەترسە، ئێمە مژدەی کوڕێکی زاناو شارەزات دەدەینێ}.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٧٠٢ / بە ژمارە: ٤٣٦٦.

- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَامْرَأَتُهُ قَائِمَةٌ فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَاهَا بِإِسْحَاقَ وَمِنْ وَرَاءِ إِسْحَاقَ يَعْقُوبَ﴾ [هُود: ٧١] واتە: {خێزانەکەی حەزرەتی (إِبْـرَاهِيْم) بـەپێوە ڕاوەستابوو پێدەکەنی، ئێمەش مژدەمان پێدا، کـە (إِسْحَاق)ی دەبێـتو، لـە دوای (إِسْحَاق)یشەوە (يَعْقُوْب) پەیدا دەبێت}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿إِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِنْـهُ اسْمُهُ الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ﴾ [آل عِمْرَان: ٤٥] واتە: {فریشتەکە بە (مَرْيَم)ی فەرموو: خوای گەورە مژدەت پێ دەدات، کە بە فەرمانی خـۆی کوڕێکـت دەبێتو، نازناوی (مَسِيح)ـەو، ناویشی (عِيسَى)ی کوڕی (مَرْيَم)ـە}.
- هـەروەها فەرموویـەتی: ﴿ذَلِكَ الَّذِي يُبَشِّرُ اللهُ عِبَادَهُ الَّذِينَ آمَنُـوا وَعَمِلُـوا الصَّالِحَاتِ﴾ [الشُّوْرَى: ٢٣] واتە: {ئەوە ئـەو پاداشـتەیە، کـە خـوای گـەورە مژدەی بەخشینی دەدات بەو بەندانەی، کـە باوەڕیـان هێنـاوەو، کـردەوەی چاك ئەنجام دەدەن}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿فَبَشِّرْ عِبَادِ * الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ﴾ [الزُّمَر: ١٧ – ١٨] واتە: {دەی تۆش مژدە بدە بەو بەندانەی، کە گوێ بۆ قسە دەگرنو، شوێنی چاکترین قسە دەکەون}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنْتُمْ تُوعَـدُونَ﴾ [فُصِّـلَت: ٣٠] واتە: {مژدەی ئەو بەهەشتەتان لێبێت، کە بەڵێنتان پێ درابوو}.
- هەروەها فەرموویـەتی: ﴿يَوْمَ تَرَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ يَسْعَى نُـورُهُمْ بَـيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِمْ بُشْرَاكُمُ الْيَوْمَ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ [الْحَدِيْد: ١٢] واتـە: {لـەو ڕۆژەدا پیـاوانو ژنـانی بـاوەڕدار دەبینیـت، کـە ڕۆشـنایی باوەڕەکەیان وەکو چرا لـە بـەردەمیانو لای ڕاسـتیانەوە دەڕواتو ڕێگـەی بەهەشتیان بۆ ڕووناك دەکاتەوە، جا فریشـتەکان پێیـان دەفـەرموون: ئـەمڕۆ مژدەی بەهەشتێکتان لێبێت، کە ڕووباری ئاو بەژێر دارو باخو باخاتەکانیـدا ڕێ دەکات}.

- هەروەها فەرموویەتی: ﴿يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُمْ بِرَحْمَةٍ مِنْهُ وَرِضْوَانٍ وَجَنَّاتٍ لَهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُقِيمٌ﴾ [التوبة: ٢١] واتە: {پەروەردگاریان مژدەی میهرەبانیو ڕەزامەندی خۆیان پێ دەدات‌و، مژدەی باخ‌و باخاتێکیشیان پێ دەدات، کە نازو نعمەتی هەمیشەیی‌و بەردەوامی تێدایە بۆیان}.

ئەو حەدیسانەش کە لە کتێبە صەحیحەکاندا لەبارەی مژدە پێدانەوە هاتون، گەلێك زۆرو مەشهوورن.

یەکێکیان بریتیە لە حەدیسی مژدە پێدانەکەی دایکە (خَدِيْجَة) (خوای لێ ڕازی بێت) کە ماڵێکی لە قامیش بۆ درووستکراوە لە بەهەشتدا، هیچ ماندووبوون‌و ژاوەژاوێکی تێدا نیە.[1]

یەکێکیشیان حەدیسەکەی هاوەڵی خۆشەویست (کَعْب)ی کوڕی (مَالِك)ە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا هێنراوە، سەبارەت بە چیرۆکی تەوبە کردنەکەی. (کَعْب) فەرموویەتی: گوێم لە دەنگی کەسێکەوە بوو، کە بە بەرزترین دەنگی خۆی هاواری دەکرد: "(کَعْب)ی کوڕی (مَالِك) مژدە". ئیتر خەڵکی دەستیان کرد بە مژدە پێدانمان‌و، منیش چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، خەڵکیش دەستە دەستە پێم دەگەیشتن‌و، پیرۆزبایی تەوبەکەیان لێ دەکردم‌و، دەیانوت: "پیرۆزت بێت کە خوای گەورە تەوبەی لێ وەرگرتیت" هەتا چوومە ناو مزگەوتەوە، بینیم وا خەڵکی لەدەوری پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) کۆبوونەتەوە، جا هاوەڵی خۆشەویست (طَلْحَة)ی کوڕی (عُبَيْدُالله) هەستاو، بەڕاکردن هات بۆلام‌و، تەوقەی لەگەڵدا کردم‌و، پیرۆزبایی لێ کردم.

---

(١) بروانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٦٣٦ / بە ژمارە: ١٦٩٩، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٨٨٧ / بە ژمارە: ٢٤٣٣.

جا هـاوەڵی خۆشەویسـت (كَعْـب) ئـەم هەڵوێسـتەی هـاوەڵی خۆشەویسـت (طَلْحَة)ی قەت لـەبیر نەدەچوو.

هاوەڵی خۆشەویست (كَعْب) دەفەرموێت: كاتێك سـڵاوم لـە پێغەمبـەری خـوا كرد (دروودی خوای لەسەر بێت)، بینـیم ڕوخسـاری لـە خۆشـیدا دەگەشـایەوەو، پێـی فەرمووم: «أَبْشِرْ بِخَيْرِ يَوْمٍ مَرَّ عَلَيْكَ مُنْذُ وَلَدتْكَ أُمُّكَ». واتە: "مـژدەت لـێبێـت كـە ئەمە باشترین ڕۆژی تەمەنتە، لەوەتەی لەدایك بوویت".[1]

## دروستە سەرسووڕمان بە لەفزی (سُبْحَانَ اللهُ)و (لا إلهَ إلاّ اللهُ)و هاووێنەكانیان دەربرێت

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە جارێك لـە یەكێك لـە ڕێگـەكانی شاری مەدینەی پیرۆزدا بە خزمەت پێغەمبەری خوا گەیشتمو، لەو كاتەشـدا لـەشـم گران بوو. بۆیە بە دزیەوە ڕۆیشتم خۆم شۆردو، پێغەمبەریش هەر چاوەڕێم بوو. جا كە هاتمەوە بۆ خزمەتی، فەرمووی: "(أَبو هُرَيْـرَة) ئـەوە لـەكوێ بوویـت؟" منـیش عەرزم كرد: ئەی پێغەمبەری خوا، كە گەیشـتم بـە خزمـەتت، لـەشـم گـران بـوو، پێیشم ناخۆش بوو لـە خزمەتتدا دانیشم، هەتا خۆم نەشۆرم. پێغەمبەریش فـەرمووی: «سُبْحَانَ اللهِ، إنَّ الْمُؤْمِنَ لا يَنْجُسُ».[2] واتە: "بەڕاستی مرۆڤی ئیماندار پیس نابێت".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٦٠٣ / بە ژمارە: ٤١٥٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢١٢٠ / بە ژمارە: ٢٧٦٩.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ١٠٩ / بە ژمارە: ٢٧٩، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٢٨٢ / بـە ژمارە: ٣٧١.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئافرەتێك سەبارەت بە خۆشۆردن لە سووڕی مانگانە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا کرد (دروودی خوای لەسەر بێت). ئەویش فەرمانی پێ کرد کە چۆن خۆی بشوات‌و، پێشی فەرموو: «خُذِي فِرْصَةً مِنْ مِسْكٍ فَتَطَهَّرِي بِهَا». واتە: "پارچە قوماشێکی بۆنخۆش ببەو، خۆتی پێ پاك بکەرەوە". ئافرەتەکەش عەرزی کرد: "چۆن خۆمی پێ پاك بکەمەوە؟" پێغەمبەریش فەرمووی: "خۆتی پێ پاك بکەرەوە". ئافرەتەکە هەم عەرزی کردەوە: "چۆن؟" پێغەمبەریش فەرمووی: "(سُبْحانَ اللهِ) خۆت پاك بکەرەوەو، تەواو".

دایکە (عَائِشَة) دەفەرموێت: منیش ئافرەتەکەم ڕاکێشا بۆلای خۆم‌و، وتم: "شوێن شوێنەواری خوێنەکە بکەوە". واتە: (پارچە قوماشەکە بخەرە ئەو جێگەی کە خوێنەکەی لێوە هاتوە).[1]

منیش دەڵێم: ئەمە دەقی یەکێك لە ڕیوایەتەکانی ئیمامی بوخاریەو، ڕیوایەتەکانی تری‌و ڕیوایەتەکانی ئیمامی موسلیمیش هەر بە هەمان مانان.

جا مەبەستی ئەم فەرمایشتە ئەوەیە، کە با ئافرەتەکە تۆزێك بۆنی میسك بدات لە پارچە لۆکەیەك یان پارچە خوریەك، یان پارچە قوماشێك، یان شتێکی لەو جۆرەو، ئەوجا بیخاتە ناو زێی خۆیەوە، تا بۆنخۆشی بکات‌و، بۆنە ناخۆشەکەی لابات.

وتراویشە: مەبەست لەو کارە ئەوەیە کە زوو مندالْ بگرێت. ئەمەش بۆچوونێکی لاوازەو، خواش لە هەموو کەس زاناترە.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ١١٩ / بە ژمارە: ٣٠٨، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٢٦٠ / بە ژمارە: ٣٣٢.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە صـەحیحی موسـلیمدا، لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە خوشکەکەی (رُبَيِّع) -کە پێی دەوترا (أُمُّ حَارِثَةَ)- مرۆڤێکی بریندار کردبوو، کێشەکەیان هێنایە خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەویش فەرمووی: «الْقِصَاصَ الْقِصَاصَ». واتە: "تۆڵەی شـەرعی لەسـەر جێبەجی بکەن، تۆڵەی شەرعی". دایکی (رُبَيِّع)یش عەرزی کرد: "ئـەی پێغەمبـەری خـوا، تۆڵـە لـە فلاّنـە کـەس دەکرێتـەوە؟ سـوێند بـەخوا تۆڵـەی لێ ناکرێتـەوە!" پێغەمبەریش فەرمووی: «سُبْحَانَ اللّهِ! يَا أُمَّ الرُّبَيِّعِ، الْقِصَاصُ كِتَـابُ اللهِ».[1] واتـە: "ئەی (أُمَّ الرُّبَيِّع)، تۆڵە کردنەوە بڕیارو حوکمی خوایە".

منیش دەڵێم: ئەصڵی حەدیسەکە لە هەردوو صـەحیحی بوخـاری‌و موسـلیمدا هاتوە. بەڵام ئەمەی باسمان کـرد دەقـی ڕیوایەتەکـەی ئیمـامی موسـلیمەو، ئـەویش مەبەستەکەی ئێمەیە لێرەدا.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە صـەحیحی موسـلیمدا، لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (عِمْرَان)ی کوڕی (حُصَيْن)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێـت)، لەو حەدیسە درێژەیدا، کە سەبارەت بە چیرۆکی ئافرەتە دیلکراوەکـە هـاتوە، کـە لـە دەسـتی کافرەکـان بەربوەو، سواری حوشترەکەی پێغەمبەری خوا بوەو، نەزریشی کردوە، کـە ئەگـەر خوای گەورە ڕزگاری بکات، دەبێت ئەو حوشترە سەرببڕێت! جا کە چیرۆکەکەیان بۆ پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) باس کرد، ئەویش فـەرمووی: «سُـبْحَانَ اللّهِ! بِئْسَ مَا جَزَتْها».[2] واتە: "بەڕاستی ئەو ئافرەتە پاداشتێکی خراپی حوشـترەکەی داوەتەوە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبـو مُوْسَى)ی (أشْعَرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێـت)، لـە حەدیسی داوای مۆڵـەت کردنەکەدا،

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٣٠٢ / بە ژمارە: ١٦٧٥.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٢٦٢ / بە ژمارە: ١٦٤١.

که ئەو بە ئیمامی (عُمَر)ی فەرموو (خوای لێ ڕازی بێت): {سَمِعْتُ رَسُولَ الله –صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ– يَقُولُ: «الاِسْتِئْذَانُ ثَلاَثٌ فَإِنْ أُذِنَ لَكَ، وَإِلاَّ فَارْجِعْ»........} جا لە کۆتایی حەدیسەکەدا هاتوە: "ئەی کوڕی (خَطَّاب)، مەبە بە سزاو ئازار بۆ هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)". ئیمامی (عُمَر)یش فەرمووی: "(سُبْحَانَ اللَّهِ)، مەسەلەکە هەر ئەوەندەیە کە من شتێکم بیستو، حەزم کرد لێی دڵنیابم".[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لەو حەدیسە درێژەی هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (سَلام)دا، کاتێك پێی وترا: "تۆ بەهەشتیت". ئەویش فەرمووی: "(سُبْحَانَ اللّهِ)، نابێت کەسێك شتێك بڵێتو، ئاگای لێی نەبێت"..... ئیتر تەواوی حەدیسەکەی باس کرد.[2]

## باسی فەرمان کردن بە چاکەو، نەهی کردن لە خراپە

ئەم باسە گرنگترین باسە، یان یەکێکە لە گرنگترین باسەکان. لەبەر زۆری ئەو دەقانەی کە لەبارەیەوە هاتون، چونکە پێگەیەکی گرنگی هەیەو، زۆریش جێگەی بایەخەو، زۆرێکیش لە خەڵکی تێیدا کەمتەرخەمن.

لێرەشدا ناتوانرێت هەرچی لەو بارەوە هاتبێت باس بکرێت. بەڵام ئێمە هیچکام لە بابەتە گرنگەکانی فەرامۆش ناکەین.

زانایانیش لەم بارەوە چەندین کتێبیان لێرەو لەوێ داناوەو، منیش لە سەرەتای شەرحی صەحیحی موسلیمدا بەشێکیم کۆکردۆتەوەو، تێیدا هۆشداریم داوە لەسەر ئەو بابەتە گرنگانەی، کە کەس لە زانینو ئاگا لێبوونیان بێ نیاز نیە.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٦٩ / بە ژمارە: ٢١٥٤.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٦ / ٢٥٧٢ / بە ژمارە: ٦٦٠٨، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٩٣٠ / بە ژمارە: ٢٤٨٤.

- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ [آل عِمْرَان: ١٠٤] واتە: {با هەمیشە لەناو ئێوەدا کۆمەڵێك هەبن خەڵکی بانگ بکەن بۆسەر ڕێگەی ڕاستو، فەرمان بە چاکە بکەنو، نەهی لە خراپە بکەن، جا هەر ئەوانە براوەو بەختەوەر دەبن}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ﴾ [الْأَعْرَاف: ١٩٩] واتە: {کارو ڕەوشتی جوانی خەڵکی قبوڵ بکەو، فەرمانیش بە چاکە بکە}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ﴾ [التَّوْبَة: ٧١] واتە: {باوەڕدارانی پیاوانو ئافرەتان هەندێکیان دۆستی هەندێکیانن، فەرمان بە چاکە دەکەنو، نەهی لە خراپە دەکەن}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿كَانُوا لا يَتَنَاهَوْنَ عَنْ مُنْكَرٍ فَعَلُوهُ﴾ [الْمَائِدَة: ٧٩] واتە: {ئەوانە عادەتیان وابوو، کە یەکتریان لە خراپەو تاوان نەدەگێڕایەوەو، نەهیان لە خراپە نەدەکرد}.

هەروەها گەلێك ئایەتی تریش لەم بارەوە هاتوون.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)ـەوە (خوای لیٚ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: لە پێغەمبەری خوام بیستوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَراً، فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ، فَبِلِسانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ، فَبِقَلْبِهِ، وَذلِكَ أَضْعَفُ الْإِيْمَانِ».[1]
واتە: "هەر کەسێك لە ئێوە شتێکی خراپو ناڕەوای بینی، با بە دەستو هێزی خۆی بیگۆڕێت. ئەگەر نەیتوانی، با بە قسەو بە زمانی بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی، با بە دڵی پێی ناخۆش بێت. کە ئەم بەدڵ پێناخۆشبوونە لاوازترین پلەی باوەڕە".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٦٩ / بە ژمارە: ٤٩.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (حُذَيْفَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «وَالَّذِيْ نَفْسِيْ بِيَدِهِ، لَتَأْمُرُنَّ بِالْمَعْرُوفِ، وَلَتَنْهَوُنَّ عَنِ الْمُنْكَرِ، أَوْ لَيُوشِكَنَّ اللهُ تَعَالَى أنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عِقَاباً مِنْهُ، ثُمَّ تَدْعُونَهُ، فَلا يُسْتَجَابَ لَكُمْ». واتە: "سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، فەرمان دەکەن بە چاکەو، نەهی دەکەن لە خراپە، یان نزیکە خوای گەورە سزایەکتان لای خۆیەوە بۆ ڕەوانە بکات، ئەوجا لێی بپاڕێنەوەو، دوعاکەشتان گیرا نەبێت".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و( (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، بە چەند ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە ئیمامی (أَبُو بَكْر)ی (صِدِّيْق)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: "خەڵکینە، ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنْفُسَكُمْ لَا يَضُرُّكُمْ مَنْ ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ﴾ [الْمَائِدَة: ١٠٥] واتە: {ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان بەخواو پێغەمبەر هێناوە، ئاگاتان لەخۆتان بێت، ئەگەر ئێوە لەسەر ڕێگەی ڕاست بن، ئەو کەسەی گومڕا بوە زیانتان پێ ناگەیەنێت} ، منیش لە پێغەمبەری خوام بیستوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «إنَّ النَّاسَ إذَا رأوا الظَّالِمَ فَلَمْ يأخُذُوا على يَدَيْهِ أوْشَكَ أنْ يَعُمَّهُمُ اللَّهُ بعِقَابٍ مِنْهُ»".[2] واتە: "بەڕاستی ئەگەر خەڵکی کەسی ستەمکار ببینن‌و، دەستەکانی نەگرن‌و ڕێگەی ستەم کردنی لێ نەگرن، نزیکە خوای گەورە سزایەکی گشتگیریان لای خۆیەوە بۆ بنێرێت".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٤٦٨ / بە ژمارە: ٢١٦٩.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٥٢٥ / بە ژمارە: ٤٣٣٨، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٤٦٧ / بە ژمارە: ٢١٦٨، وسُنَنُ النَّسَائِيِّ الْكُبْرَى / ٦ / ٣٣٨ / بە ژمارە: ١١١٥٧، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٣٢٧ / بە ژمارە: ٤٠٠٥.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و لە غەیری ئەوانیشدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو سَعِيْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «أَفْضَلُ الْجِهَادِ كَلِمَةُ عَدْلٍ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ». واتە: "گەورەترین‌و باشترین جیهادو تێکۆشان بریتیە لە کردنی قسەیەکی حەقّ لای دەسەڵاتدارێکی زۆرداری ستەمکار".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

منیش دەڵێم: حەدیسەکانی ئەم باسە لەوە مەشهوورترن کە باس بکرێن.

ئەو ئایەتە پیرۆزەش -کە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنْفُسَكُمْ لَا يَضُرُّكُمْ مَنْ ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ﴾- لەو ئایەتانەیە، کە زۆرێك لە نەزان‌و نەفامەکان پێی هەڵدەخەڵەتێن‌و، بە شێوەیەکی جیاواز لە مەبەستەکەی خۆی لێکی دەدەنەوە. بەڵکو لێکدانەوەی ڕاست بۆ ماناکەی ئەمەیە: (ئێوە ئەگەر ئەوەی فەرمانتان پێکراوە بیکەن، ئیتر گومڕایی گومڕایان زیانتان پێ ناگەیەنێت). جا یەکێك لەو شتانەی فەرمانیان پێکراوە، بریتیە لە فەرمان کردن بە چاکەو، نەهی کردن لە خراپە. ئایەتەکەش لەڕووی ماناوە لەم فەرمایشتەی خوای گەورەوە نزیکە، کە فەرموویەتی: ﴿مَا عَلَى الرَّسُولِ إِلاَّ الْبَلاغُ﴾ [الْمَائِدَة: ٩٩، والنُّور: ٥٤، والْعَنْكَبُوت: ١٨] واتە: {پێغەمبەر تەنها ئاگادار کردنەوەو پێڕاگەیاندنی لەسەرە}.

بشزانە کە فەرمان کردن بە چاکەو، نەهی کردن لە خراپە چەند مەرج‌و شێوازێکی زانراوی خۆی هەیە، کە ئێرە جێگەی ئەوە نیە، بە درێژی باسیان بکەین. باشترین‌و جوانترین جێگەش بریتیە لە کتێبی (إِحْيَاءُ عُلُوْمِ الدِّيْن). منیش ئەوەی گرنگ‌و سەرەکیە لە شەرحی صەحیحی موسلیمدا بەڕوونی باسم کردوە. تەوفیقیش تەنها بەدەستی خوایە.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٥٢٧ / بە ژمارە: ٤٣٤٤، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٧٤١ / بە ژمارە: ٢١٧٤.

- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إِلاَّ لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ [ق: ١٨] واتە: {ئادەمیزاد هـەر قسـەیەك بکـات، فریشـتەیەكی چـاودێری لـەلادایـە، قسەكەی تۆمار دەكات}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَبِالْمِرْصَادِ﴾ [الفَجْـر: ١٤] واتـە: {بەڕاسـتی پەروەردگاری تۆ چاودێریان دەكاتو لـە كەمیندایە بۆیان}.

لـە باسەكانی پێشوودا ئەوەندەی خوای گەورە بۆی ئاسان كردم، باسـی زیكـرە سونەتەكانو هاووێنەكانیانم كرد. لێرەشدا دەمەوێت ئەو وتەو لـەفزانە بخەمە پاڵیان، كە ناپەسەند یان حەرامن. تاوەكو كتێبەكە گشتگیر بێـت بـۆ حوكمـەكانی هـەموو جۆرە وتەو لـەفزێك.

جا لێرەدا تەنها ئەو وتەو لـەفزە سەرەكیو گرنگانە بـاس دەكـەم، كـە هـەموو كەسێكی دیندار پێویستی بە زانینو ئاگا لێبوونیان هەیە. هـەروەها ئەوانـەی باسـیان دەكەم زۆربەیان زانراون. بۆیە بۆ زۆرێكیان بەڵگەكانیان نـاهێنم. تـەوفیقیش تـەنها بەدەستی خوایە.

## باسێك: {پاراستنی زمان لە قسە، مەگەر قسەی خەیر}

بزانە كە هەموو (مُكَلَّف)ێـك بـۆی هەیـە زمـانی خـۆی بپارێزێـت لـە هـەموو قسەیەك، مەگەر قسـەیەك كـە بەرژەوەنـدی تێدا بێـت. هـەر كـاتێكیش كـردنو نەكردنی قسـەیەك یەكسـان بـوون لـە بەرژەوەندیـدا، ئـەوە سـونەت وەهایـە كـە نەكرێت. چونكە ڕەنگە هەندێك جار قسەی حـەڵاڵ سەربكێشـێت بـۆ حـەرام یـان ناپەسەند. بەڵكو ئەمە زۆرە، یان عادەت وایە كـە زۆر جـار هـەر وا دەبێـت. هـیچ شتێكیش هاوتای سەلامەتیو دوور لـە كێشەیی نیە.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، فَلْيَقُلْ خَيْراً، أَوْ لِيَصْمُتْ».[1] واتە: "ئەو کەسەی باوەڕی بەخواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، با قسەی چاك بکات، یان بێدەنگ بێت".

منیش دەڵێم: ئەم حەدیسەی کە ئیمامی بوخاریو موسلیم هاودەنگن لەسەر (صَحِيْح)یەکەی، دەقێکی ڕاشکاوە لەسەر ئەوەی کە نابێت مرۆڤی ئیماندار قسە بکات، مەگەر قسەکەی خەیر بێت. ئەویش ئەوەیە کە بەرژەوەندیەکی ئاشکرای تێدا بێت. جا هەر کاتێکیش گومانی هەبوو کە بەرژەوەندی تێدایە، ئیتر با قسە نەکات.

ئیمامی (شَافِعِيّ) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ئەگەر کەسێك ویستی قسە بکات، با بەر لە کردنەکەی بیری لێ بکاتەوە، ئەگەر بەرژەوەندی تێدابوو، با بیکاتو، ئەگەر گومانیشی هەبوو، با نەیکات، هەتا دەردەکەوێت کە بەرژەوەندی تێدایە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو مُوْسَى)ی (أَشْعَرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: "عەرزی پێغەمبەرم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، کام موسوڵمانە لە هەموو موسوڵمانان باشترە؟" ئەویش فەرمووی: «مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ».[2] واتە: "ئەو موسوڵمانەی، کە موسوڵمانان سەلامەت بن لە زیانی زمانو لە دەستی".

---

(١) بروانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٤٠ / بە ژمارە: ٥٦٧٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٦٨ / بە ژمارە: ٤٧.

(٢) بروانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ١٣ / بە ژمارە: ١١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٦٦ / بە ژمارە: ٤٢.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَهْل)ی کوڕی (سَعْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ يَضْمَنْ لِيْ مَا بَيْنَ لَحْيَيْهِ وَمَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ، أضْمَنْ لَهُ الْجَنَّةَ».[1] واتە: "ئەو کەسەی زەمانەتی نێوان دوو شەویلگەکەی (کە بریتیە لە زمانی)و نێوان هەردوو ڕانیم بۆ بکات (کە بریتیە لە داوێنی)، منیش زەمانەتی بەهەشتی بۆ دەکەم".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە گوێی لێبووە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِنَّ الْعَبْدَ يَتَكَلَّمُ بالْكَلِمَةِ، مَا يَتَبَيَّنُ فِيْهَا، يَزِلُّ بهَا إِلَى النَّارِ أبْعَدَ مِمَّا بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ». واتە: "بەڕاستی جاری وا هەیە بەندەیەك قسەیەك دەکاتو، بیری لێ ناکاتەوەو لێی وردنابێتەوە کە چاکە یان خراپە، ئەو قسەیە بەناو ئاگری دۆزەخدا دەیباتە خوارەوە، زیاتر لە پانتایی نێوان ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا".

لە ڕیوایەتەکەی ئیمامی بوخاریدا بەم جۆرە هاتوە (أبْعَدُ مِمَّا بَيْنَ الْمَشْرِقِ)، ئیتر باسی (مَغْرِب) نەکراوە.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «إِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بالْكَلِمَةِ مِنْ رِضْوَانِ اللَّهِ تَعَالَى، مَا يُلْقِي لَهَا بَالاً، يَرْفَعُ اللَّهُ تَعَالَى بِهَا دَرَجَاتٍ. وَإِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بالْكَلِمَةِ مِنْ سَخَطِ اللَّهِ تَعَالَى، لا يُلْقِي

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٧٦ / بە ژمارە: ٦١٠٩.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٧٧ / بە ژمارە: ٦١١٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٢٩٠ / بە ژمارە: ٢٩٨٨.

لَهَا بَالاً، يَهْوِي بِهَا فِي جَهَنَّمَ».[1] واته: "بەڕاستی بەندە قسەیەکی وەها دەکات، کە مایەی ڕەزامەندی خوای گەورەیەو، ئەوەندەش دڵی ناداتێ، کەچی خوای گەورە بەهۆی ئەو قسەوە چەند پلەیەك پلەی بەرز دەکاتەوە. جاری واش هەیە قسەیەکی وەها دەکات، کە مایەی ڕق و تووڕەیی و نارەزایی خوای گەورەیەو، ئەوەندەش دڵی ناداتێ، کەچی خوای گەورە بەهۆی ئەو قسەوە فڕەی دەداتە ناو ئاگری دۆزەخەوە".

منیش دەڵێم: لە هەموو نوسخە ئەصڵیەکانی صەحیحی بوخاریدا بەم جۆرە هاتوە: (يَرْفَعُ اللَّهُ بِهَا دَرَجَاتٍ)، واتە: (دَرَجَاتِهِ)، یان تەقدیری فەرمایشتەکە بەم جۆرەیە: (يَرْفَعُهُ).

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (مُوَطَّأ)ی ئیمامی (مَالِك)و، لە هەردوو کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (بِلال)ی کوڕی (حَارث)ی (مُزَنِيّ)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِنَّ الرَّجُلَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ رِضْوَانِ اللهِ تَعَالَى، مَا كَانَ يَظُنُّ أَنْ تَبْلُغَ مَا بَلَغَتْ، يَكْتُبُ اللهُ تَعَالَى لَهُ بِهَا رِضْوَانَهُ إِلَى يَوْمِ يَلْقَاهُ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ سَخَطِ اللهِ تَعَالَى، مَا كَانَ يَظُنُّ أَنْ تَبْلُغَ مَا بَلَغَتْ، يَكْتُبُ اللهُ تَعَالَى بِهَا سَخَطَهُ إِلَى يَوْمِ يَلْقَاهُ». واتە: "بەڕاستی جاری وا هەیە پیاوێك قسەیەکی وەها دەکات، کە مایەی ڕەزامەندی خوای گەورەیەو، گومانیشی وا نەبوە ئەو قسەیە بگاتە ئەو ئاستە باشەی کە پێی گەیشتوە، کەچی خوای گەورە بەهۆی ئەو قسەوە ڕەزامەندی خۆی بۆ دەنوسێت، تا ئەو ڕۆژەی پێی دەگاتەوە. جاری واش هەیە قسەیەکی وەها دەکات، کە مایەی ڕق و تووڕەیی و نارەزایی خوای گەورەیەو، گومانیشی وا نەبوە ئەو قسەیە بگاتە ئەو ئاستە خراپەی کە پێی گەیشتوە، کەچی

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٧٧ / بە ژمارە: ٦١١٣.

خوای گەورە بەهۆی ئەو قسەوە تووڕەیی‌و ناڕەزایی خۆیی بۆ دەنوسێت، تا ئەو ڕۆژەی پێی دەگاتەوە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێكی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە كتێبەكەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (سُفْيَان)ی كوڕی (عَبْدُاللهِ)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: "عەرزی پێغەمبەری خوام كرد: ئەی پێغەمبەری خوا، شتێكم پێ بفەرموو، تا دەستی پێوە بگرم" ئەویش فەرمووی: «قُلْ: "رَبِّيَ اللهُ" ثُمَّ اسْتَقِمْ». واتە: "بڵێ: پەروەردگارم خوایەو، ئەوجا لەسەر ئەو باوەڕە بمێنەرەوە". منیش عەرزم كرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، ترسناكترین شت بۆ من چیە؟" ئەویش دەستی گرت بە زمانی خۆیەوە، ئەوجا فەرمووی: "ئەمەیە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێكی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[2]

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە كتێبەكەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووكیان ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لا تُكْثِرُوا الْكَلامَ بِغَيْرِ ذِكْرِ اللهِ، فَإنَّ كَثْرَةَ الْكَلامِ بِغَيْرِ ذِكْرِ اللهِ تَعَالَى قَسْوَةٌ لِلْقَلْبِ، وَإنَّ أبْعَدَ النَّاسِ مِنَ اللهِ تَعَالَى الْقَلْبُ الْقَاسِيْ».[3] واتە: "بێ لە زیكری خوا قسە زۆر مەكەن. چونكە قسەی زۆر كردن،

---

(١) بڕوانە: مُوَطَّأ الْإمَامِ مَالِك / ٢ / ٩٨٥ / بە ژمارە: ١٧٨١، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٥٥٩ / بە ژمارە: ٢٣١٩، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٣١٢ / بە ژمارە: ٣٥١١.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٦٠٧ / بە ژمارە: ٢٤١٠، وسُنَنُ النَّسَائِيِّ الْكُبْرَى / ٦ / ٤٥٨ / بە ژمارە: ٥٤٩٤، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٣١٤ / بە ژمارە: ٣٩٧٢.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٦٠٧ / بە ژمارە: ٢٤١١. ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێكی (حَسَن)ی (غَرِيْب)ـە.

بێ لە زیکری خوا، دەبێتە هۆی ڕەقبوونی دڵ. دورترین کەسیش لە ڕەحمەتی خوا بریتیە لە خاوەنی دڵی ڕەقو ڕەش".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ وَقَاهُ اللهُ تَعَالَى شَرَّ مَا بَيْنَ لَحْيَيْهِ، وَشَرَّ مَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ، دَخَلَ الْجَنَّةَ». واتە: "ئەو کەسەی خوای گەورە لە شەڕو خراپەی نیوان شەویلگەکانی (واتە:زمانی)و شەڕی نێوان ڕانەکانی (واتە:داوێنی) بپارێزێت، دەچێتە بەهەشتەوە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عُقْبَة)ی کوڕی (عَامِر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: عەرزی پێغەمبەری خوام کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، ڕزگاربوون چیە؟" ئەویش فەرمووی: «أَمْسِكْ عَلَيْكَ لِسَانَكَ، وَلْيَسَعْكَ بَيْتُكَ، وَابْكِ عَلَى خَطِيئَتِكَ». واتە: "زمانی خۆت بگرەو، لەماڵی خۆتدا دانیشەو مەیەرە دەرەوەو، بە پەشیمانیەوە لەسەر تاوانەکانت بگری".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «إِذَا أَصْبَحَ ابْنُ آدَم، فَإِنَّ الْأَعْضَاءَ كُلَّها تُكَفِّرُ اللِّسَانَ، فَتَقُولُ: "اتَّقِ اللهَ فِيْنا، فَإِنَّمَا نَحْنُ بِكَ، فَإِنِ اسْتَقَمْتَ، اسْتَقَمْنا، وَإِنِ

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٦٠٦ / بە ژمارە: ٢٤٠٩.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٦٠٥ / بە ژمارە: ٢٤٠٦.

اعْوَجَجْتَ، اعْوَجَجْنَـــا"». [(١)] واتــە: "ئەگــەر ئــادەمیزاد ڕۆژی لێبوویــەوە، هــەموو ئەندامەکانی لەشی بە ملکەچی لە زمانی دەپاڕێنەوەو، پێی دەڵــێن: (لــەخوا بترســە دەربارەی ئێمە، چونکە ئێمە بەتۆوە بەندین. ئەگەر تۆ ڕێك‌و ڕاســت بیــت، ئێمــەش ڕێك‌و ڕاست دەبین. ئەگەر تۆش لارو خواروخێچ بیــت، ئێمــەش لارو خــواروخێچ دەبین)".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَــە)دا، لــە (أُمُّ حَبِیْبَة)ی دایکی ئیماندارانــەوە (خــوای لێ ڕازی بێــت)، ئــەویش لــە پێغەمبــەری خــواوە (دروودی خوای لەسەر بێــت)، کە فەرموویەتی: «كُلُّ كَلامِ ابْنِ آدَمَ عَلَيْهِ، لا لَهُ، إلاَّ أمْــراً بِمَعْرُوفٍ، وَنَهْياً عَنْ مُنْكَرٍ، أوْ ذِكْراً لِلّهِ تَعَالَى». [(٢)] واتە: "هەموو قسەیەکی ئادەمیزاد لە دژی حسێب دەکرێت، نەك لە بەرژەوەندی، مەگەر ئەو قســەیە فــەرمان کــردن بێت بە چاکەو، نەهی کردن بێت لە خراپە، یان زیکری خوای گەورە بێت".

بۆشمــان ڕیوایــەت کــراوە لــە کتێبەکــەی ئیمــامی (تِرْمِــذِيّ)دا، لــە هــاوەڵی خۆشەویست (مُعَاذ)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کــە فەرموویــەتی: "عــەرزی پێغەمبــەری خوام کرد: ئەی پێغەمبــەری خــوا، کــارو کردەوەیــەکم پــێ بفــەرموو، کــە بمخاتــە بەهەشتەوەو، دووریشم بخاتەوە لە ئاگر". ئەویش فەرمووی: «لَقَدْ سَأَلْتَ عَنْ عَظِيمٍ، وَإِنَّهُ لَيَسِيرٌ عَلَى مَنْ يَسَّرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ: تَعْبُدُ اللَّهَ لَا تُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا، وَتُقِيمُ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَتَصُومُ رَمَضَانَ، وَتَحُجُّ الْبَيْتَ». واتــە: "بەڕاســتی دەربــارەی شــتێکی زۆر گەورە پرسیارت کردو، ئاسانیشە لەسەر ئەو کەسەی خوای گەورە لەسەری ئاسان بکات: بەندایەتی بۆ خوا بکەو ئەو بپەرستەو، هیچ شتێك مەکە بە هاوەڵ‌و شــەریك بۆی‌و، نوێژەکان بەجوانی‌و بەڕێك‌وپێکی ئــەنجام بــدەو، مــانگی ڕەمــەزان بــەڕۆژوو

---

(١) بروانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٦٠٥ / بە ژمارە: ٢٤٠٧. شێخ (عَبْدُالْقَادِرِ الْــأَرْنَؤُوْط) لــە تەخریجی (أذْكَار)دا فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ــە.

(٢) بروانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٦٠٨ / بە ژمارە: ٢٤١٢، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٣١٥ / بە ژمارە: ٣٩٧٤. شێخ (عَبْدُالْقَادِرِ الْأرْنَؤُوْط) فەرموویەتی: ڕشتەکەی لاوازە.

بەو، حەجی ماڵی خوا بکە". ئەوجا پێغەمبەر فەرمووی: «أَلَا أَدُلُّكَ عَلَى أَبْوَابِ الْخَيْرِ؟ الصَّوْمُ جُنَّةٌ، وَالصَّدَقَةُ تُطْفِئُ الْخَطِيئَةَ كَمَا يُطْفِئُ الْمَاءُ النَّارَ، وَصَلَاةُ الرَّجُلِ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ». واتە: "ئایا ڕێنموویت بکەم بۆلای چەند دەرگایەکی چاکە؟: ڕۆژوو گرتن قەڵغانو پارێزەرە لە ئاگرو، خێر کردنو صەدەقەش گوناهو تاوان دەکوژێنێتەوە، وەکو چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوەو، نوێژ کردنی پیاویش لە ناوجەرگەی شەودا". ئەوجا ئەم ئایەتانەی خوێندەوە: ﴿تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ * فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ [السَّجْدَة: ١٦ - ١٧]. واتە: {لاتەنیشتەکانیان لە جێگەی خەوتنەکەیان دووردەکەوێتەوەو، واز لە خەوتن دەهێننو، لە ترسی سزای دۆزەخو بەتەمای خەلاّتی بەهەشت لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوەو، لەو ڕزقو ڕۆزیەی پێمان داون خەیرو صەدەقەی لێ دەکەن * هیچ کەسێك نازانێت ئەو کەسانە چی خەیرو خەلاّتێکیان لە پەنهانەوە بۆ دانراوە، لەو خێروبێرانەی کە چاویانی پێ گەش دەبێتەوە، ئەمەش وەکو پاداشتێك بۆ ئەو کردەوە باشانەی لە دنیادا ئەنجامیان داون} . ئەوجا پێغەمبەر فەرمووی: «أَلَا أُخْبِرُكَ بِرَأْسِ الْأَمْرِ وَعَمُودِهِ وَذُرْوَةِ سَنَامِهِ؟». واتە: "ئایا خەبەرت پێ بدەم، کە سەری هەموو جۆرە خواپەرستیو دینداریەك چیەو، کۆڵەکەو چڵەپۆپەی ستوونەکەی کامەیە؟" منیش عەرزم کرد: "بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، بفەرموو". ئەویش فەرمووی: «رَأْسُ الْأَمْرِ الْإِسْلَامُ، وَعَمُودُهُ الصَّلَاةُ، وَذُرْوَةُ سَنَامِهِ الْجِهَادُ». واتە: "سەری هەموو کارێك بریتیە لە ئیسلامەتیو، کۆڵەکەی ئاینیش بریتیە لە نوێژ کردنو، چڵەپۆپەی ستوونەکەشی بریتیە لە جیهادو تێکۆشان". ئەوجا فەرمووی: «أَلَا أُخْبِرُكَ بِمِلَاكِ ذَلِكَ كُلِّهِ؟». واتە: "ئایا خەبەرت پێ نەدەم، کە شیرازەو مەبەستی سەرەکی هەموو ئەمانە کامەیە؟" منیش عەرزم کرد: "بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، بفەرموو". ئەویش زمانی خۆی گرتو، فەرمووی: «كُفَّ عَلَيْكَ هَذَا». واتە: "ئاگات لەمە بێتو، خۆتی لێ بپارێزە". منیش عەرزم کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، بۆچی ئێمە لەسەر ئەو قسانەی دەیانکەین لێپرسینەوەمان لەگەڵدا دەکرێتو، سزا دەدرێین؟". ئەویش فەرمووی:

«ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ، وَهَلْ يَكُبُّ النَّاسَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ -أَوْ قَالَ عَلَى مَنَاخِرِهِمْ- إِلَّا حَصَائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ». واته: "دایکت لەدەستت بدات‌و ڕۆڵەڕۆت بۆ بکات، ئەی ئایا بێجگە لە درووێنەی زمانیان، چی تر هەیە ئەو خەڵکە بە ڕوودا بخاتە ناو ئاگری دۆزەخەوە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[1]

منیش دەڵێم: (ذِرْوَة)و (ذُرْوَة) واتە: چڵەپۆپە.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مِنْ حُسْنِ إِسْلامِ الْمَرْءِ تَرْكُهُ مَا لا يَعْنِيهِ».[2] واتە: "یەکێك لە نیشانەکانی جوانێتی‌و ڕێك‌وپێکی موسوڵمانێتی کەسێك، ئەوەیە کە واز لەو شتە بهێنێت، کە پەیوەندی بە ئەوەوە نیە".

حەدیسێکی (حَسَن)ـە.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّٰه)ی کوڕی (عَمْرو)ی کوڕی (عَاص)ـەوە (خوا لە خۆی‌و باوکیشی ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ صَمَتَ نَجَا».[3] واتە: "ئەو کەسەی بێدەنگ بێت‌و قسە نەکات بە سەلامەتی ڕزگاری دەبێت".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ١١ / بە ژمارە: ٢٦١٦.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٥٥٨ / بە ژمارە: ٢٣١٧، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٣١٥ / بە ژمارە: ٣٩٧٦.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٦٦٠ / بە ژمارە: ٢٥٠١.

ڕشتەکەی لاوازە. جا منیش تەنها لەبەر ئەوە هێنام، کە بڵێم لاوازە. چونکە حەدیسێکی مەشهوورە.[1]

هەروەها زۆرێك حەدیسی صەحیحی تری وەکو ئەمانە لەمبارەوە هاتوون. ئەوانەش کە من باسم کردن بەسن بۆ کەسێك کە خوای گەورە تەوفیقی دابێت. لەمەولاش ئەگەر خوا بیەوێت، لە باسی غەیبەتدا کۆمەڵێکی تر باس دەکەین. تەوفیقیش تەنها بەدەستی خوایە.

هەروەها زۆرێك فەرمایشتیش لە زانایانی (سَلَف)و لە غەیری ئەوانیشەوە سەبارەت بەم باسە هاتوون، جا لەبەرئەوەی ئەو حەدیسانەی پێشترمان هێنا، ئیتر پێویست بە هێنانی ئەوان ناکات. بەڵام هەندێك لە گرنگەکانیان باس دەکەین، لەوانە:

پێمان گەیشتوە کە جارێك (قُسّ)ی کوڕی (سَاعِدَة)و (أكْثَم)ی کوڕی (صَيْفِي) بەیەك گەیشتن، یەکێکیان بەوی تریانی وت: "چەند عەیبت لە مرۆڤدا بینیوەتەوە؟" ئەویش وتی: "زیاتر لەوەی کە بژمێردرێت. بەڵام ئەوەی کە ژماردوومە هەشت هەزار (٨٠٠٠) عەیبە. جا سیفەتێکیشم بینیەوە، ئەگەر تۆ بەکاری بهێنیت، هەموو عەیبەکان دادەپۆشێت". ئەویش وتی: "ئەو سیفەتە کامەیە؟" وتی: "پاراستنی زمان".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە زاناو خواناسی پایەبەرز (فُضَيْل)ی کوڕی (عِيَاض)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: "هەر کەسێك قسەکانی خۆی بە

---

(١) بەڵام حافظی عێراقی فەرموویەتی: ڕشتەی حەدیسەکە لای ئیمامی (تِرْمِذِيّ) لاوازە، ئەگینا لای ئیمامی (طَبَرَانِيّ) ڕشتەیەکی (حَسَن)ـە. هەروەها ئیمامی (مُنْذِرِيّ)و شێخی عەسقەلانیش فەرموویانە: کەسەکانی ڕشتەکەی متمانەدارن. بڕوانە: الْمُغْنِي عَنْ حَمْلِ الْأَسْفَار / ٢ / ٧٦٥ / بە ژمارە: ٢٨١١، والتَّرْغِيْبُ والتَّرْهِيْب / ٣ / ٣٤٣ / بە ژمارە: ٤٣٥٧، وفَتْحُ الْبَارِي / ١١ / ٣٠٩. هەروەها بڕوانە: فَيْضُ الْقَدِيْر / ٦ / ١٧١.

بەشێك لە كردەوەكانی دابنێت، قسە كەم دەكات لەو شتانەدا كە پەیوەندیان بە ئەوەوە نیە".

ئیمامی (شَافِعِيّ)ش (ڕەحمەتی خوای لێبێت) بە (رَبِیْع)ی قوتابی خۆی فەرموە: "ئەی (رَبِیْع)، قسە لەو شتەدا مەكە كە پەیوەندی بە تۆوە نیە. چونكە ئەگەر یەك وشە بڵێیت، ئەو وشەیە دەبێت بە خاوەنی تۆ، تۆ نابیت بە خاوەنی ئەو".

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی كوڕی (مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: "هیچ شتێك نیە لە زمان شایستەتر بێت بە سجن كردن".

كەسێكی تر فەرموویەتی: "زمان وەكو گیانلەبەری دڕندە وەهایە، ئەگەر باش نەیبەستیتەوە، پەلامارت دەدات و هێرش دەكاتە سەرت".

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە زانای پایەبەرز شێخ (أَبُو الْقَاسِمِ)ی (قُشَیْرِيّ)ەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، لە (رِسَالَة) بەناوبانگەكەیدا، كە فەرموویەتی: "قسە نەكردن سەلامەتیەو، ئەویش ئەصڵەو، بێدەنگبوونیش لەكاتی خۆیدا سیفەتی پیاوە گەورەكانە، وەكو چۆن قسە كردن لە جێگەی خۆیدا بەرێزترین و گەورەترینی سیفەتەكانە". پاشان فەرموویەتی: لە زانای پایەبەرز (أَبُو عَلِيّ)ی (دَقَّاق)م بیستوە، كە دەیفەرموو: "ئەو كەسەی لە بەرامبەر حەق بێدەنگ بێت شەیتانی لاڵە".

ئەوجا فەرموویەتی: سەبارەت بەوەش كە سۆفیە خواپەرستە ڕاساڵەكان بێدەنگی و قسە نەكردنیان هەڵبژاردوە، لەبەر ئەوە بوە كە زانیویانە قسە كردن چەندە بەڵای پێوەیەو، سەرەڕای ئەوەی كە بەشی نەفسیشی پێوەیەو، بەدەرخەری ئەو سیفەتانەشە كە هۆكاری وەسف و ستایشن و، ئارەزووی ئەوەشی تێدایە كە كەسەكە دەیەوێت لە نێو هاوڕێنەكانی خۆیدا جیاوازو تایبەت بێت، بەوەی كە قسەی جوان دەزانێت. هەروەها چەندین بەڵای تریش.

بۆیــه بێــدەنگیو قســه نــەکردن یەکێکــه لــه ســیفەتی سـۆفیه خواناســەکانو، یەکێکیشه لـه پایەکانی پەیڕەوەکەیان، بۆ خۆبەکەم زانـینو، پاڵفتـه کردنـی ئاکـارو ڕەوشتیان.

جا یەکێك لـەو دێڕە هۆنراوانەی لـەم بارەوە هۆندوویانەتەوە بریتیه لـه:

| | |
|---|---|
| احْفَظْ لِسَانَكَ أَيُّهَــا الْإِنْسَــانُ | لا يَلْــدَغَنَّكَ، إِنَّــه ثُعْبَــانُ |
| كَمْ فِيْ الْمَقَابِرِ مِنْ قَتِيْلِ لِسَــانِهِ | قَدْ كَانَ هَابَ لِقَاءَهُ الشُّجْعَانُ |

واته: زمانت بپارێزه ئەی مرۆڤ، با پێتــەوە نــەدات، چــونکه ئــەو مــارە. زۆرێــك کوژراوی زمان لــه گۆڕســتانەکاندان، کــه کــاتی خــۆی ئــازاو نەبــەردەکان لــەوە دەترسان پێی بگەنو ڕووبەڕووی ببنەوە.[1]

زانای زمــانزان (عَبَّاس)ی کــوڕی (فَــرَج)ی (رِيَاشِــيّ)ش (ڕەحـمەتی خـوای لێبێـت) فەرموویەتی:

| | |
|---|---|
| لَعَمْرُكَ إِنَّ فِيْ ذَنْبِيْ لَشُــغْلاً | لِنَفْسِيْ عَنْ ذُنُوْبِ بَنِيْ أُمَيَّة |
| عَلَى رَبِّيْ حِسَــابُهمُ إِلَيْــهِ | تَنَاهَى عِلْمُ ذَلِــكَ لا إِلَيَّــهْ |
| وَلَيْسَ بِضَائِرِيْ مَا قَدْ أَتَــوْهُ | إِذَا مَا اللهُ أَصْلَحَ مَا لَدَيَــهْ |

واته: سوێند به تەمەنی تۆ، لـه تاوانەکانی خۆمدا ئەوەندەم هەیـه، کــه ســەرقاڵم بکــەنو، نەمپەرژێتــه ســەر تــاوانی ئومەویــەکان. حیســابی ئــەوانیش لای خــوای پەروەردگارمە، ئەو زانیاری لەبارەیانەوە هەیـه، نــەك مــن. ئــەوەی ئــەوان دەیکــەن زیانێك لـەمن نادات، ئەگەر خوای گەورە حاڵو دڵی خۆم چاك بکات.

---

(۱) منیش دەڵێم:

| | |
|---|---|
| ئاگات لـەزمانت بێ ئەی مرۆڤی موسوڵمان | نەوەك پێتەوە بدات، ئەو مـارە لـەبۆ گیـان |
| زۆر کەس لـه گۆڕستاندا کوژراوی زمانێتی | کەچی لـه کاتی خۆیدا ئازایان لێی دەترسان |

## باسی حەرامێتی غەیبەت‌و فیتنەیی کردن (الْغِيْبَةِ وَالنَّمِيْمَةَ)

بزانە کە ئەم دوو سیفەتە لە ناشیرینترینی سیفەتە ناشیرینەکانن‌و، لە هەمووشیان زیاتر لەناو خەڵکیدا بڵاون، بەجۆرێك کە خەڵکانێکی کەم نەبێت، کەس لێیان سەلامەت‌و پارێزراو نیە. جا لەبەرئەوەی کە خەڵکی بەگشتی پێویستیان بەوە هەیە، کە لەم دوو سیفەتە بترسێنرێن‌و هۆشداریان بدرێتێ، بۆیە منیش بەم دوانە دەستم پێکرد:

غەیبەت: ئەوەیە کە باسی کەسێك بکرێت بە شتێك، کە ئەو پێی ناخۆشە. ئیتر ئەو شتە لە لاشەیدا بێت، یان لە ئاینەکەی، یان لە دنیاداریەکەی، یان لە خودی خۆیدا، یان لە شێوازی پێکهاتەی لاشەیدا، یان لە ڕەوشت‌و هەڵس‌وکەوتیدا، یان لە ماڵ‌و موڵکیدا، یان لە منداڵێکیدا، یان لە باوکیدا، یان لە هاوسەرەکەیدا، یان لە خزمەتکارەکەیدا، یان لە بەندەو کەنیزەکەکەیدا، یان لە جامانیەکەیدا، یان لە کراسەکەیدا، یان لە ڕۆیشتن‌و ڕێ کردن‌و جووڵەیدا، یان لە ڕووخۆشی‌و بێشەرمی‌و ڕووگرژی‌و کرانەوەکەیدا، یان لە هەر شتێکی تردا، کە پەیوەندی بەو کەسەوە هەبێت. ئیتر ئایا بە قسە باسی بکەیت، یان بە نوسین، یان بە هێما، یان بە چاوت یان بە دەستت یان بە سەرت ئاماژەی بۆ بکەیت، یان بە شتێکی لەو جۆرە.

بۆ نموونە لەبارەی لاشەیەوە بڵێیت: کوێرە، یان شەلە، یان چاوی کزو تەڕە، یان کەچەڵە، کورتە، یان درێژە، یان ڕەشە، یان زەردۆڵە.

لەبارەی ئاینەکەشیەوە بڵێیت: فاسقە، یان دزە، یان ناپاکە، یان ستەمکارە، یان بەچاوی سووك تەماشای نوێژ دەکات، یان لە بەرامبەر شتە پیسەکاندا کەمتەرخەمە، یان لەگەڵ باوکیدا چاکەکار نیە، یان زەکات نادات بەو کەسانەی شایستەینی، یان خۆی لە غەیبەت لانادات.

لەبارەی دنیاکەشیەوە بڵێیت: کەم ئەدەبە، یان بەچاوی سووك تەماشای خەڵکی دەکات، یان وا نابینێت کەس مافی لەسەری هەبێت، یان زۆربڵێیە، یان زۆرخۆرە،

یان زۆرخەوە، یان لەو کاتەدا دەخەوێت، کە کاتی خەو نیە، یـان لـە جێگەیەکـدا دادەنیشێت، کە جێگەی ئەو نیە.

لەبارەی باوکیشیەوە بڵێیت: باوکی فاسـقە، یـان هیندیـە، یـان (نَبَطِــيّ)، یـان (زَنْجِيّ)، یان پینەچیە، یان کوتاڵفرۆشە، یان مسگەرە، یان دارتاشە، یان ئاسـنگەرە، یان جۆلآیە.

لەبارەی ڕەوشـتو ئاکاریشـیەوە بڵێیـت: بەدڕەوشـتە، یـان خۆبەزلزانـە، یـان ڕیابازە، یان هاروهاجە، یان تونـدو زبـرە، یـان نـەتوانکارە، یـان دڵـی لاوازە، یـان هەڵەشەو هەڵپەکارە، یان ڕووگرژو مۆنە، یان بێشەرمو بێعـارە، یـان شـتێکی لـەو جۆرە.

لەبارەی کراسو پۆشاکەکەشیەوە بڵێیت: قۆڵی دەڵپە، یان لـەخوارەوە شـۆڕە، یان پرتوپیسە، یان شتێکی لەو جۆرە.

ئیتر شتەکانی تریش هەر بەم جۆرە قیـاس دەکـرێنو، ڕێسـاکەشـی ئەوەیـە، کـە بەجۆرێك باس بکرێت، ئەو پێی ناخۆش بێت.

پێشەوای پایەبەرز (أَبو حَامِد)ی (غَزَالِيّ) کۆدەنگی مۆسوڵمانانی هێنـاوە لەسـەر ئەوەی، کە غەیبەت: بریتیە لەوەی کە بەجۆرێك باسی کەسێك بکـەیت، ئـەو پێـی ناخۆش بێت. لەمەولاش ئـەو حەدیسـە (صَحِيْح)ـە دەهێـنین، کـە بەڕاشـکاوی وا دەفەرموێت.

(نَمِيْمَة)ش: بریتیە لە گواستنەوەی قسە لـە کەسـێکەوە بـۆ کەسـێکی تـر، بـە مەبەستی تێکدانی نێوانیان.

جا ئەمە پێناسەی هەردووکیان بوو.

سەبارەت بە حوکمی شەرعیش لەبارەیانەوە، ئـەوە بـە کـۆدەنگی موسـوڵمانان هەردووکیان حەرامن‌و، چەندین بەڵگەی ڕاشـکاویش لەسـەر حەرامێتیەکـەیان لـە قورئان‌و سونەت‌و کۆدەنگی ئومەتدا هاتوە.

- خوای گەورە فەرموویـەتی: ﴿وَلا يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضاً﴾ [الْحُجُرَات: ١٢] واتـە: {هەندێکتان غەیبەتی هەندێکی ترتان مەکەن}.
- هـەروەها فەرموویـەتی: ﴿وَيْـــلٌ لِكُــــلِّ هُمَــــزَةٍ لُمَــــزَ ﴾ [الْهُمَــزَة: ١] واتـە: {لەناوچوون‌و سزا بۆ هەموو ئەو کەسانەی غەیبەتی خەڵکی دەکـەن‌و، بـۆ هەموو ئەو کەسانەش تانەو تەشەر لە خەڵکی دەدەن}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿هَمَّازٍ مَشَّاءٍ بِنَمِيمٍ﴾ [الْقَلَم: ١١] واتە: {ئەو کەسـانەی غەیبەتی خەڵکی زۆر دەکەن‌و، فیتنەیی‌و دووزمانی دەکەن‌و، قسە دەهێـنن‌و دەبەن}.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هـاوەڵی خۆشەویست (حُذَيْفَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لـە پێغەمبـەری خـواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «لا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ نَمَّامٌ».[1] واتـە: "کەسـی فیتنـەو دووزمان ناچێتە بەهەشتەوە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هـاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـــەوە (خوا لـە هـەردووکیان ڕازی بێـت)، کـە پێغەمبـەری خـوا (درودی خوای لەسەر بێت)، بەلای دوو گۆڕدا تێپەڕی‌و، فەرمووی: «إِنَّهُما يُعَذَّبانِ، وَمَا يُعَذَّبانِ فِي كَبِيْرٍ». لە ڕیوایەتەکەی ئیمامی بوخاریدا فەرموویەتی: «بَلَى، إِنَّه كَبِيْـــرٌ،

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٥٠ / بە ژمارە: ٥٧٠٩، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ١٠١ / بە ژمارە: ١٠٥. لە صەحیحی بوخاریدا دەقی حەدیسـەکە تەنها بەم جـۆرە هـاتوە: (لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَتَّاتٌ). بەڵام لە صەحیحی موسلیمدا بە هەردوو جۆرەکە هاتوە.

أَمَّا أحَدُهُما، فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ، وَأَمَّا الْآخَرُ، فَكَانَ لا يَسْتَتِرُ مِنْ بَوْلِـهِ». [1] واتـه: "بەڕاستی ئـەم دوانـە سـزا دەدرێـن، لـەسـەر کـارێکیش سـزا نـادرێن کـە خۆیـان بەگەورەیان دانابێت، یان لـەسەر کارێك سـزا نـادرێن کـە واز لێهێنـانی ئـەرکێکی گەورەو گران بوبێت. بـەڵێ بەڕاسـتی ئـەوەی لـەسـەری سـزا دەدرێـن تـاوانێکی گەورەیە. چونکە یەکێکیان قسەی دەهێناو دەبـردو، فیتنـەیی‌و دووزمـانی دەکـرد. ئەوی تریشیان خۆی لـە میزو لـە پاشمیز نەدەپاراست".

منیش دەڵێم: زانایان فەرموویانە: (وَمَا يُعَذَّبانِ فِي كَبِيْرٍ) واتە: کارێك کە بـەلای خۆیانەوە بەگەورەیان نەزانیوە. یان کارێك کە واز لێهێنانی کـارێکی گـەورە نـەبوە لەسەریان.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە صەحیحی موسلیم‌و لـە (سُنَن)ی ئیمـامی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ)دا، لـە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خـوای لەسـەر بێـت)، فـەرمووی: «دەزانـن غەیبـەت چـیە؟». هـاوەڵانیش عـەرزیان کـرد: "خـواو پێغەمبەرەکـەی لـە هـەموو کـەس زانـاترن". پێغەمبەریش فەرمووی: «ذِكْرُكَ أخَاكَ بِمَا يَكْرَهُ». واتە: "ئەوەیە کە براکـەی خـۆت بەجۆرێك باس بکەیت، ئەو پێی ناخۆش بێت". جا عەرزی کرا: "ئەی ئەگەر براکەم ئەو شتەی تێدا بوو کە من وتم؟" ئەویش فـەرمووی: «إنْ كانَ فِيْهِ مَا تَقُـولُ، فَقَـدِ اغْتَبْتَهُ، وَإنْ لَمْ يَكُنْ فِيْهِ مَا تَقُولُ، فَقَدْ بَهَتَّهُ». واتە: "ئەگەر ئـەوەی تـۆ دەیلێـت لـە براکەتدا هەبوو، ئەوە غەیبەتت کردوەو، ئەگەر تێشیدا نـەبوو، ئـەوە بوختانـت بـۆ کردوە".

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٥٠ / بە ژمارە: ٥٧٠٨، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٢٤٠ / بە ژمارە: ٢٩٢.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِیْح)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو بَکْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، لە حەجی ماڵئاواییدا، لە وتاری ڕۆژی جەژندا، لە (مِنَـی) فەرمووی: «إِنَّ دِمَاءَکُمْ وَأَمْوَالَکُمْ وَأَعْرَاضَکُمْ حَرَامٌ عَلَیْکُمْ، کَحُرْمَةِ یَوْمِکُمْ هَذَا، فِيْ بَلَدِکُمْ هَذَا. أَلا هَلْ بَلَّغْتُ؟».[2] واتە: "بەڕاستی خوێنو ماڵو شەرەفو ناموستان لەیەکتر حەرامە، وەکو چۆن ئەوانە لەم ڕۆژەداو لەم شارەدا حەرامن. جا ئایا ئەوەی کە لەسەر من بوو ڕامگەیاند؟".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا، لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: عەرزی پێغەمبەری خوام کرد (دروودی خوای لەسەر بێت): "ئەوەندەت بەس نیە کە (صَفِیَّة) وەها وەهایە؟" یەکێك لە ڕاویەکان فەرموویەتی: "مەبەستی ئەوە بوە، کە (صَفِیَّة) کورتەبالاً بوە". پێغەمبەری خواش فەرمووی: «لَقَدْ قُلْتِ کَلِمَةً، لَوْ مُزِجَتْ بِمَاءِ الْبَحْرِ، لَمَزَجَتْهُ». واتە: "شتێکت گوت، ئەگەر تێکەڵ بە ئاوی دەریا بکرێت، بەجۆرێك تێکەڵی دەبێت، کە تامەکەی یان بۆنەکەی دەگۆڕێت". دایکە (عَائِشَة) فەرمووی: "هەروەها لاسکانێی کەسێکیشم بۆ کردەوە" پێغەمبەریش فەرمووی: «مَا أُحِبُّ أَنِّيْ حَکَیْتُ إِنْسَاناً، وَأَنَّ لِيْ کَذَا وکَذَا». واتە: "پێم خۆش نیە لاسکانێی کەسێك بکەمەوەو، لە بەرامبەردا ئەوەندە ئەوەندەم دەست بکەوێت".

(١) بڕوانە: صَحِیْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٠١ / بە ژمارە: ٢٥٨٩، وسُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٨٥ / بە ژمارە: ٤٨٧٤، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٣٢٩ / بە ژمارە: ١٩٣٤، وسُنَنُ النَّسَائِيّ الْکُبْرَی / ٦ / ٤٦٧ / بە ژمارە: ١١٥١٨.

(٢) بڕوانە: صَحِیْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٦٢٠ / بە ژمارە: ١٦٥٤، وصَحِیْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٣٠٥ / بە ژمارە: ١٦٧٩.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِیْح)ـە.[1]

منیش دەڵێم: ئەم حەدیسە یەکێکە لە گەورەترین، یان هەر گەورەترینی ئەو فەرمایشتانەیە، کە سەبارەت بە ڕێگری لە غەیبەت کردن هاتون‌و، منیش هیچ حەدیسێك پێنازانم، کە لە زەمی غەیبەتدا بگاتە ئەم ئاستە. خوای گەورەش فەرموویەتی: ﴿وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى * إِنْ هُوَ إِلاَّ وَحْيٌ يُوحَى﴾ [النّجم: ٣ - ٤] واتە: {ئەوەی پێغەمبەری خوا دەیفەرموێت لە ئارەزووی نەفسی خۆیەوە نیە. بەڵکو ئەوەی دەیفەرموێت وەحیەو لەلایەن خواوە بۆی نێردراوە}.

جا داوا لە خوای بەخشندە دەکەین، کە لوتفمان لەگەڵدا بکات‌و، لە هەموو خراپەو ناخۆشیەك بمانپارێزێت.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ رازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، فەرموویەتی: «لَمَّا عُرِجَ بِي، مَرَرْتُ بِقَوْمٍ لَهُمْ أَظْفَارٌ مِنْ نُحاسٍ، يَخْمِشُونَ وُجُوهَهُمْ وَصُدُورَهُمْ، فَقُلْتُ: "مَنْ هؤُلاءِ يَا جِبْرِيلُ؟" قَالَ: هَؤُلاءِ الَّذِيْنَ يَأْكُلُونَ لُحُومَ النَّاسِ، وَيَقَعُونَ فِيْ أَعْرَاضِهِمْ».[2] واتە: "کاتێك بۆ ئاسمانەکان بەرزکرامەوە، بەلای خەڵکانێکدا تێپەڕیم، نینۆکیان هەبوو لە مس، دەم‌وچاوو سینگی خۆیان پێ دەڕووشاند! منیش پرسیم: (جوبرەئیل، ئەمانە کێن؟) ئەویش

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٨٥ / بە ژمارە: ٤٨٧٥، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٦٦٠ / بە هەردوو ژمارە: ٢٥٠٢ و ٢٥٠٣.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٨٥ / بە ژمارە: ٤٨٧٨. ئیمامی (أَبُو دَاوُد) هیچی لەبارەی ئەم حەدیسەوە نەفەرموە. کەواتە بەلایەوە پەسەندە. حافظی عێراقیش فەرموویەتی: ئیمامی (أَبُو دَاوُد) ئەم حەدیسەی بە (مُرْسَل)ی‌و بە (مُسْنَد)یش ڕیوایەت کردوە، بەڵام (مُسْنَد)ەکەیان (صَحِیْح) ترە. بڕوانە: الْمُغْنِي عَنْ حَمْلِ الْأَسْفَار / ٢ / ٨١٦ / بە ژمارە: ٢٩٩٦.

فەرمووی: ئەمانە ئەوانەن کە گۆشتی خەڵکی دەخۆن‌و، غەیبەتیان دەکەن‌و قسەی خراپ دەکەن لەبارەی ناموس‌و ئابڕوویانەوە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَعِيْد)ی کوڕی (زَيْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «إِنَّ مِنْ أَرْبَى الرِّبَا الاسْتِطَالَةَ فِي عِرْضِ الْمُسْلِمِ بِغَيْرِ حَقٍّ».[1] واتە: "بەڕاستی خراپترین‌و قێزەونترین جۆری ڕیباو سوو بریتیە لە زماندرێژی‌و دەخستنە ناو ناموس‌و ئابڕووی موسوڵمان بە ناڕەوا".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ، لَا يَخُونُهُ، وَلَا يَكْذِبُهُ، وَلَا يَخْذُلُهُ، كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ، عِرْضُهُ، وَمَالُهُ، وَدَمُهُ، التَّقْوَى هَا هُنَا، بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنْ الشَّرِّ أَنْ يَحْتَقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ». واتە: "موسوڵمان برای موسوڵمانە، خیانەت‌و ناپاکی لەگەڵدا ناکات‌و، درۆی لەگەڵدا ناکات‌و، پشت ناکاتە هاوکاری‌و یارمەتیدانی. هەموو شتێکی موسوڵمان لەسەر موسوڵمان حەرامە: ناموس‌و ماڵ‌و خوێنی. تەقواو لەخواترسی ئا لێرەدایە (مەبەستی ناو دڵە). ئەوەندەش بەسە لە خراپەو تاوان، کە کەسێك بەچاوی سووکەوە تەماشای برایەکی موسوڵمانی خۆی بکات".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٨٥ / بە ژمارە: ٤٨٧٦. ئیمامی (مُنْذِرِيّ)و شێخی (هَيْثَمِيّ) فەرموویانە: ئیمامی (أَحْمَد)و ئیمامی (بَزَّار)یش ڕیوایەتیان کردوەو، کەسەکانی ڕشتەکەی ئیمامی (أَحْمَد) متمانەدارن. بڕوانە: التَّرْغِيْبُ والتَّرْهِيْب / ٣ / ٢٣٠ / بە ژمارە: ٣٨١٠، ومَجْمَعُ الزَّوَائِد / ٨ / ١٥٠ / بە ژمارە: ١٣٤٤٤.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

منیش دەڵێم: بەڕاستی ئەم حەدیسە زۆرێک سوودی گەورەی تێدایە!!! تەوفیقیش تەنها بەدەستی خوایە.

## باسی هەندێك بابەتی گرنگ، كە پەیوەندیان بە پێناسەی غەیبەتەوە هەیە

لە باسەکەی پێشوودا ئەوەمان وت، کە غەیبەت بریتیە لە باسکردنی کەسێك بەجۆرێك کە ئەو پێی ناخۆش بێت. ئیتر ئایا بە دەم باسی بکەیت، یان بە نوسین، یان بە چاو یان بە دەست یان بە سەرت ئاماژەی بۆ بکەیت.

ڕێسای کردنی غەیبەتیش ئەمەیە: هەر شتێك بەهۆی ئەوەوە نوقسانی موسوڵمانێك بۆ کەسێك پیشان بدرێت، ئەوە غەیبەتەو حەرامە. لەوانە: لاسایی کردنەوەی بەوەی کە لارەلار یان لۆقەلۆق دەڕوات، یان بە هەر شێوازێکی تر، کە مەبەست پێی لاسایی کردنەوەی شێوازی کەسێك بێت‌و، بویسترێت بەو لاسایی کردنەوە کەم‌وکورتی ئەو کەسە پیشان بدرێت. جا هەموو ئەمانە حەرامن، بەبێ ناکۆکی لەنێوان زانایاندا.

یەکێکیش لەوانە ئەوەیە کە دانەری کتێبێك لە کتێبەکەیدا باسی کەسێك بکات‌و، بڵێت: "فلانە کەس وای وت" مەبەستیشی عەیبدارکردن‌و بەناقۆڵایی باسکردنی بێت، کە ئەوەش هەر حەرامە.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٣٢٥ / بە ژمارە: ١٩٢٧. دەقی ئەم حەدیسە بە هەندێك پاش‌وپێشەوە لای ئیمامی موسلیمیش هاتوە. بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٩٨٦ / بە ژمارە: ٢٥٦٤.

خۆ ئەگەر مەبەستی ئەوە بوو ڕوونی بکاتەوە کە بۆچوونەکەی هەڵەیە، تا کەس شوێنی نەکەوێت. یان بۆچوونەکەی لاوازە لەڕووی زانستیەوە، تا کەس پێی هەڵنەخەڵەتێتو، پێی وەرنەگرێت، ئەوە غەیبەت نیە. بەڵکو دڵسۆزیەو پێویستەو، پاداشتیشی لەسەری دەدرێتەوە، ئەگەر مەبەستی ئەوە بوو.

بەهەمان شێوە ئەگەر دانەری کتێبێك، یان کەسێکی تر وتی: خەڵکانێك یان کۆمەڵێك وایان وتوەو، بۆچوونەکەشیان هەڵەیە، یان نەزانینە، یان بێئاگاییە، یان شتێکی لەو جۆرەیە، ئەوەش هەر غەیبەت نیە. بەڵکو غەیبەت بریتیە لە باسکردنی کەسێك یان کۆمەڵە کەسێکی دیاریکراو.

هەروەها جۆرێکی تر لە غەیبەتە حەرامەکان ئەوەیە کە تۆ بڵێیت: کەسێك یان یەکێك لە شەرعزانان، یان یەکێك لەوانەی کە خۆی بە زانا دادەنێت، یان یەکێك لە موفتیەکان، یان یەکێك لەوانەی بە پیاوچاك دادەنرێت، یان خۆی بە خۆپارێزو دنیانەویست پیشان دەدات، یان یەکێك لەو کەسانەی ئەمڕۆ سەردانی کردین، یان یەکێك لەوانەی ئەمڕۆ بینیمان فلانە کاری ئەنجامدا، یان شتێکی لەو جۆرە، ئەگەر کەسی ڕوتێکراوی قسەلەگەڵداکراو لە قسەکە تێبگات.

بە هەمان شێوە غەیبەتی ئەو کەسانەی کە خۆیان بە زاناو خوێندەوارو خواناس پیشان دەدەن. ئەوانیش جاری وا هەیە بەجۆرێکی ناڕاشکاوانە غەیبەت دەکەن، کە خەڵکی لێی تێدەگەن، هەر وەکو چۆن لە غەیبەتی ڕاشکاو تێدەگەن. وەکو ئەوەی کە بوترێت بە یەکێك لەوانە: "ئەوە فلانە کەس چۆنە؟" ئەویش بڵێت: "خوا ئیصلاحمان بکات"، یان "خوا لێمان خۆش ببێت"، یان "خوا ئیصلاحی بکات"، یان "داوا لەخوا دەکەین ساغو سەلامەتمان بکات"، یان "سوپاسو ستایشی ئەو خوایە دەکەین، کە تاقی نەکردوینەتەوە بە چوونەلای ستەمکاران"، یان "پەنا بەخوا دەگرین لە خراپە"، یان "خوا لە کەمشەرمی بمانپارێزێت"، یان "خوا تەوبەمان لێ

وەرگرێت"، یان هەر شتێکی تری هاوشێوە، کە نوقسانیو کەموکورتی کەسەکەی لێوە وەربگرێت. هەموو ئەمانە غەیبەتی حەرامن.

بە هەمان شێوە ئەگەر بڵێت: "فلاّنە کەسیش هەر گیرۆدەیە بەوەی کە ئێمەی پێ گیرۆدەین"، یان "چارەیەکی نیە لەو کارەدا، چونکە هەموومان هەر دەیکەین".

جا ئەمانە نموونە بوون. ئەگینا وەکو باسمان کرد، ڕێسای غەیبەت کردن ئەوەیە، کە تۆ بە کەسی ڕوتێکراوی بەرامبەرت بگەیەنیت، کە فلاّنە کەس نوقسانیو کەموکورتی هەیە.

هەموو ئەمانەش لەو حەدیسەوە وەردەگیرێن، کە لە باسەکەی پێشتردا لە صەحیحی موسلیمو لە غەیری ئەویشدا هێنامان سەبارەت بە پێناسەی غەیبەت کردن. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## باسێك: {غەیبەت کردن و گوێ لێ گرتنیشی حەرامە}

بزانە کە غەیبەت وەکو لەسەر ئەو کەسە حەرامە، کە دەیکات، بە هەمان شێوە لەسەر ئەو کەسەش حەرامە کە گوێی لێی دەبێتو بەڵێی بۆ دەکات. بۆیە ئەو کەسەی گوێی لە کەسێکی ترە، وا خەریکە دەست بە غەیبەتی حەرام دەکات، پێویستە لەسەری نەهی لێ بکات، ئەگەر ترسی زیانێکی ئاشکرای نەبوو. خۆ ئەگەر ترسی هەبوو، ئەوا دەبێت بەدڵ پێی ڕازی نەبێتو، ئەگەر توانیشی با کۆڕەکە بەجێ بهێڵێت. خۆ ئەگەر توانی بە زمان ئینکاری بکات، یان توانی بە قسەیەکی تر غەیبەتەکە بپچڕێنێت، ئەوە دەبێت بیکات. جا ئەگەر وا نەکات، ئەوا تاوانبار دەبێت.

ئەوجا ئەگەر بەدەم وتی: بێدەنگ بەو، بە دڵیش حەزی لێبوو بەردەوام بێت، ئەوە پێشەوای پایەبەرز (أَبو حَامِد)ی (غَزَالِـيّ) فەرموویەتی: ئەوە بە دووڕوویی

دادەنرێت‌و، کەسەکەش هەر بە تاوانبار دادەنرێت، بۆیە پێویستە بە دڵیش پێی ناخۆش بێت.

هەر کاتێکیش کەسێك ناچار بوو لەو کۆڕەدا بمێنێتەوە کە غەیبەتی تێدا دەکرێت‌و، نەشی دەتوانی ئینکاری بکات، یان ئینکاری دەکردو، لێی قبوڵ نەدەکراو، بە هیچ ڕێگەیەکیش نەیدەتوانی کۆڕەکە بەجێبهێڵێت، ئەوا حەرامە لەسەری کە گوێ لە غەیبەتەکە بگرێت. بەڵکو ڕێگەچارەی ئەو ئەوەیە کە بە زمان‌و بە دڵیش، یان تەنها بەدڵ زیکری خوا بکات، یان خۆی بە شتێکی ترەوە خەریك بکات، تا گوێی لە غەیبەتەکە نەبێت. ئیتر ئەگەر گوێیشی لێبێت هیچ زیانی نیە، بەڵام لەم حاڵەتەدا نابێت خۆی گوێی بۆ بگرێت. ئەگەر دوای ئەوەش توانی کۆڕەکە بەجێبهێڵێت‌و، ئەوان هەر لەسەر غەیبەتەکە بەردەوام بوون، ئەوا پێویستە لەسەری بەجێی بهێڵێت.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ وَإِمَّا يُنْسِيَنَّكَ الشَّيْطَانُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ الذِّكْرَى مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ [الأنعام: ٦٨] واتە: {ئەگەر ئەو کەسانەت بینی، کە بە گاڵتەو تانەو تەشەرەوە ڕۆچووبوونە ناو ئایەتەکانی قورئانەکەی ئێمە، تۆش پشتیان تێ بکەو، ڕوویان لێ وەربچەرخێنە، هەتا دەچنە ناو باس‌و بابەتێکی ترەوە. خۆ ئەگەر شەیتان ئەم ئامۆژگاری‌و ڕێنموویەی لەبیربردیتەوەو، لە کۆڕی ئەو کۆمەڵە کەسەدا دانیشتیت، ئەوا کە بیرت هاتەوە، ئیتر لەگەڵ ئەو کۆمەڵە ستەمکارەدا دامەنیشە}.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە خواناسی پایەبەرز (إِبْرَاهِيْم)ی کوڕی (أَدْهَم)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە دەعوەت کراوە بۆ خوانێك، ئەوەیش تەشریفی هێناوە. جا خەڵکی کۆڕەکە باسی پیاوێکیان کرد، کە نەهاتوە. وتیان: "پیاوێکی تەمبەڵو لاشە قورسە". شێخ (إِبْرَاهِيْم)یش فەرمووی: "من خۆم ئەمەم بەخۆم کرد، وا هاتوم بۆ

جێگەیەك، كە غەیبەتی خەڵكی تێدا دەكرێت!"، ئیتر تەشریفی هاتە دەرەوەو، تا سێ ڕۆژ نانی نەخوارد.

یەكێكیش لەو هۆنراوانەی لەم بارەوە وتراون بریتیە لە:

وَسَمْعَكَ صُنْ عَنْ سَمَاعِ الْقَبِيْحِ كَصَوْنِ اللِّسَانِ عَنِ النُّطْقِ بِهْ
فَإِنَّكَ عِنْدَ سَمَاعِ الْقَبِيْحِ شَرِيْكٌ لِقَائِلِهِ، فَانْتَبِهْ

واتە: گوێت لە بیستنی قسەی خراپ بپارێزە، وەكو چۆن زمانتی لێ دەپارێزیت. چونكە تۆ لەكاتی بیستنی خراپەدا دەبیت بە هاوبەشی ئەو كەسەی قسە خراپەكەی كردوە، بۆیە ئاگات لەخۆت بێت.(١)

## مرۆڤی موسوڵمان بەچی غەیبەت لەكۆڵی خۆی بكاتەوە؟

بزانە كە ئەم باسە زۆرێك بەڵگەی لە قورئانو سونەتدا لەسەر هاتوە. بەڵام مـن تەنها ئاماژە بە هەندێكیان دەكەم. جا ئەو كەسەی خوا موەفەقی كردبێت بەو بەڵگانە لە غەیبەت كردن دەگەڕێتەوەو، ئەوەش كە خوا موەفەقی نەكردوە، بە خوێندنەوەی چەند بەرگێكیش لە غەیبەت كردن ناگەڕێتەوە.

گرنگترینو سەرەكیترین بەڵگەی ئەم باسە ئەوەیە كە ئەو دەقانەی سەبارەت بە حەرامی غەیبەت كردن هێنامان، مرۆڤی موسوڵمان بیانخاتە پێش چاوی خۆیو، ئەوجا بیر لەم دوو فەرمایشتەی خوای گەورە بكاتەوە:

---

(١) منیش دەڵێم:

گوێت بپارێزە لە قسەی خراپ وەك چۆن زمانتی لێ بەدوور دەگری
هۆشداربە كە تۆش دەبیە هاوبەشی كابرای قسەكەر تاوان وەردەگری

- ﴿مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إِلاَّ لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ [ق: ١٨] واتـه: {ئـادەمیزاد هـەر قسەیەك بكات، فریشتەیەكی چاودێرو ئامادەكراوی لەلادایە بۆ نووسین‌و تۆماركردنی ئەو قسەیە}.
- ﴿وَتَحْسَبُونَهُ هَيِّناً وَهُوَ عِنْدَ اللهِ عَظِيمٌ﴾ [النُّور: ١٥] واته: {ئێوە ئەو قسەیە بە سووك‌و ئاسان دەزانن، بەڵام لای خوا زۆر گەورەو گرانە}.

هەروەها با بیر لەو حەدیسە (صَحِيْح)ـەش بكاتەوە، كە دەفەرموێت: (بەڕاستی پیاو قسەیەك لەو قسانە دەكات، كە مایەی توڕەبوونی خوای گەورەیەو، كەچی خۆی گوێی پێ نادات‌و، قسەكەش دەبێتە هۆی فڕەدانی بۆ ناو ئاگری جەهەنەم).

هەروەها با بیر لەو فەرمایشتانەی تریش بكاتەوە، كە پێشتر لە (**باسی پاراستنی زمان**)و، لە (**باسی غەیبەت**)دا هێنامانن‌و، با لەگەڵ ئەوەشدا ئاگای لەم قسانە بێت: (خوام لەگەڵدایە)، (خوا ئاگای لێمە)، (خوا تەماشام دەكات).

لە شێخ (حَسَن)ی (بَصْرِيّ)شەوە هاتوە (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، كە پیاوێك پێی وتوە: "تۆ غەیبەتم دەكەیت!" ئەویش فەرموویەتی: "ئەوەندە لای من بەڕێزو قەدرگران نیت، تا بتكەمە بڕیاربەدەست بەسەر چاكەكانمەوە".

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە زانای پایەبەرز (عَبْدُالله)ی كوڕی (مُبَارَك)ـەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، كە فەرموویەتی: ئەگەر غەیبەتی كەسێك بكەم، ئەوا غەیبەتی باوك‌و دایكی خۆم دەكەم، چونكە ئەوان لە هەموو كەس لەپێشترن بۆ چاكەكانم.

## باسی ئەو غەیبەتانەی كە حەڵاڵن

بزانە كە غەیبەت ئەگەرچی حەرامە، بەڵام لە هەندێك حاڵەتدا -كە بەرژەوەندی تێدایە- حەڵاڵە.

ئەوەش کە ڕێگە بە کردنی غەیبەت دەدات بریتیە لە مەبەستێکی دروستی شەرعی، کە تەنها بە غەیبەت کردنەکە ئادەمیزاد دەتوانێت پێی بگات. ئەویش یەکێکە لەم شەش هۆکارە:

- یەکەم: سکاڵای کەسی ستەملێکراو. دروستە بۆ کەسی ستەملێکراو سکاڵای ستەملێکرانی خۆی بباتە لای فەرمانڕەواو دادوەرو غەیری ئەوانیش، لەو کەسانەی کە دەسەلأتیان هەیە، تا مافەکەی لە کەسە ستەمکارەکە بۆ وەرگرنەوە. جا دەکرێت بڵێت: "فلأنە کەس ستەمی لێ کردوم"، یان "فلأنە شتی پێکردم"، یان "فلأنە شتی بردم"، یان شتێکی لەو جۆرە.
- دوەم: داوای هاوکاری لەسەر گۆڕینی خراپەیەکو، گەڕاندنەوەی کەسە خراپەکارەکە بۆ سەر ڕێگەی ڕاست. جا دەکرێت بەو کەسە بوترێت، کە ڕەنگە توانای لابردنی خراپەکەی هەبێت: "فلأنە کەس فلأنە کار دەکات، تۆ مەهێڵەو ڕێگری لێ بکە"، یان شتێکی لەو جۆرەی پێ بڵێتو، مەبەستیشی تەنها ئەوە بێت کە خراپەکە لاببرێت. خۆ ئەگەر مەبەستی ئەوە نەبێت، ئەوە حەرامە.
- سێیەم: داوای وەرگرتنی فەتوای شەرعی: بەوەی کە بە کەسی موفتی بوترێت: "باوکم یان براکەم یان فلأنە کەس ستەمێکی ئاوای لێ کردوم، ئایا بۆی هەیە بیکات، یان نا؟ من چی ڕێگەیەکم هەیە بۆ ڕزگاربوون لێیو، مافەکەی خۆشم دەست بکەوێتو، ئەو ستەمەشم لەکۆڵ ببێتەوە؟" یان پرسیارێکی لەو جۆرەی لێ بکات.

هەروەها ئەگەر پیاوێك بڵێت: "ژنەکەم ئاوام لەگەڵدا دەکات"، یان ژنێك بڵێت:"مێردەکەم ئاوام لەگەڵدا دەکات"، یان شتێکی لەو جۆرە. کە ئەم جۆرە گلەییانە لەبەر پێویستی دروستن. بەلأم باشتر وەهایە کەسەکە بڵێت: "ئەوە تۆ چی دەفەرموویت دەربارەی پیاوێك، کە ئەوە کاری بێت؟"، یان "چی دەفەرموویت ئەگەر مێردێك یان ژنێك ئاوا بکات؟"، یان شتێکی لەو جۆرە، کە هەم

مەبەستەکەی پێ دێتەدی‌و، هەم دەستنیشانکردنی کەسەکەشی تێدا نیە، ئەگەرچی دەستنیشانیشی بکات هەر دروستە. لەبەر ئەو حەدیسەی (هِنْد)ی ژنی (أَبو سُفْيَان)، کە ئەگەر خوای گەورە بیەوێت، لەمەولا باسی دەکەین. ئەو عەرزی پێغەمبەری خوای کردوە (دروودی خوای لەسەر بێت): "ئەی پێغەمبەری خوا، بەڕاستی (أَبو سُفْيَان) پیاوێکی چرووك‌و ڕەزیلە...... هتد"، پێغەمبەریش نەهی لێ نەکرد.

- چوارەم: هۆشداریدان بە موسوڵمانان‌و ئامۆژگاری کردنیان سەبارەت بە خراپەیەکی دیاریکراو. ئەویش بە چەند ڕێگەیەك دەبێت:

یەکێك لەوانە بریتیە لە جەرح کردنی ئەو کەسانەی حەدیس ڕیوایەت دەکەن، یان ئەو کەسانەی کە شایەتی دەدەن، کە ئەمە بە کۆدەنگی موسوڵمانان کارێکی دروستە. بەڵکو لەکاتی پێویستیدا واجبە.

یەکێکیش لەوانە ئەوەیە کە کەسێك ڕاوێژت پێ بکات سەبارەت بە ژن‌و ژنخوازی، یان شەریکایەتی، یان ئەمانەت لادانان، یان مامەڵە لەگەڵدا کردن لەگەڵ کەسێکی تردا، ئەوە پێویستە لەسەرت ئەوەی دەیزانیت سەبارەت بەو کەسە وەکو دڵسۆزی باسی بکەیت. خۆ ئەگەر مەبەستەکە تەنها بەوەندە دەهاتەدی، کە تۆ بڵێیت: "بۆ ئەوە ناشێت مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت"، یان "ژن‌و ژنخوازی لەگەڵدا بکەیت"، یان "وا مەکە"، یان شتێکی لەو جۆرە، ئەوە دروست نیە لەوە زیاتر بڵێیت‌و، باسی خراپەکانی بکەیت. خۆ ئەگەر مەبەستەکە نەدەهاتەدی هەتا بە ڕاشکاوانە باسی خراپەکانی نەکەیت، ئەوا قەیناکە بەڕاشکاوی باسیان بکە.

یەکێکیش لەوانە ئەوەیە کە کەسێك ببینیت بەندەیەك دەسێنێت‌و، بەندەکەش بە دز، یان بە زیناکەر، یان بە مەشروبخۆر، یان بە شتی تر ناسراوە، ئەوە پێویستە ئەو شتە بۆ کڕیارەکە ڕوون بکەیتەوە، ئەگەر پێی نەدەزانی. ئەمەش تەنها تایبەت نیە بەم حاڵەتەوە. بەڵکو هەر کەسێك زانی کاڵایەکی فرۆشراو عەیبێکی تێدایە، پێویستە لەسەری بۆ کڕیارەکەی ڕوون بکاتەوە، ئەگەر ئەو پێی نەدەزانی.

یەکێکیش لەوانە ئەوەیە کە کەسێکی زانستخواز هاتوچۆی لای کەسێکی بیدعەکار یان فاسق بکاتو، زانستی لێ وەربگرێت، تۆش ترسی ئەوەت هەبێت کە زانستخوازەکە لەو هاتوچۆیە زەرەرمەندە بێت، ئەوا پێویستە لەسەرت ئامۆژگاری بکەیتو، حاڵی مامۆستاکەی بۆ ڕوون بکەیتەوە. جا بە مەرج گیراوە کە لەم کارەدا مەبەستی دڵسۆزیو ئامۆژگاری بێت، کە ئەمە هەندێك جار هەڵەی تێدا دەکرێت. جاری واش هەیە حەسادەت وا دەکات کەسەکە ئەو قسانە بکات، یان شەیتان لێی دەگۆڕێتو، وای پیشان دەدات کە ئامۆژگاریو سۆزو بەزەییە. بۆیە دەبێت مرۆڤی موسوڵمان زۆر بە وشیاریو زیرەکیەوە مامەڵە لەگەڵ ئەم حاڵەتەدا بکات.

یەکێکیش لەوانە ئەوەیە کە کەسێك سەرپەرشتیارێتیەکی هەبێتو، بەپێی پێویستو وەکو خۆی جێبەجێی نەکات، ئیتر ئایا بۆ ئەو سەرپەرشتیارێتیە ناشێت، یان کەسێکی فاسقە، یان نەفامو بێئاگایە، یان کەسێکی لەو جۆرەیە. بۆیە پێویستە باسی ئەوە بکرێت بۆ دەسەڵاتدارو فەرمانڕەوای گشتی، تا ئەو کەسە لاببات و، کەسێکی شیاو بکاتە سەرپەرشتیار، یان دەسەڵاتدارەکە ئاگادار بکاتەوە لەوەی کە ئەو کەسە ئاوایە، بۆ ئەوەی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا بکاتو، پێی هەڵنەخەڵەتێت. هەروەها هەوڵی ئەوەش بدات، کە دەسەڵاتدارەکە هانی کەسەکە بدات لەسەر ڕاست ڕۆیشتن، یان کەسێکی تر بخاتە شوێنی.

- پێنجەم: ئەوەیە کە کەسێکی وا بێت بە ئاشکرا تاوان بکات، یان بانگەشە بۆ بیدعەکەی خۆی بکات. وەکو ئەو کەسەی کە بەئاشکرا مەشروب دەخواتەوە، یان دەست دەگرێت بەسەر ماڵی خەڵکیداو، باجو سەرانەیان بەناهەق لێ دەسێنێت، یان خەریکی خراپەکاریە. بۆیە دروستە باسی ئەو کارەی بکەیت، کە بە ئاشکرا خەریکێتیو، حەرامیشە هیچ عەیبێکی تری باس بکرێت، مەگەر بۆ باسکردنەکە هۆکارێکی تر هەبێت لەوانەی باسمان کردن.

- شەشەم: ناساندن: ئەگەر کەسێك بەنازناوێك ناسرابوو، وەکو: (أَعْمَش)و (أَعْرَج)و (أَصَمّ)و (أَعْمَى)و (أَحْوَل)و (أَفْطَس)و نازناوەکانی تر، ئەوە دروستە بە مەبەستی ناساندن بەو نازناوە بناسێنرێت‌و، حەرامیشە بە مەبەستی کەم‌وکورتی لێ گرتن بۆی بەکار بهێنرێت. خۆ ئەگەر کرا بە شتێکی تر بناسێنرێت، ئەوە باشترە.

جا ئەمە شەش هۆکار لەو هۆکارانە بوون، کە زانایان باسیان کردون‌و، دروستە بەهۆیانەوە غەیبەت بکرێت، بەو شێوەی کە باسمان کرد.

لەو زانایانەش کە باسی ئەم هۆکارانەیان کردوە: پێشەوای پایەبەرز (أَبُو حَامِد)ی (غَزَالِيّ) لە کتێبی (إِحْيَاء)داو، هەندێك لە زانایانی تریش.

بەڵگەکانی دروستێتی ئەم جۆرە غەیبەت کردنانەش لە حەدیسە (صَحِيْح)ەکاندا مەشهوورن، زۆربەی ئەم هۆکارانەش جێگەی کۆدەنگی زانایانن، کە دروستە بەهۆیانەوە غەیبەت بکرێت.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پیاوێك داوای مۆڵەتی کرد بۆ هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەویش فەرمووی: «ائْذَنُوا لَهُ، بِئْسَ أَخُو الْعَشِيرَةِ».[1] واتە: "ڕێگەی پێ بدەن، بەڕاستی کەسێکی خراپی عەشرەتەکەی خۆیەتی".

ئیمامی بوخاری ئەم حەدیسەی کردوە بە بەڵگە لەسەر دروستی غەیبەت کردنی کەسی خراپەکارو، ئەو کەسەی گومان لە دڵی خەڵکیدا دروست دەکات.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٥٠ / بە ژمارە: ٥٧٠٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٠٢ / بە ژمارە: ٢٥٩١.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) شتێکی دابەش کرد. پیاوێکیش لە پشتیوانان وتی: "سوێند بەخوا، (مُحَمَّد) لەم دابەشکردنەدا مەبەستی ڕەزامەندی خوا نەبوە!!!" منیش هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەرو، خەبەرم پێدا، ئەویش ڕەنگی ڕوخساری گۆڕاو، فەرمووی: "ڕەحمەتی خوا لە حەزرەتی (مُوْسَى)، بەڕاستی لەمەش زیاتر ئازار دراو، ئەو هەر صەبرو ئارامی گرت".[1]

لە هەندێك لە ڕیوایەتەکاندا (لای ئیمامی موسلیم) هاتوە، کە (ابْنُ مَسْعُوْد) فەرموویەتی: وتم: "ئیتر دوای ئەمە قسە بەرز ناکەمەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر".

منیش دەڵێم: ئیمامی بوخاری ئەم حەدیسەی کردوە بە بەڵگە لەسەر ئەوەی، کە دروستە کەسێك خەبەر بدات بە برایەکی خۆی، کە چی لەبارەیەوە وتراوە.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَا أَظُنُّ فُلاناً وَفُلاناً يَعْرِفانِ مِنْ دِيْنِنَا شَيْئاً».[2] واتە: "وا نازانم فلانو فیسار هیچ لەبارەی ئاینەکەی ئێمەوە بزانن".

زانای پایەبەرز (لَيْث)ی کوڕی (سَعْد) -کە یەکێکە لە ڕاویەکان- فەرموویەتی: ئەو دوو کەسە هەردووکیان دووڕوو بوون.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (زَيْد)ی کوڕی (أَرْقَم)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: لە

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١١٤٨ / بە ژمارە: ٢٩٨١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٧٣٩ / بە ژمارە: ١٠٦٢.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٥٤ / بە ژمارە: ٥٧٢٠.

سەفەرێکدا لــە خزمــەتی پێغەمبــەری خــوادا دەرچــووین (درودی خــوای لەســەر بێــت)، خەڵکەکەش تووشی نارەحەتی بوونو، (عَبْدُاللهِ)ی کوڕی (أُبَــيّ)یــش وتــی: "هــیچ خەرج مەکەن بۆ ئەوانەی لە خزمەتی پێغەمبەری خــوادان، تــا لــە دەوری نــەمێنن و بــڵاوەی لێ بکــەن!!!". هــەروەها وتــی: "ئەگــەر گەڕاینــەوە بــۆ شــاری (مَدِيْنَـــةِ)، دەســەڵاتدارەکانمان بێدەســەڵاتەکان دەردەکــەین!!!" جــا منــیش هــاتم بــۆ خزمــەتی پێغەمبەرو، خەبەرم پێدا کە وای وتوە، ئەویش ناردی بەشوێنی (عَبْدُاللهِ)دا..... ئــیتر تەواوی حەدیسەکەی بــاس کــرد. خــوای گــەورەش ســورەتی (الْمُنَـــافِقُوْن)ی بــۆ ڕاستاندنی خەبەرەکەی (زَيْد) دابەزاند: ﴿إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ...... ﴾.[1]

هەروەها لـە حەدیسی (صَحِيْح)دا هاتوە، کە (هِنْد)ی خێزانــی (أَبُــو سُــفْيَان)، عەرزی پێغەمبەری خوای کردوە (درودی خوای لەسەر بێت): "ئــەی پێغەمبــەری خــوا، بەڕاستی (أَبُو سُفْيَان) پیاوێکی چرووکو ڕەزیلە......هتد".[2]

هەروەها لـە حەدیسی (صَحِيْح)یشدا هاتوە، کــە پێغەمبــەری خــوا (درودی خــوای لەسەر بێت) بە (فَاطِمَة)ی کچی (قَيْس)ی فەرموە: (مُعَاوِيَة) پیاوێکی گــەداو نــەدارەو، (أَبُو الْجَهْم)یش گاڵۆك لەسەر شانی دانانێت (واتە: زۆر لە ژن دەدات).[3]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٨٦٠ / بە ژمارە: ٤٦٢٠، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢١٤٠ / بە ژمارە: ٢٧٧٢.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٧٦٩ / بە ژمارە: ٢٠٩٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٣٣٨ / بە ژمارە: ١٧١٤.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ١١١٤ / بە ژمارە: ١٤٨٠.

## باسی فەرمان کردن بەو کەسەی کە گوێی لە غەیبەتی مامۆستایەکی خۆی یان هاوڕێیەکی یان کەسێکی تر دەبێت، کە بەرپەرچی غەیبەتکارەکە بداتەوەو قسەکەی پوچەڵ بکاتەوە

بزانە ئەو کەسەی گوێی لە غەیبەتی موسوڵمانێك دەبێت، پێویستە بەرپەرچی بداتەوەو، ڕێگری لە غەیبەتکارەکە بکات، خۆ ئەگەر بە قسە وازی نەهێنا، ئەوا بە دەست ڕێگری لێ بکات. خۆ ئەگەر نە بە دەستو نە بە زمانیش نەیتوانی، ئەوا با کۆڕەکە بەجێ بهێڵێت.

ئەوجا ئەگەر غەیبەتی مامۆستایەکی خۆی، یان کەسێکی تری بیست، لەوانەی کە مافێکیان بەسەریەوە هەیە، یان غەیبەتکراوەکە کەسێکی خاوەن پایەو چاکەکار بوو، ئەوا دەبێت زیاتر بایەخ بەو هەڵوێستانە بدات، کە باسمان کردن.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو الدَّرْدَاء)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ رَدَّ عَنْ عِرْضِ أخِيْهِ، رَدَّ اللهُ عَنْ وَجْهِهِ النَّارَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ». واتە: "ئەو کەسەی پارێزگاری لە ناموسو ئابڕووی برایەکی دینی خۆی بکاتو، لەسەری بکاتەوە، خوای گەورەش لە ڕۆژی قیامەتدا ئاگری دۆزەخ لە دەموچاوی دووردەخاتەوە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە حەدیسەکەی هاوەڵی خۆشەویست (عِتْبَان)وە -کە وا مەشهوورە عەینەکەی مەکسورە، وتراویشە (مَضْمُوْم)ـە- (خوای لێ ڕازی بێت)، کە حەدیسێکی درێژی مەشهوورە، ئەو فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) تەشریفی

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٣٢٧ / بە ژمارە: ١٩٣١.

هەستا نوێژ بكات، وتیان: "(مَالِك)ی كوڕی (دُخْشُم)[1] لەكوێیە؟" پیاوێك وتی: "ئەوە دووڕووە، خواو پێغەمبەرەكەی خۆش ناوێت!!" پێغەمبەریش فەرمووی: «لا تَقُلْ ذَلِكَ! أَلا تَرَاهُ قَدْ قَالَ: "لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ"، يُرِيْدُ بِذَلِكَ وَجْهَ اللهِ؟».[2] واتە: "وا مەڵێ! بۆ نازانیت كە وتوویەتی: (لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)و، مەبەستیشی ڕەزامەندی خوا بوە؟".

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە شێخ (حَسَن)ی (بَصْرِيّ)ـەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، كە (عَائِذ)ی كوڕی (عَمْرو) -كە یەكێك بوە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)- چوەتە ژوور بۆلای (عُبَيْدُالله)ی كوڕی (زِيَاد)و، پێی فەرموە: "كوڕم، من لە پێغەمبەری خوام بیستوە، كە فەرموویەتی: «إِنَّ شَرَّ الرِّعَاء الْحُطَمَةُ». واتە: "خراپترینی دەسەڵاتداران‌و چاودێران ئەوانەن كە بەهۆی زەحمەت‌و ناڕەحەتیەوە ژێردەستەكانیان تێكدەشكێنن". بۆیە هەرگیز نەكەیت كە تۆ یەكێك بیت لەوان. (عُبَيْدُالله)ش پێی وت: "فەرموو دانیشە. تۆ یەكێكی لەو هاوەڵانەی پێغەمبەر كە وەكو كەپەك وەهان!!! (واتە: لە شارەزاو پایەبەرزەكانیان نیت، بەڵكو لە بێكەڵكەكانیانی، كە وەكو سوس‌و كەپەك وەهان!!! پەنا بەخوا لە بێ ئەدەبی لەو جۆرە)". (عَائِذ)یش فەرمووی: "بۆ ئەوانیش سوس‌و كەپەكیان هەبوە؟! بەڵكو سوس‌و كەپەك تەنها لە دوای ئەوان‌و لە غەیری ئەواندا هەیە".[3]

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (كَعْب)ی كوڕی (مَالِك)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، لەو حەدیسە

---

(١) شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ئەم ناوە بە (دُخْشُن)و (دُخَيْشِن)یش دەخوێنرێتەوە. بڕوانە: الْإِصَابَةُ فِيْ تَمْيِيْزِ الصَّحَابَة / ٥ / ٥٣٤ / بە ژمارە: ٧٦٤٠.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ١٦٤ / بە ژمارە: ٤١٥، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤٥٥ / بە ژمارە: ٣٣.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٤٦١ / بە ژمارە: ١٨٣٠.

درێژەیدا، کە سەبارەت بە چیرۆکی تەوبە کردنەکەی هاتوە. ئەو فەرموویەتی: کاتێك پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، لەناو کۆمەڵێکدا دانیشتبوو لە (تَبُوْك)، پرسیاری کردو فەرمووی: "(کَعْب)ی کوڕی (مَالِك) چی کرد؟" پیاوێکی هۆزی (بَنُو سَلِمَة)ش وتی: "ئەی پێغەمبەری خوا، عاباو کراسەکەی‌و، تەماشا کردنی ئەملاولاکانیان نەیانهێشت بێت بۆ غەزا!!" (مەبەستی ئەوە بوە، کە کەسێکی لەخۆڕازی بوە). هاوەڵی خۆشەویست (مُعَاذ)ی کوڕی (جَبَل)یش بە کابرای فەرموو: "ئای کە قسەیەکی خراپت کرد!! ئەی پێغەمبەری خوا، سوێند بەخوا، ئێمە تەنها چاکە لەبارەی (کَعْب)ەوە دەزانین". ئیتر پێغەمبەری خواش بێدەنگ بوو.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)دا، لە هەردوو هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ی کوڕی (عَبْدُالله)و (أَبُو طَلْحَة)وە (خوایان لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویانە: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَا مِنْ امْرِئ يَخْذُلُ امْرِءاً مُسْلِماً فِيْ مَوْضِعٍ تُنْتَهَكُ فِيْهِ حُرْمَتُهُ، وَيُنْتَقَصُ فِيْهِ مِنْ عِرْضِهِ، إِلاَّ خَذَلَهُ اللهُ فِيْ مَوْطِنٍ، يُحِبُّ فِيْهِ نُصْرَتَهُ. وَمَا مِنْ امْرِئ يَنْصُرُ مُسْلِماً فِيْ مَوْضِعٍ، يُنْتَقَصُ فِيْهِ مِنْ عِرْضِهِ، وَيُنْتَهَكُ فِيْهِ مِنْ حُرْمَتِهِ، إِلاَّ نَصَرَهُ اللهُ فِيْ مَوْطِنٍ، يُحِبُّ نُصْرَتَهُ».[2] واتە: "هەر کەسێك بەرگری‌و پشتیوانی لە موسوڵمانێك نەکات، لە جێگەیەکدا کە ئابڕووی دەشکێنرێت‌و، باسی شەرەف‌و ناموسی بە خراپە دەکرێت، خوای گەورەش لە جێگەیەکدا ئەو سەرکز دەکات، کە پێی خۆشە پشتیوانی لێ بکرێت. هەر کەسێکیش بەرگری‌و پشتیوانی لە موسوڵمانێك بکات، لە جێگەیەکدا کە باسی شەرەف‌و ناموسی بە خراپە دەکرێت‌و، ئابڕووی دەشکێنرێت، خوای

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٦٠٣ / بە ژمارە: ٤١٥٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢١٢٠ / بە ژمارە: ٢٧٦٩.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٨٧ / بە ژمارە: ٤٨٨٤. شێخی (هَيْثَمِيّ) فەرموویەتی: ئیمامی (طَبَرَانِيّ) حەدیسەکەی (جَابِر)ی لە (الْمُعْجَمُ الْأَوْسَط)دا ڕیوایەت کردوەو، ڕشتەکەشی (حَسَن)ە. بڕوانە: مَجْمَعُ الزَّوَائِد / ٧ / ٢٦٧ / بە ژمارە: ١٢١٣٨.

گەورەش لــە جێگەیەکـدا پشـتیوانی لـەو دەکـات، کـە پێـی خۆشـە پشـتیوانی لێ بکرێت".

بۆشمـان ڕیوایـەت کـراوە لــە (سُـنَن)ی ئیمـامی (أبُــو دَاوُد)دا، لــە هـاوەڵی خۆشەویست (مُعَاذ)ی کوڕی (أنَس)ــەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لــە پێغەمبــەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ حَمَى مُؤْمِناً مِــنْ مُنَــافِقٍ» وا دەزانم فــەرمووی: «بَعَثَ اللهُ مَلَكاً يَحْمِي لَحْمَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ نَارِ جَهَنَّمَ. وَمَنْ رَمَــى مُسْلِماً بِشَيْءٍ، يُرِيْدُ شَيْنَهُ بِهِ، حَبَسَهُ اللهُ عَلَى جِسْرِ جَهَنَّمَ، حَتَّى يَخْرُجَ مِمَّا قَــالَ».[1] واتە: "ئەو کەسەی حورمـەتو ناموسـی ئیمانـدارێك لـە غەیبـەتکارێکی دووڕوو بپارێزێت، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا فریشتەیەك دەنێرێت، تا گۆشتی لاشـەی ئەو لە ئاگری دۆزەخ بپارێزێت. ئەو کەسەش بوختیان بۆ موسـوڵمانێك دەکـاتو، مەبەستی عەیبدارکردنو ئابڕووبردنی بێت، خوای گەورە لەسەر پردی دۆزەخ ڕای دەگرێت، هەتا لەوەی وتوویەتی ڕزگاری دەبێتو لــە تاوانەکـەی پـاك دەکرێتـەوە (ئیتر بە گەردنئازادکردنی لەلایەن موسـوڵمانەکەوە، یـان بـە شـەفاعەتو تکـا بـۆ کردنی، یان بە سزادانی بە ئەندەزەی تاوانەکەی)".

## باسی غەیبەت کردن بە دڵ

بزانە کە هەروەکو چۆن قسەی خراپ کردن حەرامە، گومانی خـراپ بـردنیش هەر حەرامە. جا وەکو چۆن حەرامە باسی خراپەو کەموکورتی کەسێك بکەیت بـۆ

(١) بڕوانە: سُنَنُ أبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٨٧ / بە ژمـارە: ٤٨٨٣. حـافظـی عێراقـی فەرموویـەتی: ڕشتەکەی لاوازە. بڕوانە: الْمُغْنِي عَنْ حَمْلِ الْأسْفَار / ١ / ٥١٠ / بە ژمارە: ١٩٦٤. بـەڵام شێخ (عَامِر عَلِيّ يَاسِيْن) لە تـەخریجی حەدیســەکانی (أذْکَــار)دا فەرموویـەتی: حەدیســەکە بەهۆی پاڵپشتەوە دەبێت بە حەدیسێکی (حَسَن).

کەسێکی تر، هەروا حەرامە لە ناخ‌و دەرونی خۆتدا بەو جۆرە باسی بکەیت‌و، گومانی خراپی پێ ببەیت.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿اجْتَنِبُوا كَثِيراً مِنَ الظَّنِّ﴾ [الْحُجُرَات: ١٢] واتە: {ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان بە خوای گەورەو بە پێغەمبەرەکەی هێناوە، خۆتان لە زۆرێك گومان بەدوور بگرن}.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ، فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الْحَدِيثِ».[1] واتە: "خۆتان لە گومانی خراپ بپارێزن. چونکە گومانی خراپ درۆترین قسەو خەیاڵی نەفسی مرۆڤە".

هەروەها زۆرێك حەدیسی تریش لەم بارەوە هاتوون.

مەبەستیش لە غەیبەت کردن بە دڵ ئەوەیە کە دڵت بڕیاری خراپ بەسەر کەسێکی تردا بدات.

سەبارەت بەو خەیالآت‌و خوێندنەوە دەرونیانەش کە لە دڵدا جێگیر نابن‌و، خاوەنەکەیان لەسەریان بەردەوام نابێت، ئەوە بە یەکدەنگی زانایان عەفویان لێ دراوە. چونکە خاوەنەکەیان هیچ ویست‌و ئارەزوویەکی نیە لە دەروستبوونیانداو، ڕێگەیەکیشی نیە بۆ خۆلێدەرباز کردنیان.

هەر ئەم مانایەش مەبەستە بەوەی کە لە حەدیسی (صَحِيْح)دا لە پێغەمبەری خواوە هاتوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «إِنَّ اللهَ تَجَاوَزَ لِأُمَّتِي مَا

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٥٣ / بە ژمارە: ٥٧١٩، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٩٨٥ / بە ژمارە: ٢٥٦٣.

لە دڵدا حەرامە. بۆیە هەر کاتێك تۆ خەیاڵی غەیبەت یان تاوانێکی ترت بۆ دروست بوو، پێویستە لایەیت‌و، پشتی تێ بکەیت‌و، تەئویلی وای بۆ بکەیت، کە لە ڕواڵەتەکەی لای بدات.

پێشەوای پایەبەرز (أَبو حَامِد)ی (غَزَالِيّ) لە کتێبی (إِحْيَاء)دا فەرموویەتی: "ئەگەر گومانی خراپ کەوتە ناو دڵتەوە، ئەوە یەکێکە لە وەسوەسەکانی شەیتان، کە بۆت دەهاوێژێت. بۆیە پێویستە بەدرۆی بخەیتەوەو باوەڕی پێ نەکەیت، چونکە ئەو لە هەموو فاسقەکان فاسقترەو، خوای گەورەش فەرمویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَنْ تُصِيبُوا قَوْماً بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ﴾ [الْحُجُرَات: ٦] واتە: {ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان بەخواو بە پێغەمبەرەکەی هێناوە، ئەگەر کەسێکی فاسق‌و تاوانبار هەواڵو زانیاریەکی بۆ هێنان، ئێوە لێی بکۆڵنەوەو، لە ڕاستی‌و ناڕاستی دڵنیابن، نەوەکو بە نەزانین‌و بێئاگایی پەلاماری خەڵکانێك بدەن‌و، بدەن بەسەریانداو، دواتریش لەوەی کردووتانە پەشیمان ببنەوە} . بۆیە نابێت باوەڕ بە شەیتان بکرێت. خۆ ئەگەر قەرینەیەك هەبوو لەسەر ئەوەی کە گومانە خراپەکە نادروستەو، دەگونجێت پێچەوانەکەی ڕاست بێت، ئەوا نابێت گومانی خراپ ببرێت".

"جا یەکێك لە نیشانەکانی گومانی خراپ بردن ئەوەیە کە دڵت لەگەڵ کەسەکەدا بگۆڕێت‌و، وەکو جاران نەمێنێت، وات لێبێت حەزی پێ نەکەیت‌و، پێی بێتاقەت بیت‌و، کەم موراعاتی بکەیت‌و ڕێزی بگریت‌و، کەم خەفەتبار بیت بۆ تاوان‌و خراپەکانی. چونکە شەیتان بە کەمترین خەیاڵ خراپەی خەڵکی لە دڵی ئادەمیزاد نزیك دەکاتەوەو، وا دەخاتە دڵیەوە، کە: ئەوە نیشانەی زیرەکی‌و ژیری‌و زوو تێگەیشتنی تۆیەو، مرۆڤی ئیمانداریش بە نوری خوا دەڕوانێت، کەچی لەڕاستیشدا ئەو کەسە تەنها لەڕووی لەخۆبایی بوون‌و وەسوەسەی شەیتانەوە قسە دەکات. خۆ ئەگەر کەسێکی دادپەروەر خەبەری ئەو شتەی پێدایت، ئەوا نە

حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَها، مَا لَمْ تَتَكَلَّمْ بِهِ أَوْ تَعْمَلْ».[1] واتە: "خوای گەورە چاوپۆشی کردوە لە ئومەتەکەم لەو قسەو خەیاڵە خراپانەی کە دێت بە دڵیاندا، بەمەرجێك بە دەم دەرینەبڕن، یان کاری پێ نەکەن".

زانایان فەرموویانە: مەبەستی ئەو خەیاڵاتانەیە کە جێگیر نابن‌و نامێننەوە.

هەروەها فەرموویانە: ئیتر ئایا ئەو خەیاڵاتانە غەیبەت بن، یان کوفر بن، یان شتێکی تر بن. بۆیە ئەو کەسەی کە تەنها بە خەیاڵ کوفر دێت بە خەیاڵیدا، بێ ئەوەی خۆی بە مەبەست دەستی هەبێت لە دروستبوونیدا، پاشان دەست بەجێ وازی لێ بهێنێت، ئەوە کافر نابێت‌و، هیچیشی لەسەر نیە.

پێشتریش لە (**باسی وەسوەسە**)دا لە حەدیسی (صَحِيْح)دا هێنامان، کە کۆمەڵێك لە هاوەڵان عەرزی پێغەمبەری خوایان کردوە: "ئەی پێغەمبەری خوا، کەسی وامان تێدایە هەست بە بونی خەیاڵی وا دەکات لە مێشکی خۆیدا، کە باسکردنی بە شتێکی زۆر گەورە دەزانێت". ئەویش فەرمووی: "ئەو بەگەورە زانینە بریتیە لە ئیمانی پاك‌و بێگەرد".[2]

هەروەها چەند حەدیسێکی تریشمان لەوێ باس کردو، چەند حەدیسێکی تریش کە هەمان مانایان هەیە.

جا هۆی عەفو لێدرانی ئەم جۆرە خەیاڵاتانەش ئەوەیە، کە ئادەمیزاد ناتوانێت خۆیان لێ بەدوور بگرێت. بەڵکو ئەوەی کە لەتوانادا هەیە، تەنها بریتیە لە خۆ بەدوور گرتن لە بەردەوام بوون لەسەریان. هەر بۆیە بەردەوام بوون‌و چەسپبوونیان

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٦ / ٢٤٥٤ / بە ژمارە: ٦٢٨٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ١١٦ / بە ژمارە: ١٢٧.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ١١٩ / بە ژمارە: ١٣٢. منیش دەڵێم: پێشتر ئیمامی نەوەوی ئەم حەدیسەی نەهێناوە. جا سەیرە بەلامەوە، کە فەرموویەتی پێشتر هێناومانە!

لە دڵدا حەرامە. بۆیە هەر کاتێك تۆ خـەیاڵی غەیبـەت یـان تـاوانێکی تـرت بـۆ دروست بوو، پێویستە لایبەیت و، پشتی تێ بکەیت و، تەئویلی وای بۆ بکـەیت، کـە لە ڕواڵەتەکەی لای بدات.

پێشەوای پایەبـەرز (أَبُو حَامِد)ی (غَزَالِيّ) لـە کتێبـی (إحْیَـاء)دا فەرموویـەتی: "ئەگەر گومانی خراپ کەوتە ناو دڵتەوە، ئەوە یەکێکە لە وەسوەسـەکانی شـەیتان، کە بۆت دەهاوێژێت. بۆیە پێویستە بەدرۆی بخەیتەوەو باوەڕی پێ نەکەیت، چـونکە ئەو لە هەموو فاسقەکان فاسقترەو، خوای گەورەش فەرمویـەتی: ﴿يَا أَيُّهَـا الَّـذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَنْ تُصِيبُوا قَوْماً بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَـا فَعَلْـتُمْ نَادِمِينَ﴾ [الْحُجُرَات: ٦] واتە: {ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان بەخوا و بە پێغەمبەرەکـەی هێناوە، ئەگەر کەسێکی فاسق و تاوانبار هـەواڵ و زانیاریـەکی بـۆ هێنـان، ئێـوە لێـی بکۆڵنەوەو، لە ڕاستی و ناڕاستی دڵنیابن، نەوەکو بـە نـەزانین و بێئاگـایی پـەلاماری خـەڵکانێك بـدەن و، بـدەن بەسـەریانداو، دواتـریش لـەوەی کردووتانـە پەشـیمان ببنەوە} . بۆیە نابێت باوەڕ بە شەیتان بکرێت. خۆ ئەگەر قەرینەیـەك هـەبوو لەسـەر ئەوەی کە گومانە خراپەکە نادروستەو، دەگونجێت پێچەوانەکەی ڕاست بێت، ئـەوا نابێت گومانی خراپ ببرێت".

"جا یەکێك لە نیشـانەکانی گومـانی خـراپ بـردن ئەوەیـە کـە دڵـت لەگـەڵ کەسەکەدا بگۆڕێت و، وەکو جاران نەمێنێت، وات لێبێت حەزی پێ نەکەیت و، پێی بێتاقەت بیت و، کەم موراعاتی بکەیت و ڕێزی بگریـت و، کـەم خەفـەتبار بیـت بـۆ تاوان و خراپەکانی. چونکە شەیتان بە کەمترین خـەیاڵ خراپـەی خـەڵکی لـە دڵـی ئادەمیزاد نزیك دەکاتەوەو، وا دەخاتە دڵیەوە، کە: ئەوە نیشانەی زیرەکی و ژیری و زوو تێگەیشـتنی تۆیـەو، مرۆڤـی ئیمانـداریش بـە نـوری خـوا دەڕوانێـت، کەچـی لەڕاستیشدا ئەو کەسە تەنها لەڕووی لەخۆبایی بوون و وەسوەسەی شەیتانەوە قسـە دەکات. خۆ ئەگەر کەسێکی دادپـەروەر خەبـەری ئـەو شـتەی پێدایت، ئـەوا نـە

باوەڕی پێ بکەو، نە بە درۆشی بخەرەوە، تـاوەکو گومـانی خـراپ بـە هیچـکامیان نەبەیت".

"هەر کاتێکیش گومانێکی خراپ دەربارەی موسـوڵمانێك هـات بـە خەیاڵـتـدا، هەوڵ بدە زیاتر موراعاتی بکەیتو ڕێزی بگریت. چونکە ئـەو کـارە شـەیتان تـوڕە دەکاتو، لەکۆڵتی دەکاتەوەو، ئیتر گومانی لەو جـۆرە ناخاتـە دڵتـەوە، لەترسـی ئەوەی نەوەکو دەست بکەیت بە دوعای خەیر بۆ کردنی".

"هەر کاتێکیش بە بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگر بە تێکـەوتنو پێخزانـی کەسـێکی موسوڵمانت زانی، ئەوا سەلامەتی لەوەدایە کـە نهێنـی بێـت لاتو، بـا شـەیتانیش هەڵت نەخەڵەتێنێتو، بانگت بکات بۆ غەیبەت کردنـی ئـەو کەسـە. خـۆ ئەگـەر ئامۆژگاریشت کرد، بەو جۆرە ئامۆژگاری مەکە، کە تۆ دڵ خۆشیت بەوەی ئاگـات لەو تێکەوتنو نوقسانیەی ئـەو هەیـەو، سـەرەنجام ئـەو ئـەو بەچـاوی گەورەییـەوە تەماشای تۆ بکاتو، تۆش بەچاوی بچووکیەوە تەماشای ئەو بکەیت. بەڵکو هەوڵی ئەوە بدە لـەو تاوانە ڕزگاری بکەیتو، هەروەکو چۆن بۆ خۆت خەفـەتبار دەبیـت، ئەگـەر نوقسـانیەك ڕووی تـێ کردیـت، هـەروا بـۆ ئـەویش خەفـەتبار دەبیـتو، پێویستیشـە وازهێنـانی کەسـەکە لـەو نوقسـانیە بـەبێ ئامۆژگـاری تـۆ، بەلاتـەوە خۆشەویستتر بێت لـە واز لێهێنانی بە ئامۆژگاری تۆ".

جا ئەمە فەرمایشتەکەی ئیمامی (غَزَالِيّ) بوو.

منیش دەڵێم: پێشتر باسمان کرد، کە ئەگەر کەسێك خەیاڵی گومانی خراپی بـۆ دروست بوو، پێویستە وازی لێ بهێنێت. ئەمەش ئەگەر بەرژەوەندیەکی شەرعی وای نەدەخواست کە بیر لـەو خەیاڵە بکاتەوە. خۆ ئەگەر بەرژەوەندیـەکی شـەرعی وای دەخواسـت، ئـەوا دروسـتە بـیر لـە کەموکورتیـەکانی ئـەو کەسـە بکرێتـەوەو، شوێنکۆزیشیان بۆ بکرێـت، وەکـو لـە جـەرحی شـایەتەکانو ڕاویـەکانو غـەیری ئەوانیشدا لـە (**باسی ئەو غەیبەتانەی کە حەڵاڵن**)دا باسمان کرد.

## باسی کەفارەتی غەیبەت کردن و تەوبە کردن لێی

بزانە ئەو کەسەی تاوانێکی ئەنجام داوە، پێویستە پەلە بکات بۆ تەوبە کردن لەو تاوانە.

جا تەوبە کردن لەو کارانەی کە مافی خوای گەورەن، سێ مەرجی هەیە: دەبێت کەسەکە دەمودەست واز لە تاوانەکە بهێنێتو، پەشیمانیش بێت لە کردنیو، بڕیاریش بدات کە هەرگیز نەگەڕێتەوە بۆی.

تەوبەش لەو شتانەی کە مافی ئادەمیزادەکانن ئەم سێ مەرجەو، مەرجێکی تریشی هەیە، ئەویش: گەڕاندنەوەی مافەکەیە بۆ خاوەنەکەی، یان داوای عەفو لێ کردنیو، گەردن ئازاد کردنی.

بۆیە پێویستە لەسەر کەسی غەیبەتکار بەم چوار مەرجە تەوبە بکات. چونکە غەیبەت کردن مافێکی ئادەمیزادیەو، پێویستە داوای گەردن ئازادی لەو کەسە بکات، کە غەیبەتی کردوە.

جا ئایا ئەوەندە بەسە کە پێی بڵێت: "غەیبەتێکم کردیت، گەردنم ئازاد بکە"، یان دەبێت باسی غەیبەتەکەشی بۆ بکات، کە چی بوە؟ ئەوە دوو بۆچوونی هاوەڵانی ئیمامی (شَافِعِيّ) لەبارەوە هاتوە (ڕەحمەتی خوایان لێبێت):

- یەکەمیان ئەوەیە کە دەبێت باسی بکاتو ڕوونی بکاتەوە. خۆ ئەگەر بەبێ باسکردنیش کابرای غەیبەتکراو گەردنی ئازاد کرد، ئەوا نابێت باسی بکات، وەکو چۆن ئەگەر گەردنی ئازاد بکات لە ماڵو موڵکێکی نەناسراودا.
- دوەمیان ئەوەیە کە بەمەرج نەگیراوە باسی بکات. چونکە ئەم مەسەلە لەو مەسەلانەیە کە چاوپۆشیان تێدا دەکرێت. بۆیە بەمەرج نەگیراوە کابرای

غەیبەتکراو بزانێت چی وتوە، بە پێچەوانەی ماڵو موڵکەوە، کە دەبێت بزانێت چیە.

جا بۆچوونی یەکەمیان بەهێزترە. چونکە دەگونجێت ئادەمیزاد چاوپۆشی لە جۆرە غەیبەتێك بکاتو، چاوپۆشی لە جۆرێکی تر نەکات.

ئەوجا ئەگەر کابرای غەیبەتکراو مردبوو، یان غایب بوو، ئەوا ناگۆنجێت یان ئەستەمە گەردنئازادی لێ وەربگیرێت. بەڵام زانایان فەرموویانە: پێویستە داوای لێخۆشبوونی بۆ بکاتو دوعای زۆر بۆ بکاتو، خەیرو چاکەشی زۆر بۆ بکات.

هەروەها سونەتە کەسە غەیبەتکراوەکە گەردنی کەسە غەیبەتکارەکە ئازاد بکات، بەڵام واجب نیە لەسەری. چونکە ئەو گەردن ئازادکردنە کاری چاکەیەو، وازهێنانە لە ماف. بۆیە کابرا سەرپشکە تێیدا. بەڵام زیاتر سونەت وەهایە کە گەردنی ئازاد بکات، تاوەکو برا موسوڵمانەکەی خۆی لە سەرەنجامی خراپی ئەو تاوانە ڕزگار بکاتو، خۆشی پاداشتی گەورەی دەست بکەوێت، وەکو لێخۆشبوونی خواییو، خۆشەویستی خوای گەورە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ [آل عِمْرَان: ١٣٤] {ئەوانەی ڕقی خۆیان دەخۆنەوەو، لە خەڵکی دەبوورن، خوای گەورەش چاکەکارانی خۆش دەوێت}.

جا ڕێگەی پاکبوونەوەی دڵی بە لێبوردن لە کەسە غەیبەتکارەکە ئەوەیە، کە بیری خۆی بخاتەوە، تازە ئەو کارە ڕوویداوەو، هیچ ڕێگەیەکیش نیە بۆ لابردنی. بۆیە نابێت پاداشتی ئەم کارە لە دەستی خۆم دەرکەمو، دەبێت برا موسوڵمانەکەشم ڕزگار نەکەم. چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَمَنْ صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ﴾ [الشُّوْرَى: ٤٣] واتە: {بەڕاستی ئەو کەسەی ئارام دەگرێتو، لە

خـەڵکی دەبووریێـت، ئـەو کـارەی دەیکـات کـارێکی هـەرە گـەورەو بـەنرخ‌و مەردانەیە}.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ﴾ [الْأعْرَاف: ١٩٩] واتە: {کارو ڕەوشتی جوانی خەڵکی قبوڵ بکەو، فەرمانیش بە چـاکە بکـەو، خۆت لـە نەفامان لادەو پشتیان تیّ بکە}.

هەروەها ئایەتی تری هاووێنەی ئەمانە گەلێك زۆرن.

لـە حەدیسی (صَحِيْح)یشدا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) فەرموویـەتی: «وَاللهُ فِيْ عَوْنِ الْعَبْدِ، مَا كَانَ الْعَبْدُ فِيْ عَوْنِ أخِيْهِ».[1] واتـە: "خـوای گەورە لـە پشتیوانی بەندەدایە، تا ئەو لـە پشتیوانی برای ئاینی خۆیدا بێت".

ئیمامی (شَافِعِيّ)ش (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویـەتی: "ئـەو کەسـە شـەیتانە، کـە داوای ڕازیبوونی لێدەکرێت‌و، ڕازی نابێت".

زانایانی پێشـینەش (وەك لـە دیـوانی ئیمـامی شـافعیدا هـاتوە) لـەم هـۆنراوەدا فەرمویانە:

قِيْلَ لِيْ: قَدْ أسَاءَ إلَيْكَ فُــلانٌ     وَمُقَامُ الْفَتَى عَلَــى الــذُّلِّ عَــارُ

قُلْتُ: قَدْ جَاءَنَا وَأحْدَثَ عُذْراً     دِيَةُ الــذَّنْبِ عِنْــدَنَا الِاعْتِــذَارُ

واتە: پێم وترا: فلانە کەس خراپـەی کـردوە بەرامبـەرت‌و، مانـەوەی مـرۆڤیش لەسەر زەلیلی عەیبەیەو ئابڕووچـوونە!! منـیش وتم: ئـەو هـات بۆلامـان‌و عـوزرو پۆزشی هێنایەوە، تۆڵەو خوێنی تاوانیش لای ئێمە بریتیە لـە عوزرو پۆزش هێنانەوە.

جا بۆچوونە ڕاستەکە هەر ئەمەیە کە ئێمە باسمـان کـرد، سـەبارەت بـە هانـدان لەسەر گەردن ئازاد کردن لە غەیبەت کردن.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٧٤ / بە ژمارە: ٢٦٩٩.

سەبارەت بەوەش کە لە زانای پایەبەرز (سَعِيْد)ی کوڕی (مُسَيِّب)ـەوە هاتوە، کە فەرموویەتی: "گەردنی ئەو کەسە ئازاد ناکەم، کە ستەمی لێ کردوم". وە ئەوەش کە لە زانای پایەبەرز (ابْنُ سِيْرِيْن)ـەوە هاتوە، کە فەرموویەتی: "من لێم حەرام نەکردوە، تا بۆی حەڵاڵ بکەم. چونکە خوا غەیبەتی لەو کەسە حەرام کردوە، بۆیە منیش هەرگیز ئەو شتە حەڵاڵ ناکەم، کە خوای گەورە حەرامی کردوە". ئەمە بۆچوونێکی لاوازە، یان هەڵەیە. چونکە ئەو کەسەی گەردنی کابرا ئازاد دەکات، شتی حەرامی بۆ حەڵاڵ ناکات. بەڵکو دەست لە مافێکی خۆی هەڵدەگرێت بەسەر کابراوە. سەرەڕای ئەوەی کە چەندین دەقی قورئانو سونەتیش هاتون سەبارەت بەوەی کە لێبوردنو عەفو کردنو، دەست هەڵگرتن لە مافی تایبەتی کارێکی سونەتە. یان دەبێت مانای فەرمایشتەکەی (ابْنُ سِيْرِيْن) بەم جۆرە بکرێت: "من هەرگیز بە ڕەوای دانانێم کەس غەیبەتم بکات". کە ئەمەش مانایەکی ڕاستو دروستە. چونکە ئەگەر کەسێك بڵێت: "من ڕێگە دەدەم خەڵکی غەیبەتم بکەن" بەمە غەیبەت کردنی ئەو کەسە حەڵاڵ نابێت. بەڵکو حەرامەو نابێت هیچ کەسێك غەیبەتی کەسێکی تر بکات.

سەبارەت بەو حەدیسەش، کە دەفەرموێت: «أَيَعْجزُ أحَدُكُمْ أنْ يَكُونَ كَـ(أبِيْ ضَمْضَمٍ) كَانَ إذَا خَرَجَ مِنْ بَيْتِهِ، قَالَ: "إنِّيْ تَصَدَّقْتُ بِعِرْضِيْ عَلَى النَّاسِ"». ماناکەی ئەوەیە: (من داوای مافو تۆڵەی خۆم نە لە دنیاو نە لەدواڕۆژیشدا لەو کەسە ناکەم، کە ستەمی لێ کردوم). کە ئەمەش سوودی خۆی هەیە سەبارەت بە دەست هەڵگرتنو وازهێنان لەو مافە زەوتکراوەی کە بەر لە گەردن ئازاد کردنەکە هەبوە.

سەبارەت بەو مافانەش، کە دواتر پەیدا دەبن، ئەوە پێویستیان بە گەردن ئازاد کردنێکی تازە هەیە. تەوفیقیش تەنها بەدەستی خوایە.

## باسی فیتنەیی کردن (النَّمِيْمَة)

پێشتر باسی حەرامی فیتنەیی کردنو بەڵگەکانیو ئەو هەڕەشانەشمان کرد کە لەسەری هاتبوون. هەروەها باسی ئەوەشمان کرد کە فیتنەیی مانای چیە. بەڵام باسەکە بە کورتی بوو. بۆیە ئێستە زیاتر ڕوونی دەکەینەوە.

پێشەوای پایەبەرز (أَبُو حَامِد)ی (غَزَالِيّ) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: (نَمِيْمَة) بەزۆری تەنها بۆ ئەوە بەکار دەهێنرێت کە کەسێك قسەی کەسێك بگوازێتەوە بۆلای کەسە قسە لەسەرکراوەکە. وەکو ئەوەی بڵێت: "فلانە کەس لەبارەی تۆوە وای وت".

بەڵام (نَمِيْمَة) تایبەت نیە بەوەوە. بەڵکو پێناسەکەی ئەوەیە، کە شتێك ئاشکرا بکرێتو، ئاشکراکردنەکەشی ناپەسەندو خراپ بێت، ئیتر ئایا کەسە لێوە نقڵکراوەکە، یان کەسە بۆلا نقڵکراوەکە، یان کەسێکی تر پێی ناخۆش بێت. هەروەها گرنگ نیە کە بە قسە بێت، یان بە نوسین، یان بە هێما، یان بە ئاماژە، یان بە شتێکی لەو جۆرە. هەروەها شتە گواستراوەکە قسە بێت، یان کردەوە، عەیبەو نەنگی بێت، یان شتێکی تر.

بۆیە حەقیقەتی (نَمِيْمَة) بریتیە لە: ئاشکراکردنو بڵاوکردنەوەی نهێنیو، دادڕینی پەردە لەسەر ئەو شتانەی کە ئاشکراکردنیان خراپو ناپەسەندە.

دەبێت مرۆڤی موسوڵمان بێدەنگ بێت سەبارەت بە هەموو ئەو شتانەی دەیانبینێتو، پەیوەندیان بە خەڵکیەوە هەیە، مەگەر شتێکی وەها بێت کە گێڕانەوەکەی سودی موسوڵمانێك، یان لادانی تاوانێکی تێدا بێت. بۆیە ئەگەر کەسێکی بینیماڵێکی خۆی دەشاردەوە، ئەویش باسی کرد، ئەوە (نَمِيْمَة)یە.

ئیمامی (غَزَالِيّ) فەرموویەتی: ئەو کەسەش کە فیتنەییەکی بـۆ دەهێنرێـتو، پێـی دەوترێـت: "فلاّنـە کـەس وای لـەبارەی تـۆوە وای وت"، شـەش شـت پێویسـتن لـەسەری:

- یەکەم: باوەڕ بە کەسەکە نەکات. چونکە کەسی فیتنە بە فاسق دادەنرێتو، فاسقیش خەبەری لێ وەرناگیرێت.
- دوەم: نەهی لێ بکات لـەو کارەو، ئامۆژگاری بکاتو، تێیشی بگەیەنێت کـە کارێکی خراپ دەکات.
- سێیەم: لـەبەر خاتری خوا ڕق لـەو کەسە هـەڵبگرێت کـە فیتنەییەکـەی بـۆ هێناوە. چونکە ئەو کەسە خوای گـەورەش ڕقێتـی لێـیو، ڕق لێبوونـەوەش لـەبەر خاتری خوا واجبە.
- چـوارەم: گومـانی خـراپ نـەبێت بەرامبـەر بـەو کەسـەی قسـەکەی لێـوە نقلّکراوەکە. چونکە خوای گەورە فەرموویـەتی: ﴿اجْتَنِبُوا كَثِيراً مِنَ الظَّنِّ﴾ [الْحُجُرَات: ١٢].
- پێنجەم: نابێت گێڕانەوەی قسەکە پاڵنەر بێت بۆ سـیخوڕی کـردنو گـەڕان بەشوێن ڕاستیو ناڕاستیەکەیدا. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلا تَجَسَّسُوا﴾ [الْحُجُرَات: ١٢].
- شەشەم: وەکو نەهی لـە کابرای قسەهێن دەکـات کـە ئـەو کـارە نـەکات، نابێت خۆیشی قسە بهێنێتو ببات.

دەگێڕنەوە کە پیاوێك باسی پیاوێکی تری کردوە بۆ پێشەوای پایەبـەرز (عُمَر)ی کوڕی (عَبْـدُالْعَزِيْز) (خـوای لێ ڕازی بێـت)، ئـەویش فەرموویـەتی: "ئەگـەر دەتـەوێت تەماشای قسەکەت دەکـەین، جـا ئەگـەر درۆت کردبێـت، ئـەوە بـەر ئـەم ئایەتـە دەکەویت: ﴿إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا﴾، ئەگەر ڕاستیشت کردبێـت، ئـەوە بـەر ئەم ئایەتە دەکـەویت: ﴿هَمَّازٍ مَشَّاءٍ بِنَمِيمٍ﴾. ئەگـەر دەشـتەوێت لێـت دەبـوورین.

پیاوەکەش عەرزی کرد: "ئەی فـەرمانڕەوای ئیمانـداران، داوای لێبـوردن دەکـەم، هەرگیز ناگەڕێمەوە بۆ ئەو کارە".

کەسێکیش نوسراوێکی نارد بۆلای (صَاحِب)ی کوڕی (عَبَّاد)، هانیدابوو لـەسەر بردنی ماڵی هەتیوێك، کە ماڵێکی زۆر بوو. ئەویش لـە پشتی نوسراوەکەوە نوسـی: "فیتنەیی -باوەکو ڕاستیش بێت- کـارێکی ناشـیرین‌و قێزەونـە. کـابرای مـردووش (واتە: باوکی هەتیوەکە) خوا ڕەحمی پێ بکات‌و، هەتیوەکەش خوا جێگەی باوکی بۆ پڕ بکاتەوەو، ماڵەکەش خوا بەرەکەتی تێ بخات‌و زیاتری بکـات‌و، کەسـی فیتنـەش خوا لـە ڕەحمەتی خۆی دووری بخاتەوە".

## باسی نەهی کردن لە گواستنەوەی قسە بۆ فەرمانڕەواو دەسەڵاتداران، ئەگەر لەبەر پێویستی نەبێت، وەکو ترسی خرا پەیەك یان شتێکی لەو جۆرە

بۆمان ڕیوایەت کراوە لـە هەردوو کتێبەکەی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا، لـە هاوەڵی خۆشەویسـت (ابْـنُ مَسْـعُوْد)ەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویـەتی: «لا يُبَلِّغْنِيْ أَحَدٌ منْ أصْـحَابِيْ عَنْ أحَدٍ شَيْئاً، فَإِنِّيْ أُحِبُّ أنْ أَخْرُجَ إِلَيْكُمْ، وَأَنَا سَلِيْمُ الصَّدْرِ».[1] واتە: "بـا هیچـکام لـە هاوەڵانم لـەبارەی کەسی ترەوە قسەم بۆ نەهێنن. چونکە من پـێم خۆشـە کاتێـك دێمە دەر بۆلاتان‌و، دڵـم ساف‌و بێگەرد بێت‌و، هیچی تێدا نەبێت".

---

(١) بروانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٨١ / بە ژمـارە: ٤٨٦٠، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٧١٠ / بـە ژمارە: ٣٨٩٦. ئیمامی (تِرْمِذِيّ) بە لاوازی داناوە.

## باسی نەهی کردن لە تانەدان لەو نەسەبانەی، کە بە زاهیری شەرع سابت بوون

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولاً﴾ [الإسْرَاء: ٣٦] واتە: {شوێنی شتێك مەكەوە، كە زانیاریت لەبارەیەوە نیە، چونكە بەڕاستی هێزی بیستن‌و هێزی بینین‌و دڵ، هەموو ئەمانە پرسیار لە خاوەنەكانیان دەكرێت لەبارەیانەوە}.

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «اثْنَتَانِ فِي النَّاسِ هُمَا بِهِمْ كُفْرٌ: الطَّعْنُ فِيْ النَّسَبِ، وَالنِّيَاحَةُ عَلَى الْمَيِّتِ». واتە: "دوو كار لەناو خەڵكیدا هەن، كە لە كاری كافرەكانن: تانەدان لە نەسەب‌و، شین‌وزاری لەسەر مردوو".[1]

## باسی نەهی كردن لە شانازی كردن‌و خۆهەڵكێشان

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَلَا تُزَكُّوا أَنْفُسَكُمْ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقَى﴾ [النَّجم: ٣٢] واتە: {جا ئێوەش خۆتان بە پاك‌و بێ تاوان دامەنێن، چونكە خوا لە هەموو كەس زاناترە، كە كێ لەخوا دەترسێت‌و، خۆی لە تاوان دەپارێزێت}.

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە صەحیحی موسلیم‌و لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و لە غەیری ئەوانیشدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عِيَاض)ی كوڕی (حِمَار)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِنَّ اللهَ تَعَالَى أَوْحَى إِلَيَّ: أَنْ تَوَاضَعُوا، حَتَّى لا يَبْغِيَ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ، وَلا يَفْخَرَ أَحَدٌ

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٨٢ / بە ژمارە: ٦٧.

عَلَى أحَدٍ».[1] واته: "خوای گەورە وەحیی بۆ کردووم، کـە خـاکیو خۆبەکـەمزان بن، بەجۆرێك کە هیچ کەسێك ستەمو ناهەقی لــە کەســی تـر نـەکاتو، کەسـیش شانازی بەسەر کەسی تردا نەکات".

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢١٩٨ / بە ژمارە: ٢٨٦٥، وَسُنَنُ أَبِــيْ دَاوُد / ٢ / ٦٩٠ / بە ژمارە: ٤٨٩٥.

## باسی نەهی کردن لە دەربڕینی دڵ خۆشی و شادومانی بە گیرۆدەبوونی کەسێکی موسوڵمان

بۆمـان ڕیوایـەت کـراوە لـە کتێبەکـەی ئیمـامی (تِرْمِـذِيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (وَاثِلَة)ی کـوڕی (أَسْقَع)ـەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویـەتی: «لا تُظْهِرِ الشَّـمَاتَةَ لِأَخِيْـكَ، فَيَرْحَمُهُ اللهُ، وَيَبْتَلِيْكَ». واتە: "شادەکامی و خۆشحاڵی بە تێکەوتن و لێقەومانی بـرای دینی خۆت دەرمـەبڕە، ئـەگینا خـوای گـەورە ڕەحـم بـەو دەکـات و، تـۆ گـیرۆدە دەکات".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

## بەچاوی سووک تەماشا کردنی موسوڵمانان و، گاڵتە پێکردنیان کارێکی حەرام و ناڕەوایە

- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿الَّذِينَ يَلْمِزُونَ الْمُطَّوِّعِينَ مِـنَ الْمُـؤْمِنِينَ فِـي الصَّدَقَاتِ وَالَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ سَخِرَ اللهُ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ [التَّوبَة: ٧٩] واتە: {ئەو دووڕوانەی تانەو تەشەر لەو باوەڕدارانە دەدەن کـە خـەیرو صـەدەقە زۆر دەکـەن و، دەڵـێن بـۆ ڕیابـازی دەیکـەن، هەروەها تانەو تەشەر لـەو باوەڕدارانـە دەدەن، کـە بێجگـە لـە ڕەنجەشـانی خۆیان هیچ شك نابەن، جا گاڵتەیان پێ دەکەن و، توانجیـان لێ دەگـرن، کـە لات و نەدارن، ئەوانە خوای گەورە گاڵتەیان پێ دەکات و، تۆڵەی ئەو تانەو تەشەرو گاڵتەکردنەیان لێ دەکاتـەوەو، سـزایەکی ئـازاراویش چاوەڕوانیان دەکات}.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٦٦٢ / بە ژمارە: ٢٥٠٦.

- هەروەها فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِنْ قَوْمٍ عَسَى أَنْ يَكُونُوا خَيْرًا مِنْهُمْ وَلَا نِسَاءٌ مِنْ نِسَاءٍ عَسَى أَنْ يَكُنَّ خَيْرًا مِنْهُنَّ وَلَا تَلْمِزُوا أَنْفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ﴾ [الحُجُرَات: ١١] واتە: {ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، با هیچ کۆمەڵە پیاوێك گاڵتە بە هیچ کۆمەڵە پیاوێکی تر نەکەن، چونکە ڕەنگە گاڵتەپێکراوەکان لە گاڵتەکەرەکان باشتربن‌و، با هیچ کۆمەڵە ئافرەتێکیش گاڵتە بە هیچ کۆمەڵە ئافرەتێکی تر نەکەن، چونکە ڕەنگە گاڵتەپێکراوەکان لە گاڵتەکەرەکان باشتربن، هەروەها غەیبەتی یەکتری مەکەن‌و، نازناوی خراپ‌و ناشیرینیش بۆ یەکتر بەکارمەهێنن}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَيْلٌ لِكُلِّ هُمَزَةٍ لُمَزَةٍ﴾ [الهُمَزَة: ١] واتە: {لەناوچوون‌و سزا بۆ هەموو ئەو کەسانەی غەیبەتی خەڵکی دەکەن‌و، بۆ هەموو ئەو کەسانەش تانەو تەشەر لە خەڵکی دەدەن}.

سەبارەت بەو حەدیسە (صَحِيْح)انەش، کە دەربارەی ئەم باسە هاتون، ئەو لەوە زۆرترن کە بژمێردرێن. هەروەها کۆدەنگی ئومەتیش لەسەر ئەوە دامەزراوە، کە ئەو کارە کارێکی حەرامە. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لاَ تَحَاسَدُوا، وَلاَ تَنَاجَشُوا، وَلاَ تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَدَابَرُوا، وَلاَ يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ، وَكُونُوا عِبَادَ اللهِ إِخْوَانًا. الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ، لاَ يَظْلِمُهُ، وَلاَ يَخْذُلُهُ، وَلاَ يَحْقِرُهُ. التَّقْوَى هَا هُنَا» واتە: "حەسوودی بەیەکتر مەبەن‌و، زەم بەسەر مامەڵەی یەکتردا مەکەن‌و، ڕقتان لەیەکتر نەبێت‌و، پشت لەیەکتر هەڵمەکەن‌و، کەستان مامەڵە بەسەر مامەڵەی کەسی تردا نەکات‌و، بەندەی خودا برای یەکتر بن. موسوڵمان برای موسوڵمانە، ستەمی لێ ناکات‌و، لەکاتی پێویستدا پشتی تێ ناکات‌و، بەچاوی سووکەوە تەماشای ناکات. تەقواو لەخواترسانیش ئا لێرەدایە" سێ جار ئاماژەی بۆ دڵی کرد لەناو سنگیداو، پاشان فەرمووی: «بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنَ

الشَّرِّ أَنْ يَحْقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ. كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ: دَمُهُ وَمَالُهُ وَعِرْضُهُ».[١] واتە: " ئەوەندە بەسە بۆ خراپی کەسێك، کە بەچاوی سووکەوە تەماشای برایەکی موسوڵمانی خۆی بکات. هەموو شتێکی موسوڵمان لەسەر موسوڵمان حەرامە: خوێن‌و ماڵ‌و نامووسی".

منیش دەڵێم: بەڕاستی ئەم حەدیسە گەلێك سودو کەڵکی گەورەی تێدایە بۆ کەسێك، کە بە وردی بیر لە ماناکەی بکاتەوە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «لا يَدْخُل الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِيْ قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ». واتە: "ئەو کەسە ناچێتە بەهەشتەوە، کە بە ئەندازەی مسقاڵە زەڕەیەك خۆبەگەورەزانین لە دڵیدا بێت". جا پیاوێك عەرزی کرد: "پیاو حەز دەکات جل‌وبەرگ‌و نەعل‌و پێڵاوەکەی جوان بن". پێغەمبەریش فەرمووی: «إِنَّ اللهَ جَمِيْلٌ، يُحِبُّ الْجَمالَ. الْكِبْرُ بَطَرُ الْحَقِّ، وَغَمْطُ النَّاسِ». واتە: "خوا خۆی خاوەنی سیفاتی جوانە‌و، جوانیشی خۆشدەوێت. خۆبەگەورەزانین بریتیە لە بەلاوەنان‌و پووچەڵ کردنەوەی حەق‌و ڕاستی‌و، بەچاوی سووك تەماشا کردنی خەڵکی".[٢]

منیش دەڵێم: وشەی (غَمْط) بە (غَمْص)یش ڕیوایەت کراوە‌و، هەردووکیشیان یەك مانایان هەیە، کە بریتیە لە: بەچاوی سووك تەماشا کردنی خەڵکی‌و، بەکەم زانینیان.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٩٨٦ / بە ژمارە: ٢٥٦٤.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٩٣ / بە ژمارە: ٩١.

## شایەتیدانی درۆ كارێكی زۆر حەرام و ناڕەوایە

- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَاجْتَنِبُوا قَوْلَ الزُّورِ﴾ [الْحَجّ: ٣٠] واتە: {خۆتان لە قسەی درۆ بەدوور بگرن}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولاً﴾ [الْإِسْرَاء: ٣٦] واتە: {شوێنی شتێك مەكەوە، كە زانیاریت لەبارەیەوە نیە، چونكە بەڕاستی هێزی بیستن و هێزی بینین و دڵ هەموو ئەمانە پرسیار لە خاوەنەكانیان دەكرێت لەبارەیانەوە}.

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو بَكْرَة) (نُفَيْع)ی كوڕی (حَارِث)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) سێ جار بە ئێمەی فەرموو: «ألا أُنَبِّئُكُمْ بأكْبَرِ الْكَبائِرِ؟». واتە: "ئایا خەبەرتان پێ نەدەم، كە گەورەترینی گوناهە گەورەكان كامەیە؟" ئێمەش عەرزمان كرد: "بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا، خەبەرمان پێ بدە". ئەویش فەرمووی: «الْإِشْرَاكُ باللهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ». واتە: "هاوەڵدانان بۆ خوا، یاخی بوون و بچڕاندنی پەیوەندی لەگەڵ باوك و دایكدا" (أَبو بَكْرَة) دەفەرموێت: "پێغەمبەر كە وای فەرموو، شانی دادابوو، ئەوجا ڕاست دانیشت و، فەرمووی:" «ألا وَقَوْلُ الزُّوْرِ، وَشَهَادَةُ الزُّوْرِ». واتە: "ئاگادار بن كە قسەی درۆ و، شایەتیدانی درۆش لە گەورەترینی گوناهە گەورەكانن". (أَبو بَكْرَة) دەفەرموێت: ئیتر هەر ئەم فەرمایشتەی دوبارەی دەكردەوە، هەتا وتمان: "خۆزگە بێدەنگ دەبوو".[1]

منیش دەڵێم: حەدیسێكی زۆر لەمبارەوە هاتوون و، ئەوەندەش بەسە كە من باسم كردن و، كۆدەنگیش هەیە لەسەر ئەوەی كە شایەتیدانی درۆ كارێكی حەرام و ناڕەوایە.

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٢٢٢٩ / بە ژمارە: ٥٦٣١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٩١ / بە ژمارە: ٨٧.

## نابێت بەهۆی بەخشین یان شتێکی ترموە منەت بەسەر کەسدا بکرێت

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُبْطِلُوا صَدَقَاتِكُمْ بِالْمَنِّ وَالْأَذَى﴾ [الْبَقَرَة: ٢٦٤]. واتە: "ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، خەیرو بەخششەکانتان بە منەتو ئازاردان پووچەڵ مەکەنەوە".

زانایانی تەفسیر فەرموویانە: واتە: (پاداشتەکەی پووچەڵ مەکەنەوە).

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبـو ذَرّ)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «ثَلاثَةٌ لا يُكَلِّمُهُمُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ، وَلا يُزَكِّيهِمْ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ». واتە: "سێ جۆر کەس خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا قسەیان لەگەڵدا ناکاتو، بەچاوی لوتفو خۆشەویستیەوە تەماشایان ناکاتو، لە تاوانو گوناهیش پاکیان ناکاتەوە". ئەوجا پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) سێ جار ئەو ئایەتەی (پێشەوەی) خوێندەوە. (أَبو ذَرّ)یش عەرزی کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو بەدبەختو خەسارۆمەندانە کێن؟" پێغەمبەریش فەرمووی: «الْمُسْبِلُ، وَالْمَنَّانُ، وَالْمُنَفِّقُ سِلْعَتَهُ بِالْحَلِفِ الْكَاذِبِ».[1] واتە: "ئەو کەسەی بە فیزو هەوا جلوبەرگی شۆڕ لەبەر دەکاتو دامێنی جلەکانی بە زەویدا دەخشێنێتو، ئەو کەسەی منەت بەسەر خەڵکیدا دەکات (تایبەت ئەوانەی چاکەیەکی لەسەریان هەیە)و، ئەو کەسەی شمەكو کوتاڵی خۆی بە سوێندی درۆ ساغ دەکاتەوە".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ١٠٢ / بە ژمارە: ١٠٦.

# نابێت نەفرین لە هیچ شتێك بكرێت

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ثَابت)ی كوڕی (ضَحَّاك)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت) -كە یەكێكە لەو هاوەڵانەی لەژێر درەختەكەدا بەیعەتیان بە پێغەمبەری خوا كردوە- ئەو فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لَعْنُ الْمُؤْمِنِ كَقَتْلِهِ».[1] واتە: "نەفرین كردن لە كەسی ئیماندار -لە تاواندا- وەكو كوشتنی وەهایە".

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لا يَنْبَغِي لِصِدِّيقٍ أنْ يَكُونَ لَعَّاناً».[2] واتە: "نابێت كەسی ڕاساڵۆ ڕاستگۆ نەفرینكار بێت‌و، دوعای دووركەوتنەوە لە ڕەحمی خوا لە كەس بكات".

دیسان بۆمان ڕیوایەت كراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو الدَّرْدَاء)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لا يَكُونُ اللَّعَّانُونَ شُفَعاءَ وَلا شُهَدَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ» [3] واتە: "ئەوانەی لە دنیادا نەفرین زۆر دەكەن، لە ڕۆژی قیامەتدا نابن بە تكاكارو، ناشبن بە شاهید لەسەر نەتەوەكانی تر (یان پلەی شەهیدیان نادرێتی)".

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَمُرَة)ی كوڕی (جُنْدَب)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لا تَلاعَنُوا بِلَعْنَةِ اللهِ وَلا بِغَضَبِهِ

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٦٤ / بە ژمارە: ٥٧٥٤، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ١٠٤ / بە ژمارە: ١١٠.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٠٥ / بە ژمارە: ٢٥٩٧.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٠٦ / بە ژمارە: ٢٥٩٨.

وَلا بِالنَّارِ». واته: "دوعای لەم جۆرە لەیەکتری مەکەن‌و، مەڵێن: نەفرینی خوات لێبێت، یان خوا غەزەبت لێ بگرێت، یان خوا بتخاتە ئاگری دۆزەخەوە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِـذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لَيْسَ الْمُـؤْمِنُ بِالطَّعَّـانِ، وَلا اللَّعَّـانِ، وَلا الْفَاحِشِ، وَلا الْبَـذِيْءِ». واتە: "ئیمانداری تەواو زۆر توانجدەر نیەو، زۆریش نەفرینکەر نیەو، خراپەکاریش نیەو، زمان پیسیش نیە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُـنَن)ی ئیمامی (أَبُـو دَاوُد)دا لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو الدَّرْدَاء)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا لَعَنَ شَيْئاً، صَعِدَتِ اللَّعْنَـةُ إِلَـى السَّمَاءِ، فَتُغْلَقُ أَبْوَابُ السَّمَاءِ دُونَهَا، ثُمَّ تَهْبِطُ إِلَى الْأَرْضِ، فَتُغْلَقُ أَبْوَابُها دُونَهَا، ثُـمَّ تَأْخُذُ يَمِيْناً وَشِمَالاً، فَإِذَا لَمْ تَجِدْ مَسَاغاً، رَجَعَتْ إِلَى الَّذِيْ لُعِنَ، فَإِنْ كَانَ أَهْلاً لِذَلِكَ، وَإِلاَّ رَجَعَتْ إِلَى قَائِلِها».[3] واتە: "بەندەی خوا ئەگەر نەفرینی لە شتێك کرد، نەفرینەکەی بەرزدەبێتەوە بۆ ئاسمان‌و، دەرگاکانی ئاسمانی بەڕوودا دادەخرێت. ئەوجا دادەبەزێت‌و دێتەخوارەوە بۆ سەر زەوی‌و، دەرگاکانی زەویشی بەڕوودا دادەخرێت. ئەوجا بەرەو لای ڕاست‌و، بەرەو لای چەپ. جا ئەگەر جێگەیەکی

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٩٥ / بە ژمارە: ٤٩٠٦، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٣٥٠ / بە ژمارە: ١٩٧٦.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٣٥٠ / بە ژمارە: ١٩٧٧.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٩٤ / بە ژمارە: ٤٩٠٥. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ڕشتەکەی جوانە. بڕوانە: فَتْحُ الْبَارِي / ١٠ / ٤٦٧.

نەبینیەوە، ئیتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسەی نەفرینەکەی لێ کراوە. جا ئەگەر شایانی نەفرینەکە بوو، ئەوە باشە، ئەگینا دەگەڕێتەوە بۆلای کەسە نەفرینکەرەکە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو کتێبەکەی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِـذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ لَعَنَ شَيْئاً لَيْسَ بِأَهْلٍ، رَجَعَتِ اللَّعْنَةُ عَلَيْهِ».[1] واتە: "ئەو کەسەی نەفرین لە شتێك بکاتو، شتەکەش شایانی نەفرینەکە نەبێت، ئەوا نەفرینەکە بۆ خۆی دەگەڕێتەوە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عِمْرَان)ی کوڕی (حُصَيْن)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: جارێك پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) لە یەکێك لە سەفەرەکانیدا بوو، ئافرەتێکیش لە پشتیوانان بەسواری حوشترێکەوە بوو، بەدەستیەوە وەڕەسو بێزار بووبوو، ئیتر نەفرینی لێ کردو، پێغەمبەریش گوێی لێبوو، بۆیە فەرمووی: «خُذُوا مَا عَلَيْهَا، وَدَعُوْهَا، فَإِنَّهَا مَلْعُوْنَةٌ».[2] واتە: "ئەوەی بەکۆڵی حوشترەکەوەیە بیبەنو، وازیش لەخۆی بهێنن با بڕوات، چونکە نەفرینی لێ کراوە".

(عِمْرَان) فەرموویەتی: ئێستەش ئەو حوشترە دەبینم، بەناو خەڵکیدا دەڕواتو، کەس ناچێتە ڕێگەی.

منیش دەڵێم: زانایان بۆچوونی جیاوازیان هەیە سەبارەت بە موسوڵمانێتیو هاوەڵێتی (حُصَيْن)ی باوکی (عِمْرَان). بۆچوونی دروست لەسەر ئەوەیە کە

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٩٥ / بە ژمارە: ٤٩٠٨، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٣٥٠ / بە ژمارە: ١٩٧٨. هەروەها شێخی (ابْنُ حِبَّان)یش لە صەحیحەکەی خۆیدا ڕیوایەتی کردوە. بڕوانە: صَحِيْحُ ابْنِ حِبَّان / ١٣ / ٥٥ / بە ژمارە: ٥٧٤٥.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٠٤ / بە ژمارە: ٢٥٩٥.

موسوڵمان بوەو، یەکێکیشە لە هاوەڵان. بۆیە منیش وتم: (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت).

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو بَرْزَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: جارێك کەنیزەکێك (یان کچێك) بەسەر حوشترێکەوە بوو، کە هەندێك شمەكو پێویستی خەڵکەکەشی لەسەر بوو، کوتوپڕ چاوی بە پێغەمبەری خوا کەوت (دروودی خوای لەسەر بێت)و، ڕێگەی نێوان شاخەکەش تەنگەبەر دەبێت (و ناتوانێت زوو بگاتە خزمەتی پێغەمبەر)، بۆیە بەتووڕەییەوە دەڵێت: "دەی حوشترەکە بڕۆ، ئەی خوایە نەفرینی لێ بکە" پێغەمبەریش فەرمووی: «لا تُصَاحِبُنَا نَاقَةٌ عَلَيْهَا لَعْنَةٌ». واتە: "با حوشترێکمان لەگەڵدا نەبێت، کە نەفرینی لێ کراوە".

لە ڕیوایەتێکیشدا هاتوە کە فەرموویەتی: «لا تُصَاحِبُنَا رَاحِلَةٌ عَلَيْهَا لَعْنَةٌ مِنَ اللهِ تَعَالَى».[1]

## باسێك: دروستە نەفرین لە کەسانی تاوانبار بکرێت بەبێ دەستنیشان کردنیان

لە چەندین حەدیسی (صَحِيْح)ی مەشهووردا هاتوە، کە:

- پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لَعَنَ اللهُ الْوَاصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ........».[2] واتە: "لەعنەتی خوا لەو ژنەی قژ دەداتە دەمی قژو، لەوەش داوا دەکات قژ بدرێتە دەم قژی.

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٠٥ / بە ژمارە: ٢٥٩٦.
(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢١٦ / بە ژمارە: ٥٥٨٩، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٧٦ / بە ژمارە: ٢١٢٢.

- هەروەها فەرموویەتی: «لَعَنَ اللهُ آكِلَ الرِّبَا». [1] واتە: "لەعنەتی خوا لە سووخۆر".
- هەروەها فەرموویەتی: «لَعَنَ اللهُ الْمُصَوِّرِيْنَ». [2] واتە: "لەعنەتی خوا لە وێنەکێشان".
- هەروەها فەرموویەتی: «لَعَنَ اللهُ مَنْ غَيَّرَ مَنارَ الْأَرْضِ». [3] واتە: "لەعنەتی خوا لەو کەسەی سنوری زەوی دەگۆڕێت".
- هەروەها فەرموویەتی: «لَعَنَ اللهُ السَّارِقَ يَسْرِقُ الْبَيْضَةَ». [4] واتە: "لەعنەتی خوا لەو دزەی هێلکەیەك دەدزێت".
- هەروەها فەرموویەتی: «لَعَنَ اللهُ مَنْ لَعَنَ وَالِدَيْهِ، وَلَعَنَ اللهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللهِ». [5] واتە: "لەعنەتی خوا لەو کەسەی لەعنەت لە باوكو دایكی خۆی دەكاتو، لەعنەتی خواش لەو کەسەی حەیوان بۆ غەیری خوا سەردەبڕێت".
- هەروەها فەرموویەتی: «مَنْ أحْدَثَ فِيْنَا (فِيْهَا) حَدَثاً، أوْ آوَى مُحْدِثاً، فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ وَالْمَلائِكَةِ وَالنَّاسِ أجْمَعِيْنَ». [6] واتە: "ئەو کەسەی کارێکی خراپ لەنێوماندا (لەناو شاری مەدینەی پیرۆزدا) دابهێنێت، یان دالّدەی کەسی

---

(١) دەقی ئەم حەدیسە لای ئیمامی موسلیم بەم جۆرە هاتوە: «لَعَنَ رَسُولُ اللهِ -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- آكِلَ الرِّبَا وَمُؤْكِلَهُ». بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٢١٨ / بە ژمارە: ١٥٩٧.

(٢) دەقی ئەم حەدیسە لای ئیمامی بوخاری بەم جۆرە هاتوە: «لَعَنَ النَّبِيُّ -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ-...... وَلَعَنَ الْمُصَوِّرِيْنَ». بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٠٤٥ / بە ژمارە: ٥٠٣٢.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٥٦٧ / بە ژمارە: ١٩٧٨.

(٤) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٦ / ٢٤٨٩ / بە ژمارە: ٦٤٠١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٣١٤ / بە ژمارە: ١٦٨٧.

(٥) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٥٦٧ / بە ژمارە: ١٩٧٨.

(٦) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٦٦١ / بە ژمارە: ١٧٧١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٩٩٤ / بە ژمارە: ١٣٦٦.

داهێنەری خراپە بدات، ئەوە لەعنەتی خواو فریشتەکانو هەموو خەڵکی لەسەر بێت".

- هەروەها فەرموویەتی: «اللَّهُمَّ، الْعَنْ رِعْلاً وَذَكْوَانَ وَعُصَيَّةَ عَصَتِ اللهَ وَرَسُوْلَهُ».[1] واتە: "خوایە لەعنەت بکە لە هۆزەکانی (رِعْل)و (ذَكْوَان)و (عُصَيَّة)، کە لەخواو پێغەمبەرەکەی یاخی بوون". جا ئەمانە سێ هۆزی عەرەب بوون.
- هەروەها فەرموویەتی: «لَعَنَ اللهُ الْيَهُوْدَ، حُرِّمَتْ عَلَيْهِمُ الشُّحُومُ، فَجَمَلُوْهَا، فَبَاعُوْهَا».[2] واتە: "لەعنەتی خوا لە جوولەکەکان، بەزو پیویان لێ حەرام کرابوو، ئەوانیش دەیانتاواندەوە، ئەوجا دەیانفرۆشت".
- هەروەها فەرموویەتی: «لَعَنَ اللهُ الْيَهُوْدَ وَالنَّصَارَى، اتَّخَذُوا قُبُوْرَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ».[3] واتە: "لەعنەتی خوا لە جوولەکەو گاورەکان، کە گۆڕو مەرقەدی پێغەمبەرەکانیان کردبوو بە پەرستگاو، نوێژو بەندایەتیان تێدا دەکرد".
- هەروەها فەرموویەتی: «لَعَنَ رَسُوْلَ اللهِ الْمُتَشَبِّهِينَ مِنَ الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ، وَالْمُتَشَبِّهَاتِ مِنَ النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ».[4] واتە: "پێغەمبەری خوا لەعنەتی کردوە لەو پیاوانەی خۆیان بە ئافرەتانەوە دەشوبهێنن و، لەو ئافرەتانەش کە خۆیان بە پیاوانەوە دەشوبهێنن".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٥٠٠ / بە ژمارە: ٣٨٦٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤٦٦ / بە ژمارە: ٦٧٥.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٢٧٥ / بە ژمارە: ٣٢٧٣، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٢٠٧ / بە ژمارە: ١٥٨٢.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤٤٦ / بە ژمارە: ١٢٦٥، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٧٦ / بە ژمارە: ٥٢٩.

(٤) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٠٧ / بە ژمارە: ٥٥٤٦.

جا هەموو ئەم حەدیسانە لە صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا هاتون، هەندێکیان لە هەردووکیاندا هاتوون‌و، هەندێکیشیان لە یەکێکیاندان. منیش لەبەر کورتی تەنها ئاماژەم پێدان‌و، باسی ڕێگەکانیانم نەکرد.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، گوێدرێژێکی بینی، ناوچاوانی وەکو نیشانە داخ کرابوو، ئەویش فەرمووی: «لَعَنَ اللَّهُ الَّذِيْ وَسَمَهُ».[1] واتە: "لەعنەتی خوا لەو کەسەی ئەو گوێدرێژەی داخ کردوە".

لە هەردوو صەحیحەکەشدا هاتوە، کە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر) (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، بەلای کۆمەڵە گەنجێکی قورەیشیدا تێپەڕی، کە باڵدارێکیان نابووەوە، تیریان پێوە دەنا. ئەویش فەرمووی: "لەعنەتی خوا لەو کەسەی ئەم کارەی کردوە". چونکە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لَعَنَ اللَّهُ مَنِ اتَّخَذَ شَيْئاً فِيْهِ الرُّوْحُ غَرَضاً».[2] واتە: "لەعنەتی خوا لەو کەسەی گیانلەبەرێك بە نیشانە دەنێتەوە".

## باسێك: {نەفرین کردن لە موسوڵمان کارێکی حەرامە}

بزانە کە بە کۆدەنگی موسوڵمانان نەفرین کردن لە موسوڵمانی خۆپارێز کارێکی حەرام‌و ناڕەوایەو، نەفرین کردنیش لەوانەی کە سیفاتی خراپیان هەیە کارێکی دروست‌و ڕەوایە. وەکو ئەوەی کە بڵێیت: "نەفرینی خوا لە ستەمکاران"،

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٧٣ / بە ژمارە: ٢١١٧.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢١٠٠ / بە ژمارە: ٥١٩٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٥٥٠ / بە ژمارە: ١٩٥٨.

"نەفرینی خوا لە بێباوەڕو کافرەکان"، "نەفرینی خـوا لــە جوولەکـەو گاورەکـان"، "نەفرینی خوا لە تاوانبارو فاسقەکان"، "نەفرینی خوا لە وێنەکێشان"و، لــە کەسـانی هاووێنەی ئەمانە، کە لە باسەکەی پێشوودا باسمان کرد.

سەبارەت بە نەفرین کردنیش لە کەسێکی دیاریکراو، کە تاوانێکی دیـاریکراوی ئەنجامداوە، وەکو کەسێکی جوولەکە، یان گاور، یان ستەمکار، یان داوێنپیس، یـان وێنەکێش، یان سووخۆر، ئەوە ڕواڵەتی حەدیسەکان وەهایـە، کـە کـارێکی حـەرام نیە. بەڵام ئیمـامی (غَزَالِيّ) ئامـاژەی بـەوە کـردوە کـە کـارێکی حەرامـە، مەگـەر دەرهەق بەو کەسەی، کە ئێمە بزانین بە کافری مردوە. وەکو (أَبو لَهَــب)و (أَبــو جَهْل)و (فِرْعَوْن)و (هَامَان)و هاووێنەکانیان.

ئـەوجا ئیمـامی (غَزَالِــيّ) فەرمـوویـەتی: چـونکە لەعنـەت کـردن بریتیـە لــە دورخستنەوە لە ڕەحمەتی خوای گەورەو، ئێمەش نازانین کە ژیانی ئەو تاوانبارە یـان ئەو کافرە بەچی کۆتایی دەبێت.

پاشان فەرموویەتی: سەبارەت بەو کەسانەش کە پێغەمبـەری خـوا (دروودی خـوای لەسەر بێت) تایبەتی لەعنەتی لێ کردوون، ئەوە دەکرێت ئـەو زانیبێتـی کـە بـەکافری دەمرن.

ئەوجا فەرموویەتی: دوعای شـەڕکردنیش لــە کەسـێك هـەر وەکـو نـەفرین لێ کردنی وەهایە، باوەکو ئەو کەسە ستەمکاریش بێت. وەکو ئەوەی کەسێك دوعـای لێ بکاتو بڵێت: "خوا لاشەی ساغ نەکات"، "خوا سەلامەتی نـەکات"، یـان هـەر دوعایەکی تری وەکو ئەمانە، کە هەموویان خراپن.

بە هەمان شێوە نەفرین کردن لە هەموو گیانلەبەرانو لــە بێگیانـەکانیش، هـەر کارێکی خراپە.

## باسێك: {نەفرین كردن لە شتێك، كە شایانی نەفرین لێ كردن نەبێت}

زانای پایەبەرز (أَبو جَعْفَر)ی (نَحَّاس) هێناویێتی لە یەكێكێك لــە زانایانــەوە، كــە فەرموویەتی: (ئەگەر مرۆڤێك نەفرین لـە شتێك بكات، كە شایانی نـەفرین لێ كـردن نەبێت، با یەكسەر بەشوێنیدا بڵێت: "مەگەر شایانی ئەو نەفرینە نەبێت").

## باسێك: {ئەو تەعبیرانەی كەسی ئامۆژگاریكەر بەكاریان دەهێنێت بۆ ئاگادار كردنەوەو هۆشیار كردنەوەی كەسانی تر}

هەر كەسێك فەرمان بەچاكە بكات‌و، نـەهی لــە خراپـە بكـات‌و، پـەروەردەی منداڵ بكات دروستە لـە ئەنجامدانی كارەیدا بە كەسی بەرامبەر بڵێت: هەی نەگبەت (وَيْلَكَ)، یان هەی فەقیرحاڵ (يَا ضَعِيْفَ الْحَالِ)، یان هــەی كــەم بایــەخ بــە نەفسـی خۆت (يَا قَلِيْلَ النَّظَرِ لِنَفْسِهِ)، یان هەی ستەمكار لە نەفسی خۆت (يَا ظَالِمَ نَفْسِــهِ)، یان شتێكی لەو جــۆرە، بــەجۆرێك ئــەوەی دەیڵێــت نەگاتــە ئاسـتی درۆ كـردن‌و، جنێویشی تێدا نەبێت، چی بە صەراحەت یان بــە كینایــە، یــان بــە (تَعْــرِيْض)، ئـیتر باوەكو قسەكەشی ڕاست بێت.

جا ئەو كارە كاتێك دروستە، كە مەبەست لێی پەروەردە كردن‌و ڕێگری كردن بێت لـە خراپە، هەروەها بۆ ئەوەیە كە قسەكە كاریگەری زیاتر بێـت لــە دەروونـی كەسە ڕووتێكراوەكەدا.

بۆمان ڕیوایەت كراوە لـە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لــە هــاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ــەوە (خوای لێ ڕازی بێـت)، كە پێغەمبەری خوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت)، پیاوێكی بینی، حوشترێكی لێدەخوڕی، كــە هێنــابووی –وەكــو دیــاری– لــە بەیتدا سەری ببڕێت. ئەویش پێی فەرموو: "كابرا سواری حوشترەكەبە". پیاوەكــەش عەرزی كرد: "هێناومە وەكو دیاری بۆ سەربڕین". ئەویش پێی فەرموو: "ســواریبە".

پیاوەکەش عەرزی کردەوە: "هێناومە وەکو دیاری بۆ سەربڕین". جا پێغەمبەر لە جاری سێیەمدا پێی فەرموو: "سواریبە هەی نەگبەت".[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو سَعِيْد)ی (خُـدْرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: جارێك ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بووین (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەویش شتێکی دابەش دەکرد. پیاوێکی هۆزی (بَنُو تَمِيْم)، کە پێی دەوترا (ذُو الْخُوَيْصِـرَةِ) عەرزی پێغەمبەری کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، لە دابەشکردنەکەدا دادپەروەربە!!!" پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «وَيْلَكَ، وَمَنْ يَعْدِلُ إِذَا لَمْ أَعْدِلْ».[2] واتە: "هەی نەگبەت، جا کێ دادپەروەر دەبێت، ئەگەر من دادپەروەر نەبم؟!".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَدِيّ)ی کوڕی (حَاتِم)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پیاوێك لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا وتاری دەداو، وتی: (مَنْ يُطِعِ اللهَ وَرَسُولَهُ، فَقَدْ رَشَدَ، وَمَنْ يَعْصِـهِمَا، فَقَدْ غَوَى). واتە: "ئەو کەسەی گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، ڕێی ڕاستی گرتۆتەبەرو، ئەو کەسەش بێگوێییان بکات، گومڕاو سەرگەردانە". پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «بِئْسَ الْخَطِيبُ أَنْتَ، قُلْ: وَمَنْ يَعْصِ اللهَ وَرَسُولَهُ».[3] واتە: "بەڕاستی تۆ وتاربێژێکی خراپیت! بڵێ: ئەو کەسەش بێگوێیی خواو پێغەمبەرەکەی بکات".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٦٠٦ / بە ژمارە: ١٦٠٤، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٩٦٠ / بە ژمارە: ١٣٢٢.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٣٢١ / بە ژمارە: ٣٤١٤، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٧٤٤ / بە ژمارە: ١٠٦٤.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٥٩٤ / بە ژمارە: ٨٧٠.

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ی کوڕی (عَبْدُالله)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە کۆیلەیەکی هاوەڵی خۆشەویست {(حَاطِب)ی کوڕی (أَبو بَلْتَعَة)} هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خواو، شکاتی لە (حَاطِب) کردو، وتی: "ئەی پێغەمبەری خوا، بەڕاستی (حَاطِب) دەچێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە!!!" پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: «كَذَبْتَ، لا يَدْخُلُها، فَإِنَّهُ شَهِدَ بَدْراً وَالْحُدَيْبِيَةَ».[1] واتە: "درۆت کرد، ناچێتە ئاگری دۆزەخەوە. چونکە بەشداری لە غەزای (بَدْر)و لە پەیماننامەی (حُدَيْبِيَة)دا کردوە".

هەروەها لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا ئەو فەرمایشتەی ئیمامی (أَبو بَكْر)ی (صِدِّيْق)مان بۆ ڕیوایەت کراوە، کە کاتێك بینیویێتی (عَبْدُالرَّحْمَن)ی کوڕی نانو خوانی نەداوە بە میوانەکان، ئەویش پێی فەرموە: (يَا غُنْثَرُ).[2] پێشتریش ئەم حەدیسەمان لە **((کتێبی ناوەکان))**دا بەدرێژی باس کرد.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، کە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر) (خوای لێ ڕازی بێت) بە کراسێکەوە نوێژی دەکردو، جلوبەرگەکانی تریشی لەلایدا دانرابوون. جا کەسێك عەرزی کرد: "ئەوە بۆچی وات کرد؟!" ئەویش فەرمووی: "بۆیە وام کرد تا نەزانی وەکو ئێوە ببینن". لە ڕیوایەتێکیشدا فەرموویەتی: "تا بێ عەقڵی وەکو تۆ ببینیت".[3]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٩٤٢ / بە ژمارە: ٢٤٩٥.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢١٦ / بە ژمارە: ٥٧٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٢٧ / بە ژمارە: ٢٠٥٧.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ١٣٩ / بە ژمارە: ٣٤٥، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٣٠٣ / بە ژمارە: ٣٠٠٨.

## نابێت بە هەڵسوكەوتی ڕەق و زبر مامەڵە لەگەڵ هەژاران و كەسانو هەتیوان و سواڵكەران و هاوێنەكانیاندا بكرێت، دەبێت بە قسەی نەرم و خۆبەكەمزانینەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بكرێت

- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَأَمَّا الْيَتِيمَ فَلا تَقْهَرْ * وَأَمَّا السَّائِلَ فَلا تَنْهَرْ﴾ [الضُّحَى: ٩ - ١٠]. واتە: {سەبارەت بە هەتیو، مامەڵەی خراپی لەگەڵدا مەكەو دەست بەسەرماڵیدا مەگرەو، سەبارەت بە سواڵكەریش ڕووگرژ مەبە لەگەڵیدا، بەڵكو پێویستیەكەی بۆ جێبەجێ بكە}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِمْ مِنْ شَيْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِمْ مِنْ شَيْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ الظَّالِمِينَ﴾ [الْأَنْعَام: ٥٢]. واتە: {ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو كەسانە لە كۆڕی خۆت دەرمەكە، كە بەیانیان و ئێواران لە خوا دەپاڕێنەوەو، مەبەستیان دەستخستنی ڕەزامەندی خوایە، چون حیسابی ئەوان لەسەر تۆ نیەو، حیسابی تۆش لەسەر ئەوان نیە، جا ئەگەر دەریان بكەیت دەچیتە ڕیزی ستەمكارانەوە}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ﴾ [الْكَهْف: ٢٨]. واتە: {ئەی پێغەمبەری خودا، خۆت لەگەڵ ئەو كەسانەدا ڕابگرە، كە بەیانیان و ئێواران لە خوا دەپاڕێنەوەو، مەبەستیان دەستخستنی ڕەزامەندی خوایە، نەكەیت چاوت لەوان وەربچەرخێنیت و بۆ كافرەكان بڕوانیت}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَاخْفِضْ جَنَاحَكَ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ [الْحِجْر: ٨٨] واتە: {باڵی میهرەبانی و نەرمونیانی بۆ باوەڕداران ڕابخە}.

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَائِذ)ی كوڕی (عَمْرو)ەوە، كە جارێك (أَبُو سُفْيَان) هات بەسەر كۆمەڵێكدا، كە هەر سێ هاوەڵی خۆشەویست (سَلْمَان)و (صُهَيْب)و (بِلال)یان تێدابوو. جا ئەوانیش

فەرموویان: "هێشتا شمشێری خوا نەگەیشتۆتە گەردنی دوژمنی خوا". ئیمامی (أَبــو بَكْر)یش (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: "ئەوە چۆن قسەی وا بەرامبەر بـە ڕیشسـپیو گەورەی قورەیش دەکەن؟!" ئەوجا تەشریفی هێنا بۆ خزمـەتی پێغەمبـەرو، خەبـەری پێدا. پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: «يَا أَبَــا بَكْــرٍ، لَعَلَّــكَ أَغْضَبْتَهُمْ!! لَئِنْ كُنْتَ أَغْضَبْتَهُمْ، لَقَدْ أَغْضَبْتَ رَبَّكَ».[1] واتــە: "ئـەی (أَبــو بَكْــر)، ڕەنگـە ئـەو هاوەڵانـەت تـووڕە کردبێـت!! خـۆ ئەگـەر تـووڕەت کـردبن، ئـەوە بەدڵنیاییەوە پەروەردگارت تووڕە کردوە". ئەوجا ئیمـامی (أَبو بَكْر) تەشـریفی هێنـا بۆلایانو، فـەرمووی: "براکـانم، ئایـا مـن تـووڕەم کـردن؟" ئـەوانیش فـەرموویان: "نەخێر".

## باسی چەند وشەیەك، کە باکارهێنانیان ناپەسەندە

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (سَهْل)ی کوڕی (حُنَيْف)و لە دایکە (عَائِشَة)وە (خوا لە هـەردووکیان ڕازی بێت)، ئەوانیش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کـە فەرموویـەتی: «لا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: "خَبُثَتْ نَفْسِي"، وَلَكِنْ لِيَقُلْ: "لَقِسَتْ نَفْسِي"».[2] واتە: (هیچ یەکێك لە ئێوە با نەڵێت: "نەفسم پیس بوە" بەڵکو با بڵێت: "نەفسم خراپ بوە").

بۆشمان ڕیوایەت کـراوە لـە (سُــنَن)ی ئیمـامی (أَبــو دَاوُد)دا، بـە ڕشـتەیەکی (صَحِيْح)، لە دایکە (عَائِشَة)وە (خوای لێ ڕازی بێـت)، ئـەویش لـە پێغەمبـەری خـواوە

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٩٤٧ / بە ژمارە: ٢٥٠٤.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٨٥ – ٢٢٨٦ / بە هەردوو ژمارە: ٥٨٢٥ و ٥٨٢٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧٦٥ / بە هەردوو ژمارە: ٢٢٥٠ و ٢٢٥١.

(دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «لا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: "جَاشَتْ نَفْسِيْ"، وَلَكِنْ لِيَقُلْ: "لَقِسَتْ نَفْسِيْ"». [1]

زانایان فەرموویانە: هەردوو وشەی (لَقِسَتْ)و (جَاشَتْ) بەمانای خراپبوون دێن. هەروەها فەرموویانە: وشەی (خَبُثَتْ)یش بۆیە ناپەسەندە، لەبەر لەفزەکەی (کە ناپەسەندە موسوڵمان بەکاری بهێنێت بۆ خۆی).

پێشەوای پایەبەرز (أَبو سُلَيْمَان)ی (خَطَّابِيّ) فەرموویەتی: هەردوو وشەی (لَقِسَتْ)و (خَبُثَتْ) یەك مانایان هەیە. وشەی (خَبُثَ)ش بۆیە ناپەسەندە، لەبەر لەفزەکەی‌و، قێزەونی‌و ناشیرینی ئەو ناوەی لێی دروست دەکرێت (واتە: خَبِيْث). پێغەمبەری خواش هاوەڵانی فێرکردوە، کە وشەی جوان بەکار بهێنن‌و، واز لە وشەی خراپ‌و ناشیرین بهێنن.

## باسێك: {ناونانی ترێ بە (كَرْم) ناپەسەندە}

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «يَقُولُونَ: الْكَرْمَ. إِنَّمَا الْكَرْمُ قَلْبُ الْمُؤْمِنِ». واتە: "ئەوان دەڵێن: (كَرْم)، (كَرْم)یش بریتیە لە دڵی مرۆڤی ئیماندار".

لە ڕیوایەتێکی ئیمامی موسلیمیشدا هاتوە، کە فەرموویەتی: «لا تُسَمُّوا الْعِنَبَ الْكَرْمَ، فَإِنَّ الْكَرْمَ الْمُسْلِمُ». واتە: "بە ترێ مەڵێن: (كَرْم)، چونکە (كَرْم) بریتیە لە مرۆڤی موسوڵمان".

لە ڕیوایەتێکی تریشیدا فەرموویەتی: «فَإِنَّ الْكَرْمَ قَلْبُ الْمُسْلِمِ». [1]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧١٣ / بە ژمارە: ٤٩٧٩.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (وَائِل)ی کوڕی (حُجْر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «لا تَقُولُوا: الْكَرْمَ، وَلَكِنْ قُولُوا: الْعِنَبَ وَالْحَبَلَةَ».(٢)

منیش دەڵێم: وشەی (حَبَلَة) بە (حَبْلَة)ش خوێنراوەتەوە، وەکو شێخی (جَوْهَرِيّ)و غەیری ئەویش فەرموویانە.

مەبەستیش لەم حەدیسە بریتیە لە نەهی کردن لە ناونانی ترێ بە (کَرْم)، کە لە سەردەمی پێش ئیسلامدا وای پێ دەوتراو، هەندێك لە خەڵکیش ئەمڕۆ هەر وای پێ دەڵێن. پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) نەهی کردوە لەو جۆرە ناوبردنە.

ئیمامی (خَطَّابِيّ)و غەیری ئەویش لە زانایان فەرموویانە: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لەوە ترساوە، کە جوانیو سەرنجڕاکێشی ناوی (کَرْم) پاڵنەرێك بێت بۆ خەڵکی، کە ئەو مەیو عارەقە بخۆنەوە وا لە بەروبوومەکەی ئەو وەرگیراوە. بۆیە ئەو ناوەی لێ دارنی. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## باسێك: {عەیبدار کردنی خەڵکیو خۆهەڵکێشانو شانازی کردن بەسەریاندا}

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٨٧ / بە ژمارە: ٥٨٢٩، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧٦٣ / بە ژمارە: ٢٢٤٧.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧٦٤ / بە ژمارە: ٢٢٤٨.

فەرموویەتی: «إِذَا قَالَ الرَّجُلُ: "هَلَكَ النَّاسُ" فَهُوَ أَهْلَكُهُمْ».[(١)] واتە: "ئەگەر کەسێك بڵێت: خەڵکی تیاچوون، ئەوە خۆی لەوان تیاچووترە، یان ئەو فەوتاندوونی".

منیش دەڵێم: وشەی (أَهْلَكُهُمْ) بە (أَهْلَكَهُمْ)یش ڕیوایەت کراوەو، مەشهوورەکەشیان بریتیە لەوەی یەکەمیان. لە ڕیوایەتێکیشدا کە لە کتێبی (حِلْيَةُ الْأَوْلِيَاءِ)دا بۆمان ڕیوایەت کراوە، لە باسی ژیانی زانای پایەبەرز (سُفْيَان)ی (ثَوْرِيّ) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، لەوێ پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: «فَهُوَ مِنْ أَهْلَكِهِمْ».[(٢)] ئەم ڕیوایەتەش پاڵپشتی بۆچوونە مەشهوورەکە دەکات.

پێشەوای پایەبەرز (أَبو عَبْدِالله)ی (حُمَيْدِيّ) لە کتێبی (الْجَمْعُ بَيْنَ الصَّحِيْحَيْن)دا فەرموویەتی: لە ڕیوایەتی یەکەمدا یەکێك لە ڕاویەکان فەرموویەتی: من نازانم، گوایە (أَهْلَكَهُمْ)ـە، یان (أَهْلَكُهُمْ)؟ شێخی (حُمَيْدِيّ) فەرموویەتی: مەشهوورەکەیان بریتیەر لە (أَهْلَكُهُمْ). واتە: ئەو لە خەڵکەکە تیاچووترە. ئەوجا فەرموویەتی: ئەوەش کاتێکە کە قسەکەی بە شێوازی عەیبدارکردنو بەچاوی سووك تەماشا کردنی خەڵکیو، خۆفەزڵدان بێت بەسەریاندا. چونکە ئەو ئاگای لەوە نیە کە خوای گەورە چی نهێنیەکی هەیە لە دروستکراوەکانی خۆیدا. جا شێخی (حُمَيْدِيّ) فەرموویەتی: هەندێك لە زانایانمان ئاوایان فەرموە.[(٣)]

شێخی (خَطَّابِيّ)ش فەرموویەتی: مانای حەدیسەکە ئەوەیە، کە ئەو کەسە بەردەوام عەیبە لە خەڵکی دەگرێتو، باسی خراپەیان دەکاتو، دەڵێت: خەڵکی خراپ بوونو، تیاچوونو، شتی لەو جۆرە. جا کە ئاوای کرد، ئیتر ئەو لەوان تیاچووترە. واتە: حاڵی لەوان خراپترە، بەهۆی ئەو گوناهباربوونەوە کە تووشی دەبێت لە ئەنجامی عەیبدارکردنو باسکردنی خەڵکی بە خراپە. بەڵکو ڕەنگە

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٢٤ / بە ژمارە: ٢٦٢٣.

(٢) بڕوانە: حِلْيَةُ الْأَوْلِيَاءِ وَطَبَقَاتُ الْأَصْفِيَاء / ٧ / ١٤١.

(٣) بڕوانە: الْجَمْعُ بَيْنَ الصَّحِيْحَيْن / ٣ / ٢٨٧ / بە ژمارە: ٢٦٥٢.

**هەندێك جاریش ئەو كارە وای لێ بكات، كە بەخۆی سەرسام بێتو، خۆی وا ببینێت، كە فەزڵی هەیە بەسەر خەڵكیداو، ئەو لەوان باشترە، بۆیە ئەویش تیادەچێت.**

**ئەمەش فەرمایشتی شێخی (خَطَّابِيّ)ـە، كە لە كتێبی (مَعَـالِمُ السُّـنَن)دا بۆمان ڕیوایەت كراوە.**

**هەروەها ئەم حەدیسەمان لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)دا بۆ ڕیوایەت كراوە، كە ئەو فەرموویەتی: شێخی (قَعْنَبِيّ) بۆی گێڕاینەوە لە ئیمامی (مَالِك)ـەوە، ئەویش لە (سَهْل)ی كوڕی (أَبُو صَالِح)ـەوە، ئەویش لە باوكیەوە، ئەویش لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە. پاشان شێخی (قَعْنَبِيّ) فەرموویەتی: ئیمامی (مَالِك) فەرموویەتی: ئەگەر كەسەكە ئەو قسە بكات وەكو خەفەت خواردن بۆ حاڵی خەڵكی ـ واتە: مەبەستی دینداری خەڵكی بوو ـ، ئەوە وا نازانم هیچ خراپەیەكی تێدا بێت. بەڵام ئەگەر وا بیڵێت، كە بەخۆی سەرسام بێتو، خەڵكی بە بچووكو سووك بزانێت، ئەوە كارێكی ناپەسەندەو، نەهیشی لێ كراوە.[1]**

**منیش دەڵێم: ڕشتەی ئەم تەفسیرو لێكدانەوەیە لەوپەڕی (صَحِيْح)یدایەو، لێكدانەوەكەش جوانترینو كورتترین لێكدانەوەیە، كە سەبارەت بە مانای حەدیسەكە وتراوە. بەتایبەتیش كە لە ئیمامی (مَالِك)ـەوە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت).**

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧١٤ / بە ژمارە: ٤٩٨٣.

## باسێك: {نابێت بوترێت: ئەوەی خوای گەورە ویستوویەتی و فلآنە کەسیش ویستوویەتی هەر وا دەبێت}

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)دا، بە ڕشتەیەکی (صَحِيح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (حُذَيْفَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «لا تَقُولُوا: "مَا شَاءَ اللهُ، وَشَاءَ فُلانٌ"، وَلَكِنْ قُولُوا: "مَا شَاءَ اللهُ، ثُمَّ شَاءَ فُلانٌ"».[1] واتە: "ئێوە مەڵێن: ئەوەی خوای گەورە ویستی و فلآنە کەسیش ویستی، هەر وا دەبێت. بەڵکو بڵێن: ئەوەی خوای گەورە ویستی لەسەر بوەو، پاشان فلآنە کەسیش دەیەوێت، هەر وا دەبێت".

شێخی (خَطَّابِيّ)و غەیری ئەویش فەرموویانە: ئەمە ڕێنموویی کردنە بۆ ڕەچاوکردنی ئەدەب. چونکە پیتی (وَاو) بۆ کۆکردنەوەو هاوبەشیەو، پیتی (ثُمَّ)ش بۆ (عَطْف) کردنە لەگەڵ بەشوێنیەکدا هاتن و هەبوونی ماوە لە نێوان دوو شتدا. بۆیە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) ڕێنموویی خەڵکی کردوە، کە ویست و ئیرادەی خوای گەورە پێش بخەن بەسەر ویستی کەسانی تردا.

لە زانای پایەبەرز (إِبْرَاهِيم)ی (نَخَعِيّ)شەوە هاتوە، کە ئەو پێی ناخۆش بوە کەسێك بڵێت: "پەنا بەخواو بەتۆش دەگرم". بەڵام بە دروستی زانیوە کە کەسێك بڵێت: "پەنا بەخواو پاشان بەتۆش دەگرم".

زانایان فەرموویانە: دەکرێت کەسێك بڵێت: "ئەگەر خوای گەورە پاشان فلآنە کەس نەبوایە فلآنە شتم دەکرد". بەڵام نابێت بڵێت: "ئەگەر خواو فلآنە کەس نەبوونایە.....".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧١٣ / بە ژمارە: ٤٩٨٠.

## باسێك: {تەنها خوای گەورە ڕۆزیدەرەو خاوەنی نیعمەتەکانە}

ناپەسەندە کەسێك بڵێت: "بارامنمان بەهۆی فلاَنە هەسارەوە بۆ باری". خۆ ئەگەر وا بڵێتو، باوەڕیشی وابێت کە هەسارەکە بارانەکەی باراندوە، ئەوە کافر دەبێت. بەلاَم ئەگەر وا بڵێتو، باوەڕیشی وابێت، کە خوای گەورە بارانەکەی باراندوەو، ئەو هەسارەیەش نیشانەی بارینی بارانەکەیە، ئەوە کافر نابێت. بەلاَم قسەیەکی ناپەسەندی کردوە. چونکە تەعبیرێکی بەکارهێناوە، کە خەڵکانی پێش ئیسلام بەکاریان دەهێنا، لەگەڵ ئەوەشدا کە تەعبیرێکی هاوبەشە لە نێوان ویستی کوفرو غەیری کوفریشدا.

پێشتریش لە باسی (**زیکری دوای باران بارین**)دا ئەو حەدیسە (صَحِيْح)ـەمان هێنا، کە پەیوەندی بەم باسەوە هەبوو.

## باسێك: {ئایا دەکرێت کەسێك بڵێت: ئەگەر فلاَنە کار ئەنجام بدەم، ئەوە من جوولەکەم یان گاورم؟}

حەرامە کەسێك بڵێت: "ئەگەر فلاَنە کار ئەنجام بدەم، ئەوە من جوولەکەم، یان گاورم، یان لە ئیسلام بەریم"، یان قسەیەکی لەو جۆرە بکات.

خۆ ئەگەر قسەیەکی وای کردو، مەبەستیشی ئەوەبوو کە دەرچوونی خۆی لە ئیسلام ببەستێتەوە بە ئەنجامدانی ئەو کارەوە، ئەوە دەست بەجێ کافر دەبێتو، بڕیارە شەرعیەکانی تایبەت بە کەسی لەدین هەڵگەڕاوە (مُرْتَدّ)ی بەسەردا جێبەجێ دەکرێت. بەلاَم ئەگەر مەبەستی ئەوە نەبوو، ئەوا کافر نابێت. بەڵکو کارێکی حەرامی ئەنجام داوە. بۆیە پێویستە لەسەری تەوبە بکات. تەوبەش ئەوەیە، کە دەمودەست واز لە تاوانەکە بهێنێتو، لە کردنیشی پەشیمان بێتو، بڕیاریش بدات

که هەرگیز نەگەڕێتەوە سەری‌و، داوای لێخۆشبوونیش لە خوای گەورە بکات‌و، (شایەتومان بهێنێت‌و) بڵێت: "لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، مُحَمَّدٌ رَسُوْلُ اللهِ".

## باسێك: {نابێت بە موسوڵمانێك بوترێت كافر}

### زۆر زۆر حەرامە کە موسوڵمانێك بە موسوڵمانێك بڵێت: "ئەی کافر!!!"

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا قَالَ الرَّجُلُ لِأَخِيْهِ: "يَا كَافِرُ"، فَقَدْ بَاءَ بِهَا أَحَدُهُمَا، فَإِنْ كَانَ كَمَا قَالَ، وَإِلاَّ رَجَعَتْ عَلَيْهِ».[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو ذَرّ)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە گوێی لە پێغەمبەری خوا بووە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ دَعَا رَجُلاً بِالْكُفْرِ، أَوْ قَالَ: "عَدُوَّ اللهِ"، وَلَيْسَ كَذَلِكَ، إِلاَّ حَارَ عَلَيْهِ». واتە: "ئەو کەسەی بە موسوڵمانێك بڵێت کافر، یان پێی بڵێت ئەی دوژمنی خوا، کەسەکەش وەها نەبێت، ئەوا قسەکەی دەگەڕێتەوە بۆ خۆی".[2]

جا ئەمە دەقی ڕیوایەتەکەی ئیمامی موسلیمەو، ڕیوایەتەکەی ئیمامی بوخاریش هەر بە هەمان مانایە.

وشەی (حَارَ)ش واتە: دەگەڕێتەوە.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٦٤ / بە ژمارە: ٥٧٥٣، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٧٩ / بە ژمارە: ٦٠.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٤٧ / بە ژمارە: ٥٦٩٨، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٧٩ / بە ژمارە: ٦١.

## باسێك: {نابێت دوعا بكرێت كە خوای گەورە ئیمان لە كەسێك بسێنێ}

ئەگەر موسوڵمانێك دوعای لە موسوڵمانێكی تر كردو، وتی: "خوایە ئیمانی لێ بسێنێ" ئەوا بەو دوعایە گوناهبار دەبێت. جا ئایا بە كردنی ئەو دوعایە كەسەكە كافر دەبێت یان نا؟ ئەوە دوو بۆچوونی هاوەڵانمانی لەسەرە، پێشەوای پایەبەرزی هاوەڵانمان قاضـي (حُسَـيْن) لـە فەتاواكەیدا هەردوو بۆچوونەكەی هێناوەو، دروستترینیشیان ئەوەیە كە نەخێر كافر نابێت.

جا دەكرێت بەڵگە بۆ ئەم بۆچوونە بەو فەرمایشتەی خوای گەورە بهێنرێتەوە، كە دوعایەكی حەزرەتی (مُوْسَى)ی تێدایە (دروودی خوای لەسەر بێت): ﴿رَبَّنَا اطْمِسْ عَلَى أَمْوَالِهِمْ وَاشْدُدْ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُوا حَتَّى يَرَوُا الْعَذَابَ الْأَلِيمَ﴾ [یونس: ٨٨].

بەڵام ئەم بەڵگەیە جێگەی تێبینیو سەرنجە، ئەگەرچی بشڵێین: شەرعی ئومەتانی پێش ئێمە شەرعی ئێمەشە.

## باسێك: {حوكمی ئەو كەسەی ناچاركراوە وشەی كوفر بە دەمیدا بێت}

ئەگەر هەندێك كافر زۆریان لە موسوڵمانێك كرد، كە بەناچاری وشەی كوفر بەدەمیدا بێتو، ئەویش وشەكەی وتو، دڵیشی پڕبوو لە ئیمان، ئەوە بە دەقی قورئانی پیرۆزو بە كۆدەنگی موسوڵمانانیش ئەو كەسە كافر نابێت.

جا ئایا باشتر وەهایە كە وشەكە بڵێتو، خۆی لە كوشتن بپارێزێت؟ ئەوە پێنج بۆچوونی هاوەڵانمانی لەسەرە:

- بۆچوونی دروست ئەوەیە كە ئارام بگرێت تا دەیكوژنو، وشەی كوفر بەدەمیدا نەیەت. بەڵگەكانی ئەم بۆچوونە مەشهوورن لە حەدیسە (صَحِيْح)ەكانو لە كارو كردەوەی هاوەڵانیشدا (خوایان لێ ڕازی بێت).
- دوەم: باشتر وایە وشەكە بڵێتو، خۆی لە كوشتن بپارێزێت.

- سێیەم: ئەگەر مانەوەی کەسەکە بەرژەوەندی موسوڵمانانی تێدابوو، بەوەی کە ئومێد هەبوو بەسەر دوژمناندا زاڵ بێت، یان بڕیارەکانی شەرعی ڕاپەڕێنێت، ئەوە باشتر وەهایە کە وشەکە بڵێت. بەڵام ئەگەر بەو جۆرە نەبوو، ئەوا خۆڕاگری لەسەر کوشتن باشترە.
- چوارەم: ئەگەر یەکێك بوو لە زانایان، یان لەو کەسانەی کە جێگەپێیان هەڵدەگیرا، ئەوا ئارام گرتن باشترە، نەوەکو خەڵکانی نەخوێندەوار بەو کارەی ئەو هەڵبخەڵەتێن.
- پێنجەم: پێویستە وشەکە بڵێت. چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾ [البَقَرَة: ١٩٥]. واتە: {بە دەستی خۆتان خۆتان مەفەوتێنن} . جا ئەم بۆچوونەیان هەر زۆر لاوازە.

## باسێك: {حوكمی ئەو كەسەی ناچاركراوە موسوڵمان بێت}

ئەگەر موسوڵمانێك زۆری لە کافرێك کردو، ئەویش بەناچاری شایەتومانی هێنا:

جا ئەگەر کافرێکی (حَرْبِيّ)و شەڕکەر بوو، ئەوا موسوڵمانبوونەکەی دروستە. چونکە زۆر لێ کردنو ناچارکردنەکەی بە حەق بوە. بەڵام ئەگەر کافرێکی (ذِمِّيّ)و پەنادراو بوو، ئەوا نابێت بە موسوڵمان. چونکە ئێمە لەسەر خۆمان پێویستمان کردوە، کە واز لەم جۆرە کافرە بهێنین. بۆیە زۆر لێ کردنی حەق نیە. بۆچوونێکی لاوازیش هەیە کە دەڵێت: بەو زۆر لێ کردنە دەبێت بە موسوڵمان. چونکە موسوڵمانەکە فەرمانی پێ کردوە، کە بێتە سەر ڕێگەی ڕاست.

## باسێك: {ئایا وتنی شایەتومان وەكو گێڕانەوە بە موسوڵمانبوون دانانرێت؟}

ئەگەر كەسێكی كافر بەبێ زۆر لێ كردن شایەتومانی هێنا، جا:

ئەگەر بە شێوازی گێڕانەوە بوو. بەوەی كە وتی: گوێم لێبوو فلانە كەس دەیوت: "لا إِلَهَ إلاَّ اللهُ، مُحَمَّدٌ رَسُوْلُ اللهِ"، ئەوە بە موسوڵمان دانانرێت.

بەڵام ئەگەر دوای داوا لێكردنی لەلایەن موسوڵمانێكەوە شایەتومانەكەی هێنا، بەوەی كە موسوڵمانێك پێی وتبوو: بڵێ: "لا إِلَهَ إلاَّ اللهُ، مُحَمَّدٌ رَسُوْلُ اللهِ"، ئەویش وتی، ئەوا بە موسوڵمان دادەنرێت. خۆ ئەگەر هەر خۆی سەرەتا وتی‌و، نە گێڕانەوە بوو، نە كەسیش پێی وتبوو، ئەوا مەزهەبی دروست‌و مەشهوور -كە زۆربەی هاوەڵانی لەسەرە- ئەوەیە كە بە موسوڵمان دادەنرێت. بۆچوونێكیش هەیە كە پێی وایە بە موسوڵمان دانانرێت. چونكە ڕەنگە قسەی موسوڵمانێكی گێڕابێتەوە.

## باسێك: {نابێت بە كەس بوترێت: جێگەنشینی خوا}

نابێت ئەو كەسەی كاروباری موسوڵمانان بەڕێوە دەبات پێی بوترێت: (خَلِيْفَةُ اللهِ) واتە: جێگەنشینی خوا". بەڵكو با پێی بوترێت: (الْخَلِيْفَة)و (خَلِيْفَةُ رَسُوْلِ اللهِ)و (أَمِيْرُ الْمُؤْمِنِيْن) واتە: "جێگەنشین"و، "جێگەنشینی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)"و، "فەرمانڕەوای بڕواداران".

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە كتێبی (شَرْحُ السُّنَّة)ی پێشەوای پایەبەرز (أَبُو مُحَمَّد)ی (بَغَوِيّ)دا، كە ئەو (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: هیچ خراپەیەكی تێدا نیە كە ئەو كەسەی كاروباری موسوڵمانان بەڕێوە دەبات پێی بوترێت: (أَمِيْرُ الْمُؤْمِنِيْن)و (خَلِيْفَة)، ئەگەرچی پێچەوانەی سیرەی پێشەوا دادپەروەرەكانیشە.

چونکه ئەو کەسە کاروباری بڕواداران بەڕێوە دەبات‌و، بڕوادارانیش گوێڕایەڵی لێ دەکەن.

هەروەها فەرموویەتی: دەکرێت پێی بوترێت: (خَلِيْفَة)، چونکە دەبێتە جێگرەوەی کەسی پێش خۆی‌و، لەجێگەی ئەودا دادەنیشێت.

هەروەها فەرموویەتی: هیچ کەسێك لەدوای باوکە (آدَم)و حەزرەتی (دَاوُد) (درودو سەلامی خوایان لەسەر بێت) پێی ناوترێت: (خَلِيْفَةُ الله).

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ [الْبَقَرَة: ٣٠].

هەروەها فەرموویەتی: ﴿يَا دَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ﴾ [ص: ٢٦]).[١]

لە زانای پایەبەرز (ابْنُ أَبِي مُلَيْكَة)شەوە هاتوە، کە پیاوێك بە ئیمامی (أَبُو بَكْر)ی (صِدِّيْق) وت: "ئەی جێگەنشینی خوا". ئەویش (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: "من جێگەنشینی (مُحَمَّد)م (درودی خوای لەسەر بێت)و، بەوەش ڕازیم".[٢]

پیاوێکیش بە پێشەوای پایەبەرز (عُمَر)ی کوڕی (عَبْدُالْعَزِيْز)ی وت: "ئەی جێگەنشینی خوا". ئەویش (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: "نەگبەت، زۆر ڕۆیشتیت!!! دایکم ناوی ناوم (عُمَر). خۆ ئەگەر بەو ناوە بانگت بکردمایە، قبووڵم بوو. پاشان کە گەورە بووم‌و، کونیەی (أَبُو حَفْص)م بۆ دانرا. خۆ ئەگەر بەویش بانگت

---

(١) بڕوانە: شَرْحُ السُّنَّة / ١٤ / ٧٥.

(٢) ئیمامی (أَحْمَد) ڕیوایەتی کردوە‌و، کەسەکانی ڕشتەی گێڕانەوەکەشی متمانەدارن، بەڵام ئەوەندە هەیە، کە (ابْنُ أَبِي مُلَيْكَة) لە سەردەمی ئیمامی (أَبُو بَكْر)دا نەژیاوە. واتە ڕشتەکەی بچڕانی تێدایە. بڕوانە: مُسْنَدُ الْإِمَامِ أَحْمَد / ١ / ٢٢٥ / بە ژمارە: ٥٩، ومَجْمَعُ الزَّوَائِد / ٥ / ١٨٤ / بە ژمارە: ٨٩٤١.

بکردمایە، هەر قبوولّم بوو. پاشان کردمتان بە سەرپەرشتیاری کاروبارتانو، ناوتان نام: فەرمانڕەوای بڕواداران. خۆ ئەگەر بەوەش بانگت بکردمایە، هەر بەس بوو".[1]

شەرعزانی مەزهەبی ئیمامی شافیعی، پێشەوای پایەبەرز (أَبُو الْحَسَن)ی (مَاوَرْدِيّ) بەصرەیی، لە کتێبی (الْأَحْكَامُ السُّلْطَانِيَّة)دا فەرموویەتی: پێشەوای موسوڵمانان پێی وتراوە جێگەنشین. چونکە بوەتە جێگەداری پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) لەناو ئومەتەکەیدا. پاشان فەرموویەتی: دروستە بوترێت: (خَلِيْفَة) بە ڕەهایی‌و، دروستیشە بوترێت: (خَلِيْفَةُ رَسُوْلِ الله).

هەروەها فەرموویەتی: زانایان بۆچوونی جیاوازیان هەیە دەربارەی بەکارهێنانی (خَلِيْفَةُ الله):

- هەندێکیان بە دروستیان داناوە. چونکە سەرپەرشتی جێبەجێ کردنی مافەکانی خوای گەورە دەکات لەناو دروستکراوەکانیداو، خوای گەورە خۆیشی فەرموویەتی: ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَائِفَ فِي الْأَرْضِ﴾ [فَاطِر: ٣٩].
- زۆربەی زانایانیش ڕێگریان لە بەکارهێنانی ئەو تەعبیرە کردوەو، فەرمووشیانە: هەر کەسێك وا بڵێت تاوانبار دەبێت.

جا ئەمە فەرمایشتی ئیمامی (مَاوَرْدِيّ) بوو.[2]

منیش دەڵێم: یەکەم کەسێك کە پێی وتراوە: (أَمِيْرُ الْمُؤْمِنِيْن) ئیمامی (عُمَر)ی کوری (خَطَّاب) بوە (خوای لێ ڕازی بێت). هیچ ناکۆکیەکیش لەم بارەوە لە نێوان زانایاندا نیە.

سەبارەت بەوەش کە هەندێك نەخوێندەواری نەزان وا گومان دەبەن، کە یەکەم جار بۆ(مُسَيْلَمَة)ی درۆزن بەکارهێنراوە، ئەوە هەڵەیەکی ڕاشکاوانەو نەزانینێکی

---

(١) بڕوانە: شَرْحُ السُّنَّة / ١٤ / ٧٦.

(٢) بڕوانە: الْأَحْكَامُ السُّلْطَانِيَّة / ٣٩.

زۆر ناشیرینەو، پێچەوانەی کۆدەنگی زانایانیشە. کتێبەکانیشیان بە ئاشکرا ئەوەی تێدایە، کە زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی، کە یەکەم کەسێك پێی وتراوە: (أَمِيْرُ الْمُؤْمِنِيْن) ئیمامی (عُمَر)ی کوری (خَطَّاب) بوە (خوای لێ ڕازی بێت).

پێشەوای پایەبەرز (أَبو عَمْرو)ی (ابْنُ عَبْدِالْبَرّ) لە کتێبی (الِاسْتِيْعَابُ فِيْ مَعْرِفَةِ الْأَصْحَاب)دا، باسی ئەوەی کردوە کە یەکەم جار بە ئیمامی (عُمَر) وتراوە: (أَمِيْرُ الْمُؤْمِنِيْن)و، هۆکارەکەیشی باس کردوەو، ئەوەیشی باس کردوە، کە بە ئیمامی (أَبو بَكْر) (خوای لێ ڕازی بێت) وتراوە: (خَلِيْفَةُ رَسُوْلِ الله) (دروودی خوای لەسەر بێت).[1]

## باسێك: {نابێت بە کەس بوترێت (شاهان شاه)}

زۆر حەرامە کە بە دەسەلاّتدارێك، یان بە هەر کەسێکی تر بوترێت: (شاهان شاه). چونکە ماناکەی بریتیە لە: پاشای پاشایانو، کەسیش بێجگە لەخوای گەورە بەو وەسفە وەسفدار ناکرێت.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «سوكو ڕسواترین ناو بەلای خوای گەورەوە ئەوەیە، کە پیاوێك خۆی ناوبنێت: (مَلِكُ الْأَمْلَاكِ)».[2]

زانای پایەبەرز (سُفْيَان)ی کوڕی (عُيَيْنَة)ش فەرموویەتی: (مَلِكُ الْأَمْلَاك) وەکو (شاهان شاه) وایە.

---

(١) بڕوانە: الِاسْتِيْعَابُ فِيْ مَعْرِفَةِ الْأَصْحَاب / ٣ / ١١٥٠ – ١١٥١.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٩٢ / بە ژمارە: ٥٨٥٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٨٨ / بە ژمارە: ٢١٤٣.

## باسێك سەبارەت بە بەكارهێنانی وشەی (سَيِّد)

بزانە كە وشەی (سَيِّد) بۆ ئەو كەسە بەكار دەهێنرێت، كە گەورەی هۆزەكەی خۆیەتیو، پلەو پایەی لەوان بەرزترەو، بۆ كەسی فەرمانڕەواو پایەبەرزیش بەكار دەهێنرێت. هەروەها بۆ ئەو كەسە خۆڕاگرو ئارامگرەش بەكار دەهێنرێت، كە تووڕەبوون نایورووژێنێتو، بۆ كەسی بەڕێزو، بۆ خاوەنی شتو، بۆ مێردیش بەكار دەهێنرێت.

چەندین حەدیسیش دەربارەی بەكارهێنانی وشەی (سَيِّد) هاتوون بۆ كەسانی بەڕێزو پایەبەرز.

یەكێك لەوانە ئەو حەدیسەیە كە لە صەحیحی بوخاریدا بۆمان ڕیوایەت كراوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو بَكْـرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، حەسەنی كوڕی ئیمامی (عَلِيّ) لەگەڵ خۆیدا بردە سەر مینبەرەكەو، فەرمووی: «إِنَّ ابْنِي هَذَا سَيِّدٌ، وَلَعَلَّ اللهَ تَعَالَى أَنْ يُصْلِحَ بِهِ بَيْنَ فِئَتَيْنِ مِنَ الْمُسْلِمِيْنَ».[1] واتە: "بەڕاستی ئەم كوڕی منە سەیدو پایەبەرزە، ئومێدەوارم كە خوای گەورە دوو گرۆهی موسوڵمانانی پێ یەكبخاتەوە".

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە كاتێك هاوەڵی خۆشەویست (سَعْد)ی كوڕی (مُعَاذ) تەشریفی هێنا بۆ خزمەتی پێغەمبەر، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) بە پشتیوانانی فەرموو: «قُومُوا إِلَى سَيِّدِكُمْ، أَوْ

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٣٢٨ / بە ژمارە: ٣٤٣٠.

خَيْرِكُمْ».[1] واته: "هەستن بچن بەدەم سەیدو گەورەکەتانەوە، یان بچن بەدەم باشترینەکەتانەوە".

لە هەندێك ڕیوایەتدا بەم جۆرە هاتوەو، لە هەندێکیشیاندا تەنها بە (سَـــيِّدِكُمْ) هاتوەو، هیچ گومانو دوودڵیەکی تێدا نیە.[2]

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُــو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: هاوەڵی خۆشەویست (سَعْد)ی کوڕی (عُبَادَةَ) (خوای لێ ڕازی بێت) عەرزی پێغەمبەری کرد: "ئـەی پێغەمبـەری خـوا، ئەگـەر کەسێك پیاوێکی لەگەڵ ژنەکەی خۆیدا بینی، ئایا بیکوژێت؟" پێغەمبـەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) فـەرمووی: «انْظُرُوا (إِسْمَعُوا) إِلَى مَا يَقُــولُ سَــيِّدُكُمْ!».[3] واتـە: "سەیرکەن (گوێ بگرن) سەیدو گەورەکەتان چی دەڵێت!".

سەبارەت بەو نەهیەش، کە لەو حەدیسەدا هاتوە، وا بە ڕشتەیەکی (صَــحِيْح) بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)دا، لــە هــاوەڵی خۆشەویست (بُرَيْدَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبــەری خــوا (دروودی خــوای لەسـەر بێت) فەرموویــەتی: «لاَ تَقُولُوا لِلْمُنافِقِ سَيِّدٌ، فَإِنَّه إِنْ يَكُ سَيِّداً، فَقَدْ أَسْخَطْتُمْ رَبَّكُمْ – عَزَّ وَجَلَّ–».[4] واتە: "بە کەسی دووڕوو مـەڵێن سـەید، چـونکە ئەگـەر گـەورەی

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٥١١ / بە ژمارە: ٣٨٩٥، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٣٨٨ / بە ژمارە: ١٧٦٨.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١١٠٧ / بە ژمارە: ٢٨٧٨.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ١١٣٥ / بە ژمارە: ١٤٩٨.

(٤) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧١٣ / بە ژمارە: ٤٩٧٧.

کۆمەڵێکیش بێت (یان خاوەنیماڵو کۆیلەو کەنیزەکیش بێت)، ئەوا ئێوە بەو قسە پەروەردگارتان لەخۆتان دەڕەنجێنن.[1]

منیش دەڵێم: یەکخستنەوەو کۆکردنەوەی ئەم حەدیسانە بەوە دەبێت، کە قەیناکات بە ڕەهایی بوترێت: فلأنە کەس (سَیِّد)ە، یان بە کەسێك بوترێت: (یَا سَیِّدِيْ)، یان شتێکی لەو جۆرە، ئەگەر کەسە بە (سَیِّد)دانراوەکە کەسێکی پایەبەرزی چاکەکار بێت، ئیتر بەهۆی زانستەوە، یان بەهۆی خواپەرستیو دینداریەوە، یان بەهۆی شتێکی ترەوە. بەڵام ئەگەر کەسێکی فاسق بوو، یان تۆمەتبار بوو سەبارەت بە دینداریەکەی، یان شتێکی لەو جۆرە، ئەوا ناپەسەندە پێی بوترێت: (سَیِّد).

فەرمایشتێکی لەم جۆرەشمان لە پێشەوای پایەبەرز (أَبُو سُلَيْمَان)ی (خَطَّابِيّ)ـەوە بۆ ڕیوایەت کراوە، لە کتێبی (مَعَالِمُ السُّنَن)دا، سەبارەت بە چۆنێتی یەکخستنەوەو کۆکردنەوەی ئەم حەدیسانە.[2]

## باسێك: {چۆنێتی بانگردنی گەورە لەلایەن کۆیلەکەیەوەو، بانگردنی کۆیلەش لەلایەن گەورەکەیەوە}

ناپەسەندە کۆیلەیەك بە خاوەنەکەی بڵێت: (رَبِّيْ). بەڵکو دەتوانێت بڵێت: (سَیِّدِيْ). هەروەها دەتوانێت بڵێت: (مَوْلايَ).

---

(١) چونکە کەسی دووڕوو شایانی ئەو ڕێزو حورمەتە نیە. خۆ ئەگەر گەورەی خۆتان بێت، ئەوە زیاتر خواتان تووڕە کردوە. چونکە دەبێت حاڵی ئەو کۆمەڵە چۆن بێت، کە دووڕوویەکیان کردوە بە گەورەی خۆیان؟! ئەوجا ئەگەر گەورەی هیچ کۆمەڵێك نەبوو، ئەوە دووبارە زیاتر خواتان تووڕەکردوە. چونکە لەلایەك بەکارهێنانی وشەکە درۆیەو لەجێگەی خۆیدا نیەو، لەلایەکیشەوە وەکو وتمان: کەسەکە شایانی ئەو ڕێزو حورمەتە نیە.

(٢) بڕوانە: مَعَالِمُ السُّنَن / ٤ / ١٥٥.

هـەروەها ناپەسـەندە خاوەنەکـەش بـە کۆیلەکـەی بڵێـت: (عەبدەکـەم، کەنیزەکەکەم). بەڵام دەتوانێت بڵێت: (کوڕەکەمو کچەکەم) یان (غولامەکەم).

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «لا يَقُلْ أَحَدُكُمْ: "أَطْعِمْ رَبَّكَ"، "وَضِّئْ رَبَّكَ"، "اسْقِ رَبَّكَ. وَلْيَقُلْ: "سَيِّدِي وَمَوْلايَ"، وَلا يَقُلْ أَحَدُكُمْ: "عَبْدِي، أَمَتِي"، وَلْيَقُلْ: "فَتَايَ، وَفَتَاتِي، وَغُلامِي"».[1] واتە: "با کـەس لـە ئێـوە نـەڵێت: خـواردن بـدە بـە (رَبّ)ـەکەت، یان دەستنوێژی بۆ بگـرە، یـان ئـاوی بـدەرێ. بـەڵکو بـا بڵێـت: (سَيِّدِي)و (مَوْلايَ). با کەسیش لە ئێـوە نـەڵێت: (کۆیلەکـەم)، (کەنیزەکەکـەم). بەڵکو با بڵێت: (کوڕەکەم)، (کچەکەم)، (غولامەکەم)".

لە ڕیوایەتێکی ئیمامی موسلیمیشدا هاتوە، کە فەرموویەتی: «وَلا يَقُلْ أَحَدُكُمْ: "رَبِّي"، وَلْيَقُلْ: "سَيِّدِي وَمَوْلايَ"».

لە ڕیوایەتێکی تریشدا هاتوە، کە فەرموویـەتی: «لا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: "عَبْدِي، وَأَمَتِي"، فَكُلُّكُمْ عَبِيدٌ، وَلا يَقُلِ الْعَبْدُ: "رَبِّي"، وَلْيَقُلْ: سَيِّدِي». واتـە: "بـا کـەس لـە ئێوە بە کۆیلەکەی خۆی نەڵێت: (بەندەکەم)و (کەنیزەکەکەم). چـونکە هـەمووتان بەندەی خوان. با کۆیلەش بە گەورەکەی خۆی نەڵێت: (رَبِّي). بـەڵکو بـا بڵێـت: (سَيِّدِي)".

لە ڕیوایەتێکی تریشدا هاتوە، کە فەرموویـەتی: «لا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: "عَبْدِي، وَأَمَتِي"، كُلُّكُمْ عَبِيدُ اللهِ، وكُلُّ نِسائِكُمْ إِمَاءُ اللهِ، وَلَكِنْ لِيَقُلْ: "غُلامِي، وَجَارِيَتِي، وَفَتَايَ، وَفَتَاتِي"».

---

(١) بروانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٩٠١ / بە ژمارە: ٢٤١٤، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧٦٥ / بە ژمارە: ٢٢٤٩.

منيش دەڵێم: زانایان فەرموویانە: وشەی (الرَّبّ) بە ئـەلف‌و لامـەوە تایبەتـە بـە خوای گەورەوەو، تەنها بۆ ئەو بەکار دەهێنرێت. بەڵام لەگـەڵ دانـەپاڵ (إضَـــافَة)دا بۆلای شتێك دەكرێت بوترێت: (رَبُّ الْمَال)و (رَبُّ الدَّار)و، شتی تریش.

یەكێك لـە نمونەكانی ئەم حاڵەتە ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوایە (درودی خوای لەسەر بێت)، لـەو حەدیسە (صَحِيْح)ـەدا، كە سەبارەت بە حوشترە وەنبوەكە هاتوەو، فەرموویەتی: «دَعْهَا، حَتَّى يَلْقَاهَا رَبُّهَا».[1]

هەروەها ئەو حەدیسە (صَحِيْح)ـەش، كـە پێغەمبـەری خـوا (درودی خوای لەسـەر بێت) فەرموویەتی: «حَتَّى يُهِمَّ رَبَّ الْمَالِ مَنْ يَقْبَلُ صَدَقَتَهُ».[2]

هەروەها ئەو فەرمایشتەی ئیمامی (عُمَر)یش (خوای لێ رازی بێت)، كە لـە صەحیحدا هاتوەو، فەرموویەتی: (رَبَّ الصُّرَيْمَةِ وَرَبَّ الْغُنَيْمَةِ).[3] واتە: (خاوەنی گەلـە حوشترو گەلـە مەڕێكی كەم، كە ژمارەیان لـە دەوروبەری بیست بۆ چل سەردا بێت)

هـەروەها بـەكارهێنانی تـری هاووێنـەی ئەمانـە لـە حەدیسـدا گـەلێك زۆرو مەشهوورن.

هەروەها شەرعزانانیش بەكارهێنانی لەم جۆرەیان زۆرە.

زانایان فەرموویانە: بۆیە ناپەسەندە كە كۆیلە بە خاوەنەكـەی بڵێـت: (رَبِّـــيْ). چونكە ئەو لەفزە وا دەگەیەنێت كـە خاوەنەكـەی هاوبەشـی خـوای گەورەیـە لــە سیفەتی (      )دا.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤٦ / بە ژمـارە: ٩١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٣٤٦ / بـە ژمارە: ١٧٢٢.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٥١٢ / بە ژمارە: ١٣٤٦، وصَحِيْحُ مُسْـلِم / ٢ / ٧٠١ / بە ژمارە: ١٥٧.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١١١٣ / بە ژمارە: ٢٨٩٤.

سەبارەت بە حەدیسی: «حَتَّى يَلْقَاهَا رَبُّهَا»و، (رَبَّ الصُّرَيْمَة)و، هاووێنەکانیشیان، بۆیە بەو جۆرە بەکارهێنراون، چونکە حوشتر جێگەی تەکلیفی شەرعی نیەو، هەر وەکو (خانوو)و (ماڵ) وەهایەو، گومانیشی تێدا نیە، کە وتنی: (رَبُّ الْمَال)و (رَبُّ الدَّار) هیچ ناپەسەندیەکی تێدا نیە.

سەبارەت بەو فەرمایشتەی حەزرەتی (یُوْسُف)یش (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: ﴿اذْكُرْنِيْ عِنْدَ رَبِّكَ﴾ [یُوْسُف: ٤٢]. ئەوە بە دوو جۆر وەڵام دراوەتەوە:

- یەکێکیان ئەوەیە، کە حەزرەتی (یُوْسُف) بەو جۆرە قسەی لەگەڵ کابرای بەندکراودا کردوە، کە لێی تێی بگات. جا ئەم جۆرە بەکارهێنانەش لەبەر ناچاری دروستە. وەکو چۆن حەزرەتی (مُوْسَى) (دروودی خوای لەسەر بێت)، بە (سَامِرِيّ) فەرموو: ﴿وَانْظُرْ إِلَى إِلَهِكَ﴾ [طه: ٩٧]. واتە: (تەماشای ئەو شتە بکە، کە کردووتە بەخوای خۆت).
- وەڵامی دوەمیش ئەوەیە، کە ئەوە شەرعی ئومەتانی پێش ئێمەیە، شەرعی ئەوانیش نابێت بە شەرع بۆ ئێمە، ئەگەر لە شەرعەکەی خۆماندا پێچەوانەکەی هاتبوو. کە ئەمەش هیچ ڕاجیاییەکی تێدا نیە. بەڵام زانا ئوصولیەکان ڕای جیاوازیان هەیە دەربارەی ئەو شەرعەی پێش ئێمە، کە لە شەرعەکەی خۆماندا حوکمێکی هاووێنەی ئەو، یان پێچەوانەکەی نەهاتوە، ئایا دەبێت بە شەرع بۆ ئێمەش، یان نابێت؟

## باسێك: {سەبارەت بە ناپەسەندی وتنی (مَوْلاَيَ)}

پێشەوای پایەبەرز (أَبو جَعْفَر)ی (نَحَّاس) لە کتێبی (صِنَاعَةُ الْكِتَاب)دا فەرموویەتی: سەبارەت بە وشەی (الْمَوْلَى) ئێمە نازانین کە ڕاجیایی لە نێوان زانایاندا هەبێت لەوەدا، کە نابێت هیچ کەسێك بە هیچ کەسێکی تر بڵێت: (مَوْلاَيَ).

منیش دەڵێم: ئیمە لە باسەکەی پێشوودا ئەوەمان باسکرد، کە دروستە وشەی (مَوْلاَيَ) بەکاربهێنرێتو، هیچ دژایەتیەکیش لە نێوان فەرمایشتەکەی شێخی

(نَحَّاس)و ئەمەدا نیە. چونکە ئەوەی ئەو باسی کردوە بریتیە لە بەکارهێنانی وشەی (الْمَوْلَى) بە ئەلف‌ولامەوە.

هەروەها شێخی (نَحَّاس) فەرموویەتی: دروستە وشەی (سَيِّد) بۆ کەسێك بەکار بهێنرێت، کە فاسق‌و تاوانبار نەبێت، بەڵام دروست نیە وشەی (السَّيِّد) بە ئەلف‌ولامەوە بۆ غەیری خوا بەکار بهێنرێت.

جا بۆچوونی بەهێز ئەوەیە، کە هیچ خراپەیەکی تێدا نیە، هەردوو وشەی (الْمَوْلَى)و (السَّيِّد) بە ئەلف‌ولامەوە بەکاربهێنرێن، بەڵام بەو مەرجەی کە پێشتر باسمان کرد. خواش لە هەموو کەس زاناترە.

## نابێت قسە بە ڕەشەبا بوترێت:

پێشتر لە باسی (**ئەوەی لە کاتی هەڵکردنی ڕەشەبادا دەوترێت**) دوو حەدیسمان هێنا، کە دەربارەی نەهی کردن لە قسەوتن بە ڕەشەبا هاتبوون.

## باسێك: {ناپەسەندە قسە بە نەخۆشی (تا) بوترێت}

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، تەشریفی برد بۆلای (أُمُّ السَّائِب) یان (أُمُّ الْمُسَيَّب)و، فەرمووی: «ما لَكِ يَا أُمَّ السَّائِبِ -أَوْ يَا أُمَّ الْمُسَيِّب- تُزَفْزِفِينَ؟» واتە: "ئەوە چیتە لەرزت لێهاتوە؟" ئەویش عەرزی کرد: (تام هەیە، خوا بەرەکەتی تێ نەخات!) پێغەمبەریش فەرمووی: «لا تَسُبِّي الْحُمَّى، فَإِنَّها تُذْهِبُ خَطَايَا بَنِيْ آدَمَ، كَمَا يُذْهِبُ الْكِيْرُ خَبَثَ الْحَدِيْدِ».[1] واتە: "قەسە بە تا مەڵێ، چونکە ئەو تاوانو هەڵەکانی ئادەمیزاد لادەبات، وەکو چۆن کوورە یان مووشەدەمەی کوورەچی (واتە ئەو ئامرازەی کە فووی پێ دەکرێت لە کوورە) ژەنگو پیسایی ئاسن لادەبات".

منیش دەڵێم: وشەی (تُزَفْزِفِينَ) بە (تُرَفْرِفِينَ)ش ڕیوایەت کراوە، بەڵام ئەوەی یەکەمیان مەشهوورترە. جا یەکێك لەو زانایانەی باسی ئەم دوو شێوازە خوێندنەوەیان کردوە بریتیە لە شێخی (ابْنُ الْأَثِيْر).

خاوەنی کتێبی (مَطَالِعُ الْأَنْوَار)یش باسی (تُزَفْزِفِينَ)و (تُرَقْرِقِينَ)شی کردوە. بەڵام ئەوەی کە مەشهوورە تەنها (تُزَفْزِفِينَ)و (تُرَفْرِفِينَ)یە.

## باسێك سەبارەت بە قسەوتن بە کەڵەشێر:

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)دا، بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (زَيْد)ی کوڕی (خَالِد)ی (جُهَنِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لا

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٩٩٣ / بە ژمارە: ٢٥٧٥.

تَسُبُّوا الدِّيْكَ، فَإِنَّهُ يُوْقِظُ لِلصَّلاةِ».[1] واته: "قسه به كەڵەشێر مەڵێن. چونكە ئەو خەڵكی خەبەردەكاتەوە بۆ نوێژ".

## نابێت لە كاتی لێقەوماندا هاوار هاوارو ئەو قسە خراپانە بكرێت، كە لە سەردەمی نەفامیدا دەكران:

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الْخُدُوْدَ، وَشَقَّ الْجُيُوْبَ، وَدَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ». واته: "ئەو كەسە لە ئێمە نیە، كە (لەكاتی لێقەوماندا) بەڕوومەتی خۆیدا دەكێشێتو، یەخەی خۆی دادەدڕێتو، هاوار هاواری سەردەمی نەفامی دەكات".

لە ڕیوایەتێكیشدا بەم جۆرە هاتوە: «أَوْ شَقَّ أَوْ دَعَا».[2] (واته: ئەو كەسە لە ئێمە نیە، كە یەكێك لەو سێ كارە ئەنجام دەدات).

## باسێك: {ناپەسەندە بە مانگی (مُحَرَّم) بوترێت (صَفَر)}

ناپەسەندیشە بە مانگی (مُحَرَّم) بوترێت (صَفَر)، چونكە ئەوەش لە دابو نەریتی سەردەمی نەفامیە.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٤٨ / بە ژمارە: ٥١٠١.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤٣٦ / بە ژمارە: ١٢٣٥، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٩٩ / بە ژمارە: ١٠٣.

## باسێك: {نابێت داوای لێخۆشبوون بۆ كەسی كافرو بێباوەڕ بكرێت}

حەرامە داوای لێخۆشبوون‌و شتی لەو جۆرە بۆ ئەو كەسە بكرێت، كە بە كافری مردوە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَى مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ﴾ [التوبة: ١١٣]. واتە: {پێغەمبەرو باوەڕدارانیش بۆیان نیە داوای لێخۆشبوون بۆ ئەو كەسانە بكەن، كە هاوبەشیان بۆ خوای گەورە داناوە، باوەكو ئەو كەسانە خزم‌و كەس‌وكاری خۆشیان بن، دوای ئەوەی بۆیان دەركەوت، كە ئەوانە دۆزەخین}

هەروەها حەدیسیش بەم مانایە هاتوەو، موسوڵمانانیش كۆدەنگن لەسەری كە نابێت كاری لەو جۆرە بكرێت.

## باسێك: {نابێت بە ناهەق قسە بە موسوڵمان بوترێت}

حەرامە قسە بە موسوڵمان بوترێت بەبێ هۆیەكی شەرعی، كە ڕێگە بە قسەپێوتن بدات.

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، كە فەرموویەتی: «سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ».[1] واتە: "قسەوتن بە موسوڵمان لەڕێدەرچوون‌و فاسقێتیە".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٧ / بە ژمارە: ٤٨، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٨١ / بە ژمارە: ٦٤.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمو لە هەردوو کتێبەکەی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «الْمُسْتَبَّانِ مَا قَالا، فَعَلَى الْبَادِئِ مِنْهُمَا، مَا لَمْ يَعْتَدِ الْمَظْلُومُ». واتە: "ئەو دوو کەسەی قسەو جنێو بەیەکتر دەدەن تاوانی هەردووکیان لەسەر ئەوەیانە کە یەکەم جار دەستی پێکردوە، بەمەرجێك کەسە ستەم لێکراوەکە زیادەڕەوی نەکات".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[1]

## باسێك: {نابێت لەکاتی گفتوگۆو قسە کردن لەگەڵ خەڵکیدا هەندێك تەعبیری خراپ بەکاربهێنرێت}

یەکێك لەو تەعبیرە خراپانەی کە بەگوێرەی داب‌ونەریت بەکار دەهێنرێن، ئەوەیەکە کە کەسێك بە کەسێکی ناحەزی خۆی بڵێت: (هەی کەرە)، یان (هەی سابرێن)، یان (هەی سەگ)، یان شتێکی لەو جۆرە.

جا ئەم تەعبیرانە لە دوو ڕووەوە خراپن:

یەکەم ئەوەیە کە درۆن. دوەمیش ئەوەیە کە ئازاری بۆ کەسەکە تێدایە.

ئەمەش بە پێچەوانەی ئەوەی کە بە کەسێك بوترێت: (ئەی زاڵمی ستەمکار)، یان شتێکی لەو جۆرە. چونکە ئەمە چاوپۆشی لێکراوە لەکاتی بوونی کێشەو ناکۆکیدا. لەگەڵ ئەوەشدا کە بەزۆری ڕاستە. چونکە کەم کەس هەیە کە ستەمکار نەبێت، ئیتر لە نەفسی خۆی، یان لە کەسێکی تر.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٠٠ / بە ژمارە: ٢٥٨٧، وسُنَنُ أَبِـيْ دَاوُد / ٢ / ٦٩٠ / بە ژمارە: ٤٨٩٤، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٣٥٢ / بە ژمارە: ١٩٨١.

## باسێك: {نابێت بوترێت: هیچ مەخلوقێکم لەگەڵدا نیە بێجگە لە خوا}

شێخی (نَحَّاس) فەرموویەتی: هەندێك لە زانایـان بـە ناپەسـەندیان دانـاوە، کـە کەسێك بڵێت: (هیچ مەخلوقێکم لەگەڵدا نیە بێجگە لە خوا).

منیش دەڵێم: هۆی ناپەسەندیەکە بریتیە لـە ناشیرینی تەعبیرەکە لەو ڕووەوە، کـە ئەصڵ لە هەڵاوێرکردن (واتە: لە اسْتِثْنَاء)دا ئەوەیە کە (مُتَّصِل) بێت (واتە: هەڵاوێر کراوەکە لە ڕەگەزی هەڵاوێر لێکراوەکە بێت)، کە ئەمەش لێرەدا مەحاڵە. چونکە ئەوەی لەم تەعبیرەدا هەیە (اسْتِثْنَاء)ی (مُنْقَطِع)ـەو، وەکو ئەوە وەهایە کە وترابێت: (بەڵام تەنها خوام لەگەڵدایە). ئەمەش لەو فەرمایشتەی خوای گەورەوە وەرگیراوە، کە فەرموویـەتی: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَما كُنْـتُمْ﴾ [الْحَدِيْـد: ٤]. واتـە: {ئێـوە لـە هـەر شوێنێکدا بن خوای گەورەتان لەگەڵدایە}.

جا باشتر وەهایە کە لەبرێتی ئەوە بوترێـت: (کەسـم لەگەڵـدا نیـە بێجگـە لـە خوای گەورە).

هەروەها شێخی (نَحَّاس) فەرموویەتی: ناپەسەندە کە بوترێت: (لەسەر ناوی خوا دانیشە). بەڵکو با بوترێت: (بەناوی خواوە دانیشە).

## باسێك: {نابێت سوێند بە جۆرێك لە جۆرەکانی بەندایەتی کردن بخورێت}

شێخی (نَحَّاس) گێڕاوێتیەوە لە یەکێك لە زانایـانی (سَلَف)ـەوە، کـە ئـەو بـە ناپەسەندی دەزانێت کەسی ڕۆژووەوان بڵێت: (سوێند بەو مۆرەی کە لەسـەر دەمـم دراوە). بەڵگەشی بەوە هێناوەتەوە کە مۆر تەنها لەسەر دەمی کافرەکان دەدرێت.

جا ئەو بەڵگەیە جێگەی سەرنجو تێبینیە. بەڵکو بەڵگەی ناپەسەندیەکەی ئەوەیە، کە ئەو قسە سوێند خواردنە بەغەیر خوا. جا -ئەگەر خوای گەورە بیەوێت- لەم نزیکانەشدا باسی ئەوە دەکەین، کە نەهی کراوە لە سوێند خواردن بە غەیری خوا.

بۆیە دەتوانین بڵێین: ئەو قسەیە لەبەر دوو هۆ ناپەسەندە:

- یەکەم: لەبەر ئەو بەڵگەی کە باسمان کرد.
- دوەم: بێ ئەوەی پێویست بکات، کەسەکە دەری دەخات کە بەڕۆژوە. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## باسێك: {ناپەسەندە ئەو وشانە بەکار بهێنرێن، کە لەسەردەمی نەفامیدا بەکارهێنراون}

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)دا، لە (عَبْدُالرَّزَّاق)ـەوە، ئەویش لە (مَعْمَر)ەوە، ئەویش لە (قَتَادَة)وە، یان لە کەسێکی ترەوە، ئەویش لە هاوەڵی خۆشەویست (عِمْرَان)ی کوڕی (حُصَیْن)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: (ئێمە لە سەردەمی نەفامیدا دەمانوت "أَنْعَمَ اللهُ بِكَ عَیْناً" وە "أَنْعِمْ صَبَاحاً". جا کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام هات، ئیتر نەهیمان لێ کرا ئەو جۆرە تەعبیرانە بەکار بهێنین).

شێخ (عَبْدُالرَّزَّاق) فەرموویەتی: شێخ (مَعْمَر) فەرموویەتی: ناپەسەندە کەسێك بڵێت: "أَنْعَمَ اللهُ بِكَ عَیْناً". بەڵام هیچی تێدا نیە کە بڵێت: "أَنْعَمَ اللهُ عَیْنَكَ".[1]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِي دَاوُد / ٢ / ٧٧٩ / بە ژمارە: ٥٢٢٧.

منیش دەڵێم: ئیمامی (أَبو دَاوُد) ئەم حەدیسەی بەم جۆرە لە (قَتَادة)، یان لە کەسێکی ترەوە ڕیوایەت کردوە.

جا وەکو زانایانیش فەرموویانە: ئەم جۆرە حەدیسە بە (صَحِیْح) دانانرێت. چونکە ڕاستە کە (قَتَادة) کەسێکی متمانەدارە، بەڵام کەسەکەی تر کەسێکی نەناسراوە، جا دەگونجێت ئەویش حەدیسەکەی لە کەسێکی نەناسراوی ترەوە وەرگرتبێت. بۆیە حوکمی شەرع بەم جۆرە حەدیسە سابت نابێت. بەڵام وا باشترە کە مرۆڤی موسوڵمان خۆی لە بەکارهێنانی ئەم جۆرە تەعبیرە بپارێزێت، چونکە ڕەنگە حەدیسەکە (صَحِیْح) بێت[1]، سەرەڕای ئەوەی کە هەندێك لە زانایان حەدیسی کەسی نەناسراو دەکەن بەبەڵگە. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

(١) نەخێر ئەم حەدیسە (صَحِیْح) نیە، ئەگەرچی کەسەکانی ڕشتەکەشی متمانەداربن! چونکە وەکو شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ڕشتەکەی بچڕانی تێدایە. بڕوانە: فَتْحُ الْبَارِي / ١١ / ٤. منیش دەڵێم: بچڕانەکە لە نێوان (قَتَادة)و (عِمْرَان)دایە. چونکە (قَتَادة) نزیکەی هەشت ساڵ دوای وەفاتی (عِمْرَان) لەدایك بوە. کەواتە ناگونجێت حەدیسی لەو وەرگرتبێت. بڕوانە: سِيَرُ أَعْلَامِ النُّبَلاء / (عِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنِ الْخُزَاعِيُّ) / ٢ / ٥٠٨ – ٥١١ / بە ژمارە: ١٠٥، وە (قَتَادَةُ بْنُ دِعَامَةَ السَّدُوْسِيُّ) / ٥ / ٢٦٩ – ٢٧٠ / بە ژمارە: ١٣٢.

## نابێت دوو کەس بەیەکەوە چپە بکەن و، کەسێکی تریشیان لەگەڵدا بێت؛

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا كُنْتُمْ ثَلاثَةً، فَلا يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُوْنَ الْآخَرِ حَتَّى تَخْتَلِطُوا بِالنَّاسِ، مِنْ أَجْلِ أَنَّ ذَلِكَ يُحْزِنُهُ».[1] واتە: "ئەگەر ئێوە سێ کەس بوون، دوانتان بەیەکەوە چپە نەکەن و، کەسی سێیەمیش بەتەنها بێت، هەتا تێکەڵ بە خەڵکی دەبن. چونکە ئەو کارە کەسی سێیەم خەفەتبار و دڵتەنگ دەکات".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا كَانُوا ثَلاثَةً، فَلا يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُوْنَ الثَّالِثِ».[2]

هەروەها ئەم حەدیسەمان لە (سُنَن)ی (أَبُوْ دَاوُد)یشدا بۆ ڕیوایەت کراوەو، ئەو ئەمەشی بۆ زیاد کردوە: (أَبُو صَالِح) -ئەو کەسەیە کە حەدیسەکەی لە (ابْنُ عُمَر)ەوە ڕیوایەت کردوە- فەرموویەتی: عەرزی (ابْنُ عُمَر)م کرد: "ئەی ئەگەر چوار کەس بوون؟" ئەویش فەرمووی: "ئەگەر چوار کەس بوون قەیناکە زیانی نیە".[3]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣١٩ / بە ژمارە: ٥٩٣٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧١٨ / بە ژمارە: ٢١٨٤.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣١٨ / بە ژمارە: ٥٩٣٠، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧١٧ / بە ژمارە: ٢١٨٣.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٧٩ - ٦٨٠ / بە هەردوو ژمارە: ٤٨٥١ و ٤٨٥٢.

## نابێت هیچ ئافرەتێك، باسی جوانی لەش و لاری ئافرەتێکی تر بکات بۆ مێردەکەی خۆی، یان بۆ کەسێکی تر، ئەگەر لەبەر پێویستیەکی شەرعی نەبێت، وەکو ئارەزووی خواستن و هێنانی ئەو ئافرەتە، یان شتێکی لەو جۆرە:

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لا تُبَاشِرِ الْمَرْأَةُ الْمَرْأَةَ، فَتَصِفُهَا لزَوْجِهَا كَأَنَّهُ يَنْظُرُ إِلَيْها».[1] واتە: "نابێت ئافرەتێك تەماشای ئافرەتێکی تر بکات و دەست لە لاشەی بدات و، دواتر بەجۆرێك وەسفی بکات بۆ مێردەکەی خۆی، وەکو لەبەرچاوی بێت".

## باسێك: {ئەو کەسەی هاوسەرگیری کردوە ناپەسەندە پێی بوترێت: (بەخۆشی بەیەکەوە بژین و، منداڵیش لەنێوانتاندا پەیدا ببێت)}

ئەو کەسەی ژنی هێناوە ناپەسەندە پێی بوترێت: (بِالرِّفَاءِ وَالْبَنِيْنَ) واتە: (بەخۆشی بەیەکەوە بژین و، منداڵیش لەنێوانتاندا پەیدا ببێت). بەڵکو با پێی بوترێت: (بَارَكَ اللهُ لَكَ، وَبَارَكَ عَلَيْكَ)، وەکو لە ((**کتێبی هاوسەرگیری**))دا باسمان کرد.[2]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٢٠٠٧ / بە ژمارە: ٤٩٤٢. من لە صەحیحی موسلیمدا ئەم حەدیسەم نەبینیەوە!!!

(٢) ئێمەش لەوێ بەڵگەی ناپەسەندیەکەیمان هێنایەوە.

## باسێك: {نا پەسەندە لەكاتی تووڕەییدا ئامۆژگاری كەسی تووڕە بكرێت}

شێخی (نَحَّاس) گێڕاوێتیەوە لە زانای پایەبەرز، شەرعزانی ئەدیب، شێخ (أبو بَكْر) (مُحَمَّد)ی كوڕی (یَحْیَی)ی (صُوْلِيّ)، كە فەرموویەتی: ناپەسەندە كە لەكاتی تووڕەبوونی كەسێكدا پێی بوترێت: "باسی خوا بكە". چونكە مەترسی ئەوەی لێ دەكرێت كە تووڕەییەكەی وای لێ بكات كوفر بێت بە دەمیدا. هەروەها فەرموویەتی: بەهەمان شێوە نابێت پێی بوترێت: "صەلاوات لەسەر پێغەمبەر بدە"، چونكە هەمان مەترسی لێ دەكرێت.

## باسێك: {نا پەسەندە كەسێك بڵێت: خوا دەزانێت، ئەو شتە وەها نیە، یان وەهایە}

یەكێك لە خراپترین ئەو لەفزو تەعبیرانەی، كە زۆرێك لە خەڵكی عادەتیان پێوە گرتوە، ئەگەر بیانەوێت سوێند لەسەر شتێك بخۆن، خۆیان لەوە دەپارێزن، كە بڵێن: (سوێند بەخوا)، چونكە پێیان ناخۆشە دواتر سوێندەكەیان بكەوێت، یان ناوی خوا بە گەورە دەزانن و، حەز ناكەن سوێندی پێ بخۆن. جا لەبریتی ئەوە دەڵێن: (خوا دەزانێت، ئەو شتە وەها نیە، یان وەهایە)، یان شتێكی لەو جۆرە. كە ئەم جۆرە عیبارەتە مەترسیەكی گەورەی تێدایە. چونكە ئەگەر خاوەنەكەی دڵنیابێت لەوەی كە شتەكە وەهایە وا ئەو دەیڵێت، ئەوە قەیناكات. بەڵام ئەگەر گومانی هەبوو، ئەوە هەر زۆر خراپە. چونكە درۆ بەدەم خوای گەورەوە دەكات، كە گوایە خوای گەورە ئاگای لەو شتەیە، كە ئەم دڵنیا نیە لەسەری.

هەروەها خراپەیەكی وردتریشی تێدایە، كە لەوەی پێشوو خراپترە، ئەویش ئەوەیە كە خوای گەورەی بەوە وەسفدار كردوە، كە زانیاری لەبارەی شتێكەوە هەیە، كە پێچەوانەكەی ڕاستە. جا ئەم وەسفداركردنەش لە هەر كەسێكدا بێتەدی

کافر دەبێت. بۆیە پێویستە لەسەر مرۆڤی موسوڵمان کە خۆی لە بەکارهێنانی ئەم جۆرە عیبارەتانە بپارێزێت.

## باسێك: {ناپەسەندە نزاو پاڕانەوە ببەسترێتەوە بە ویستی خواوە}

ناپەسەندە لە دوعاکردندا بوترێت: (خوایە لێم خۆشبە ئەگەر دەتەوێت). بەڵکو با کەسەکە بەقەناعەتی تەواوەوە بپاڕێتەوەو داوا بکات.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لا يَقُولَنَّ أحَدُكُمْ: "اللَّهُمّ اغْفِرْ لِي إنْ شِئْتَ"، "اللَّهُمَّ ارْحَمْنِي إنْ شِئْتَ"، لِيَعْزِمِ الْمَسْألَةَ، فَإنَّهُ لا مُكْرِهَ لَهُ».

لە ڕیوایەتێکی ئیمامی موسلیمدا بەم جۆرەش هاتوە: «وَلَكنْ لِيَعْزِمْ وَلْيُعَظِّمِ الرَّغْبَةَ، فَإنَّ اللهَ لا يَتَعَاظَمُهُ شَيْءٌ أعْطَاهُ».[1]. واتە: "با هیچ کەسێك لە ئێوە نەڵێت: (خوایە لێم خۆشبە ئەگەر دەتەوێت)، (خوایە ڕەحم پێ بکە ئەگەر دەتەوێت). بەڵکو داواکەتان یەکلایی بکەنەوەو، سووربن لەسەری‌و، بە ڕەغبەتێکی گەورەوە داوا بکەن، چونکە هیچ کەسێك نیە زۆر لەخوا بکات‌و، هەر شتێکیش ئەو بیبەخشێت خۆی بە گەورەو گرانی نازانێت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٣٤ / بە ژمارە: ٥٩٨٠، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٦٣ / بە ژمارە: ٢٦٧٩.

(دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویـەتی: «إِذَا دَعَا أَحَدُكُمْ فَلْيَعْزِمِ الْمَسْأَلَةَ، وَلَا يَقُــولَنَّ: اللَّهُمَّ، إِنْ شِئْتَ فَأَعْطِنِي، فَإِنَّهُ لَا مُسْتَكْرِهَ لَهُ».[1]

## باسێك: {حوكمی سوێند خواردن بە غەیری ناوو سیفەتەكانی خوای گەورە}

سـوێند خـواردن بـە غـەیری ناوەكـانو سـیفەتەكانی خـوای گـەورە كـارێكی ناپەسەندە، ئیتر ئایا بە پێغەمبەر بێت، یان بە كەعبە، یان بە فریشتە، یان بە ئەمانەت، یان بە ژیان، یان بە ڕۆح، یان بە غەیری ئەمانەش. جا سوێند خواردنـە بـە ئەمانـەت لـە هەموویان ناپەسەندتر.

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَرَ)ەوە (خوا لە هەردووكیان ڕازی بێت)، ئەویش لـە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێـت)، كە فەرموویەتی: «إِنَّ اللهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، فَمَــنْ كَانَ حَالِفاً، فَلْيَحْلِفْ بِاللهِ، أَوْ لِيَصْمُتْ».

لـە ڕیوایەتێكی تری صەحیحدا هاتوە، كە فەرموویـەتی: «فَمَنْ كَانَ حَالِفاً، فَــلا يَحْلِفْ إِلاَّ بِاللهِ، أَوْ لِيَسْكُتْ».[2] واتە: "خوای گەورە نەهیتان لێ دەكات كە سـوێند بە باوباپیرانتان بخۆن. بۆیە ئەو كەسەی دەیەوێت سوێند دەخوات، با تەنها سوێند بە ناوەكانو سیفەتەكانی خوا بخوات، یان بێدەنگ بێت".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٣٤ / بە ژمارە: ٥٩٧٩، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٦٣ / بە ژمارە: ٢٦٧٨.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٦٥ / بە ژمارە: ٥٧٥٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٢٦٧ / بە ژمارە: ١٦٤٦.

سەبارەت بە نەهی کـردنیش لـە سـوێند خـواردن بـە ئەمانـەت حەدیسـی زۆر توندمان بۆ ڕیوایەت کراوە: لەوانە ئەو حەدیسەی، کە لـە (سُنَن)ی ئیمـامی (أَبُـو دَاوُد)دا بۆمان ڕیوایەت کراوە، بە ڕشتەیەکی (صَحِیْح)، لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (بُرَیْدَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لەسـەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ حَلَفَ بِالْأَمَانَةِ، فَلَيْسَ مِنَّا».[1] واتە: "ئەو کەسەی سـوێند بـە ئەمانەت بخوات، لە ئێمە نیە (واتە: ڕێبـازی ئێمـەی نـەگرتوەو پـەیڕەوی لـە ئێمـە نەکردوە)".

## باسێك: {ناپەسەندە لە كڕین و فرۆشتن و شتی لەو جۆرەدا سوێند بخورێت}

سوێند خواردنی زۆر لە کڕین و فرۆشتن و شتی لەو جۆرەدا کارێکی ناپەسـەندە، باوەکو سوێندەکەش ڕاست بێت.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُـو قَتَادَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە لە پێغەمبەری خوای بیستوە (درودی خوای لەسەر بێت)، فەرموویەتی: «إِيَّاكُمْ وكَثْرَةَ الْحَلِفِ فِي الْبَيْعِ، فَإِنَّهُ يُنَفِّقُ، ثُمَّ يَمْحَـقُ».[2] واتـە: لـە کڕین و فرۆشتندا خۆتان لە سوێند خـواردنی زۆر بپـارێزن، چـونکە ڕاسـتە سـەرەتا ڕەواج و برەو بە ماڵو شمەکەکەتان دەدات و، بۆتـان سـاغ دەکاتـەوە، بـەڵام دواتـر پیت و فەڕی کاسپیەکە ناهێڵێت (بـەوەی کـە لـە دیـن و لـە دنیاشـدا سـوودی لێ نابینن)".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٢٤٣ / بە ژمارە: ٣٢٥٣.

(٢) بڕوانە: صَحِیْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٢٢٨ / بە ژمارە: ١٦٠٧.

## باسێك: {ناپەسەندە بوترێت: (قَوْسُ قُزَح)}

ناپەسەندە بەو شتە بوترێت (قَوْسُ قُزَح)، کە بە ئاسمانەوەیە.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبی (حِلْيَةُ الْأَوْلِيَاء)ی زانای پایەبەرز (أَبُو نُعَيْم)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لا تَقُولُوا: "قَوْسَ قُزَحَ"، فَإِنَّ قُزَحَ شَيْطَانٌ، وَلَكِنْ قُولُوا: "قَوْسَ اللهِ -عَزَّ وَجَلَّ-"، فَهُوَ أَمَانٌ لِأَهْلِ الْأَرْضِ».[1] واتە: "مەڵێن: (قَوْسُ قُزَح). چونکە (قُزَح) یەکێکە لە ناوەکانی شەیتان. بەڵکو بڵێن: (قَوْسُ الله)". چونکە ئەوە ئەمانی خوایە بۆ خەڵکی، کە ئیتر با ترسی غەرقبوونو ژێرئاوکەتنیان نەبێت.

منیش دەڵێم: شێخی (جَوْهَرِيّ)و غەیری ئەویش فەرموویانە: (قُزَح) وشەیەکی (غَيْرُ مُنْصَرِف)ـە (واتە: حاڵەتی مەجرورریەکەی بە فەتحەیە)و، خەڵکی نەخوێندەواریش دەڵێن: (قُدَح)، کە ئەوەش هەڵەیە.

## باسێك: {نابێت مرۆڤی موسوڵمان باسی تاوانی خۆی بۆ خەڵکی بکات}

ئەگەر کەسێك تووشی تاوانێك یان شتێکی لەو جۆرە بوو، ناپەسەندە بۆ کەسێکی تری باس بکات، بەڵکو پێویستە تەوبە بکاتو بگەڕێتەوە بۆلای خوای گەورەو، دەست بەجێ واز لە کارەکە بهێنێتو، پەشیمان ببێتەوە لەوەی

---

(١) بڕوانە: حِلْيَةُ الْأَوْلِيَاءِ وَطَبَقَاتُ الْأَصْفِيَاء / ٢ / ٣٠٩. حەدیسێکی لاوازە. چونکە کەسێکی لاواز لە ڕشتەکەیدایە، بەناوی (زَكَرِيَّا)ی کوڕی (حَكِيم). هەندێك لە زانایانیش بە (مَوْضُوْع)و هەڵبەستراویان داناوە. بەڵام دەبێت ئیمامی نەوەوی بە (مَوْضُوْع)ی دانەنابێت، بۆیە هێناویتی. بڕوانە: اللَّآلِيءُ الْمَصْنُوْعَةُ فِي الْأَحَادِيْثِ الْمَوْضُوْعَة (لِلسُّيُوْطِيّ) / ١ / ٧٩ – ٨٠.

کردوویەتی‌و، بڕیاریش بدات، کە هەرگیز ناگەڕێتەوە بۆ تاوانی لەو جۆرە. چونکە ئەم سیانە بریتین لە پایەکانی تەوبە کردن‌و، تەوبەش دروست نیە، هەتا ئەم سێ مەرجەی تێدا نەیەتەدی.

خۆ ئەگەر بۆ مامۆستایەکی خۆی گێڕایەوە، یان بۆ کەسێکی وەها، کە ئومێدی هەیە ڕێنمویی بکات بۆ دەرچوون لە تاوانەکەی، یان شتێکی فێر بکات، کە هۆکار بێت بۆ پاراستن لەو جۆرە تاوانە، یان هۆکاری تووشبوونی تاوانەکەی پێ بناسێنێت، یان دوعای خەیری بۆ بکات، یان شتێکی لەو جۆرە، ئەوە قەیناکات، بەڵکو کارێکی باشیشە. بۆیە کاتێك ناپەسەندە، کە باسکردنەکەی ئەم جۆرە بەرژەوەندیانەی تێدا نەبێت.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: لە پێغەمبەری خوام بیستوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «كُلُّ أُمَّتِيْ مُعَافً إلاّ الْمُجَاهِرِيْنَ، وَإنَّ مِنَ الْمُجاهَرَةِ أنْ يَعْمَلَ الرَّجُلُ بِاللَّيْلِ عَمَلاً، ثُمَّ يُصْبِحُ وَقَدْ سَتَرَهُ تَعَالَى عَلَيْهِ، فَيَقُولُ: "يَا فُلانُ، عَمِلْتُ الْبَارِحَةَ كَذَا وكَذَا"، وَقَدْ بَاتَ يَسْتُرُهُ رَبُّهُ، وَيُصْبِحُ يَكْشِفُ سِتْرَ اللهِ عَلَيْهِ».[1] واتە: "هەموو ئومەتەکەم لە ناڕەحەتی‌و لە زمان‌و دەستی خەڵکی سەلامەت‌و پارێزراو دەبن (یان خوا لێیان خۆش دەبێت بەوەی، کە لە دنیادا ئاشکرایان ناکات، یان لە دوارۆژدا سزای توندیان نادات) تەنها ئەوانەیان نەبێت کە نهێنی خۆیان ئاشکرا دەکەن. نهێنی ئاشکراکردنیش ئەوەیە، کە پیاوێك بە شەودا کارێکی خراپ بکات‌و، دواتر کە ڕۆژ بوویەوە خوای گەورە بۆی پۆشیوە، کەچی خۆی بە کەسێك دەڵێت: فلانە کەس من دوێنی شەو کارێکی وەهاوەهام کرد. جا

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٥٤ / بە ژمارە: ٥٧٢١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٢٩١ / بە ژمارە: ٢٩٩٠.

خوای گەورە بە شەودا پەردەی بەسەردا دەدات‌و بۆی دەپۆشێت‌و، خۆیشی بـەیانی ئەوەی خوا بۆی پۆشیوە پەردەی لـەسەر هەڵدەماڵێت‌و ئاشكرای دەكات".

## باسێك: {بچڕاندنی پەیوەندی نێوان خەڵكی كارێكی حەرام‌و ناڕەوایە}

حەرامە مرۆڤی موكەلـەف قسەیەكی وەها لـەگەڵ كۆیلـەی كەسێكدا، یان لـەگەڵ ژنەكەیدا، یان لـەگەڵ كوڕەكەیدا، یان لـەگەڵ خزمەتكارەكەیدا، یان لـەگەڵ یـەكێك لـە خزمەكانیدا بكات‌و، قسەكەش ببێتە هۆی تێكدانی هەڵس‌وكەوتی ئەمانە لـەگـەڵ كەسەكەدا، مەگەر قسەكە فەرمان كردن بە چاكە، یان نەهی كردن لـە خراپە بێت.

- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَـاوَنُوا عَلَـى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾ [المَائِدَة: ٢]. واتـە: {هاوكـاری یـەكتر بـن لـەسـەر چـاكەو لـەخواترسان، هاوكاری یەكتر مەبن لـەسەر تاوان‌و دوژمنكاری}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ [ق: ١٨] واتە: {ئادەمیزاد هـەر قسـەیەك بكـات، فریشـتەیەكی چـاودێرو ئامـادەكراو بـۆ نووسین‌و تۆماركردنی ئەو قسەیەی لـەلادایە}.

بۆمان ڕیوایەت كراوە لـە هەردوو كتێبەكەی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (نَسَـائِيّ)دا، لـە هاوەڵی خۆشەویسـت (أَبـو هُرَيْـرَة)وە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، كـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (درورودی خوای لـەسەر بێت)، فەرموویەتی: «مَنْ خَبَّبَ زَوْجَـةَ امْـرِئٍ أَوْ مَمْلُوكَهُ، فَلَيْسَ مِنَّا». واتە: "ئەو كەسەی ژنی پیاوێك یان كۆیلـەكەی تێـك بـدات‌و هەڵی بخەڵـەتێنێت لـەئێمە نیە".[1]

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٦٤ / بە ژمـارە: ٥١٧٠، وسُنَنُ النَّسَـائِيِّ الْكُبْـرَى / ٥ / ٣٨٥ / بە ژمارە: ٩٢١٤. هەروەها شێخی (ابْنُ حِبَّان)و ئیمـامی (حَاكِم)یـش ڕیوایـەتیان كردوەو، ئیمامی (حَاكِم) فەرموویەتی: ڕشتەكەی (صَحِيْح)ـە. بڕوانـە: صَحِيْحُ ابْنِ حِبَّان /

منیش دەڵێم: (خَبَّبَ) واتە: تێکی بداتو، هەڵی بخەڵەتێنێت.

## باسێك: {ئەگەر کەسێك بڕێك پارەی لە گوێڕایەڵی خوای گەورەدا خەرج کرد، با بڵێت: ئەوەندە پارەم خەرج کرد. بەڵام نابێت بڵێت: ئەوەندەم دۆڕاند، یان ئەوەندەم لەدەست دا}

هەرماڵو پارەیەك لە گوێڕایەڵی خوای گەورەدا خەرج بکرێت، وا باشە لەبارەیەوە بوترێت: (أَنْفَقْتُ) واتە: خەرجم کرد، یان شتێکی لەو جۆرە. بۆ نموونە بوترێت: هەزار دینارم لە سەفەری حەجدا خەرج کرد. یان دوو هەزارم لە غەزادا خەرج کرد. بە هەمان شێوە ئەوەندەم لە میوانداریدا خەرج کردو، ئەوەندەشم لە خەتەنەکردنی منداڵەکەمدا خەرج کردو، ئەوەندەشم لە ژن هێنانەکەمدا خەرج کردو، ئەوەندەشم بۆ فلانە کاری هاوشێوەی ئەمانە خەرج کرد.

بەڵام نابێت وا بڵێت کە زۆربەی نەخوێندەوارەکان دەیڵێن: لە میوانداریدا ئەوەندەم دۆڕاندو، لە سەفەری حەجدا ئەوەندەم خەسار کردو، لە سەفەرەکەمدا ئەوەندەم لەدەست دەرچوو.

پوختەی ئەم باسە ئەوەیە کە تەعبیری: خەرجم کردو هاووێنەکانی بۆ گوێڕایەڵیو بەندایەتی بەکار دەهێنرێن. تەعبیری: خەسارم کردو، دۆڕاندمو، لەدەستم داو، هاووێنەکانیشیان بۆ بێفەرمانیو کارە ناپەسەندەکان بەکار دەهێنرێنو، بۆ گوێڕایەڵی بەکار ناهێنرێن.

---

١٠ / ٢٠٥ / بە ژمارە: ٤٣٦٣، والْمُسْتَدْرَك عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ٤ / ٣٣١ / بە ژمارە: ٧٨١٦.

## باسێك: {ئایا دەكرێت شوێنكەوتوو لەدوای پێشنوێژەكەیەوە قورئانەكەی ئەو بڵێتەوە؟}

یەكێك لەو شتانەی نەهی لێ كراوە ئەوەیە كە زۆرێك لە خەڵكی لە نوێژدا دەیكەن، كاتێك پێشنوێژەكە دەڵێت: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾، شوێنكەوتوەكانیش بەشوێنیدا دەڵێن: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾.

بۆیە دەبێت ئەم كارە نەكرێت‌و، هۆشداریش لەبارەیەوە بدرێت. چونكە خاوەنی كتێبی (الْبَيَان) -كە یەكێكە لە هاوەڵانمان- فەرموویەتی: ئەو كارە نوێژەكە بەتاڵ دەكاتەوە، مەگەر شوێنكەوتوەكە مەبەستی خوێندنەوەی قورئان بێت.[1]

جا ئەمەی كە ئەو فەرموویەتی، ئەگەرچی جێگەی تێبینی‌و سەرنجەو، ڕەنگە كەسیش هاوڕای نەبێت، بەڵام باشتر وایە شوێنكەوتوو خۆی لەم جۆرە كارە بەدوور بگرێت. چونكە ئەگەر نوێژەكەشی بەتاڵ نەكاتەوە، هەر كارێكی ناپەسەندە لەم جێگەدا. خواش لە هەموو كەس زانا ترە.

## باسێك: {نەهی كردن لەوەی بوترێت: باج حەقی دەوڵەتە}

یەكێك لەو تەعبیرانەی كە زۆر نەهی لێ كراوەو، دەبێت مرۆڤی موسوڵمان خۆی لە بەكارهێنانیان بپارێزێت ئەوەیە، كە خەڵكانی نەخوێندەوارو هاووێنەكانیان دەربارەی ئەو باجانەی لەسەر كڕین‌و فرۆشتن‌و مامەڵەی لەو جۆرە وەردەگیرێن، بەكاریان دەهێنن‌و دەڵێن: ئەمە مافی دەوڵەتە، یان مافی دەوڵەتت لەسەرە، یان هەر تەعبیرێكی تری هاوشێوە، كە داگرەوەبێت بەسەر ناونانی شتەكە بە ماف یان ئەرك‌و واجب‌و شتی لەو جۆرە.

---

(١) بڕوانە: الْبَيَان فِيْ مَذْهَبِ الْإِمَامِ الشَّافِعِيّ / ٢ / ٣١١.

جا بەکارهێنانی ئەم تەعبیرانە کارێکی زۆر خراپەو، داهێنراوێکی زۆر ناشیرینە. بە جۆرێك کە هەندێك لە زانایان فەرموویانە: ئەو کەسەی ئەو شتە بە ماف ناو ببات، کافر دەبێتو لە گرۆهی ئیسلام دەردەچێت. بەڵام بۆچوونی دروست ئەوەیە کە کافر نابێت، مەگەر باوەڕی وابێت کە هەر بەڕاستی ئەوە مافە، لەهەمان کاتدا بشزانێت کە ستەمو زوڵمە.

بۆیە بۆچوونی ڕاست ئەوەیە کە بەو شتانە بوترێت: باج یان زەریبەی دەوڵەت، یان شتی لەو جۆرە. تەوفیقیش تەنها بەدەستی خوایە.

## باسێك: {ناپەسەندە بەناوی خوای گەورەوە داوای شت بکرێت}

ناپەسەندە بەناوی خوای گەورەوە داوای هیچ شتێکی تر بکرێت بێجگە لە بەهەشت.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لا يُسْأَلُ بِوَجْهِ اللهِ إِلاَّ الْجَنَّةُ».[1] واتە: "نابێت بە ناوی خوای گەورەوە داوای هیچ شتێك بکرێت بێجگە لە بەهەشت".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٥٢٤ / بە ژمارە: ١٦٧١. ڕشتەکەی لاوازە. چونکە کەسێکی لاوازی تێدایە، بەناوی (سُلَيْمَان)ی کوڕی (مُعَاذ)ەوە. بڕوانە: ذَخِيْرَةُ الْحُفَّاظ / ٥ / ٢٧١٨ / بە ژمارە: ٦٣٤٠، وفَيْضُ الْقَدِيْر / ٦ / ٤٥١.

## باسێك: {حوكمی ئەو كەسەی بەناوی خواوە داوای شت دەكات و، ئەو دەكات بە تكاكار}

ناپەسەندە دەست بنرێت بەڕووی ئەو كەسەوە، كە بەناوی خوای گەورەوە داوای شتێك دەكات و، ئەو بكات بە تكاكار.

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أبو دَاوُد)و (نَسَائِيّ)دا، بە چەند ڕشتەیەك -كە لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا حەدیسیان پێ ڕیوایەت كراوە- لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووكیان ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، فەرموویەتی: «مَنْ اسْتَعاذَ بالله، فَأعِيْذُوْهُ، وَمَنْ سَأَلَ بالله تَعَالَى، فَأعْطُوهُ، وَمَنْ دَعاكُمْ، فَأجِيْبُوْهُ، وَمَنْ صَنَعَ إلَيْكُمْ مَعْرُوفاً، فَكَافِئُوْهُ، فَإنْ لَمْ تَجِدُوا مَا تُكَافِئُوْنَهُ، فَادْعُوا لَهُ، حَتَّى تَرَوْا أنَّكُمْ قَدْ كَافَأْتُمُوْهُ».[1] واتە: "ئەو كەسەی پەنای بۆ خوا برد (وەكو ئەوەی بڵێت: توخوا وا مەكە، یان ئازارم مەدە، یان....)، ئێوەش پەنای بدەن. ئەو كەسەش بەناوی خواوە داوای شتێكی كرد (وەكو ئەوەی بڵێت: توخوا فلانە شتم بدەرێ، یان فلانە كارم بۆ بكە)، ئێوەش بەدەمیەوە بچن و، كارەكەی بۆ بكەن. ئەو كەسەش چاكەیەكی بەرامبەر كردن، ئێوەش پاداشتی بدەنەوەو حەقی بۆ بكەنەوە. ئەگەر شتێكیشتان نەبوو پاداشتی ئەوی پێ بدەنەوە، دوعای خەیری بۆ بكەن، هەتا باوەڕتان بۆ دروست دەبێت، كە بەو دوعا بۆ كردنە پاداشتتان داوەتەوە".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٥٢٤ / بە ژمارە: ١٦٧٢، وسُنَنُ النَّسَائِيِّ / ٥ / ٨٢ / بە ژمارە: ٢٥٦٧.

## باسێك: {ناپەسەندە بە كەسێك بوترێت: خوا دەوامت بدات، یان خوا بتهێڵێت}

مەشهوورترین بۆچوون لەسەر ئەوەیە، كە ناپەسەندە كەسێك بە كەسێكی تر بڵێت: (أَطَالَ اللهُ بَقَاءَكَ) واتە: "خوا درێژە بە مانەوەت بدات"، یان (خوا دەوامت بدات).

پێشەوای پایەبەرز (أَبو جَعْفَر)ی (نَحَّاس) لە كتێبی (صِنَاعَةُ الْكِتَاب)دا فەرموویەتی: هەندێك لە زانایان پێیان ناخۆش بوە، كە خەڵكی بڵێن: (أَطَالَ اللهُ بَقَاءَكَ)، هەندێكیشیان ڕێگەیان پێ داوە.

زانای پایەبەرز (إِسْمَاعِيْل)ی كوڕی (إِسْحَاق) فەرموویەتی: یەكەم كۆمەڵێك كە تەعبیری (أَطَالَ اللهُ بَقَاءَكَ)یان بەكارهێناوە بێ دینەكان بوون.

ڕیوایەتیش كراوە لە زانای پایەبەرز (حَمَّاد)ی كوڕی (سَلَمَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە كاتی خۆی نامەو نوسراوی موسوڵمانان بەم شێوە بوو: (مِنْ فُلانٍ إِلَى فُلانٍ: أَمَّا بَعْدُ، سَلامٌ عَلَيْكَ، فَإِنِّيْ أَحْمَدُ اللهَ الَّذِيْ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ، وَأَسْأَلُهُ أَنْ يُصَلِّيَ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّد). واتە: "لە فلانەوە بۆ فیسار، پاشان، سڵاوت لێبێت، ئەوجا من سوپاس و ستایشی ئەو خوایە دەكەم، كە هیچ پەرستراوێكی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە ئەو، داواشی لێ دەكەم، كە دروودو سۆزی خۆی بڕێژێت بەسەر پێغەمبەرو خزم و كەس و كارەكەیدا". پاشان بێ دینەكان جۆرە نوسراوێكیان داهێنا، كە سەرەتا بەمە دەستی پێ دەكرد: (أَطَالَ اللهُ بَقَاءَكَ).

## باسێك: {دروسته به كەسێك بوترێت: باوكو دایكم بەقوربانت بن}

مەزهەبی دروستی هەڵبژێردراو ئەوەیە، كە ناپەسەند نیە كەسێك به كەسێكی تر بڵێت: (باوكو دایكم بەقوربانت بن)، یان (خوا بمكات به قوربانت).

چەندین حەدیسی مەشهووریش له هەردوو صەحیحەكەو له غەیری ئەوانیشدا لەسەر دروستی بەكارهێنانی ئەو جۆره تەعبیرانه هاتوون، ئیتر ئایا باوكو دایكەكە موسوڵمان بن، یان كافر. بەڵام هەندێك له زانایان ئەو تەعبیرەیان به ناپەسەند داناوه، ئەگەر باوكو دایكەكه موسوڵمان بن.

شێخی (نَحَّاس) فەرموویەتی: ئیمامی (مَالِك)ی كوڕی (أَنَس) به ناپەسەندی داناوه كه بوترێت: (خوا بمكات به قوربانت)، بەڵام هەندێك له زانایان به دروستیان داناوه.

زانای پایەبەرز قاضي (عِيَاض)یش فەرموویەتی: زۆربەی زانایان وای بۆچوون كه ئەو كاره دروسته، ئیتر ئایا كەسه بەقوربانكراوەكه (واته: باوكو دایكەكه) موسوڵمان بێت یان كافر.

منیش دەڵێم: ئەوەنده حەدیسی (صَحِيْح) لەسەر دروستی ئەو كاره هاتوون، كه لەژماره نایەن. هەندێكیشیانم له (شَرْحُ صَحِيْحِ مُسْلِم)دا هێناوه.[1]

---

(١) یەكێك لەوانه بریتیه لەو حەدیسه صەحیحەی، كه ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی كردوه، له ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ی كوڕی (مَالِك)ـەوه (خوای لێ ڕازی بێت)، كه هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو طَلْحَة) (خوای لێ ڕازی بێت) به پێغەمبەری خوای (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموه: (يَا نَبِيَّ اللَّهِ جَعَلَنِي اللَّهُ فِدَاكَ). بڕوانه: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٨٧ / به ژماره: ٥٨٣١.

## باسێك: {تانەدان لە قسەی خەڵكیو، چەنوچوونو دەمەدەمەو، كێشەو ناكۆكی نانەوە لەگەڵ خەڵكیدا كارێكی نا پەسەندە}

(مِرَاء)و (جِدَال)و (خُصُوْمَة)ش هەندێكن لەو قسەو وتووێژانەی کە کردنیان خراپە.

پێشەوای پایەبەرز (أبو حَامِد)ی (غَزَالِيّ) فەرموویەتی: (مِرَاء): بریتیە لە تانەدان لە قسەی کەسێكی تر، بەهۆی دەركەوتنی خەڵەلو نوقسانیەك تێیدا، تەنها بە مەبەستی سووك كردنی خاوەنەكەیو، دەرخستنی فەزڵی خۆت بەسەر ئەودا.

هەروەها فەرموویەتی: (جِدَال)یش جۆرە گفتوگۆیەكە، پەیوەندی بە سەرخستنو سەلماندنی مەزهەبەكانەوە هەیە.

هەروەها فەرموویەتی: (خُصُوْمَة)ش بریتیە لە سووربوونو پێداگری کردن لەسەر قسەیەك، بەمەبەستی دەستكەوتنی ماڵو پارە یان شتێكی تر.

ئەوجا (خُصُوْمَة) هەندێك جار هەر لە سەرەتای قسە كردنەوە بوونی هەیەو، هەندێك جاریش بەهۆی ڕەخنە گرتنەوە لە قسەی كەسێكی تر دروست دەبێت. بەڵام (مِرَاء) تەنها بەهۆی ڕەخنە گرتنەوە دروست دەبێت.

جا ئەمە فەرمایشتەكەی ئیمامی (غَزَالِيّ) بوو.

ئەوجا بزانە كە هەندێك جار (جِدَال) بە كردنی قسەی حەقو ڕاست دروست دەبێتو، هەندێك جاریش بە قسەی هەڵەو پڕوپووچ دروست دەبێت.

- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ [الْعَنْكَبُوْت: ٤٦].
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ [النَّحل: ١٢٥].
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿مَا يُجَادِلُ فِي آيَاتِ اللهِ إِلَّا الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ [غَافِر: ٤].

جا ئەگەر (جِدَال)ـەکە بۆ دەرکـەوتن‌و سـەلماندنی حـەق‌و ڕاسـتی بێـت، ئـەوا کارێکی باش‌و پەسەندەو، ئەگـەر بـۆ دژایـەتی حـەق‌و ڕاسـتیش بێـت، یـان بـەبێ زانیاری‌و زانست بێت، ئەوا کارێکی خراپ‌و ناپەسـەندە. بۆیـە ئـەو دەقانـەی کـە سەبارەت بە باشێتی‌و خراپێتی (جِدَال) هاتوون دەبێت بەم جۆرە لێك بدرێنەوە.

پاشان (مُجَادَلَة)و (جِدَال) هەر یەك مانایان هەیەو، منیش ئەم باسەم بە درێژی لـە کتێبی (تَهْذِيْبُ الْأَسْمَاءِ وَاللُّغَات)دا ڕوون کردۆتەوە.

یەکێك لـە زانایان فەرموویەتی: هیچ شتێکم نەدیوە لـە (خُصُـــوْمَة) زیـاتر دیـن لـەناوببات‌و، مەردایەتی بشکێنێت‌و، چێژ نەهێڵێت‌و، دڵیش سەرقاڵ بکات.

جا ئەگەر تۆ بپرسیت‌و بڵێیت: (خُصُوْمَة) کارێکی پێویستە بۆ ئادەمیزاد لـەپێناو مانەوەی مافەکانیدا.

ئەوا وەڵامی پرسیارەکەت هەر ئەو وەڵامەیە کـە ئیمـامی (غَزَالِـــيّ) داوێتیـەوە، ئەویش ئەوەیە کە باسی زۆر خراپێتی (خُصُوْمَة) تەنها بۆ ئەو کەسەیە، کە بەناحـەق بیکات، یان بەبێ زانیاری. وەکو بریکاری قاضي، کە لـە (خُصُـــوْمَة)یەکـدا دەبێتـە بریکار، بەر لـەوەی بزانێت مافەکە هی کام لـە دوو لایەنەکەیە، واتە بـەبێ زانیـاری دەچێتە ناو (خُصُوْمَة)کەوە.

هەروەها لـە جۆری (خُصُوْمَة)ی خراپە، ئەوەی کە کەسێك داوای مـافی خـۆی بکات، بەڵام نەك بە ئەندازەی پێویست، بـەڵکو بەئاشـکرا ئینکـاری دەکـات‌و درۆ دەکات بۆ ئازاردانی بەرامبەرەکەی‌و زاڵبوون بەسەریدا.

بەهەمان شێوە هەر لـە جۆری (خُصُوْمَة)ی خراپە، ئـەوەی کـە کەسـێك قسـەی خراپ‌و ئازاراوی تێکەڵ بە (خُصُوْمَة)کـە دەکـات‌و، هـیچ پێویستیشـی بـەو جـۆرە قسانە نیە بۆ دەستخستنی حەقەکەی خۆی.

بەهەمان شێوە ئەو کەسەش کە تاکە پاڵنەری بۆ کردنی (خُصُوْمَة)کە بریتییە لە ئینکاری کردن، بۆ ئەوەی کەسی بەرامبەر ببەزێنێت‌و بیشکێنێت، کە ئەمەش کارێکی خراپە.

سەبارەت بەو کەسە ستەم لێکراوەش کە بە ڕێگەیەکی شەرعی پشتگیری بەڵگەکەی خۆی دەکات، بێ ئەوەی دژایەتی توندو زیادەڕەوی‌و گیری زیاد لەپێویست بکات‌و، مەبەستیشی ئینکاری‌و زیان گەیاندن نیە، ئەوە کارەکەی حەرام نیە. بەڵام باشتر وایە واز لە (خُصُوْمَة)کە بهێنێت، ئەگەر ڕێگەیەکی تری هەبوو بۆ دەست خستنی مافەکەی خۆی. چونکە بە ڕێکی ڕاگرتن‌و ئاگا لێبوونی زمان لەکاتی (خُصُوْمَة)دا کارێکی ئەستەم‌و مەحاڵەو، (خُصُوْمَة)ش ڕق‌و کینە لە دڵدا دروست دەکات‌و، تووڕەیی دەورووژێنێت‌و، ئەگەر تووڕەییش وروژا، ئیتر ڕق‌و کینە لەنێوان دوو لایەنەکەدا پەیدا دەبێت، هەتا وای لێ دێت هەریەکەیان بە خەفەت‌و خەمباری ئەوی تریان خۆشحاڵ دەبێت‌و، بە دڵ خۆشیشی خەمبار دەبێت‌و، زمانی بەرەڵا دەکات بۆ تانەدان لە کەسایەتی بەرامبەرەکەی. بۆیە ئەو کەسەی (خُصُوْمَة) دەکات، ڕووبەڕووی ئەم بەڵاو نەهامەتیانە دەبێتەوەو، بەلایەنی کەمیشەوە دڵی بە (خُصُوْمَة)کەوە سەرقاڵ دەبێت، هەتا ئەگەر لەناو نوێژیشدا بێت، خەیاڵ‌و دڵی هەر بەستراوە بە کێشەو (خُصُوْمَة)کەوە، بۆیە حاڵی بە هاوسەنگی نامێنێتەوە.

(خُصُوْمَة)ش سەرەتای دەست پێکردنی خراپەیە، بە هەمان شێوە (جِدَال)و (مِرَاء)یش. بۆیە باشتر وایە مرۆڤی موسوڵمان دەرگای (خُصُوْمَة) لەخۆی نەکاتەوە، تەنها لە کاتی ناچاری‌و پێویستدا نەبێت. جا لەو کاتەشدا با زمان‌و دڵی خۆی لە بەڵاو نەهامەتیەکانی (خُصُوْمَة) بپارێزێت.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی:

پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «كَفَى بِكَ إِثْمـاً أَنْ لا تَـزَالَ مُخَاصِماً».[1] واتە: "بەسە بۆ تاوانباریی تۆ، کە هەمیشە خەریکی کێشمەکێش‌و مشتومڕ بیت".

لە ئیمامی (عَلِيّ)شەوە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: (إِنَّ لِلْخُصُوْمَاتِ قُحَماً) واتە: (بەڕاستی کێشەو ناکۆکیەکان چەندین جێگەی تیاچوون‌و لەناچوونیان تێدایە).[2]

## باسێك: {ناپەسەندە لەکاتی قسە کردندا دەم پان بکرێتەوەو زۆر لەخۆ بکرێت بۆ ڕێکخستنی کۆتایی بڕگەکان}

ناپەسەندە کەسێك لە کاتی قسە کردندا دەم پان بکاتەوەو زۆر لەخۆی بکات بۆ ڕێکخستنی کۆتایی بڕگەکان‌و، بەکارهێنانی ڕەوانبیژی‌و ئەو جۆرە پێشەکیانەی، کە خەڵکانی خۆبەڕەوانبیژزان خوویان پێوە گرتوون‌و، هێنانی قسەی ڕازاوەو زەرق‌و بەرق، کە هەموو ئەمانە لەجۆری زۆر لەخۆ کردنی خراپن.

بەهەمان شێوە زۆر لەخۆ کردن بۆ ڕێکخستنی کۆتایی بڕگەکانیش هەر کارێکی ناپەسەندە. هەروەها لەکاتی ڕوو تێکردنی خەڵکانێکی نەخوێندەواردا گەڕان بەشوێن ئیعرابی وردو ناڕوون‌و وشەی غەریب‌و سەرلێدەرنەچوو کارێکی ناپەسەندە. بۆیە دەبێت لە کاتی قسە کردن لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانەدا لەفزو تەعبیری وەها بەکار بهێنرێت، کە بەڕوونی لێی تێ بگەن‌و، قورس‌و گران نەبێت لەسەریان.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيِّ / ٤ / ٣٥٩ / بە ژمارە: ١٩٩٤. ڕشتەکەی لاوازە. بڕوانە: فَيْضُ الْقَدِيْر / ٥ / ٥.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ الْبَيْهَقِيِّ الْكُبْرَى / ٦ / ٨١ / بە ژمارە: ١١٢٢٠.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو کتێبەکەی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (عَمْرو)ی کوڕی (عَاص)ـەوە (خوا لە خۆیو باوکیشی ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِنَّ اللّهَ يُبْغِضُ الْبَلِيغَ مِنَ الرِّجَالِ الَّذِيْ يَتَخَلَّلُ بِلِسَانِهِ كَمَا تَتَخَلَّلُ الْبَقَرَةُ». واتە: "بەڕاستی خوای گەورە ڕقی لەو کەسە دەمهەڕاشەیە، کە وەکو مانگا زمانی بە دەمیدا ڕادەدات".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) سێ جار فەرمووی: «هَلَكَ الْمُتَنَطِّعُونَ». واتە: "ئەو کەسانە تیاچوون کە زیادەڕەوی لە کارەکانیاندا دەکەن".[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِنَّ مِنْ أَحَبِّكُمْ إِلَيَّ، وَأَقْرَبِكُمْ مِنِّي مَجْلِساً يَوْمَ الْقِيَامَةِ، أَحَاسِنُكُمْ أَخْلاقاً. وَإِنَّ أَبْغَضَكُمْ إِلَيَّ، وَأَبْعَدَكُمْ مِنِّي يَوْمَ الْقِيَامَةِ، الثَّرْثَارُوْنَ وَالْمُتَشَدِّقُوْنَ وَالْمُتَفَيْهِقُوْنَ». واتە: "بەڕاستی یەکێك لە خۆشەویستترین کەسی ئێوە بەلای منەوەو، یەکێك لە نزیکترین کەستان لە منەوە لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەوانەتانن کە خاوەنی ڕەوشتو ئاکاری جوانو شیرینن. ڕقلێبووترین کەسی ئێوەش بەلای منەوەو، دوورترینیشتان لەمنەوە لە ڕۆژی قیامەتدا بریتین لە: کەسانی زۆربڵێو، دەمدرێژو، خۆبەگەورەزان". جا عەرزیان کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە زانیومانە

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٢٠ / بە ژمارە: ٥٠٠٥، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ١٤١ / بە ژمارە: ٢٨٥٣.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٥٥ / بە ژمارە: ٢٦٧٠.

که (الثَّرْثارُوْن)و (الْمُتَشَدِّقُوْن) کێن، ئەی (الْمُتَفَیْقِهُوْن) کـێن؟" ئـەویش فـەرمووی: «الْمُتَکَبِّرُوْنَ». واتە: (ئەوانەن کە خۆیان بەگەورە پیشان دەدەن).

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

هـەروەها فەرموویـەتی: (ثَرْثَـــار)یـش ئـەو کەسـەیە کـە قسـە زۆر دەکـاتو، (مُتَشَدِّق)یش ئەو کەسەیە کە دەمدرێژیو قسەی زیادەو خـراپ بەرامبـەر خـەڵکی دەکات.

ئەوجا بزانە کە بەکارهێنانی لـەفزو تەعبیری جوان لـە وتارو ئامۆژگاریدا بەر ئەم کارە خراپە ناکـەوێت، ئەگـەر زیـادەڕەویو نامۆپیشـاندانی تێـدا نـەبێت. چـونکە مەبەست لـە وتارو ئامۆژگاری بریتیە لــە ورووژانـدنو هانـدانی دڵـی خـەڵکی بـۆ گوێڕایەڵی کردنی خوای گەورە. جا لـەفزو تەعبیری جوانیش لـەم ڕووەوە کاریگەری ئاشکرای هەیە.

## باسێك: {نا پەسەندە لەدوای نوێژی عیشاوە بێجگە لە قسەی باش هیچ قسەیەکی تر بکرێت}

هەر کەسێك نوێژی عیشای کرد، ئیتر ناپەسـەندە ئـەو قسـانە بکـات، کـە لـە غەیری ئەو کاتەدا کردنیان حەڵاڵە. مەبەستم بە قسـەی حـەڵاڵ ئـەو قسـانەیە، کـە کردنو نەکردنیان یەکسانە.

سەبارەت بەو قسانەش کە لـە غەیری ئەو کاتەدا حەرامن یان ناپەسـەندن، ئـەوە لـەم کاتەدا هەر زۆر حەرامو ناپەسەندن.

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٣٧٠ / بە ژمارە: ٢٠١٨.

سەبارەت بە قسەی خەیرو چاکیش، وەکو دەورکردنەوەی زانستو، چیرۆکی پیاوچاکانو، ئاکارو ڕەوشتە بەرزەکانو، قسە کردن لەگەڵ میواندا، ئەوە هیچ ناپەسەندیەکی تێدا نیە. بەڵکو سونەتەو، چەندین حەدیسی (صَحِيْح)یش لەوبارەوە هاتوون.

بەهەمان شێوە قسە کردن لەبەر پێویستی، یان لەبارەی شتە پێشهاتەکانەوە، ئەویش هەر قەیناکات.

ئەوجا چەندین حەدیسی مەشهوور لەبارەی هەموو ئەمانەوە هاتوون، کە باسم کردن، بەلاّم من بە کورتی هەندێکیان باس دەکەمو، ئاماژەش بۆ زۆرێکیان دەکەم.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو بَرْزَةَ)ە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) خەوتنی پێش نوێژی عیشاو، قسە کردنی دوای نوێژی عیشای پێی ناخۆش بوە.[1]

ئەوحەدیسانەش، کە دەربارەی ڕێگەپێدان بە قسە کردن لەو شتانەی پێشەوە هاتوون، گەلێك زۆرن:

یەکێك لەوانە: حەدیسەکەی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا هاتوەو، باس لەوە دەکات، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) لە کۆتایی تەمەنیدا نوێژی عیشای کرد، جا کە سلاّوی دایەوە، فەرمووی: «أَرَأَيْتَكُمْ لَيْلَتَكُمْ هَذِهِ، فَإِنَّ عَلَى

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢١٥ / بە ژمارە: ٥٧٤، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤٤٧ / بە ژمارە: ٦٤٧.

رَأْسِ مِئَةِ سَنَةٍ، لاَ يَبْقَى مِمَّنْ هُوَ عَلَى ظَهْرِ الْأَرْضِ الْيَوْمَ أَحَدٌ».[1] واته: "لەم شەوەوە بەدواوە تاوەكو سەد ساڵی تر، كەسێك لەوانە نامێنن، كە ئەمڕۆ لەسەر زەوی دەژین".

یەكێكیش لەوانە: حەدیسەكەی هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)ـە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا هاتوە، كە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) نوێژی عیشای دواخست هەتا شەو نیوە بوو، ئەوجا تەشریفی هێناو نوێژی بە جەماعەت بۆ كردن. جا كە لەنوێژەكە بوویەوە، بەو كەسانەی فەرموو، كە لەخزمەتیدا بوون: «عَلَى رِسْلِكُمْ، أُعَلِّمُكُمْ، وَأَبْشِرُوا أنَّ مِنْ نِعْمَةِ اللهِ عَلَيْكُمْ أَنَّهُ لَيْسَ مِنَ النَّاسِ أحَدٌ يُصَلِّي هَذِهِ السَّاعَةَ غَيْرَكُمْ». یان فەرمووی: «مَا صَلَّى أحَدٌ هَذِهِ السَّاعَةَ غَيْرَكُمْ».[2] واتە: "پەلە مەكەن‌و مەڕۆن، تا شتێكتان فێر بكەم، مژدەشتان لێبێت، كە بەڕاستی یەكێك لە نازو نیعمەتەكانی خوای گەورە لەسەر ئێوە ئەوەیە، كە بێجگە لە ئێوە یەك كەس نیە لەم كاتەدا نوێژ بكات".

یەكێكیش لەوانە: حەدیسەكەی هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە لە صەحیحی بوخاریدا هاتوە، كە ئەوان چاوەڕوانی پێغەمبەری خوایان كردوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەویش لە نزیكی نیوەی شەودا تەشریفی هێنا بۆلایان‌و، نوێژی بە جەماعەت بۆ كردن -مەبەستی نوێژی عیشایە-. (أَنَس) فەرمووی: پاشان پێغەمبەر وتارێكی بۆ داین‌و، فەرمووی: «ألا إنَّ النَّاسَ قَدْ صَلُّوْا، ثُمَّ

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢١٦ / بە ژمارە: ٥٧٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٩٦٥ / بە ژمارە: ٢٥٣٧.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٠٧ / بە ژمارە: ٥٤٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤٤٣ / بە ژمارە: ٦٤١.

رَقَدُوا، وَإِنَّكُمْ لَنْ تَزَالُوا فِيْ صَلاةٍ مَا انْتَظَرْتُمُ الصَّـــلاةَ».[1] واتـە: "ئاگـادابن کـە بەڕاستی خەڵکی نوێـژیان کـردوەو، پاشـان خـەوتوون. بـەڵام ئێـوە بـەردەوام لــە نوێژدان، مادەم چاوەڕێی نوێژ بکەن".

یەکێکیش لەوانە: حەدیسەکەی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّـــاس)ـــە (خوا لـە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە دەربارەی شەومانەوەکەی هاتوە لـە ماڵی پوورە (مَيْمُوْنَة)یدا -کە خوشکی دایکی بوەو، یەکێکیشە لــە دایکـانی ئیمانـداران-. (ابْـــنُ عَبَّـــاس) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) نوێژی عیشـای کـردو، پاشـان تەشریفی بردە ماڵەوەو فەرمایشتی لەگەڵ خێزانەکەیدا کـرد. هـەروەها فـەرمووی: «نَامَ الغُلَيِّمُ؟». واتە: "کوڕە بچووکەکە خەوتوە؟".[2]

یەکێکیش لەوانە: حەدیسەکەی هـاوەڵی خۆشەویسـت (عَبْدُالرَّحْمَن)ی کـوڕی ئیمامی (أَبُو بَكْر)ە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کـە دەربـارەی چـیرۆکی میوانـەکانی ئیمامی (أَبُو بَكْر) هاتوەو، ئەو تەشریفی نەهێناوەتەوە بۆلایـان هـەتا نوێـژی عیشـای کـردوە، پاشـان تەشـریفی هێناوەتـەوەو، قسـەی لەگـەڵ میوانـەکانو، لەگـەڵ هاوسەرەکەیو کوڕەکەشیدا کردوە.[3]

جا ئەم دوو حەدیسە لـە هـەردوو صـەحیحی بوخـاریو موسـلیمدا هـاتوونو، هاوڕێنەی ئەمانەش لـە زۆریدا لەژمارە نایەنو، ئەوەندەش بەسە کـە ئێمـە هێنامـان. سوپاسو ستایش بۆ خوای گەورە.

---

(١) بڕوانـە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢١٦ / بـە ژمـارە: ٥٧٥. هـەروەها ئیمـامی موسـلیمیش ڕیوایەتی کردوە. بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤٤٣ / بە ژمارە: ٦٤٠.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٥٥ / بە ژمارە: ١١٧.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٣١٢ / بە ژمارە: ٣٣٨٨.

## باسێك: {ناپەسەندە بە نوێژی عیشا بوترێت: (عَتَمَة)و، بە نوێژی مەغریبیش بوترێت: عیشا}

ناونانی نوێژی عیشا بە (عَتَمَة) كارێكی ناپەسەندە، لەبەر ئەو حەدیسە صەحیحە مەشهوورانەی، كە لەو بارەوە هاتوون. هەروەها ناونانی نوێژی مەغریبیش بە عیشا هەر كارێكی ناپەسەندە.

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالله)ی كوڕی (مُغَفَّل)ی (مُزَنِـيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لا تَغْلِبَنَّكُمُ الْأَعْرَابُ عَلَى اسْمِ صَلاتِكُمُ الْمَغْرِبِ». ئەوجا فەرمووی: «وَتَقُوْلُ الْأعْرَابُ: هِيَ الْعِشَاءُ».[1] واتە: "با عادەتی عەرەبە دەشتەكیەكان زاڵ نەبێت بەسەرتانداو، بكەونە شوێن قسەی ئەوان لە ناونانی نوێژی مەغریبدا، كە ئەوان پێی دەڵێن: عیشا".

سەبارەت بەو حەدیسانەش كە دەربارەی ناونانی نوێژی عیشا بە (عَتَمَة) هاتوون، وەكو حەدیسی: «لَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي الصُّبْحِ وَالْعَتَمَةِ، لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْـواً».[2] واتە: "ئەگەر خەڵكی بیانزانیایە چی خەیرو پاداشتێك لە نوێژی بەیانیو نوێژی عیشا (عَتَمَة)دا هەیە، با بە گاوەڵكێش بێت، هەر دەهاتن بۆیان"، ئەوە بە دوو جۆر وەڵام دەدرێنەوە:

- یەكەم: ئەو حەدیسانە وەكو ڕوونكردنەوەیەك وەهان بۆ ئەوەی، كە ئەو نەهی كردنەی لەبارەی ناونانی نوێژی عیشا بە (عَتَمَة) هاتوە، بۆ حەرامبوونی كارەكە نیە، بەڵكو بۆ ئەوەیە، كە خەڵكی خۆیان لەو جۆرە بەكارهێنانە بپارێزن.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٠٦ / بە ژمارە: ٥٣٨.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٢٢ / بە ژمارە: ٥٩٠، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٢٥ / بە ژمارە: ٤٣٧.

- **دوەم: ئەو حەدیسانە ڕوویان پێ کراوەتە کەسانێك، کە ترسی ئەوەیان لێکراوە، ئەگەر بوترایە نوێژی عیشا، ڕەنگە لێیان تێك بچێتو، نەزانن مەبەست پێی نوێژی مەغریبە یان عیشا.**

**سەبارەت بە ناونانی نوێژی بەیانیش بە (غَدَاة)، ئەوە مەزهەبی دروست لەسەر ئەوەیە، کە هیچ ناپەسەندیەکی تێدا نیەو، زۆرێك حەدیسی (صَحِيْح)یش لەبارەی بەکارهێنانی ناوی (غَدَاة) بۆ نوێژی بەیانی هاتوون. کەچی کۆمەڵێك لە هاوەڵانمان پێیان وایە ئەو ناونانە ناپەسەندە. بەڵام بۆچوونەکەیان هیچ نیە.**

**هەروەها هیچ خراپەیەکیشی تێدا نیە کە بە هەردوو نوێژی مەغریبو عیشا بوترێت (عِشَاءَيْن)و، هیچ خراپەیەکیشی تێدا نیە کە تەعبیری (الْعِشَاءُ الْـآخِرَة) بۆ نوێژی عیشا بەکار بهێنرێت. ئەوەش هەڵەیەکی ئاشکرایە کە لە ئیمامی (أَصْمَعِيّ)ـەوە نقلّ کراوە، کە ئەو فەرموویەتی: نابێت بوترێت: (الْعِشَاءُ الْـآخِرَة). چونکە لە صەحیحی موسلیمدا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «أَيُّمَا امْرأَةٍ أصَابَتْ بَخُوراً فَلا تَشْهَدْ مَعَنا الْعِشَاءَ الْـآخِرَةَ».[1] واتە: "هەر ئافرەتێك بۆنی خۆشی دابێت لە خۆی، با لە نوێژی عیشادا لەگەڵماندا ئامادە نەبێت".**

**هەروەها ئەو تەعبیرە لە فەرمایشتی زۆرێك لە هاوەڵاندا لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمو لە کتێبەکانی تریشدا هاتوە. منیش هەموو ئەم بابەتانەم بە بەڵگەکانیەوە لە کتێبی (تَهْذِيْبُ الْأَسْـمَاءِ وَاللُّغَـات)دا بە ڕوونی باس کردوە. تەوفیقیش تەنها بەدەستی خوایە.**

---

**(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٢٨ / بە ژمارە: ٤٤٤.**

## باسێك: {درکاندن و بڵاوکردنەوەی نهێنی کارێکی حەرامە}

یەکێکی تر لەو کارانەی کە نەهی لێکراوە بریتیە لە درکاندن و بڵاوکردنەوەی نهێنی، زۆرێك حەدیسیشی لەبارەوە هاتوە. جا ئەو کارە حەرامە ئەگەر زیان یان ئازاری بۆ خاوەنەکەی تێدابوو.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا حَدَّثَ الرَّجُلُ بِالْحَدِيثِ ثُمَّ الْتَفَتَ، فَهِيَ أَمَانَةٌ». واتە: "ئەگەر پیاوێك قسەیەکی گێڕایەوەو، پاشان لایکردەوە، ئەوە ئەمانەتە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

## باسێك: {ناپەسەندە پرسیاری ئەوە لە پیاو بکرێت، کە بۆچی داوێتی لە ژنەکەی}

ئەگەر لەبەر پێویستی نەبێت، ناپەسەندە پرسیار لە پیاوێك بکرێت: بۆچی داوێتی لە ژنەکەی.

لە سەرەتای ئەم کتێبەوە لە (باسی پاراستنی زمان)دا چەند حەدیسێکی (صَحِيْح)مان هێنا، سەبارەت بە بێدەنگبوون و قسە نەکردن دەربارەی ئەو شتەی، کە بەرژەوەندیەکی ئاشکرای تێدا نیە.

هەروەها ئەم حەدیسە (صَحِيْح)ـەشمان هێنا: «مِنْ حُسْنِ إِسْلامِ الْمَرْءِ تَرْكُهُ مَا لا يَعْنِيْهِ».[1]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٨٣ / بە ژمارە: ٤٨٦٨، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٣٤١ / بە ژمارە: ١٩٥٩.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (نَسَائِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە ئیمامی (عُمَر)ی کوڕی (خَطَّاب)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئـەویش لـە پێغەمبـەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کـە فەرموویـەتی: «لا يُسْأَلُ الرَّجُلُ: فِـيْمَ ضَـرَبَ امْرَأَتَهُ».[٢] واتە: "نابێت پرسیار لـە پیاو بکرێت: بۆچی داوێتی لـە ژنەکەی خۆی؟"

## باسێك: {حوكمی شەرع لەبارەی نووسین و وتنی شیعرەوە}

لەبارەی شیعرەوە حەدیسێکمان بۆ ڕیوایەت کراوە لە (مُسْنَد)ی زانای پایەبـەرز (أَبو يَعْلَى)ی (مَوْصِلِيّ)دا، بە ڕشتەیەکی (حَسَن) لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: جارێك لـەبارەی شیعرەوە پرسیار لـە پێغەمبـەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) کرا، ئەویش فـەرمووی: «هُوَ كَلامٌ، حَسَـنُهُ كَحَسَـنِ الْكَلامِ، وَقَبِيْحُهُ كَقَبِيْحِ الْكَلامِ».[٣] واتە: "شیعر قسـەیە، جوانەکـەی وەکـو قسـەی جوان وەهایەو، ناشیرینەکەشی وەکو قسەی ناشیرین وەهایە".

---

(١) ئیمامی نەوەوی پێشتر فەرموویەتی: ئەم حەدیسە حەدیسێکی (حَسَن)ـەو، دواتریش لە سێ حەدیسەکەی کۆتـایی کتێبەکـەدا جـارێکی تـر دەیهێنێتـەوەو، دەفـەرموێت: حەدیسـێکی (حَسَن)ـە. جا سەیرە بەلامەوە، کە لێرەدا دەفەرموێت: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە!!

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٦٥٢ / بە ژمـارە: ٢١٤٧، وسُنَنُ النَّسَـائِيِّ الْكُبْـرَى / ٥ / ٣٧٢ / بە ژمـارە: ٩١٦٨، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٦٣٩ / بـە ژمـارە: ١٩٨٦. ئیمـامی (حَاكِم)یش ڕیوایەتی کردوەو، فەرموویەتی: ڕشتەکەی (صَحِيْح)ـە. بڕوانـە: الْمُسْـتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ٤ / ١٩٤ / بە ژمارە: ٧٣٤٢. بەڵام هەندێك لـە زانایـان فەرموویانـە: ڕشتەکەی کەسێکی لاوازی تێدایە. بڕوانـە: فَيْضُ الْقَدِيْرِ / ٦ / ٣٩٧، وأَسْنَى الْمَطَالِبِ فِيْ أَحَادِيْثَ مُخْتَلِفَةِ الْمَرَاتِب / ٣٢٩ – ٣٣٠ / بە ژمارە: ١٧٤٥.

(٣) بڕوانە: مُسْنَدُ أَبِيْ يَعْلَى / ٨ / ٢٠٠ / بە ژمارە: ٤٧٦٠. دەقی حەدیسـەکە لـە نوسـخەی بەچاپگەیەنراودا بەم جۆرەیە: «هُوَ كَلَامٌ. فَحَسَنُهُ حَسَنٌ وَقَبِيحُهُ قَبِيحٌ».

زانایان فەرموویانە: مانای ئەم حەدیسە ئەوەیە، کە شیعرو هۆنراوە هەروەکو پەخشان وەهایە. بەڵام خۆبۆتەرخان کردنی‌و، تایبەت خەریکبوونی کارێکی خراپە.

جا لە چەند حەدیسێکی (صَحِيْح)دا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) گوێی لە شیعر گرتوەو[1]، فەرمانیشی بە هاوەڵی خۆشەویست (حَسَّان)ی کوڕی (ثَابِت) کردوە، کە شیعری (هِجَاء) بەسەر کافرەکاندا بڵێت.[2]

هەروەها هاتوە کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِنَّ مِنَ الشِّعْرِ حِكْمَةً».[3] واتە: "بەڕاستی جۆرێك لە شیعر حیکمەت‌و ئامۆژگاری چاکی تێدایە، یان قسەی ڕاست‌و دروستی تێدایە".

هەروەها هاتوە کە فەرموویەتی: «لَأَنْ يَمْتَلِئَ جَوْفُ أَحَدِكُمْ قَيْحاً، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمْتَلِئَ شِعْراً».[4] واتە: "ئەگەر بۆشایی سکی یەکێك لە ئێوە پڕ ببێت لە کێم‌و زوخاو، باشترە بۆی کە پڕبێت لە شیعر".

---

(١) یەکێك لەوانە ئەو حەدیسەیە کە ئیمامی (أَحْمَد)و (تِرْمِذِيّ) ڕیوایەتیان کردوە لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ی کوڕی (سَمُرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: زیاتر لە سەد جار لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا دانیشتووم‌و، هاوەڵان شیعریان خوێندۆتەوە. ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە. بڕوانە: مُسْنَدُ الْإِمَامِ أَحْمَد / ٣٤ / ٤٣٦ / بە ژمارە: ٢٠٨٥٣، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ١٤٠ / بە ژمارە: ٢٨٥٠.

(٢) وەکو ئیمامی بوخاری‌و موسلیم ڕیوایەتیان کردوە، لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (بَرَاء)ی کوڕی (عَازِب)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت). بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٧٩ / بە ژمارە: ٥٨٠١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٩٣٣ / بە ژمارە: ٢٤٨٦.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٧٦ / بە ژمارە: ٥٧٩٣.

(٤) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٧٩ / بە ژمارە: ٥٨٠٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧٦٩ / بە ژمارە: ٢٢٥٨. ئیمامی نەوەوی فەرموویەتی: مەبەستی فەرمایشتەکە ئەوەیە، کە کەسەکە بەجۆرێك شیعر زاڵبووبێت بەسەریدا، کە مەشغوڵ‌و سەرقاڵی بکات‌و، نەیپەرژێتە

جا هەموو ئەم فەرمایشتانە بەو جۆرە لێکدەدرێنەوە کە باسمان کرد.

## باسێك: {نەهی کردن لە خراپگۆیی و زمانپیسی}

یەکێکی تر لەو کارانەی کە نەهی لێ کراوە بریتیە لە خراپگۆیی و زمانپیسی.

ئەو حەدیسە (صَحِيْح)انەش کە لەو بارەوە هاتوون زۆرو ناسراون.

مانای خراپگۆیی و زمانپیسیش ئەوەیە، کە کەسێك ڕاشکاوانە باسی شتی خراپ و قێزەون بکات، ئیتر باوەکو قسەکە ڕاستیش بکات و، کابراش ڕاست بکات.

جا ئەم جۆرە قسانەش زۆرتر پەیوەندیان بە جووتبوون و شتی لەو جۆرەوە هەیە.

بۆیە پێویستە لەو بوارەدا قسەی کینایەدار بکرێت و، بە تەعبیرێکی جوان قسەکە بکرێت، کە مەبەستەکەی لێوە وەربگیرێت.

جا ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزو حەدیسە (صَحِيْح)ـە پیرۆزەکانیش هەر بەو جۆرە هاتوون:

- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَائِكُمْ﴾ [الْبَقَرَة: ١٨٧]. واتە: {ئەو شەوەی بەیانی بەڕۆژوو دەبن جووتبوون لەگەڵ خێزانەکانتاندا حەڵاڵە بۆتان}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُ وَقَدْ أَفْضَى بَعْضُكُمْ إِلَى بَعْضٍ﴾ [النِّسَاء: ٢١]. واتە: {چۆن دەکرێت ئێوە مارەیی ژنەکانتان ببەن بۆ خۆتان، لەکاتێکدا کە لە ڕێگەی جووتبوونەوە چێژتان لەیەکتر بردوە}.

---

سەر خوێندنی قورئانی پیرۆزو، فێربوونی سەرجەم زانستە شەرعیەکانی ترو، زیکری خوای گەورە.

• هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ﴾ [البَقَرَة: ٢٣٧].
واتە: {ئەگەر ژنەکانتان تەلاقدا بەر لەوەی دەستیان پێ بگەیەنن‌و جووتبن لەگەڵیاندا}.

هەروەها گەلێك ئایەت‌و حەدیسی (صَحِيْح) لەم بارەوە هاتوون.

زانایان فەرموویانە: دەبێت مرۆڤی موسوڵمان بۆ ئەم جۆرە کارانە، ئەو تەعبیرە ڕاشکاوانە بەکار نەهێنێت، کە مایەی شەرمەزارین، بەڵکو بە کینایە باسیان بکات.

بۆ نموونە: لەبریتی (جِمَاع)ی ئافرەت تەعبیری (إِفْضَاء)و (دُخُوْل)و (مُعَاشَرَة)و (وِقَاع)و شتی لەو جۆرە بەکار بهێنێت‌و، بە ڕاشکاوانە وشەی (نَيْك)و (جِمَاع)و شتی لەو جۆرە بەکارنەهێنێت.

هەروەها لەبریتی ئەوەی بڵێت میزم کرد، یان پاشەڕۆم کرد، با باسی جێبەجێ کردنی پێویستی‌و، چوون بۆ سەرئاو بکات‌و، بەڕاشکاوانە باسی میزو پاشەڕۆو شتی لەو جۆرە نەکات.

بەهەمان شێوە بۆ باسی هەندێك عەیبەو نوقسانی، وەکو (بەڵەکی)و (بۆنی دەم)و (بۆگەنی لاشە)و شتی لەو جۆرە، با تەعبیری جوانی وەها بەکار بهێنێت، کە مەبەستەکەیان پێ بگات.

ئیتر هەرچی شتی تریش هەیە، هەر بەم جۆرە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت.

پاشان بزانە کە هەموو ئەمانە کاتێك وەهایە، کە پێویست نەکات بەڕاشکاوی باس بکرێن. خۆ ئەگەر پێویستی کرد، بۆ ڕوونکردنەوەو فێرکردن، یان ترسی ئەوە هەبوو کە کەسی بەرامبەر لە کینایەو مەجاز حاڵی نەبێت، یان بەجۆرێکی تر حاڵی ببێت، ئەوا با ڕاشکاوانە باسیان بکات، تا بە تەواوەتی کەسی بەرامبەر تێ بگات.

جا ئەو حەدیسانەش کە بەڕاشکاوی باسی هەندێك لەم شتانەی تێدا کراوە[1]، هەر بەم جۆرە لێکدەدرێنەوە. واتە: بۆ کاتی پێویستیە، وەکو باسمان کرد. چونکە گەیاندنی مەبەستو تێگەیاندنی کەسی بەرامبەر لە کاتی پێویستیدا لە ڕەچاوکردنی ئەدەب باشترە. تەوفیقیش تەنها بەدەستی خوایە.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «ئیمانداری تەواو زۆر تانەو توانج لە خەڵکی نادات، زۆریش نەفرین نایەت بەدەمیداو، خراپەکاریش نیەو، خراپەگۆو زمانپیسیش نیە».

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَا كَانَ الْفُحْشُ فِي شَيْءٍ إِلَّا شَانَهُ، وَمَا كَانَ الْحَيَاءُ فِي شَيْءٍ إِلَّا زَانَهُ». واتە: "خراپەگۆییو خراپەکاری لە هەر شتێکدا بێت، ناشرینی دەکات، شەرمو حەیاش لە هەر شتێکدا بێت، جوانی دەکات".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

---

(١) وەکو ئەو حەدیسەی کە ئیمامی بوخاری بۆمان ڕیوایەت دەکات، لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: کاتێك (مَاعِز)ی کوڕی (مَالِك) هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خواو، عەرزی کرد: زینام کردوە. پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) پێی فەرموو: «لَعَلَّكَ قَبَّلْتَ أَوْ غَمَزْتَ أَوْ نَظَرْتَ». ئەویش عەرزی کرد: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا. پێغەمبەریش پێی فەرموو: «أَنِكْتَهَا؟». بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٦ / ٢٥٠٢ / بە ژمارە: ٦٤٣٨.

(٢) پێشتر تەخریجمان کرد.

## باسێك: {پێویستە باوكو دایك مامەڵەی چاكیان لەگەڵدا بكرێتو، نەڕەنجێنرێن}

ڕەنجاندنو زویركردنی باوكو دایكو هاوێنەكانیان كارێكی زۆر حەرامە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَقَضَى رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِنْدَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُلْ لَهُمَا أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُلْ لَهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا * وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُلْ رَبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا﴾ [الْإِسْرَاء: ٢٣ – ٢٤]. واتە: {خوای گەورە فەرمانی كردوەو بڕیاری داوە كە دەبێت تەنها ئەو بپەرستنو، مامەڵەی چاكیش لەگەڵ باوكو دایكدا بكەن، جا ئەگەر یەكێكیان یان هەردووكیان پیر بوونو بەساڵدا چوون نابێت ئۆفیان لەدەست بكەیتو، زویریان بكەیت، بەڵكو دەبێت بە ڕێزەوە قسەیان لەگەڵدا بكەیت * بە ملكەچیەوە باڵی سۆزو بەزەییان بۆ ڕابخەو، بڵێ: پەروەردگارم بەزەییت پێیاندا بێتەوە، وەكو چۆن ئەوان منیان بە منداڵی پەروەردە كرد}.

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی كوڕی (عَمْرو)ی كوڕی (عَاص)ـەوە (خوا لە خۆیو باوكیشی ڕازی بێت)، كە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مِنَ الْكَبَائِرِ شَتْمُ الرَّجُلِ وَالِدَيْهِ». واتە: "یەكێك لە تاوانە گەورەكان بریتیە لە: قسەوتنی كەسێك بە باوكو دایكی خۆی!". هاوەڵانیش عەرزیان كرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، گوایە كەس قسە بە باكو دایكی خۆی دەڵێت؟!" ئەویش فەرمووی: «نَعَمْ، يَسُبُّ أَبَا الرَّجُلِ، فَيَسُبُّ أَبَاهُ، وَيَسُبُّ أُمَّهُ، فَيَسُبُّ أُمَّهُ». واتە: "بەڵێ، ئەو قسە بە باوكو دایكی كەسێكی تر دەڵێتو، كەسەكەش قسە بە باوكو دایكی ئەو دەڵێتەوە".[1]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٢٨ / بە ژمارە: ٥٦٢٨، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٩٢ / بە ژمارە: ٩٠.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ژنێکم هەبوو، خۆشم دەویستو، ئیمامی (عُمَر)یش ڕقی لێیبوو، جا پێی فەرمووم: (تەڵاقی بدە)، منیش بەگوێم نەکردو تەڵاقم نەدا، ئەویش تەشریفی برد بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)و، مەسەلەکەی بۆ باسکرد، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: «تەڵاقی بدە».

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[1]

## نەهی کردن لە درۆ کردنو، باسی جۆرەکانی

چەندین دەقی قورئانی پیرۆزو سونەتی پێغەمبەری خوا هاتوون سەبارەت بە حەرامێتی درۆ کردن بە شێوەیەکی گشتی.

درۆ کردنیش یەکێکە لە تاوانە قێزەونەکانو، عەیبو نەنگیە ناشیرینەکان.

جا سەرەڕای ئەو دەقە ئاشکرانەی کە لەبارەیەوە هاتوون، کۆدەنگیش هەیە لەسەر حەرامێتیەکەی. بۆیە پێویست ناکات یەکە بەیەکەی دەقەکان بهێنرێن. بەڵکو ئەوەی گرنگە بریتیە لە باسکردنی ئەو جۆرانەی کە لێی هەڵاوێر کراونو، هۆشداریێدان لەسەر وردەکاریەکانی درۆ کردن.

ئەوجا سەبارەت بە خۆپاراستنو دوورکەوتنەوە لە درۆ کردن ئەو حەدیسە بەسە کە ئیمامی بوخاریو موسلیم بەصەحیحیان داناوە. ئەویش بریتیە لەو حەدیسەی کە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا بۆمان ڕیوایەت کراوە،

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٥٧ / بە ژمارە: ٥١٣٨، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٣ / ٤٩٤ / بە ژمارە: ١١٨٩.

له هاوه‌ڵی خۆشه‌ویست (أَبُــو هُرَيْــرَة)وه (خوای لێ ڕازی بێت)، كـه فه‌رموویـه‌تی: پێغه‌مبه‌ری خوا (درودی خوای له‌سه‌ر بێت) فه‌رموویـه‌تی: «نیشـانه‌ی كه‌سـی مونـافیق‌و دووڕوو سـێ شـته: ئه‌گـه‌ر قسـه بكـات، درۆ ده‌كـات‌و، ئه‌گـه‌ر بـه‌ڵێن بـدات، پێچه‌وانه‌ی به‌ڵێنه‌كه‌ی ده‌كـات‌و، ئه‌گـه‌ر شـتێكی پـێ بسـپێردرێت‌و متمانـه‌ی پـێ بكرێت، ناپاكی‌و خیانه‌ت ده‌كات».[1]

بۆشمان ڕیوایه‌ت كراوه لـه هه‌ردوو صه‌حیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لـه هـاوه‌ڵی خۆشه‌ویست (عَبْدُاللّه)ی كوڕی (عَمْرو)ی كوڕی (عَاص)ـه‌وه (خوا له خۆی‌و باوكیشـی ڕازی بێت)، كه پێغه‌مبه‌ری خوا (درودی خوای له‌سه‌ر بێت) فه‌رموویه‌تی: «أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيْهِ كَانَ مُنَافِقاً خَالِصاً، وَمَنْ كَانَتْ فِيْهِ خَصْلَةٌ مِنْهُنَّ كَانَتْ فِيْهِ خَصْلَةٌ مِنْ نفـاقٍ حتَّـى يَدَعَها: إِذَا ائتُمِنَ خَانَ، وَإِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ، وَإِذَا خَاصَمَ فَجَـرَ».[2] واته: "چوار سیفه‌ت هه‌ن، ئه‌و كه‌سه‌ی هه‌موویانی تێدابێت، مونافیق‌و دووڕوویـه‌كی ته‌واوه. ئه‌و كه‌سه‌ش یه‌كێكیانی تێدابێت، سیفه‌تێكی دووڕوویی تێدایـه، هـه‌تا وازی لێ ده‌هێنێت (سـیفه‌ته‌كانیش ئه‌مانـه‌ن): ئه‌گـه‌ر متمانـه‌ی پێكـرا، خیانـه‌ت‌و ناپـاكی ده‌كات‌و، ئه‌گه‌ر قسه‌شی كـرد، درۆ ده‌كـات‌و، ئه‌گـه‌ر پـه‌یمان‌و بـه‌ڵێنیش بـدات، ده‌یشكێنێت‌و غـه‌در ده‌كـات‌و، ئه‌گـه‌ر كێشه‌یه‌كیشـی له‌گـه‌ڵ كه‌سـێكدا هـه‌بوو، ناهه‌قی پێ ده‌كات‌و سته‌می لێ ده‌كات (به‌وه‌ی كه مافه‌كه‌ی بـۆ ناگه‌ڕێنێتـه‌وه، یـان داوای مافی ئه‌و ده‌كات بۆ خۆی)".

لـه ڕیوایه‌ته‌كه‌ی ئیمامی موسلیمدا لـه بریتی (وَإِذَا ائْتُمِنَ خَانَ) ڕسـته‌ی (إِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ) هاتوه.

---

(١) پێشتر ته‌خریجمان كرد.

(٢) بڕوانه: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢١ / به ژمـاره: ٣٤، وصَــحِيْحُ مُسْـلِم / ١ / ٧٨ / بـه ژماره: ٥٨.

سەبارەت بەو حاڵەتانەش کە لە مەسەلەی درۆ کـردن هـەڵاوێر کـراون، ئـەوە بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسـلیمدا، لـە ژنـەهاوەڵی خۆشەویست {(أُمُّ كُلْثُوْم)ی کچی (عُقْبَة)ی کوڕی (أَبو مُعَيْط)}ــەوە (خـوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەو گوێی لە پێغەمبەری خوا بوە (دروودی خـوای لەسـەر بێـت)، فەرموویـەتی: «لَيْسَ الْكَذَّابُ الَّذِيْ يُصْلِحُ بَيْنَ النَّاسِ فَيَنْمِيْ خَيْراً، أوْ يَقُوْلُ خَيْراً».[1] واتە: "درۆزن ئەو کەسە نیە، کە نێوان خەڵکی ڕێك دەخاتو، قسەی خـەیرو چـاك لـەنێوانیانـدا دێنێو دەبا، یان قسەی خەیر دەکـات (بـۆ نموونـە دەڵێـت: فلانەکـەس سـلاوی لێ دەکردیت، یان تۆی زۆر خۆش دەوێت، یان باسی چاکەی تۆی دەکرد......هتد)".

جا دەقی حەدیسەکە تا ئێرە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسـلیمدا هـاتوە. ئیمامی موسلیمیش لە ڕیوایـەتێکی خۆیـدا ئەمەشـی بـۆ زیـادکردوە: (أُمُّ كُلْثُـوْم) فەرموویەتی: من گوێم لە پێغەمبەری خوا نەبوە ڕێگە بە هیچ جۆرە درۆیـەك بـدات -واتە ئەوەی لەناو خەڵکیدا دەکرێت-، تەنها لە سێ حاڵەتـدا نـەبێت، ئـەوانیش: جەنگو، چاکسازی لەنێوان خەڵکیو، قسەی ژنو مێرد بۆ یەکتری.

جا ئەم حەدیسـە ڕاشـکاوە لـەوەدا، کـە هەنـدێك جـۆری درۆ کـردن لەبـەر بەرژەوەندی حەلاڵو ڕەوان.

زانایانیش بە مەزبووتی باسی ئەو جۆرانـەیان کـردوە، کـە حـەلاڵن. جـوانترین فەرمایشتێکیش کە من بینیومە سەبارەت بە باسکردنیان بـە مـەزبووتی، ئەوەیـە کـە پێشەوای پایەبەرز (أَبو حَامِد)ی (غَزَالِيّ) باسی کردوەو، فەرموویـەتی: قسـە کـردن هۆکارە بۆ گەیاندنی مەبەستەکان. هەر مەبەستێکیش باشو پەسەند بێتو، بشکرێت لەڕێگەی قسەی ڕاستو درۆشەوە کەسـێك پێـی بگـات، ئـەوە درۆ کـردن تێیـدا حەرامە. چونکە پێویست بە درۆ کردن ناکات. خۆ ئەگەر دەکرا بە درۆ کردن پێی

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٩٥٨ / بە ژمارە: ٢٥٤٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠١١ / بە ژمارە: ٢٦٠٥.

بگەیتو، بە ڕاست کردن نەدەکرا، ئەوا درۆ کردن تێیدا حـەڵاڵو ڕەوایـە، ئەگـەر دەستخسـتنی ئـەو مەبەسـتە خـۆی لەخۆیـدا حـەڵاڵو ڕەوا بێـتو، خـۆ ئەگـەر دەستخستنی مەبەستەکە واجب بێـت، ئـەوا درۆ کردنەکـەش واجـب دەبێـت. بـۆ نموونە: ئەگەر موسـوڵمانێك خـۆی لـە سـتەمكارێك شـاردەوەو، سـتەمكارەكەش هەواڵی پرسی، پێویستە درۆ بکرێت سەبارەت بە خۆشاردنەوەکەی.

بەهەمان شێوە ئەگەر کەسێك ئەمانەتێکی لابـوو، یـان لای کەسـێکی تـر بـوو، ستەمكارێكیش هەواڵی دەپرسیو، دەیویست بیبـات، ئـەوا واجبـە درۆ بکـات بـۆ شـاردنەوەی. بـەجۆرێك ئەگــەر کــابرای ئەمانەتدانــەر خــۆی خەبــەری دا بــە ستەمكارەکەو، ئەویش بـەزۆر بـردی، ئـەوا زەمانـەتی ئەمانەتەکـە لەسـەر خـودی کابرای ئەمانەتدانەر دەبێت، کە خەبەری داوە. خۆ ئەگەر ستەمكارەکە سوێندیشـی بدات لـەسەری، ئەوا دەبێت سوێند بخواتو، لـە سوێندەکەیدا (تَوْرِيَة) بەکاربهێنێت. جا ئەگەر سوێندی خواردو (تَوْرِيَة)شـی بـەکار نـەهێنا، ئـەوا دروسـترین بۆچـوون لـەسەر ئەوەیە، کە سوێندەکەی دەکەوێت. بەڵام بۆچوونێکی لاواز هەیە، کـە پێـی وایە سوێندەکەی ناکەوێت.

بەهەمان شێوە ئەگەر ئامانجو مەبەسـتی جـەنگێك، یـان چاکسـازی نێـوان دوو کەس، یان هەوڵدان بۆ نەرمکردنی دڵی کەسێکی تاوانلەسـەرکراو بـۆ ئـەوەی لـە کابرای تاوانبار خۆش ببێت، بە درۆ کردن نـەبێت نەدەهاتـەدی، ئـەوا درۆ کـردن حەرام نیە. بێ گومان ئەمەش کاتێك کە مەبەستەکە تەنها بە درۆ کردن دەهاتەدی.

جا ئیحتیات لە هـەموو ئەمانـەدا ئەوەیـە کـە (تَوْرِيَــــة) بـەکاربهێنرێت. مانـای (تَوْرِيَة)ش ئەوەیە، کە مەبەست بەو شتەی سـوێندەکەی لەسـەر دەخـوات شـتێکی ڕاستو دروست بێت، خۆی بە درۆی نەزانێت، ئیتر باوەکو بەڕواڵـەتیش درۆ بێت.

هەروەها ئەگەر مەبەستێکی ڕاستو دروستیشی نەبوو، بەڵکو بە قسـەکەی بـە ڕەهایی کردبوو، ئەوا لـەم حاڵـەتەشدا درۆ کردنەکە هەر حەرام نیە.

پێشەوای پایەبەرز (أَبو حَامِد)ی (غَزَالِيّ) فەرموویەتی: بـە هـەمان شـێوە ئەگـەر درۆ کردنەکە پەیوەندی بـە مەبەسـتێکی دروسـتی خۆیـەوە، یـان کەسـێکی تـرەوە هەبوو.

مەبەستی دروستی خۆی وەکو ئـەوەی کـە کەسـێکی سـتەمکار گرتوویـەتی‌و، داوای ماڵ‌و پارەی لێ دەکات، تا بیبات. لـەم حاڵـەتەدا بۆی هەیە نکوڵی لێ بکات‌و، بڵێت: ماڵ‌و پارەم نیە. یـان دەسـەڵاتداری وڵات پرسـیاری تـاوان‌و خراپەیـەکی لێ دەکات، کە ئـەنجامی داوەو، تـەنها خـۆی‌و خـوای گـەورە ئاگایـان لێیـەتی. لـەم حاڵەتەشدا بۆی هەیە نکـوڵی لێ بکـات. بـۆ نموونـە بڵێـت: زینـام نـەکردوە، یـان مەشروبم نەخواردۆتەوە.

جا چەندین حەدیسی مەشهوور هەن، سەبارەت بە تەڵقین کردنی ئەو کەسـانەی دانیان بە یەکێك لـەو تاوانانەدا نـاوە، کـە حـەدی شـەرعیان لەسـەرە، جـا تـەڵقین دەکرێن بەڵکو لـە دانپێدانانەکەیان پاشگەز ببنەوە.[1]

سەبارەت بە مەبەستی دروستی کەسێکی تریش وەکو ئەوەی کە پرسیاری نهێنی برایەکی خۆی لێ بکرێت، ئەویش نکوڵی لێ بکات. یان شتێکی لـەو جۆرە.

ئەوجا دەبێت بەراوردێك بکرێت لـەنێوان خراپەی درۆ کردنەکەو، ئەو خراپەی لـە ئەنجامی ڕاست کردنەکەوە پەیدا دەبێت. خۆ ئەگەر خراپـەی ڕاسـت کردنەکـە زیانی زیاتر بوو، ئەوا دەکرێت درۆکە بکرێت. بەڵام ئەگەر بە پێچەوانەوە بوو، یـان گومان هەبوو کە کامیان زیانیان زیاترە، ئەوا حەرامە درۆکە بکرێت.

---

(١) وەکو حەدیسەکەی (مَاعِز)ی کوڕی (مَالِك)، کە عـەرزی پێغەمبـەری خـوای کـرد: زینـام کردوە. پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێت) پێی فـەرموو: «لَعَلَّكَ قَبَّلْـتَ أَوْ غَمَـزْتَ أَوْ نَظَرْتَ».

پاشان هەر کاتێك دروست بێت کەسێك درۆ بکات، ئـەوا ئەگـەر مەبەسـتەکە پەیوەندی بەخۆیەوە هەبوو، سونەت وەهایە، کە درۆ نەکات. بەڵام ئەگەر پەیوەندی بە کەسێکی ترەوە هەبوو، ئەوا ناکرێت چاوپۆشی لـە مافی ئەو کەسەکەدا بکرێـت. ئەگەرچی لەو حاڵەتانەشدا کە درۆ کردن دروستو ڕەوایە، باشتر وەهایە کـە درۆ هەر نەکرێت، مەگەر بڵێین درۆ کردنەکە واجبە، ئەو کاتە دەبێت بکرێت.

بزانە کە بەلای ئەهلی سونەوە درۆ کردن بریتیە لـە خەبـەردان لـە شـتێك بـە پێچەوانەی ئەوەی کە خۆی هەیە (واتە شـتێك بڵێیـت، کـە وا نـەبێت)، ئـیتر ئایـا بەدەستی ئەنقەست بیکەیت، یان بە نەزانین. بەڵام لـەکاتی نەزانیندا کەسەکە تاوانبار نابیت. بەڵکو تەنها لـەکاتی دەستی ئەنقەستدا تاوانبار دەبیت.

هاوەڵانیشمان بەڵگەیان بەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خـوا هێناوەتـەوە، کـە درۆ کردنی بەستۆتەوە بە دەستی ئەنقەستەوە، وەکو فەرموویەتی: «مَـنْ كَـذَبَ عَلَـيَّ مُتَعَمِّداً، فَلْيَتَبَوأ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ».(1)

## وا باشە مرۆڤی موسوڵمان بەر لە گێڕانەوەی قسە لە ڕاستیو ناڕاستیەکەی بکۆڵێتەوەو، نابێت هەر شتێکیشی بیست بیگێڕێتەوە، هەتا گومانی وا نەبێت کە ڕاستە

- خوای گەورە فەرموویـەتی: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولاً﴾ [الْإِسْـرَاء: ٣٦] واتـە: {شـوێنی شـتێك مەکەوە، کە زانیاریت لـەبارەیەوە نیە، چـونکە بەڕاسـتی گـوێو چـاوو دڵ هەموو ئەمانە پرسیار لـە خاوەنەکانیان دەکرێت لـەبارەیانەوە}.

---

(1) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٥٢ / بە ژمـارە: ١١٠، وصَحِيْحُ مُسْـلِم / ١ / ١٠ / بـە ژمارە: ٣.

- هەروەها فەرموویەتی: ﴿مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إِلاَّ لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ [ق: ١٨] واتە: {ئادەمیزاد هەر قسەیەك بكـات، فریشـتەیەكی لەلادایـە، ئاگـای لێیـەتیو، قسەكەی تۆمار دەكات}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَبِالْمِرْصَادِ﴾ [الْفَجْـر: ١٤] واتـە: {بەڕاسـتی پەروەردگاری تۆ چاودێریان دەكاتو لە كەمیندایە بۆیان}.

بۆشمـان ڕیوایـەت كـراوە لـە صـەحیحی موسـلیمدا لـە پێشـەوای پایەبـەرزی شوێنكەوتوان (حَفْص)ی كوڕی (عَاصِم)ـەوە، ئەویش لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْـــرَةَ)وە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، كـە پێغەمبـەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) فەرموویەتی: «كَفَى بِالْمَرْءِ كَذِباً أنْ يُحَدِّثَ بِكُلِّ مَا سَمِعَ».[1] واتـە: "هـەر ئەوەنـدە بەسە بۆ درۆ كردنی كەسێك، كە هەرچی بیست بیگێڕێتەوە".

ئیمامی موسلیم لە دوو ڕێگەوە ئـەم حەدیسـەی ڕیوایـەت كـردوە: یـەكێكیان ئەمەیەو، دوەمیشیان لە (حَفْص)ی كوڕی (عَاصِم)ـەوەیە، ئـەویش بـە (مُرْسَـــل)ی ڕیوایەتی كردوە لە پێغەمبەری خـواوە (دروودی خـوای لەسـەر بێـت)، ئـیتر باسـی (أَبُـــو هُرَيْرَةَ)ی نەكردوە. بۆیە ئەو ڕیوایەتەیان پێش دەخرێت كە لە ڕشتەكەیدا ناوی (أَبُو هُرَيْرَةَ)ی هێناوە. چونكە زیادە لە كەسی متمانەدارەوە قبوڵ دەكرێت. ئەمـەش ئـەو مەزهەبە دروستە هەڵبژێردراوەیە، كە شـەرعزانانو ئوصـولیەكانو لێكۆڵـەرەوانی فەرموودەناسانی لەسەرە، كە ئەگـەر حەدیسـێك لـە دوو ڕێگـەوە ڕیوایـەتكرابوو، یەكێكیان (مُرْسَل)و، ئەوی تریشیان (مُتَّصِل)، ئەوا (مُتَّصِل)ـەكە پـێش دەخرێـتو، حەدیسەكەش بە (صَحِيْح) دادەنرێـتو، بـۆ هـەموو مەسـەلەیەكیش دەكرێـت بـە بەڵگە، چی حوكمی شەرعی بێت یان هەر شتێكی تر. خواش لە هەموو كـەس زانـا ترە.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ١٠ / بە ژمارە: ٥.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا لە ئیمامی (عُمَـر)ی کوڕی (خَطَّاب)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: «بِحَسْبِ الْمَرْءِ مِنَ الْكَذِبِ أنْ يُحَدِّثَ بِكُلِّ مَا سَمِعَ».(1) واتە: "هەر ئەوەندە بەسە بۆ درۆ کردنی کەسێك، کە هەرچی بیست بیگێڕێتەوە".

دیسان لە صەحیحی موسلیمدا حەدیسێکی تری وەکو ئەم حەدیسەمان لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (مَسْعُوْد)ەوە بۆ ڕیوایەت کراوە (خوای لێ ڕازی بێت).(2)

هەروەها گەلێك فەرمایشتی تریش لەم بارەوە لە هاوەڵانو لە غەیری ئەوانیشەوە هاتوە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)دا، بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو مَسْعُوْد)ەوە یان لە (حُذَيْفَة)ی کوڕی (يَمَان)ـەوە (خوایان لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: لە پێغەمبەری خوام بیستوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «بِئْسَ مَطِيَّةُ الرَّجُلِ زَعَمُوا».(3) واتە: " تەعبیری (زَعَمُوا) بارگیرێکی خراپە (واتە عادەتێکی زۆر خراپە، کە کەسێك بۆ گەیشتن بە مەبەستێکی دیاریکراو سواری ئەو تەعبیرە ببێتو، هەر ئەو بەکار بهێنێت)".

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە پێشەوای پایەبەرز (أَبُو سُلَيْمَان)ی (خَطَّابِيّ)ـەوە، کە لە کتێبی (مَعَالِمُ السُّنَن)دا فەرموویەتی: ئەصڵی ئەم حەدیسە ئەوەیە، کە ئەگەر کەسێك ویستبێتی بگات بە پێویستیەکی خۆیو بڕوات بۆ شارێك، سواری وڵاخێك دەبوو، دەڕۆیشت هەتا دەگەیشتە پێویستیەکەی. جا پێغەمبەری خواش تەعبیری

---

(1) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / 1 / 11 / بە ژمارە: 5.

(2) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / 1 / 11 / بە ژمارە: 5.

(3) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / 2 / 712 / بە ژمارە: 4972.

(زَعَمُوا)ی شوبهاندوه به ولاَخـەوه -کـە کەسـێك بـەر لـە قسـە کـردن بـەکاری دەهێنێت، تا پێی بگات به مەبەستەکەی خۆی-.

جا تەعبیری (زَعَمُوا) بۆ گێڕانەوەی حەدیسێك بـەکار دەهێنرێـت، کـە ڕشـتەی نەبێت و کەسی متمانەدار نەیگێڕابێتەوه. بەڵکو تەنها بـۆ گێڕانـەوەی قسـەیەکە کـە گەیشتوه.

پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) زەمی ئەو جۆره قسەیەی کردوه، کـە بەو جۆره گەیشتوه به کەسەکەو، فەرمانیشی بەو کەسه کـردوه کـە لـە ڕاسـتیو ناڕاستی قسەکه بکۆڵێتەوەو، نەیگێڕێتەوه هەتا لە ڕێگەی کەسی متمانـەدارەوه پێـی نەگات.

ئەمه فەرمایشتەکەی شێخی (خَطَّابِيّ) بوو.[1] خواش لە هەموو کەس زانا تره.

## باسی بەکارهێنانی ئوسلوبی (تَعْرِيْض)و (تَوْرِيَة)

بزانه کە ئەم باسـە یەکێکـە لـە باسـە هـەره گرنگـەکان، چـونکە زۆر بـەکار دەهێنرێتو، خەڵکیش بەگشـتی پێیـەوه گـیرۆدەن. بۆیـە دەبێـت بـە وردی باسـی بکەینو، دەبێت ئەو کەسەش دەیخوێنێتەوه بـە وردی لێـی تێبگـاتو کاریشـی پـێ بکات.

پێشتریش باسی ئەوەمان کـرد کـە درۆ کـردن کـارێکی زۆر حەرامـەو، باسـی ئەوەشمان کرد کە بەرەلاَکردنی زمان چەندە مەترسیداره. جا ئەم باسە ڕێگایەکە بـۆ سەلامەتی لەو مەترسیه.

---

(١) بڕوانه: مَعَالِمُ السُّنَن / ٤ / ١٣٠.

ئەوجا بزانە کە (تَوْرِيَة)و (تَعْرِيْض) ئەوەیە، کە تۆ وشـەیەك بـەکاربهێنیت، ئـەو بەڕواڵەت مانایەکی تایبەتی هەبێت‌و، تۆش مەبەستت پێـی مانایـەکی تـر بێـت، کـە وشەکە ئەویش دەگرێتەوە، بەڵام ئەو مانایـە پێچـەوانەی ڕواڵـەتی وشـەکەیە. کـە ئەمەش جۆرێکە لـە جۆرەکانی فێڵ‌و خەڵەتاندن.

زانایان فەرموویانە: ئەگـەر بەرژەوەندیـەکی شـەرعی بـەهێزتر لـە خەڵەتانـدنی کەسی بەرامبەر وای دەخواست کە بەو جۆرە قسە بکرێت، یان پێویسـتیەکی وەهـا هەبوو، کە تەنها بە درۆ کردن دەهاتەجێ، ئەوە قەیناکە (تَعْــرِيْض) بـەکاربهێنرێت. خۆ ئەگەر هیچکام لەمانە نەبوون، ئەوە ناپەسەندە، بەڵام حەرام نیە، مەگەر بکرێت بە هۆکارو ڕێگەیەك بۆ دەستکەوتنی شـتێکی ناحـەق، یـان بـۆ بـەلاوەنانی حـەق‌و ڕاستی، ئیتر لـەم کاتەدا دەبێت بە حەرام. ئائەمەش ڕێسای باسەکەیە.

سەبارەت بەو فەرمایشتانەش کە سەبارەت بـەم باسـە هـاتوون، هەنـدێکیان بـە ڕەواو حەڵاڵی دادەنێن‌و، هەندێکیش بە حەڵاڵی دانانێن. جا ئەو فەرمایشتانەش بـەم جۆرە لێکدەدرێنەوە کە ئێمە باسمان کرد.

یەکێك لـەو فەرمایشتانەی دەربارەی قەدەغەیی‌و ڕێگری لێ کردن هاتوە ئەوەیـە کە بۆمان ڕیوایەت کراوە لـە (سُنَن)ی (أَبُوْ دَاوُد)دا بە ڕشتەیەکی لاواز –بەڵام ئـەو بەلاوازی دانەناوە، ئەمەش وا دەخوازێت کە بەلای ئەوەوە (حَسَــــن) بێـت، وەکـو پێشتر باسمان کرد–، لـە هاوەڵی خۆشەویست (سُفْيَان)ی کوڕی (أَسِيْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: لـە پێغەمبەری خوام بیستوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کـە فەرموویەتی: «كَبُرَتْ خِيانَةً أنْ تُحَدِّثَ أخَاكَ حَدِيْثاً، هُوَ لَكَ بِهِ مُصَدِّقٌ، وَأَنْــتَ بِــهِ كَاذِبٌ».[1] واتە: "خیانەت‌و ناپاکیەکی زۆر گەورەیـە، کـە قسـەیەك بـۆ برایـەکی خۆت بکەیت، ئەو باوەڕت پێ بکات‌و، تۆش درۆی لـەگەڵدا بکەیت".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧١١ / بە ژمـارە: ٤٩٧١. حـافظـی عێراقـی فەرموویـەتی: هەروەها ئیمامی (أَحْمَد)و (طَبَرَانِيّ)ش لـە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویسـت (نَوَّاس)ی کـوڕی

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە زانای پایەبەرز (ابْنُ سِيْرِيْن)ـەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، کە فەرموویەتی: بازنەی قسە کردن لەوە فراوانترە کە کەسی ڕێکوپێك درۆ بکات.

نموونەی (تَعْرِيْض)ی ڕەواو حەلاڵیش وەکو ئەوەی کە شێخی (نَخَعِــيّ) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ئەگەر قسەیەکی تۆ گەیشتەوە بـە پیاوێـك، تـۆ بڵــێ: (اللهُ يَعْلَمُ مَا قُلْتُ مِنْ ذَلِكَ مِنْ شَيْءٍ). جـا کەسـی بیســەر وا گومـان دەبـات، کـە تـۆ قسەکەت نەکردوەو، مەبەستی تۆش ئەوەیە کە خـوا ئاگـای لـەوەیـە مـن وتوومـە. (چونکە کەسـی بیســەر وا تێـدەگات کـە پیتـی "مَــا" بـۆ نەفیـە، کەچـی ئیسـمی مەوصولـە).

دیسان شێخی (نَخَعِيّ) فەرموویەتی: بە کوڕەکەت مەڵێ: "أشْتَرِيْ لَكَ سُــكَّراً". واتە: "شەکرت بۆ دەکڕم، یان شەکرت بۆ بکڕم؟" بـەڵکو پێـی بڵــێ: "ئـەوە چـی دەڵێیت ئەگەر شەکرت بۆ بکڕم؟". (چونکە تەعبیری یەکەم ئەگەری بەڵێن پێـدانی هەیە، کە ڕەنگە دواتر نەتوانیت بۆی جێبەجێ بکەیت).

هـەروەها ئەگــەر کەسـێك هـەواڵی شـێخی (نَخَعِــيّ) بپرسـیایە، ئـەویش بـە کەنیزەکەکەی دەفەرموو: "پێی بڵێ: بڕۆ لە مزگەوت بیبینە".

کەسێکی تر وتوویەتی: "باوکم بەر لە ئێستە لە ماڵ دەرچوە".

شێخی (شَعْبِيّ)ش بازنەیەکی دەکێشاو، دەیفەرموو بە کەنیزەکەکـەی: "پەنجـەت بخەرە ناویەوەو، بڵێ: ئەو لێرە نیە".

---

(سَمْعَان)ـەوە بە ڕشتەیەکی جوان (جَيِّــد) ڕیوایـەتیان کـردوە. بـەڵام شـێخی (هَيْثَمِــيّ) فەرموویەتی: ڕشتەکەی ئەوانیش (عُمَر)ی کوڕی (هَارُوْن)ی تێدایە، کە هەندێك لە زانایان بە متمانەداریان داناوەو، هەندێکیش بە لاواز. بڕوانـە: الْمُغْنِيْ عَنْ حَمْــلِ الْأَسْــفَار / ٢ / ٨٠٥ / بە ژمارە: ٢٩٤٩، ومَجْمَعُ الزَّوَائِد / ١ / ١٤٢ / بە ژمارە: ٦١٢.

هەروەها هاووێنەی ئەمەیە ئەو قسەیەش کە خەڵکی عادەتیان پێوە گرتوەو، بەو کەسەی دەعوەتی کردوون بۆ خواردن دەڵێن: "نیەتم هێناوە" وای تێدەگەیەنێت کە ئەو بەڕۆژوەو، کەچی مەبەستی ئەوەیە، کە نیەتی هێناوە واز لە خواردن بهێنێت.

هەروەها وەکو ئەوەی کە کەسێك پرسیار لە کەسێکی تر بکات: "فلأنە کەست بینیوە؟" ئەویش بلێت: "مَا رَأَيْتُهُ". واتە: (مَا ضَرَبْتُ رِئَتَهُ) واتە: "نەمکێشاوە بە سی ئەو کەسەدا".

هەروەها تەعبیری تری هاووێنەی ئەمانە گەلێك زۆرن.

جا ئەگەر کەسێك سوێندنی لەسەر یەکێك لەم تەعبیرانە خواردو، لە سوێنەکەشیدا (تَوْرِيَة)ی بەکارهێنا، ئەوا سوێندەکەی ناکەوێت، ئیتر ئایا سوێند بەخوا بخوات، یان بە تەلأق، یان بە شتێکی تر. بۆیە نە تەلأقەکەو نە سوێندەکەشی ناکەون. ئەمەش ئەگەر دادوەر سوێندی نەدات کە مەبەستی چی بوە. بەلأم ئەگەر سوێندی دا، ئەوا حیساب بۆ نیەتی دادوەرەکە دەکرێت، ئەگەر سوێندی بەخوا دا. خۆ ئەگەر سوێندی بە تەلأق دا، ئەوا حیساب بۆ نیەتی سوێنخۆرەکە دەکرێت. چونکە دروست نیە دادوەر سوێندی بدات بە تەلأق. لەبەرئەوە ئەویش هەر وەکو کەسانی تر وەهایە لەم بابەتەدا. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

ئیمامی (غَزَالِيّ) فەرموویەتی: یەکێك لەو درۆ حەرامانەی کە دەبێتە هۆی فاسقبوون، ئەوەیە کە خەڵکی لە هەندێك قسەدا کردوویانە بە عادەتو زیادەڕەوی تێدا دەکەن. وەکو ئەوەی کە یەکێك دەڵێت: (سەد جار پێم وتیت)و، (سەد جار داوام لێ کردیت)و، شتی لەو جۆرە، کە مەبەستی ئەوە نیە سەد جار ئەو کارەی کردوە، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کە زۆر جار کردوویەتی. جا ئەگەر تەنها یەك جار داوای کردبێت، ئەوە درۆی کردوەو، ئەگەر چەند جارێکیش داوای کردبێت، کە بەپێی عادەت کەس ئەوەندە داوای شت ناکات، ئەوا تاوانبار نابێت. خۆ ئەگەر

نەشگەیشتبوە سەد جارو، چەند جارێکی مابوو، ئەوا کابرای زیادەڕەویکار ڕووبەڕووی درۆ کردن دەبێتەوە.

منیش دەڵێم: بەڵگەی دروستی زیادەڕەوی کردنو، ئەوەش کە بە درۆ حیساب ناکرێت، ئەو حەدیسەیە کە بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) سەبارەت بە (أَبو الْجَهْم) فەرموویەتی: «ئەو گالۆك لەسەر شانی داناگرێتو، سەبارەت بە (مُعَاوِيَة)ش، فەرموویەتی: ئەو هیچماڵو پارەی نیە».[1] خۆ ئەوە شتێکی زانراو بوە کە (مُعَاوِيَة) کراسی هەبوەو لەبەری کردوەو، (أَبو الْجَهْم)یش لەکاتی خەوتنو شتی تردا گالۆکەکەی دادەنا. تەوفیقیش تەنها بەدەستی خوایە.

## ئەگەر کەسێك قسەیەکی خراپی کرد، چی بڵێتو چی بکات

- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِمَّا يَنْزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ﴾ [فُصِّلَتْ: ٣٦] واتە: {ئەگەر وەسوەسەو خەیاڵاتێك لە شەیتانەوە ڕووی لە دڵت کرد، پەنا بەخوا بگرە}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ اتَّقَوْا إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ تَذَكَّرُوا فَإِذَا هُمْ مُبْصِرُونَ﴾ [الأَعْرَاف: ٢٠١] واتە: {بەڕاستی ئەوانەی لەخوا دەترسنو، خۆیان لە تاوان دەپارێزن، ئەگەر وەسوەسەیەك لەلایەن شەیتانەوە لێیان بدات، یەکسەر بیر دەکەنەوەو، چاوی سەرو دڵیان بەکار دەکەوێتەوە}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ وَمَنْ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَى مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ * أُولَئِكَ جَزَاؤُهُمْ مَغْفِرَةٌ مِنْ رَبِّهِمْ وَجَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا

(١) بروانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ١١١٤ / بە ژمارە: ١٤٨٠. من ئەم حەدیسەم لە صەحیحی بوخاریدا نەبینیەوە!!!

الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَنِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ﴾ [آل عِمْرَان: ١٣٥ - ١٣٦] واته: {ئەوانەی ئەگەر کارێکی خراپ‌و ناشیرینیان ئەنجامدا، یان ستەمێکیان لە خۆیان کرد، خوایان بەبیردێتەوەو، داوای لێخۆشبوونی تاوانەکانیانی لێ دەکەن، جا کێ هەیە بێجگە لە خوا لە تاوان ببورێت؟ هەروەها بەردەوام نابن لەسەر ئەو خراپەو تاوانەی کردوویانەو، دەشزانن ئەگەر پەشیمان ببنەوە، خوا لێیان خۆش دەبێت، ئەگینا تووشی سزایان دەکات. جا ئەوانە پاداشتەکەیان بریتیە لە لێخۆشبوون لەلایەن پەروەردگاریانەوەو، بریتیشە لە باخ‌و باخاتێك کە چەندین ڕووبارو جۆگە بەژێریاندا ڕێ دەکەن‌و، ئەوانیش بە زیندوویی بۆ هەتاهەتایە تێیدا دەمێننەوە، جا بەڕاستی ئەمە پاداشتێکی هەرە جوان‌و باشە بۆ چاکەکاران}.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ حَلَفَ، فَقَالَ فِي حَلِفِهِ: "باللاَّتِ وَالعُزَّى"، فَلْيَقُلْ: "لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ". وَمَنْ قَالَ لِصَاحِبِهِ: "تَعَالَ أُقامِرْكَ"، فَلْيَتَصَدَّقْ».[1] واتە: "ئەو کەسەی سوێندی خواردو، لە سوێندەکەیدا وتی: بە (لات)و بە (عُزَّى)، با یەکسەر بڵێت: (لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ). ئەو کەسەش بە هاوڕێیەکی خۆی وت: وەرە با قومارت لەگەڵدا بکەم، ئەوا با لە کەفارەتی ئەو قسەدا خەیرو صەدەقەیەك بکات (یان ئەو بڕە پارە بکات بە خەیر، کە دەیەوێت قوماری پێوە بکات)".

بشزانە ئەو کەسەی قسەیەك یان کارێکی حەرام دەکات، پێویستە پەلە بکات لە تەوبە کردن، کە تەوبەش سێ پایەی هەیە: دەست بەجێ واز لە تاوانەکە بهێنێت‌و، پەشیمانیش بێت لە کردنی‌و، بڕیاریش بدات، کە هەرگیز نەگەڕێتەوە

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٨٤١ / بە ژمارە: ٤٥٧٩، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٢٦٧ / بە ژمارە: ١٦٤٧.

سەری. خۆ ئەگەر تاوانەکە مافی کەسێکیشی پێوە پەیوەست بوو، ئەوا دەبێت لەگەڵ ئەو سیانەدا کاری چوارەمیش بکات، ئەویش بریتیە لە گەڕاندنەوەی مافەکە بۆ خاوەنەکەی، یان دەستخستنی گەردن ئازادی لێی، کە پێشتریش ئەمەمان باسکرد.

ئەوجا ئەگەر تەوبەی لە یەك تاوان کرد، ئەوا پێویستە تەوبە لە هەموو تاوانەکان بکات. خۆ ئەگەر تەوبەی تەنها لە یەك تاوان کرد، ئەوا تەوبەکەی لەو تاوانە دروستە. ئەگەر بەو جۆرەی باسمان کرد تەوبەیەکی دروستی لە تاوانێك کردو، پاشان لە کاتێکی تردا گەڕایەوە بۆ کردنی تاوانەکە، ئەوا بەم کارەی دوەم گوناهبار دەبێتەوەو، پێویستە تەوبەی لێ بکاتو، تەوبەکەی یەکەمیشی بەتاڵ نابێتەوە. ئەمەش مەزهەبی ئەهلی سونەیە، بە پێچەوانەی موعتەزیلەکان کە لە هەردوو مەسەلەکەدا ڕایان جیاوازە. تەوفیقیش تەنها بەدەستی خوایە.

## باسی بەکارهێنانی چەند تەعبیرێك، کە هەندێك لە زانایان بە ناپەسەندیان داناونو، کەچی ناپەسەند نین

بزانە کە ئەم باسەش یەکێکە لە باسە پێویستەکان، نەوەکو کەس بە بۆچوونێکی پووچەڵ هەڵبخەڵەتێتو، پشتی پێ ببەستێت.

بشزانە کە پێنج حوکمە شەرعیەکە -واتە: واجبو سونەتو حەرامو ناپەسەند (مَكْـرُوْه)و حەلاڵ (مُبَـاح)- هیچیان بە بەڵگە نەبێت سابت نابن. بەڵگە شەرعیەکانیش دیارە کامانەن. کەواتە هەر حوکمێك کە بەڵگەی نەبێت، لاناکرێت بەلایەوەو، پێویستیشی بە وەڵامدانەوە نیە، چونکە نابێت بە بەڵگەو، وەڵامدانەوەشی ناوێت، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك لە زانایان بەڵگەیان هێناوەتەوە لەسەر پووچەڵ کردنەوەی ئەو حوکمەی کە بەڵگەی شەرعی نیە.

مەبەستیشم لەم پێشەکیە ئەوەیە، کە هەر مەسەلەیەکم باس کردبێت‌و، کەسێك بە ناپەسەندی دانابێت‌و، پاشان وتبێتم: ناپەسەند نیە، یان قسەیەکی پووچەڵە، یان شتێکی لەو جۆرە، ئەوە پێویست بە بەڵگەهێنانەوە ناکات لەسەر پووچەڵیەکەی. خۆ ئەگەر بەڵگەشم هێنایەوە، ئەوە هەروا هێناومەتەوە.

پاشان بۆیە ئەم باسەم کردوە، تاوەکو ڕوونی بکەمەوە هەڵە کامەیەو ڕاست کامەیە، بۆئەوەی کەس بە پایەبەرزی‌و گەورەیی ئەو زانایانە هەڵنەخەڵەتێت، کە قسە پووچەڵەکە دراوەتە پاڵیان.

بزانە کە من ناوی ئەو زانایانە نابەم، کە فەرموویانە ئەم تەعبیرانە ناپەسەندن، تاوەکو لە پلەو پایەیان نەیەتە خوارەوەو، گومانی خراپیان پێ نەبرێت.

مەبەستەکەش ئەوە نیە کە لەکەدار بکرێن‌و لە پلەوپایەیان بهێنرێتە خوارەوە. بەڵکو مەبەستەکە تەنها هۆشداریدانە لەو قسەو بۆچوونە پووچەڵانەی کە لێیانەوە نقڵکراوە، ئیتر ئایا بەصەحیحی لێیانەوە هاتبێت، یان نا. خۆ ئەگەر بە صەحیحی لێیانەوە هاتبوو، ئەوا –وەکو زانراوە– هیچ لەکەداریان ناکات‌و لە پلەوپایەیان ناهێنێتە خوارەوە. هەندێك جاریش بەشێك لەو قسانە بە مەبەستێکی دروست دراوەتە پاڵیان، بەوەی کە ئەوەی ئەو فەرموویەتی دەگونجێت وابێت، جا با کەسێکی تر بەوردی تەماشایان بکات، بەڵکو بۆچوونی ئەو پێچەوانەی بۆچوونی من بێت، بەمەش بۆچوونەکە بەوە بەهێز دەبێت، کە ئەو ئیمامەی پێشتر وای فەرموە. تەوفیقیش تەنها بەدەستی خوایە.

جا یەکێك لەو تەعبیرانە ئەوەیە کە پێشەوای پایەبەرز (أَبُو جَعْفَر)ی (نَحَّاس) لە کتێبی (شَرْحُ أَسْمَاءِ اللهِ تَعَالَى)دا گێڕاویتیەوە لە یەکێك لە زانایانەوە، کە ئەو بەناپەسەندی داناوە بوترێت: (تَصَدَّقَ اللهُ عَلَيْكَ) واتە: (خوا خێرت پێ بکات). فەرموویەتی: "چونکە کەسی خێرکەر چاوەڕێی پاداشت دەکات (ئەمەش بۆ خوای گەورە ناگونجێت)".

منیش دەڵێم: ئەم بڕیارە هەڵەیەكی ڕاشكاوو، نەزانینێكی ناشیرینەو، بەڵگەكەشی لە خۆی خراپترە. چونكە لە صەحیحی موسلیمدا هاتوە لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، كە دەربارەی كورت كردنەوەی نوێژ فەرموویەتی: «صَدَقَةٌ تَصَدَّقَ اللَّهُ بِهَا عَلَيْكُمْ، فاقْبَلُوا صَدَقَتَهُ».[1] واتە: "خەیرێكەو، خوای گەورە پێی كردوون، دەی ئێوەش خەیری خوا قبووڵ بكەن"

## باسێك: {دروستە بوترێت: خوایە لە ئاگر ئازادم بكە}

یەكێكی تر لەو تەعبیرانە ئەوەیە كە دیسان پێشەوای پایەبەرز (أَبُو جَعْفَر)ی (نَحَّاس) لەو زاناوە گێڕاویتیەوە، كە ئەو بەناپەسەندی داناوە بوترێت: (اللَّهُمَّ، أعْتِقْنِيْ مِنَ النَّارِ) واتە: (خوایە لە ئاگر ئازادم بكە). فەرموویەتی: "چونكە ئەو كەسەی كۆیلە ئازاد دەكات، بەشوێن پاداشتدا دەگەڕێت".

منیش دەڵێم: ئەم قسەیەو بەڵگەكەشی ناشیرینترین هەڵەو، ڕیسواترین نەزانینو بێئاگاییە لە ئەحكامەكانی شەرع. خۆ ئەگەر من بڕۆمو بەشوێن ئەو حەدیسە (صَحِيْح)انەدا بگەڕێم، كە بەڕاشكاوی باسیان لەوە كردوە، كە خوای گەورە هەركام لە دروستكراوەكانی خۆی بوێت ئازادی دەكات، ئەوا كتێبەكەم ئەوەندە درێژدەبێتەوە، كە خوێنەر ماندوو بكات.

جا یەكێك لەو حەدیسانە بریتیە لە حەدیسی: «مَنْ أعْتَقَ رَقَبَةً، أعْتَقَ اللهُ تَعَالَى بِكُلِّ عُضْوٍ مِنْها عُضْواً مِنْهُ مِنَ النَّارِ».[2] واتە: "ئەو كەسەی كۆیلەیەك ئازاد بكات، خوای گەورە بە هەموو ئەندامێكی ئەو كۆیلەیە ئەندامێكی ئەویش لە ئاگر ئازاد دەكات".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِمٍ / ١ / ٤٧٨ / بە ژمارە: ٦٨٦.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيِّ / ٦ / ٢٤٦٩ / بە ژمارە: ٦٣٣٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ١١٤٧ / بە ژمارە: ١٥٠٩.

## باسێك: {دروسته بوترێت: فلاّنه شت بكه لەسەر ناوی خوا}

یەكێكی تر لەو تەعبیرانە ئەوەیە كە یەكێك لە زانایان فەرموویەتی: ناپەسەندە كەسێك بڵێت: (افْعَلْ كَذَا عَلَى اسْمِ اللهِ) واتە: (فلاّنە شت بكە لەسەر ناوی خوا). فەرموویەتی: "چونكە ناوی خوا لەسەرووی هەموو شتێكەوەیە".

پێشەوای پایەبەرز قاضي (عِيَاض)و غەیری ئەویش فەرموویانە: ئەم قسەیە هەڵەیە. چونكە لە چەند حەدیسێكی (صَحِيْح)دا هاتوە، كە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) دەربارەی قوربانی كردن بە هاوەڵانی فەرموە: «اذْبَحُوا عَلَى اسْمِ اللهِ».[1] واتە: (بڵێن: "بِاسْمِ اللهِ"و، سەری ببڕن).

## باسێك: {دروسته بوترێت: (خوای گەورە لەژێر ڕەحمەتی خۆیدا كۆمان بكاتەوە). دروستیشە بوترێت: (خوایە بە ڕەحمی خۆت ڕەحممان پێ بكە)}

یەكێكی تر لەو تەعبیرانە ئەوەیە كە شێخی (نَحَّاس) گێڕاویێتیەوە، لە زانای شەرعزانی ئەدیب شێخ (أَبو بَكْر) (مُحَمَّد)ی كوڕی (يَحْيَى)ی (صُولِيّ)، كە فەرموویەتی: مەڵێ: (جَمَعَ اللهُ بَيْنَنَا فِيْ مُسْتَقَرِّ رَحْمَتِهِ). واتە: (خوای گەورە لەژێر ڕەحمەتی خۆیدا كۆمان بكاتەوە). فەرموویەتی: "چونكە ڕەحمەتی خوا لەوە فراوانترە كە جێگەی هەبێت". هەروەها ئەو فەرموویەتی: مەڵێ: ( خوایە بە ڕەحمی خۆت ڕەحممان پێ بكە).

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٠٩٥ / بە ژمارە: ٥١٨١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٥٥١ / بە ژمارە: ١٩٦٠.

منیش دەڵێم: وا نازانین كە هیچكام لــەو دوو فەرمایشــتە بەڵگــەیان هــەبێت‌و، ئەوەش كە ئەو فەرموویەتی نابێت بە بەڵگــە. چــونكە كــابرا -كــە دەڵێــت لــەژێر رەحمەتی خۆیدا- مەبەستی بەهەشتە. كەواتە مانای قســەكەی بــەم جۆرەیــە: خــوای گەورە لــە بەهەشتدا بەیەكەوە كۆمان بكاتەوە، كە بریتیە لــە جێگــەی جێگیربــوون‌و مانەوەو نیشتەجێبوون بە ئارامی‌و، ئەو كەسانەش دەچنە نــاوی، تــەنها بــە رەحمــەتی خوای گەورە دەچنە ناویەوە. پاشان ئەو كەسەی دەچێنە نــاوی، هــەتا هەتایــە تێیــدا دەمێنێتەوەو، ئەمین‌و بێخەم دەبێت لە ڕووداوو نارەحەتیــەكان، كــە ئەمەشــی تــەنها بەرەحمەتی خوا دەستكەوتوە. كەواتە وەكــو ئــەوە وەهایــە كــە كــابرا وتبێتــی: "لــە جێگەیەكدا كۆمان بكەرەوە، كە بەرەحمەتی تۆ دەستمان دەكەوێت".

## باسێك: {دروستە بوترێت: (خوایە لە ئاگر رزگارم بكە). دروستیشە بوترێت: (خوایە شەفاعەتی پێغەمبەرمكە تمان بە نصیب بكە)}

شێخی (نَحَّاس) گێڕاوێتیەوە، لەو شێخ (أَبو بَكْر)ەی پێشوو، كە فەرموویەتی: بــا نەوترێت: (اللهمَّ أجرْنا من النار). واتە: (خوایە لە ئاگر ڕزگارم بكە). هــەروەها بــا نەوترێت: (اللهمَّ ارْزُقْنَا شَفَاعَةَ النَّبِيِّ -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ-). چونكە شەفاعەت بۆ كەسێك دەكرێت، شایانی چوونە ئاگر بێت.

منیش دەڵێم: ئەمە هەڵەیەكی زۆر ناشــیرین‌و، نــەزانینێكی ڕوونــەو، ئەگــەر لــە ترسی هەڵخەڵەتان بەو هەڵەیەو، باسكردنی لە كتێبەكاندا نەبوایە، منیش نەمدەوێرا بیگێڕمەوە. چونكە چەندین حەدیس لە كتێبە صــەحیحەكاندا هــاتون ســەبارەت بــە هاندانی ئیمانداره تەواوەكان، كە بەڵێنی شەفاعەتی پێغەمبــەری خوایــان پــێ دراوە.

وەکو ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت): «مَنْ قالَ مِثْــلَ مَــا يَقُولُ الْمُؤَذِّنُ.......... حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِيْ».[1] هەروەها چەندین فەرمایشتی تریش.

بەڕاستی پێشەوای پایەبەرز قاضي (عِيَاض) (رەحمەتی خوای لێبێت) جـوانی فـەرموە: کە لـە چەندین ڕێگەوە هاتوە، کە چاکەکارانی (سَــلَف) (خوایان لێ ڕازی بێت) داوای شەفاعەتی پێغەمبەریان کردوەو، حەزیشیان لێ کردوە. ئەوجا فەرموویەتی: جـا بۆیـە لاناکرێتەوە بەلای ئەوەدا، کە هەنـدێك کـەس بـە ناپەسـەندیان دانـاوە، بەپاسـاوی ئەوەی، کە شەفاعەت تەنها بۆ تاوانبارانە. چونکە لـە چەند حەدیسـێکی (صَحِيْح)دا هاتوە لـە صەحیحی موسلیمو لـە غەیری ئەویشـدا، کـە شـەفاعەت بـۆ خـەڵکانێك دەکرێـت، تـا بـەبێ حیسـابو لێپرسینەوە بچـنە بەهەشـتەوەو، بـۆ کەسـانێکیش دەکرێت، تا پلـەیان لـە بەهەشتدا زیاد بکات. پاشان فەرموویەتی: هـەموو کەسـێکی ژیر -کە دان بە کەمتەرخەمی خۆیدا بنێت- پێویسـتی بـە لێبـوردنی خـوا هەیـەو، ترسی ئەوەی هەیە کە بچـێتە ڕیـزی تیاچـوانەوە. جـا بـەپێی قسـەی خـاوەنی ئـەو بۆچوونە بێت، دەبێت ئەو کەسە داوای لێخۆشبوونو ڕەحمی خوا نـەکات. چـونکە ئەوانیش تایبەتن بە تاوانبارانەوە، کە هەموو ئەمانـەش پێچـەوانەی ئـەوەن، کـە لــە زانایانی (سَلَف)و (خَلَف)ـەوە هاتوەو، ئەوان داوای ئەو شتانەیان کردوە.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٢٨٨ / بە ژمارە: ٣٨٤.

## باسێك: {ئینكاری كردنی ئەم قسەیە هیچ ئەصلێكی نیە: ( پشتم بە پەروەردگاری بەخشندەی خۆم بەستوە )}

یەكێكی تر لەو تەعبیرانە ئەوەیە كە كەسانێك لەو شێخ (أَبُو بَكْر)ەوە گێڕاویانەتەوە، كە فەرموویەتی: مەڵێ: (تَوَكَّلْتُ عَلَى رَبِّيْ الرَّبِّ الْكَرِيْمِ)، بەڵكو بڵێ: (تَوَكَّلْتُ عَلَى رَبِّيَ الْكَرِيْمِ). واتە: پشتم بە پەروەردگاری بەخشندەی خۆم بەستوە.

منیش دەڵێم: ئەو قسەیەی هیچ ئەصڵێكی نیە.

## باسێك: {ناپەسەند نیە بە (طَوَاف) بوترێت: (شَوْط)}

یەكێكی تر لەو تەعبیرانە ئەوەیە كە كۆمەڵێك لە زانایان -وەكو لێیانەوە نقل كراوە- بەناپەسەندیان داناوە بە (طَوَاف)ی ماڵی خوا بوترێت (شَوْط)، یان (دَوْر). جا ئەو زانایانە فەرموویانە: با بۆ یەك جار بوترێت (طَوْفَة)و، بۆ دوو جاریش بوترێت: (طَوْفَتَان)و، بۆ سێ جاریش بوترێت: (طَوْفَات)و، بۆ حەوت جاریش بوترێت: (طَوَاف).

منیش دەڵێم: وا نازانین ئەوەی ئەوان فەرموویانە ئەصڵێكی هەبێت. جا ڕەنگە هۆكاری ناپەسەندیەكە بەلای ئەوانەوە ئەوە بێت، كە ئەو تەعبیرانە لە سەردەمی نەفامیدا بەكارهێنراون. بەڵام بۆچوونی ڕاستو هەڵبژێردراو ئەوەیە، كە بەكارهێنانیان هیچ ناپەسەندیەكی تێدا نیە. چونكە بۆمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ەوە (خوا لە هەردووكیان ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: (أَمَرَهُمْ رَسُوْلُ اللهِ -صَلَّى اللهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ- أَنْ يَرْمُلُوا ثَلاثَةَ أَشْوَاطٍ، وَلَمْ يَمْنَعْهُ أَنْ يَأْمُرَهُمْ أَنْ يَرْمُلُوا الْأَشْوَاطَ كُلَّهَا إلاَّ الْإِبْقَاءُ

عَلَيْهِمْ).[1] واتە: "پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرمانی بە هاوەڵان کرد، کە لە سێ سوورِانەوەکەی یەکەمدا نەرمە ڕاکردنێکی بۆ بکەن، ئەوەش کە نەیهێشت فەرمانیان پێ بکات، تا لە هەموو سوورِانەوەکاندا ڕا بکەن، تەنها ئەوە بوو کە دەیویست بێننەوەو بەهیلاکا نەچن".

## باسێك: {حوكمی بەكارهێنانی ناوی ڕەمەزان بەبێ وشەی مانگ}

یەکێکی تر لەو تەعبیرانە ئەوەیە کە بوترێت: ڕەمەزان بەڕۆژوو بووین، یان ڕەمەزان هات، یان شتێکی لەو جۆرە، ئەگەر مەبەست پێی مانگەکە بێت. جا بۆچوونی جیاواز هەیە سەبارەت بە ناپەسەندی ئەم جۆرە قسانە: کۆمەڵێك لە زانایانی (مُتَقَدِّمِيْن) فەرموویانە: ناپەسەندە بەتەنها بوترێت ڕەمەزانو وشەی مانگی لەگەڵدا باس نەکرێت. جا ئەم بۆچوونە لە هەردوو زانای پایەبەرز شێخ (حَسَن)ی (بَصْرِيّ)و (مُجَاهِد)ەوە ڕیوایەت کراوە.

ئیمامی (بَيْهَقِيّ) فەرموویەتی: ڕێگەی گەیشتنی فەرمایشتەکە بۆلای هەردووکیان لاوازە.

مەزهەبی هاوەڵانمان لەسەر ئەوەیە کە ناپەسەندە بوترێت: ڕەمەزان هات، یان هاتەژوورەوە، یان ئامادەبوو، یان شتێکی لەو جۆرە، کە قەرینەیەکیان لەگەڵدا نەبێت، دەلالەت بکات لەسەر ئەوەی کە مەبەست پێی مانگەکەیە. بەڵام ئەگەر قەرینەی لەگەڵدا باس بکرێت ناپەسەند نیە. وەکو ئەوەی کە بوترێت: ڕەمەزان بەڕۆژوو بووم، یان شەوانەی ڕەمەزان تەراویحو عیبادەتم دەکرد، یان ڕۆژووی

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٥٨١ / بە ژمارە: ١٥٢٥، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٩٢٣ / بە ژمارە: ١٢٦٦.

ڕەمەزان واجبە، یان مانگی پیرۆزی ڕەمەزان هات، یان هەر قەرینەیەکی تری وەکو ئەمانە.

جا هاوەڵانمان وایان فەرموەو، هەردوو پێشەوای پایەبەرز (أَبُو الْحَسَن)ی (مَاوَرْدِيّ) لە کتێبی (الْحَاوِي)داو، (أَبو نَصْر)ی (صَبَّاغ) لە کتێبی (الشَّامِل)دا ئەم بۆچوونەیان لە هاوەڵانمانەوە نقلّ کردوە.

هەروەها زانایانی تریش هەر بەڕەهایی ئەم بۆچوونەیان لە هاوەڵانمانەوە نقلّ کردوە.

هاوەڵانمان بەڵگەیان بە حەدیسێك هێناوەتەوە، کە بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (بَيْهَقِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لا تَقُوْلُوا رَمَضَانُ، فَإِنَّ رَمَضَانَ اسْمٌ مِنْ أَسْمَاءِ اللهِ تَعَالَى، وَلَكِنْ قُوْلُوا: شَهْرُ رَمَضَانَ».[1] واتە: "مەڵێن: ڕەمەزان. چونکە ڕەمەزان ناوێکە لە ناوەکانی خوای گەورە. بەڵکو بڵێن: مانگی ڕەمەزان".

جا ئەم حەدیسە حەدیسێکی لاوازەو، ئیمامی (بَيْهَقِيّ)ش بەلاوازی داناوەو، لاوازیەکەشی دیارو ئاشکرایەو، هیچ کەسێکیش (رَمَضَان)ی لە ڕیزی ناوەکانی خوای گەورەدا باس نەکردوە، لەگەڵ ئەوەی کە زۆرێك لە زانایان کتێبیان سەبارەت بە ناوەکانی خوای گەورە داناوە.

بۆچوونی دروست -خواش لە هەموو کەس زاناترە- ئەوەیە کە ئیمامی بوخاری لە صەحیحەکەی خۆیو، چەند زانایەکی (مُحَقِّق)یش بۆی چوون، کە هەرچۆن ئەو وشەیە بەکار بهێنرێت ناپەسەند نیە. ئیمامی بوخاری فەرموویەتی: چونکە ناپەسەندی تەنها بە شەرع سابت دەبێتو، هیچ شتێکیش سەبارەت بە

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٤ / ٢٠١ / بە ژمارە: ٧٦٩٣.

ناپەسەندی ئەو جۆرە بەکارهێنانە نەهاتوە. بەڵکو لە چەند حەدیسێکدا هاتوە کە دروستە بەو جۆرە بەکار بهێنرێت.

ئەو حەدیسانەش کە لەو بارەوە لە هەردوو صەحیحەکەو لە غەیری ئەوانیشدا هاتوون، لە زۆریدا نایەنە هەژمار.

خۆ ئەگەر کاتم هەبێت بۆ کۆکردنەوەی ئەو حەدیسانە، باوەڕم وایە بگەنە دووسەد (٢٠٠) حەدیس. بەڵام مەبەستەکە بە یەك حەدیس دێتەجێ. بۆیە لەباتی ئەوەی هەموو ئەو حەدیسانە بهێنین، تەنها ئەو حەدیسە بەسە، کە بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا جَاءَ رَمَضَانُ، فُتِّحَتْ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ، وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ النَّارِ، وَصُفِّدَتِ الشَّيَاطِينُ».[1] واتە: "ئەگەر ڕەمەزان هات، دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوەو، دەرگاکانی دۆزەخیش بەتوندی دادەخرێنو، شەیتانەکانیش بەتوندی کۆتو زنجیر دەکرێن".

لە هەندێك لە ڕیوایەتەکانی هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا بەم جۆرە هاتوە: (إِذَا دَخَلَ رَمَضَانُ).

لە ڕیوایەتێکی ئیمامی موسلیمیشدا بەم جۆرە هاتوە: (إِذَا كَانَ رَمَضَانُ).

هەروەها لە حەدیسی (صَحِيْح)دا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: (لا تَقَدَّمُوا رَمَضَانَ).[2]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٦٧٢ / بە ژمارە: ١٨٠٠، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٧٥٨ / بە ژمارە: ١٠٧٩.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٦٧٦ / بە ژمارە: ١٨١٥، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٧٦٢ / بە ژمارە: ١٠٨٢.

له حەدیسی (صَحِیْح)یشدا هاتوە، كە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: (بُنِيَ الْإِسْلامُ عَلَى خَمْسٍ). جا یەكێك لەو پێنجە بریتیە لە: (صَوْمُ رَمَضَانَ).[1]

هەروەها گەلێك حەدیسی تری لەم جۆرە هاتوە.

## باسێك: {حوكمی ناونانی سورەتەكانی قورئانی پیرۆز}

یەكێكی تر لەو تەعبیرانە ئەوەیە كە لە هەندێك لە زانایانی (مُتَقَدِّمِیْن)ـەوە نقلّ كراوە، كە ناپەسەندە بوترێت: سورەتی (الْبَقَرَة)و، سورەتی (الدُّخَان)و (الْعَنْكَبُوْت)و (الرُّوْم)و (الْأَحْزَاب)و..... هتد.

جا ئەو زانایانە فەرموویانە: دەبێت بوترێت: ئەو سورەتەی كە باسی (الْبَقَرَة)ی تێدایەو، ئەو سورەتەی كە باسی (النِّسَاء)ی تێدایە، ئیتر هەر بەم جۆرە.

منیش دەڵێم: ئەمەش هەڵەیەو، پێچەوانەی سونەتی پێغەمبەری خوایە (دروودی خوای لەسەر بێت). چونكە لە چەندین حەدیسدا هاتوە، كە لە چەندین جێگەدا ئەو جۆرە بەكارهێنانە هاتوە. وەكو ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت): «الْآيَتَانِ مِنْ آخِرِ سُوْرَةِ الْبَقَرَةِ مَنْ قَرَأَهُمَا فِيْ لَيْلَةٍ، كَفَتَاهُ».[2] واتە: "دوو ئایەتەكەی كۆتایی سوورەتی (الْبَقَرَة)، ئەو كەسەی لە شەودا بیانخوێنێت، بەسێتی بۆ نویّ كردنەوەی ئیمانی، یان لە خراپەی شەیتانو ئادەمیزادو لە ناخۆشی دەیپارێزن، یان جێگەی شەونوێژو باقی زیكرەكانی تری بۆ دەگرنەوە".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ١٢ / بە ژمارە: ٨، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤٥ / بە ژمارە: ١٦.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٤٧٢ / بە ژمارە: ٣٧٨٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥٥٤ / بە ژمارە: ٨٠٧.

جـا ئـەم حەدیسـە لـە هـەردوو صـەحیحی بوخـاری‌و موسـلیمدا هـاتوەو، هاووێنەکانیشی لە زۆریدا نایەنە هەژمار.

## باسێك: {دروستە بوترێت: (خوای گەورە دەفەرموێت)}

یەکێکی تر لەو تەعبیرانە ئەوەیـە کـە لـە پێشـەوای پایەبـەرزی شـوێنکەوتوان (مُطَرِّف)ی کوڕی (عَبْدُ الله)ی کوڕی (شِخِّيْرِ)ەوە هاتوە (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، کە ئەو بەناپەسەندی داناوە کەسێك بڵێت: "خوای گەورە لە کتێبەکەیدا دەفەرموێت". جا ئەو فەرموویەتی: با بوترێت: "خوای گەورە فەرموویەتی". جا ڕەنگە ئـەو بۆیـە ئـەو تەعبیرەی یەکەمیان پێ ناپەسەند بوە، چونکە فرمانەکەی ڕانەبردوەو، وا دەخوازێت کە خوای گەورە ئێستە یان لـەداهاتوودا وا دەفـەرموێت. خـۆ فەرمایشـتی خـوای گەورەش قەدیمە (واتە: سەرەتاو کۆتایی نیە).

منیش دەڵێم: ئەم قسەیە پەسەند نیە. چونکە لە چەندین حەدیسی (صَـحِيْح)دا ئەم جۆرە بەکارهێنانە هاتوەو، منیش هەندێکیانم لە (شَرْحُ صَحِيْحِ مُسْلِم)و لـە کتێبی (التِّبْيان فِيْ آدابِ حَمَلَةِ الْقُرْآن)دا باس کردوە.

خوای گەورەش فەرموویەتی: ﴿وَاللهُ يَقُوْلُ الْحَقَّ﴾ [الـأحزاب: ٤] واتـە: {خـوای گەورە ڕاست دەفەرموێت}.

لە صەحیحی موسلیمیشدا هاتوە لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو ذَرّ)ەوە (خـوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خـوا (درودی خـوای لەسـەر بێـت) فەرموویـەتی: «يَقُولُ اللَّهُ -عَزَّ وَجَلَّ-: ﴿مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا﴾ [الأنعام: ١٦٠]» واتـە:

**خوای گەورە دەفەرموێت: {ئەو کەسەی کارێکی چاك بکات، دەقاتی ئەو کارە پاداشت وەردەگرێت}.[1]**

**لە صەحیحی بوخاریشدا لە تەفسیری ئایەتی: ﴿لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ﴾دا هاتوە، کە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو طَلْحَةَ) (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ﴾ [آل عِمْرَان: ٩٢] واتە: {ئێوە ناگەنە پلەی چاکەکاری،و، ناگەنە بەهەشت، هەتا لەو شتانە نەکەن بە خەیر کە خۆشتان دەوێن}.[2]**

* * * * *          * * * * *          * * * * *

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٦٨ / بە ژمارە: ٢٦٨٧.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٥٣٠ / بە ژمارە: ١٣٩٢. هەروەها ئیمامی موسلیمیش ڕیوایەتی کردوە. بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٩٣ / بە ژمارە: ٩٩٨.

بزانە کە مەبەستمان لەم کتێبە باسکردنی هەندێك دوعـاو پاڕانەوەیـە، کـە لـە هەموو کاتێکـدا گـرنگ‌و سـونەتن، بـەبێ بەسـتنەوەیان بـە کاتێـك یـان حـاڵێکی تایبەتیەوە.

بشزانە کە ئەمە باسێکی زۆر فراوانەو، ناگونجێت سـەرلەپەڕی بـاس بکرێـت‌و، ناشگونجێت ئاگاداری بەسەر دەیەکیـدا پەیـدا بکرێـت. بۆیـە مـن تـەنها ئامـاژە بـە گرنگترین باسەکانی دەدەم.

جا یەکەمین نزاو پاڕانەوە ئەوانەن کە لـە قورئـانی پـیرۆزدا هێنـراون‌و، خـوای گەورە خەبەری داوە کە پێغەمبـەران‌و بەنـدە هەڵبـژێردراوەکانی کردوونیـان، کـە ئەوانیش زۆرو ناسراون.

هەندێکیش لەو نزاو پاڕانەوانە ئەوانەن کە بە صەحیحی لـە پێغەمبـەری خـواوە هاتون (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە ئەو کردوونی، یان فێری کەسانی تـری کـردوە. ئەم بەشەش گەلێك زۆرەو، هەندێکیمان لـە باسـەکانی پێشـوودا هێنـاو، لێرەشـدا کۆمەڵە نزاو پاڕانەوەیەکی صەحیحی تر دەهێنم، تا بخرێنـە پـاڵ نـزاو پاڕانـەوەکانی قورئانی پیرۆز. تەوفیقیش تەنها بەدەستی خوایە.

بۆمان ڕیوایەت کراوە بە چەند ڕشتەیەکی (صَحِیْح)، لە (سُنَن)ی ئیمـامی (أبُـو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (نُعْمَـان)ی کوڕی (بَشِیْر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێـت)، ئەویش لە پێغەمبەری خـواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «الدُّعَاءُ هُوَ الْعِبَادَةَ». واتە: "نزاو پاڕانـەوە لـەخوا گەورەترین جۆری خواپەرستیە (یان خواپەرستی ڕاستەقینەیەو، شـایانی ئەوەیـە پێـی بوترێت خواپەرستی، چونکە بەڵگەیە لەسـەر ڕووکردنـە خـوای گـەورەو، پشـت هەڵکردن لە غەیری ئەو)".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِیْح)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)دا، بە ڕشتەیەکی جوان (جَیِّد)، لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) حەزی لەو نزاو پاڕانەوانە دەکرد، کە داگرەوەو گشتگیر بوون بۆ خەیری دنیاو دوارۆژ (یان وشەکانیان کەم بوون‌و، ماناکانیان فراوان‌و زۆر بوون)و، بێجگە لەمانە دوعای تری نەدەکرد.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَیْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «لَیْسَ شَيْءٌ أَكْرَمَ عَلَى اللهِ تَعَالَى مِنَ الدُّعَاءِ».[3] واتە: "هیچ شتێك نیە بەلای خواوە لە نزاو پاڕانەوە بەڕێزتر بێت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَیْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ سَرَّهُ أَنْ یَسْتَجِیبَ اللهُ تَعَالَى لَهُ عِنْدَ

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٦٦ / بە ژمارە: ١٤٧٩، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٢١١ / بە ژمارە: ٢٩٦٩، وسُنَنُ النَّسَائِيِّ الْكُبْرَى / ٦ / ٤٥٠ / بە ژمارە: ١١٤٦٤، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٢٥٨ / بە ژمارە: ٣٨٢٨.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٦٧ / بە ژمارە: ١٤٨٢. ئیمامی (حَاكِم)یش ڕیوایەتی کردوەو، فەرموویەتی: ڕشتەکەی (صَحِیْح)ـە. بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِیْحَیْن / ١ / ٧٢٣ / بە ژمارە: ١٩٧٨.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٥٥ / بە ژمارە: ٣٣٧٠، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٢٥٨ / بە ژمارە: ٣٨٢٩. هەروەها شێخی (ابْنُ حِبَّان)و ئیمامی (حَاكِم)یش ڕیوایەتیان کردوەو، ئیمامی (حَاكِم) فەرموویەتی: ڕشتەکەی (صَحِیْح)ـە. بڕوانە: صَحِیْحُ ابْنِ حِبَّان / ٣ / ١٥١ / بە ژمارە: ٨٧٠، والْمُسْتَدْرَك عَلَى الصَّحِیْحَیْن / ١ / ٦٦٦ / بە ژمارە: ١٨٠١.

الشَّدَائِدِ وَالْكُرَبِ، فَلْيُكْثِرِ الدُّعَاءَ فِي الرَّخَاءِ».[1] واته: "ئەو كەسەی پێی خۆشە لە كاتی تەنگانەو نارەحەتیو خەمو خەفەتدا نزاو پاڕانەوەی لێ وەربگیرێت، با لەكاتی خۆشیو لەشساغیدا زۆر بپاڕێتەوە".

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە زۆرترین دوعای پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) ئەمە بوە: «اللَّهُمَّ، آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ».[2]

ئیمامی موسلیم لە ڕیوایەتەكەی خۆیدا ئەمەشی زیاد كردوە: ڕاوی حەدیسەكە فەرموویەتی: (أَنَس)یش ئەگەر بیویستایە یەك دوعا بكات، ئەم دوعایەی دەكردو، ئەگەر بیشیویستایە دوعا بكات، ئەم دوعایەی لەناودا دەكرد.

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «اللَّهُمَّ، إِنِّيْ أَسْأَلُكَ الْهُدَى وَالتُّقَى وَالْعَفَافَ وَالْغِنَى».[3] واتە: "خوایە، من داوای ڕێنموویيو ترسی خۆتو داوێنپاكیو بێ نیازیت لێ دەكەم".

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (طَارِق)ی كوڕی (أَشْيَم)ی (أَشْجَعِيّ)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: ئەگەر پیاوێك موسوڵمان بوایە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فێری نوێژی

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٦٢ / بە ژمارە: ٣٣٨٢. ئیمامی (حَاكِم)یش ڕیوایەتی كردوەو، فەرموویەتی: ڕشتەكەی (صَحِيْح)ە. بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٧٢٩ / بە ژمارە: ١٩٩٧.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٧٤ / بە ژمارە: ٦٠٢٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٧٠ / بە ژمارە: ٢٦٩٠.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٨٧ / بە ژمارە: ٢٧٢١.

دەکردو، پاشان فەرمانی پێ دەکرد، کە بەم چەند وشەیە بپاڕێتـەوە: «اللَّهُمَّ، اغْفِـرْ لِيْ، وَارْحَمْنِيْ، وَاهْدِنِيْ، وَعَافِنِيْ، وَارْزُقْنِيْ».[1] واتە: "خوایە، لێم خۆشبەو، بەزەییت پێمدا بێتەوەو، ڕێنموویيم بکەو، بێوەیو لەشساغم بکـەو، ڕزق‌و ڕۆزی حـەلاڵم بدەری".

لە ڕیوایەتێکی تری ئیمامی موسلیمدا لە (طَارِق)ـەوە هاتوە، کە ئەو گـوێی لـە پێغەمبەری خوا بوە، کاتێك پیاوێك هـاتوە بـۆ خزمـەتی‌و، عـەرزی کـردوە: "ئـەی پێغەمبەری خوا، چۆن بپاڕێمەوە ئەگەر داوا لە پـەروەردگارم بکـەم؟" پێغەمبـەریش فەرموویەتی: "بڵێ: (اللَّهُمَّ، اغْفِرْ لِيْ، وَارْحَمْنِيْ، وَعَافِنِيْ، وَارْزُقْنِيْ). چـونکە ئەمانـە داگرەوەن بەسەر خەیرو خۆشی دنیاو دوارۆژدا.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە صـەحیحی موسـلیمدا، لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (عَمْرو)ی کوڕی (عَاص)ـەوە (خوا لە خۆی‌و باوکیشی ڕازی بێت)، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «اللَّهُمَّ، يَا مُصَرِّفَ الْقُلُوبِ، صَرِّفْ قُلُوبَنا عَلَى طَاعَتِكَ».[3] واتە: "خوایە، ئەی گۆڕەرو وەرچەرخێنەری دڵەکان، دڵەکانمان بگۆڕەو، وەریان بچەرخێنە بۆ گوێڕایەڵی خۆت ".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هـاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێـت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویـەتی: «تَعَوَّذُوا بِاللهِ مِنْ: جَهْدِ الْـبَلاءِ، وَدَرَكِ الشَّـقَاءِ، وَسُوْءِ الْقَضَاءِ، وَشَمَاتَةِ الْأَعْدَاءِ».[1] واتە: "پەنا بە خوا بگرن لە: بەڵای وەڕسـکەرو

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٧٣ / بە ژمارە: ٢٦٩٧.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٧٣ / بە ژمارە: ٢٦٩٧.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٤٥ / بە ژمارە: ٢٦٥٤.

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٦ / ٢٤٤٠ / بە ژمارە: ٦٢٤٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٨٠ / بە ژمارە: ٢٧٠٧.

کفتکەرو، لە گەیشتن بە بەدبەختیو نەگبەتیو، لە قەزاو قەدەرێك، کە ناڕەحەتیو زەحمەتی تێدابێت بۆ دینو دنیاو لاشەو ماڵو حاڵو چارەنووسمانو، لە شادەکامیو خۆشحاڵبوونی دوژمنەکان بە تێکەوتنو لێقەومانی ئێوە".

لە ڕیوایەتێکیشدا لە زانای پایەبەرز {(سُفْيَان)ی کوڕی (عُيَيْنَة)}وە هاتوە، کە فەرموویەتی: لە حەدیسەکەدا سێ شت هەیەو، منیش دانەیەکم بۆ زیاد کردوونو، ناشزانم کامەیانە.[1]

لە ڕیوایەتێکیشدا (سُفْيَان) فەرموویەتی: گومانم هەیە کە یەکێکیانم زیاد کردوە.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «اللَّهُمَّ، إِنِّيْ أَعُوْذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ، وَالْكَسَلِ، وَالْجُبْنِ، وَالْهَرَمِ، وَالْبُخْلِ، وَأَعُوْذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوْذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ».[3] واتە: "خوایە پەنات پێ دەگرم لە بێکارەییو تەمبەڵیو تەوەزەلیو ترسنۆکیو پیربوونو پەککەوتنو چرووکیو ڕەزیلی. پەناشت پێ دەگرم لە سزای ناو گۆڕو، لە فیتنەو ئاشووبی ژیانو مردن".

لە ڕیوایەتێکدا ئەمەش هاتوە: «وَضَلَعِ الدَّيْنِ، وَغَلَبَةِ الرِّجَالِ».[1] واتە: "لە قورساییو ناڕەحەتی قەرزاریو، لە زاڵبوونی پیاوان بەسەرمدا".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٣٦ / بە ژمارە: ٥٩٨٧.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٨٠ / بە ژمارە: ٢٧٠٧.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٠٣٩ / بە ژمارە: ٢٦٦٨، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٧٩ / بە ژمارە: ٢٧٠٦.

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٠٥٩ / بە ژمارە: ٢٧٣٦.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (عَمْرو)ی کوڕی (عَاص)ـەوە، ئەویش لە ئیمامی (أَبو بَكْر)ەوە (خوا لە هەر سێکەیان ڕازی بێت)، کە ئەو عەرزی پێغەمبەری خوای کردوە (دروودی خوای لەسەر بێت): "دوعایەکم فێر بکە، تا لە نوێژدا بیکەم". پێغەمبەریش فەرمووی: بڵێ: «اللَّهُمَّ، إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِيْ ظُلْماً كَثِيْراً، وَلا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِيْ مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ، وَارْحَمْنِيْ، إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُوْرُ الرَّحِيْمُ».[1] واتە: "خوایە، من ستەمێکی زۆرم لە خۆم کردوەو، تەنها جەنابیشت لە تاوانەکان خۆش دەبیت. دەی بە لوتفی خۆت لێم خۆشبەو، ڕەحم پێ بکە، چونکە تۆ زاتێکی تاوانبەخشو میهرەبانیت".

منیش دەڵێم: وشەی (كَثِيْراً) بە (كَبِيْراً)یش ڕیوایەت کراوەو، پێشتریش لە (زیکرەکانی نوێژ)دا باسمان کرد. بۆیە سونەتە کەسی دوعاکەر بڵێت: (كَثِيْراً كَبِيْراً)و، هەردووکیان بەیەکەوە کۆبکاتەوە.

جا ئەم دوعایە ئەگەرچی سەبارەت بە نوێژ هاتوە، بەڵام دوعایەکی جوانی گرانبەهای صەحیحە. بۆیە سونەتە لە هەموو کاتو شوێنێکدا بکرێتو، لە ڕیوایەتێکیشدا هاتوە (کە بریتیە لە ڕیوایەتەکەی ئیمامی موسلیم)، ئیمامی (أَبو بَكْر) فەرموویەتی: "دوعایەکم فێر بکە، تا (لە نوێژداو) لە ماڵەوەدا بیکەم".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو مُوْسَى)ی (أَشْعَرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە ئەم دوعایە دەکرد: «اللَّهُمَّ، اغْفِرْ لِيْ خَطِيْئَتِيْ، وَجَهْلِيْ، وَإِسْرَافِيْ فِيْ أَمْرِيْ، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّيْ. اللَّهُمَّ، اغْفِرْ لِيْ جَدِّيْ، وَهَزْلِيْ، وَخَطَئِيْ، وَعَمْدِيْ، وَكُلُّ ذَلِكَ عِنْدِيْ. اللَّهُمَّ، اغْفِرْ لِيْ مَا قَدَّمْتُ، وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٨٦ / بە ژمارە: ٧٩٩، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٧٨ / بە ژمارە: ٢٧٠٥.

أَسْرَرْتُ، وَمَا أَعْلَنْتُ، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّيْ، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ، وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ، وَأَنْتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيْرٌ».[1] واته: "خوایه، له هه‌ڵه‌و نه‌فامیی‌و زیاده‌ڕه‌ویم خۆشبه‌و، له‌و تاوانه‌ش كه جه‌نابت له‌خۆم زیاتر ئاگات لێیه‌تی. خوایه، له تاوانه‌كانم خۆشبه، ئه‌وانه‌ی به‌ده‌ستی ئه‌نقه‌ست كردوومن‌و، ئه‌وانه‌ش به گاڵته كردوومن‌و، ئه‌وانه‌ش به هه‌ڵه كردوومن، كه هه‌مووشیانم هه‌یه. خوایه له‌و تاوانانه‌م خۆشبه، كه پێشتر كردوومن‌و، له‌وانه‌ش كه دواتر ده‌یانكه‌م، ئه‌وانه‌ی به نهێنیی‌و په‌نهانی ئه‌نجامم داون‌و، ئه‌وانه‌ش به ئاشكرا كردوومن‌و، له‌و تاوانه‌ش كه جه‌نابت له‌خۆم زیاتر ئاگات لێیه‌تی. بڕیارده‌ری پێشكه‌وتن‌و دواكه‌وتن هه‌ر تۆی، تۆش توانات به‌سه‌ر هه‌موو شتێكدا هه‌یه".

بۆشمان ڕیوایه‌ت كراوه له صه‌حیحی موسلیمدا، له (عَائِشَةَ)ی دایكی ئیماندارانه‌وه (خوای لێ ڕازی بێت)، كه پێغه‌مبه‌ری خوا (درودی خوای له‌سه‌ر بێت) له نزاو پاڕانه‌وه‌كه‌یدا ده‌یفه‌رموو: «اللَّهُمَّ، إِنِّيْ أَعُوْذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا عَمِلْتُ، وَمِنْ شَرِّ مَا لَمْ أَعْمَلْ».[2] واته: "خوایه، په‌نات پێ ده‌گرم له شه‌ڕو خراپه‌ی ئه‌و كاره‌ی كه كردوومه‌و، ئه‌وه‌ش كه نه‌مكردوه".

بۆشمان ڕیوایه‌ت كراوه له صه‌حیحی موسلیمدا، له هاوه‌ڵی خۆشه‌ویست (ابْنُ عُمَر)ه‌وه (خوا له هه‌ردووكیان ڕازی بێت)، كه فه‌رموویه‌تی: نزاو پاڕانه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا (درودی خوای له‌سه‌ر بێت) ئه‌مه بوه: «اللَّهُمَّ، إِنِّيْ أَعُوْذُ بِكَ مِنْ زَوَالِ نِعْمَتِكَ، وَتَحَوُّلِ عَافِيَتِكَ، وَفَجْأَةِ نِقْمَتِكَ، وَجَمِيْعِ سُخْطِكَ».[1] واته: "خوایه، په‌نات پێ ده‌گرم له نه‌مانی نازو نیعمه‌ته‌كانت‌و، له گۆڕانی بێوه‌یی‌و له‌شساغی بۆ نه‌هامه‌تی‌و

(١) بڕوانه: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٥٠ / به ژماره: ٦٠٣٥، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٨٧ / به ژماره: ٢٧١٩.

(٢) بڕوانه: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٨٦ / به ژماره: ٢٧١٦.

(١) بڕوانه: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٩٧ / به ژماره: ٢٧٣٩.

نەخۆشیو، لە تۆڵەی کتوپڕو ناگەهانو، لە هەموو ئەو کارانەی، کە مایەیی توڕەیی‌و ڕەنجاندنی تۆیە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (زَیْد)ی کوڕی (أرْقَم)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: "منیش هەر ئەو نزاو پاڕانەوەتان پێ دەڵێم، کە کاتی خۆی پێغەمبەری خوا دەیکردن"، ئەو دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، إنِّيْ أعُوْذُ بكَ مِنَ الْعَجْزِ، وَالكَسَلِ، وَالْجُبْنِ، وَالبُخْلِ، وَالهَمِّ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ. اللَّهُمَّ، آتِ نَفْسِي تَقْوَاها، وَزَكِّهَا، أنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاها، أنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلاهَا. اللَّهُمَّ، إنِّيْ أعُوْذُ بكَ مِنْ عِلْمٍ لا يَنْفَعُ، وَمِنْ قَلْبٍ لا يَخْشَعُ، وَمَنْ نَفْسٍ لا تَشْبَعُ، وَمِنْ دَعْوَةٍ لا يُسْتَجَابُ لَهَا».[١] واتە: "خوایە، من پەنات پێ دەگرم لە نەتوانکاریو، تەمبەڵیو، ترسنۆکیو، ڕەزیلیو ڕژدیو، خەمو خەفەتو، سزای ناو گۆڕ. خوایە ترسی خۆت بخەرە ناو دڵمەوەو، پاڵفتەو خاوێنی بکەرەوە، چونکە تۆ باشترین کەسیت بۆ پاککردنەوەی، هەر تۆش خاوەنو دڵسۆزو سەرپەرشتیاری دڵێو دەروونی. خوایە، من پەنات پێ دەگرم لە زانستێك کە سوودی نەبێتو، لە دڵێك کە ملکەچ نەبێتو ڕا نەچڵەکێتو، لە نەفسو دەروونێکیش کە تێر نەبێتو، لە نزاو پاڕانەوەیەکیش، کە وەرنەگیرێتو گیرا نەبێت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: بڵێ: «اللَّهُمَّ، اهْدِنِيْ، وَسَدِّدْنِيْ».[١] واتە: "خوایە، بمخەرە سەر ڕێگەی ڕاستو ڕێنموویيم بکەو، ڕێكو ڕاوەستاوم بکە".

لە ڕیوایەتێکیشدا فەرموویەتی: بڵێ: «اللَّهُمَّ، إنِّيْ أسْألُكَ الْهُدَى وَالسَّدَادَ».[٢]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٨٨ / بە ژمارە: ٢٧٢٢.

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٩٠ / بە ژمارە: ٢٧٢٥.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٩٠ / بە ژمارە: ٢٧٢٥.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَعْد)ی کوڕی (أبو وَقَّاص)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: "عەرەبێکی دەشتەکی هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)و، عەرزی کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، زیکرێکم فێر بکە، تا بیکەم" پێغەمبەریش فەرمووی: بڵێ: «لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، اللهُ أَكْبَرُ كَبِيْراً، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيْراً، سُبْحَانَ اللهِ رَبِّ الْعَالَمِيْنَ، لا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ الْعَزِيْزِ الْحَكِيْمِ». جا کابرا عەرزی کرد: "ئەمانە بۆ پەروەردگارم بوون، ئەی چی بۆ خۆم؟" پێغەمبەریش فەرمووی: بڵێ: «اللَّهُمَّ، اغْفِرْ لِيْ، وَارْحَمْنِيْ، وَاهْدِنِيْ، وَارْزُقْنِيْ، وَعَافِنِيْ». جا ڕاوی حەدیسەکە لە وشەی (عَافِنِيْ)دا گومانی هەیە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، فەرموویەتی: «اللَّهُمَّ، أَصْلِحْ لِيْ دِيْنِيَ الَّذِيْ هُوَ عِصْمَةُ أَمْرِيْ، وَأَصْلِحْ لِيْ دُنْيَايَ الَّتِيْ فِيْهَا مَعَاشِيْ، وَأَصْلِحْ لِيْ آخِرَتِي الَّتِيْ فِيْهَا مَعَادِيْ، وَاجْعَلِ الْحَيَاةَ زِيَادَةً لِيْ فِيْ كُلِّ خَيْرٍ، وَاجْعَلِ الْمَوْتَ رَاحَةً لِيْ مِنْ كُلِّ شَرٍّ».[2] واتە: "خوایە، دینو ئاینەکەمم بۆ سازو ڕێكوپێك بکە، کە مایەی پارێزرانی هەموو کاروبارێکمە. دنیاکەشم بۆ سازو ڕێكوپێك بکە، کە بژێویو گوزەرانمی تێدایە. دوارۆژیشم سازو سەلامەت بکە، کە تێیدا دەگەڕێمەوە خزمەتی تۆو زیندوو دەکرێمەوە. ژیانی دنیاشم بکە بە هۆکاری زیادبوونی هەموو خەیرو چاکەیەك. مردنیشم بکە بە مایەی حەسانەوەو ڕزگاربوونم لە هەموو شەڕو خراپەیەك".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٧٢ / بە ژمارە: ٢٦٩٦.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٨٧ / بە ژمارە: ٢٧٢٠.

(دروودی خوای لەسەر بێت)، فەرموویەتی: «اللَّهُمَّ، لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ. اللَّهُمَّ، إِنِّيْ أَعُوْذُ بِعِزَّتِكَ، لا إِلهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَنْ تُضِلَّنِيْ، أَنْتَ الْحَيُّ الَّذِيْ لاَ يَمُوْتُ، وَالْجِنُّ وَالْإِنْسُ يَمُوْتُوْنَ».[1] واتە: "خوایە، من فەرمانبەرداری بڕیارەکانی تۆم‌و، ئیمان‌و باوەڕم بە تۆ هێناوەو، پشتم بە تۆ بەستووەو، پەنام بۆ تۆ هێناوەو، بۆ خزمەتی تۆ گەڕاومەتەوەو کاروبارم بە تۆ سپاردووەو، بە پشتبەستن بە لوتفی تۆ دەچم بە گژی ناحەزانمدا. خوایە، من پەنا دەگرم بە گەورەیی‌و دەسەلاتی تۆ، کە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە تۆ، پەنات پێ دەگرم لەوەی کە گومڕام بکەیت‌و، لەڕێگە لام بدەیت. تۆ ئەو زاتە زیندوەی، کە نامریت‌و، هەموو جنۆکەو ئادەمیزادەکان دەمرن".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (بُرَيْدَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە جارێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، گوێی لێبوو پیاوێك دەیوت: «اللَّهُمَّ، إِنِّيْ أَسْأَلُكَ بِأَنِّيْ أَشْهَدُ إِنَّكَ أَنْتَ اللهُ، لا إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، الْأَحَدُ الصَّمَدُ الَّذِيْ لَمْ يَلِدْ، وَلَمْ يُولَدْ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُواً أَحَدٌ». واتە: "خوایە، من لێت دەپاڕێمەوە بەوەی، کە شایەتی دەدەم تۆ خوای‌و، هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە تۆ، تاك‌و تەنهای‌و، جێگەی ڕازو نیازیت‌و خۆشت بێ نیازی، تۆ ئەو خوایەی، کە کەسی لێ نەبوەو، لە کەسیش نەبوەو، کەسیش هاوڕێنەو هاوشێوەی نیە". پێغەمبەریش فەرمووی: «لَقَدْ سَأَلْتَ اللهَ تَعَالَى بِالِاسْمِ الَّذِيْ إِذَا سُئِلَ بِهِ أَعْطَى، وَإِذَا دُعِيَ أَجَابَ». واتە: "بەڕاستی تۆ بەو ناوەی خوای گەورە لێی پاڕایتەوەو داوت لێ کرد، کە ئەگەر بەو ناوە داوای هەرچی لێ بکرێت، دەیبەخشێت‌و، ئەگەر نزاو پاڕانەوەشی لە خزمەتدا بکرێت، گیرای دەکات‌و وەڵامی دەداتەوە".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٦ / ٢٦٨٨ - ٢٦٨٩ / بە هەردوو ژمارە: ٦٩٤٨ و ٦٩٥٠، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٨٦ / بە ژمارە: ٢٧١٧.

لە ڕیوایەتێکیشدا هاتوە، کە فەرموویەتی: «لَقَدْ سَأَلْتَ اللهَ بِاسْمِهِ الْأَعْظَمِ».

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (نَسَائِيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە جارێـك لـە خزمـەتی پێغەمبـەری خوادا دانیشتبووم، پیاوێکیش نوێژی دەکرد. پاشان پاڕایەوەو، وتی: (اللَّهُـمَّ، إِنِّـيْ أَسْأَلُكَ بِأَنَّ لَكَ الْحَمْدُ، لا إِلَه إِلاَّ أَنْتَ الْمَنَّانُ، بَدِيْعُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ، يَا ذَا الْجَلالِ وَالْإِكْرَامِ، يَا حَيُّ يَا قَيُّوْمُ). واتە: "خوایە، من لێت دەپاڕێمەوەو داوات لێ دەکەم، کە سوپاس و ستایش هەر شایستەی تۆیەو، هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینەش نیە بێجگە لە تـۆ، کـە خـاوەنی منـەتو نـازو نیعمـەتی زۆری بەسـەرمانەوە، داهێنـەری زەوی و ئاسمانەکانیت، ئەی خاوەنی شکۆمەندیو بەخشش و ڕێز، ئەی زیندووی بێ سەرەتاو بێ کۆتا، ئەی چاودێرو ڕاپەڕێنەری کاروبـاری بوونـەوەران". پێغەمبـەریش (درودی خوای لەسەر بێت) فـەرمووی: «لَقَدْ دَعَا اللهَ تَعَالَى بِاسْمِهِ الْعَظِيْمِ الَّذِيْ إِذَا دُعِـيَ بِـهِ، أَجَابَ، وَإِذَا سُئِلَ بِهِ، أَعْطَى».[2] واتە: "بەڕاسـتی ئـەو پیـاوە بـەو نـاوە گەورەیـەی خوای گەورە لێی پاڕایەوەو داوای لێ کرد، کە ئەگەر بەو ناوە نزاو پاڕانـەوەی لـە خزمەتدا بکرێت، گیرای دەکاتو وەڵامی دەداتەوەو، ئەگـەر داواشـی لێ بکرێـت، دەیبەخشێت".

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٦٩ / بە ژمارە: ١٤٩٣، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥١٥ / بـە ژمارە: ٣٤٧٥، وسُنَنُ النَّسَائِيِّ الْكُبْرَى / ٤ / ٣٩٤ / بە ژمـارە: ٧٦٦٦، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٢٦٧ / بە ژمارە: ٣٨٥٧.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٧٠ / بە ژمـارە: ١٤٩٥، وسُنَنُ النَّسَـائِيِّ الْكُبْـرَى / ١ / ٣٨٦ / بە ژمارە: ١٢٢٣. هەروەها شێخی (ابْنُ حِبَّان)و ئیمـامی (حَاكِم)یـش ڕیوایـەتیان کردوە. بڕوانـە: صَحِيْحُ ابْنِ حِبَّان / ٣ / ١٧٥ / بـە ژمـارە: ٨٩٣، والْمُسْـتَدْرَك عَلَـى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٦٨٣ / بە ژمارە: ١٨٥٧.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، بە چەند ڕشتەیەکی (صَحِیْح)، لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، بەم چەند وشەیە دەپاڕایەوە: «اللَّهُمَّ، إِنِّيْ أَعُوْذُ بِكَ مِنَ فِتْنَةِ النَّارِ، وَعَذَابِ النَّارِ، وَمِنْ شَرِّ الْغِنَى وَالْفَقْرِ». واتە: "خوایە، من پەنا بەتۆ دەگرم لە فیتنەو ئاشووبو سزای ئاگری دۆزەخو، لە خراپەو شەڕی پارەداریو نەداری".

جا ئەمە دەقی ڕیوایەتەکەی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)ەو، ئیمامی (تِرْمِذِيّ)ش فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِیْح)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە (زِیَاد)ی کوڕی (عِلاقَة)وە، ئەویش لە مامەیەوە -کە بریتیە لە هاوەڵی خۆشەویست (قُطْبَة)ی کوڕی (مَالِك) (خوای لێ ڕازی بێت)- ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «اللَّهُمَّ، إِنِّيْ أَعُوْذُ بِكَ مِنْ مُنْكَرَاتِ الْأَخْلاقِ وَالْأَعْمَالِ وَالْأَهْوَاءِ». واتە: "خوایە، من پەنا بەتۆ دەگرم لە ئاکارو کردارو ئارەزووی خراپو ناپەسەند".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٨٢ / بە ژمارە: ١٥٤٣، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٢٥ / بە ژمارە: ٣٤٩٥، وسُنَنُ النَّسَائِيِّ / ٨ / ٢٦٢ / بە ژمارە: ٥٤٦٦، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٢٦٢ / بە ژمارە: ٣٨٣٨. هەروەها ئیمامی بوخاریو موسلیمیش ئەم حەدیسەیان بە دەقێکی درێژتر ڕیوایەت کردوە. بڕوانە: صَحِیْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٤١ / بە ژمارە: ٦٠٠٧، وصَحِیْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٧٨ / بە ژمارە: ٥٨٩.

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٧٥ / بە ژمارە: ٣٥٩١. ئیمامی (حَاكِم)یش ڕیوایەتی کردوەو، فەرموویەتی: ڕشتەکەی (صَحِیْح)ـە لەسەر مەرجی ئیمامی موسلیم. بڕوانە: الْمُسْتَدْرَك عَلَى الصَّحِیْحَیْن / ٤ / ٤٩٧ / بە ژمارە: ١٩٠٤.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَـــائِيّ)دا، لە هـاوەڵی خۆشەویســت (شَكَل)ی کـوڕی (حُمَيْــد)ەوە (خوای لیّ ڕازی بێـت)، کـە فەرموویەتی: "عەرزی پێغەمبەری خوام کرد: ئەی پێغەمبەری خـوا، نـزاو پاڕانـەوەم فێر بکە". ئەویش فەرمووی: بڵــێ: «اللَّهُمَّ، إِنِّيْ أَعُوْذُ بِكَ مِنْ شَرِّ سَمْعِيْ، وَمِنْ شَــرِّ بَصَرِيْ، وَمِنْ شَرِّ لِسَانِيْ، وَمِنْ شَرِّ قَلْبِيْ، وَمِنْ شَرِّ مَنِيِّيْ». واتە: "خوایە، من پەنا بـەتۆ دەگرم لـە شەڕو خراپەی هێزی بیستنم (تا شتی خراپو ناڕەوای پێ نەبیسم)و، لــە شەڕو خراپەی هێزی بینینم (تـا شـتی خـراپو نـاڕەوای پـێ نـەبینم)و، لــە شـەڕو خراپەی زمانم (تا قسەی خراپو ناڕەوای پێ نەکەم)و، لە شەڕو خراپەی دڵــم (تـا بیروباوەڕی خراپو سیفەتی ناشیرینی تێ نەچێت)و، لە شەڕی تۆوی خۆم (تـا زۆرم بۆ نەهێنێتو، زاڵ نەبێت بەسەرمدا، بۆ کردنی داوێنپیسی، یان پێشەکیەکانی)".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ــە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو کتێبەکەی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (نَسَـــائِيّ)دا، بە دوو ڕشتەی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ــەوە (خوای لیّ ڕازی بێـت)، کە پێغەمبەری خوا (درروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «اللَّهُمَّ، إِنِّيْ أَعُوْذُ بِكَ مِــنَ الْبَرَصِ، وَالْجُنُوْنِ، وَالْجُذَامِ، وَسَيِّءِ الْأَسْقَامِ».[1] واتە: "خوایە من پەنا بەتۆ دەگرم لـە بەڵەکیو، لە شێتیو، لـە گولیو، لـە نەخۆشیە پیسو خراپەکان".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٨٣ / بە ژمارە: ١٥٥١، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٢٣ / بـە ژمارە: ٣٤٩٢، وسُنَنُ النَّسَائِيِّ / ٨ / ٢٥٩ / بە ژمـارە: ٥٤٥٥. ئیمـامی (حَـاكِم)یـش ڕیوایەتی کردوەو، فەرموویـەتی: ڕشـتەکەی (صَـحِيْح)ــە. بڕوانـە: الْمُسْــتَدْرَك عَلَــى الصَّحِيْحَيْن / ٥ / ١ / بە ژمارە: ١٩٠٨.

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٨٤ / بە ژمـارە: ١٥٥٤، وسُنَنُ النَّسَائِيِّ / ٨ / ٢٧٠ / بـە ژمارە: ٥٤٩٣.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو کتێبی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو الْيَسَر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «اللَّهُمَّ، إِنِّيْ أَعُوْذُ بِكَ مِنَ الْهَدْمِ، وَأَعُوْذُ بِكَ مِنَ التَّرَدِّيْ، وَأَعُوْذُ بِكَ مِنَ الْغَرَقِ وَالْحَرَقِ وَالْهَرَمِ، وَأَعُوْذُ بِكَ أَنْ يَتَخَبَّطَنِي الشَّيْطَانُ عِنْدَ الْمَوْتِ، وَأَعُوْذُ بِكَ أَنْ أَمُوْتَ فِيْ سَبِيْلِكَ مُدْبِراً، وَأَعُوْذُ بِكَ أَنْ أَمُوْتَ لَدِيْغاً».[1] واتە: "خوایە من پەنا بەتۆ دەگرم لە داهەڕۆژانی شتێك بەسەرمداو، پەناشت پێ دەگرم لە کەوتنەخوارەوەو، لە خنکانو، لە سووتانو، لە پیریو پەککەوتن. پەناشت پێ دەگرم کە لەکاتی مردندا شەیتان دەستم لێ بشێوێنێتو دینو عەقڵم لێ بشێوێنێت. پەناشت پێ دەگرم کە لە ڕێگەی تۆدا بە پشتهەڵکردوویی بمرمو، پەناشت پێ دەگرم، کە بە پێوەدانی گیانلەبەرێکی ژەهردار بمرم".

جا ئەمە دەقی یەکێك لە ئیمامی (أَبو دَاوُد)ەو، لە ڕیوایەتێکی تریدا ئەمەش هاتوە: (وَالْغَمِّ).

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو کتێبەکەی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (نَسَائِيّ)دا، بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «اللَّهُمَّ، إِنِّيْ أَعُوْذُ بِكَ مِنَ الْجُوعِ، فَإِنَّهُ بِئْسَ الضَّجِيْعُ، وَأَعُوْذُ بِكَ مِنَ الْخِيانَةِ، فَإِنَّهَا بِئْسَتِ الْبِطَانَةُ».[1] واتە: "خوایە من پەنات پێ دەگرم لە برسێتی، کە هاونوێنێکی خراپو بەدە. پەناشت پێ دەگرم لە خیانەتو ناپاکی، کە ناواخنێکی خراپو بەدە".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٨٤ / بە ژمارە: ١٥٥٢، وسُنَنُ النَّسَائِيِّ / ٨ / ٢٨٢ / بە ژمارە: ٥٥٣١. ئیمامی (حَاكِم)یش ڕیوایەتی کردوەو، فەرموویەتی: ڕشتەکەی (صَحِيْح)ـە. بڕوانە: الْمُسْتَدْرَك عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ٤ / ٤٩٦ / بە ژمارە: ١٩٠٣.

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٨٣ / بە ژمارە: ١٥٤٧، وسُنَنُ النَّسَائِيِّ / ٨ / ٢٦٣ / بە ژمارە: ٥٤٦٨.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە کۆیلەیەکی نوسراوبۆکراو (مُکَاتَـب) هـات بـۆ خزمـەتیو، عەرزی کرد: "توانام نیە ئەوەی لە نوسراوەکەمدا هاتوە بیدەم، تۆ هاوکاریم بکـە". ئەویش پێی فەرموو: "دەی وریابە، چەند وشەیەکت فێر دەکەم، کە پێغەمبەری خـوا (درودی خوای لەسەر بێت) فێـری کـردووم؟ ئەگـەر وەکـو کێـوی (صِـیْر) قـەرزت بەسەرەوەبێت، خوای گەورە لەسەرت لا دەبات. وشـەکانیش ئەمانـەن: «اللَّهُـمَّ، اكْفِنِيْ بِحَلالِكَ عَنْ حَرَامِكَ، وَأَغْنِنِيْ بِفَضْلِكَ عَمَّنْ سِوَاكَ». واتە: "خوایـە بـە ڕزقـی حەلاڵی خۆت لە حەرامەکانت بێ نیازم بکە. بە فەزڵو لوتفی خۆشت لـە غـەیری خۆت بێ نیازم بکە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

بۆشمـان ڕیوایـەت کـراوە لـە کتێبەکـەی ئیمـامی (تِرْمِـذِيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (عِمْرَان)ی کـوڕی (حُصَیْن)ـەوە (خوا لـە هـەردووکیان ڕازی بێـت)، کـە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) دوو فەرمایشتی فێـری (حُصَـیْن)ی بـاوکی کردوە، تا پێیان بپارێتەوە، فەرمایشتەکانیش ئەمانەن: «اللَّهُـمَّ، أَلْهِمْنِـي رُشْـدِي، وَأَعِذْنِي مِنْ شَرِّ نَفْسِي». واتە: "سەرکەوتووم بکە بۆ گرتنەبەری ڕێگـەی ڕاسـتو، لە خراپەو شەڕی نەفسی خۆشم بمپارێزە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو کتێبەکەی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (نَسَـائِيّ)دا، بە ڕشتەیەکی لاواز، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێـت)، کـە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویـەتی: «اللَّهُمَّ، إِنِّيْ أَعُوْذُ بِـكَ مِـنَ

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٦٠ / بە ژمارە: ٣٥٦٣.

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥١٩ / بە ژمارە: ٣٤٨٣.

الشِّقَاقِ وَالنِّفَاقِ وَسُوْءِ الْأَخْلَاقِ».[١] واته: "خوایه پەنا بەتۆ دەگرم لە سەرپێچی کردن لە حەقو ڕاستی (یان لە کێشەو ناکۆکیو دووبەرەکیو دوژمنایەتی)و، لە نیفاقو دووڕوویی‌و، لە ڕەوشتی خراپو بەد".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە زانای پایەبەرزی شوێنکەوتوان (شَهْر)ی کوڕی (حَوْشَب)ـەوە، کە فەرموویەتی: عەرزی (أُمُّ سَلَمَةَ)م کرد (خوای لێ ڕازی بێت): "ئەی دایکی ئیمانداران، کاتێك پێغەمبەری خوا لای تۆ دەبوو، چی دوعایەکی زۆر دەکرد؟" ئەویش فەرمووی: زۆرترین دوعای ئەمە بوو: (يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوْبِ، ثَبِّتْ قَلْبِيْ عَلَى دِيْنِكَ). واتە: (ئەی هەڵسووڕێنەرو وەرچەرخێنەری دڵەکان، دڵم لەسەر ئاینەکەت ڕاگیراو بکە).

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[٢]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە (عَائِشَةَ)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «اللَّهُمَّ، عَافِنِيْ فِيْ جَسَدِيْ، وَعَافِنِيْ فِيْ بَصَرِيْ، وَاجْعَلْهُ الْوَارِثَ مِنِّيْ، لا إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ الْحَلِيْمُ الْكَرِيْمُ، سُبْحَانَ اللهِ رَبِّ الْعَرْشِ الْعَظِيْمِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِيْنَ».[١] واته: "خوایە، لاشەو جەستەم سەلامەتو بێوەی بکە، هێزی بیستنیشم

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٨٢ / بە ژمارە: ١٥٤٦، وسُنَنُ النَّسَائِيِّ / ٨ / ٢٦٤ / بە ژمارە: ٥٤٧١. وەکو ئیمامی نەوەوی فەرمووی: (ڕشتەکەی لاوازە). چونکە کەسێکی لاوازی تێدایە، بەناوی (ضُبَارَة)ی کوڕی (عَبْدُالله)وە. بڕوانە: ذَخِيْرَةُ الْحُفَّاظ / ١ / ٤٦٣ / بە ژمارە: ٦٦٦.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٣٨ / بە ژمارە: ٣٥٢٢.

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥١٨ / بە ژمارە: ٣٤٨٠. حەدیسێکی لاوازە. چونکە ئیمامی (حَاكِم) فەرموویەتی: ئەم حەدیسە ڕشتەکەی (صَحِيْح)ـە، ئەگەر ڕاست بێت کە (حَبِيْب)ی کوڕی (أَبُو ثَابِت) حەدیسی لە (عُـرْوَة)ی کوڕی (زُبَيْر) بیستبێت. ئیمامی (تِرْمِذِيّ)ش لەدوای حەدیسەکەوە فەرموویەتی: لە ئیمامی بوخاریم بیستوە، کە (حَبِيْب)

سەلامەت بکە، بیشیکە بە میراتگری سەرجەم هێزەکانی تری لاشەمو، تا دەمرم بیهێڵەرەوە بۆم، هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە تۆ، کە خوایەکی بەئارامو میهرەبانیت، پاکو بێگەردی بۆ ئەو خوایەی، کە پەروەردگاری عەرشی مەزنەو، سوپاسو ستایشیش بۆ ئەو خوایەی، کە پەروەردگاری هەموو عالەمە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو الدَّرْدَاء)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: یەکێك لە دوعاکانی حەزرەتی (دَاوُد) (درودی خوای لەسەر بێت) ئەمە بوە: «اللَّهُمَّ، إِنِّيْ أَسْأَلُكَ حُبَّكَ، وَحُبَّ مَنْ يُحِبُّكَ، وَالْعَمَلَ الَّذِيْ يُبَلِّغُنِي حُبَّكَ. اللَّهُمَّ، اجْعَلْ حُبَّكَ أَحَبَّ إِلَيَّ مِنْ نَفْسِيْ وَأَهْلِيْ وَمِنَ الْمَاءِ الْبَارِدِ». واتە: "خوایە من داوای خۆشەویستی خۆتو خۆشەویستی ئەو کەسەشت لێ دەکەم کە تۆی خۆش دەوێتو، داوای کارێکت لێ دەکەم، کە بمگەیەنێتە خۆشەویستی تۆ. خوایە خۆشەویستی خۆتم لەلا خۆشەویستتر بکەیت لە خۆمو خێزانو کەسوکارمو، لە ئاوی ساردیش".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَعْد)ی کوڕی (أَبو وَقَّاص)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «دَعْوَةُ ذِي النُّونِ إِذْ دَعَا رَبَّهُ وَهُوَ فِيْ بَطْنِ الْحُوتِ: (لا إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، سُبْحَانَكَ، إِنِّيْ كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِيْنَ)، فَإِنَّهُ لَمْ يَدْعُ بِهَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ فِيْ شَيْءٍ قَطُّ، إِلاَّ اسْتَجَابَ لَهُ».[1] واتە "نزاو پاڕانەوەکەی

---

هیچ حەدیسی لە (عُرْوَة) نەبیستوە. کەوابوو ڕشتەکەی بچڕانی تێدایە. بڕوانە: الْمُسْتَدْرَك عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٧١١ / بە ژمارە: ١٩٤١.

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٢٥ / بە ژمارە: ٣٤٩٠.

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٢٩ / بە ژمارە: ٣٥٠٥.

حەزرەتی (یُونُس) (دروودی خوای لەسەر بێت)، کاتێك لـەناو سـکی نەهەنگەکـەدا پێـی دەپاڕایەوە لـە پەروەردگاری خۆی بریتی بوو لـەمە: (لا إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، سُبْحَانَكَ، إِنِّـي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِيْنَ)، جا هەر موسوڵمانێك بـەم دوعایـە بپاڕێتـەوە بـۆ هـەر شـتێك، خوای گەورە دێت بە هانەیەوەو، دوعاکەی گیرا دەکات".

ئیمامی (حَاكِم) فەرموویەتی: ڕشتەکەی (صَحِيْح).[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو کتێبەکەی ئیمـامی (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لـە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)و، عەرزی کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، کـام نزاو پاڕانەوە لـە هەموو نزاو پاڕانەوەکان گەورەترو باشترە؟" پێغەمبەریش فەرمووی: «سَلْ رَبَّكَ الْعَافِيَةَ وَالْمُعَافَاةَ فِي الدُّنْيا وَالْآخِرَةِ». واتە: "داوای سەلامەتیو بێوەیی لـە پەروەردگارت بکە لـە دنیاو لـە دواڕۆژدا". پاشان کابرا لـە ڕۆژی دووەمدا هاتـەوەو، عەرزی کـردەوە: "ئـەی پێغەمبـەری خـوا، کـام نـزاو پاڕانـەوە لـە هـەموو نـزاو پاڕانەوەکان گەورەترو باشترە؟" ئەویش هەر هەمان شتی پێ فەرموو. ئەوجا کابرا لـە ڕۆژی سێیەمیشدا هاتەوەو، هەمان پرسـیاری لێ کـردەوە. پێغەمبـەریش فـەرمووی: «فَإِذَا أُعْطِيْتَ الْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيا، وَأُعْطِيْتَهَا فِي الْآخِرَةِ، فَقَدْ أَفْلَحْتَ». واتـە: "ئەگـەر خوای گەورە سەلامەتیو بێوەیی دنیاو دواڕۆژت پێ ببەخشێت، ئەوە بە دڵنیاییـەوە براوەو سەرکەوتوو دەبیت".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

بۆشمـان ڕیوایـەت کـراوە لـە کتێبەکـەی ئیمـامی (تِرْمِـذِيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (عَبَّـاس)ی کـوڕی (عَبْـدُالْمُطَّلِب)ـەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، کـە

---

(١) بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٦٨٤ / بە ژمارە: ١٨٦٢.

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٣٣ / بە ژمارە: ٣٥١٢، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَـه / ٢ / ١٢٦٥ / بە ژمارە: ٣٨٤٨.

فەرموویەتی: "عەرزی پێغەمبەری خوام کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، نزاو پاڕانەوەیەکم فێر بکە، تا پێی بپاڕێمەوە لەخوای گەورە". ئەویش فەرمووی: «سَلُوا اللهَ الْعَافِيَةَ». منیش دوای چەند ڕۆژێك هاتمەوە بۆ خزمەتیو، عەرزم کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، نزاو پاڕانەوەیەکم فێر بکە، تا لەخوای گەورەی پێی بپاڕێمەوە" ئەویش فەرمووی: "ئەی (عَبَّاس)، ئەی مامەی پێغەمبەری خوا، داوای لەشساغیو بێوەیی دنیاو دواڕۆژ لەخوا بکەن".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: ئەمە حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِـذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو أُمَامَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) دوعایەکی زۆری کردو، ئێمەش هیچیمان لەبەر نەکرد. منیش عەرزم کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، دوعایەکی زۆرت کردو، ئێمەش هیچیمان لەبەر نەکرد" ئەویش فەرمووی: ئایا دوعایەکتان فێر نەکەم، کە هەموو ئەوانە لەخۆ بگرێت؟ دوعاکەش ئەمەیە: «اللَّهُمَّ، إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ مَا سَأَلَكَ مِنْهُ نَبِيُّكَ مُحَمَّدٌ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَنَعُوْذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا اسْتَعَاذَكَ مِنْهُ نَبِيُّكَ مُحَمَّدٌ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَأَنْتَ الْمُسْتَعَانُ، وَعَلَيْكَ الْبَلاغُ، وَلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ». واتە: "خوایە، ئێمە داوای بەشێك لەو خەیرو چاکانەت لێ دەکەین، کە (مُحَمَّد)ی پێغەمبەرت داوای کردوون لێت، پەناشت پێ دەگرین لە شەڕو خراپەی ئەو شتانەی، کە (مُحَمَّـد)ی پێغەمبەرت پەنای گرتوە بە تۆ لێیان. هەر تۆ پشتیوانو جێگەی هانایو، تۆشمان بەسەو (هەر تۆش دەتوانیت بمانگەیەنیتە خەیرو خۆشی دنیاو قیامەت)، هیچ هێزو توانایەکیش نیە بۆ خۆلادان لە خراپەو، بۆ کردنی چاکە بێجگە لە هێزی لوتفو پشتیوانی جەنابت".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٣٤ / بە ژمارە: ٣٥١٤.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «أَلِظُّوا بِـ"يَاذَا الْجَلالِ وَالْإِكْرامِ"». واتە: "هەمیشە پابەندبن بە وتنی: (يَاذَا الْجَلالِ وَالْإِكْرامِ)ەوە".[٢]

هەر ئەم حەدیسەشمان لە کتێبەکەی ئیمامی (نَسَائِيّ)دا بۆ ڕیوایەت کراوە، لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (رَبِيْعَة)ی کوڕی (عَامِر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت).[٣]

ئیمامی (حَاكِم) فەرموویەتی: ڕشتەکەی (صَحِيْح)ە.[٤]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، دەپاڕایەوەو، دەیفەرموو: «رَبِّ أعِنِّيْ، وَلا تُعِنْ عَليَّ، وَانْصُرْنِيْ، وَلا تَنْصُرْ عَلَيَّ، وَامْكُرْ لِيْ، وَلا تَمْكُرْ عَلَيَّ، وَاهْدِنِيْ وَيَسِّرْ الْهُدَى لِيْ، وَانْصُرْنِيْ عَلَى مَنْ بَغَى عَليَّ. رَبِّ اجْعَلْنِي لَكَ شَاكِراً، لَكَ ذَاكِراً، لَكَ رَاهِباً، لَكَ مِطْوَاعاً، إِلَيْكَ مُخْبِتاً أَوْ مُنِيْباً، تَقَبَّلْ تَوْبَتِيْ، وَاغْسِلْ حَوْبَتِيْ، وَأَجِبْ دَعْوَتِيْ، وَثَبِّتْ حُجَّتِيْ، وَاهْدِ قَلْبِيْ، وَسَدِّدْ لِسَانِيْ، وَاسْلُلْ سَخِيْمَةَ قَلْبِيْ». واتە: "ئەی پەروەردگار، یارمەتیم بدەو، یارمەتی کەس مەدە لە دژی من، پشتیوانیم بکەو سەرم بخەو، کەس سەرمەخە بەسەرمداو، ناحەزو دوژمنەکانم تووشی فیتنەو بەلاّ بکە، نەوەك من، ڕێنموویيم بکەو، ڕێگەی ڕاستم بۆ ئاسان بکەو، سەرم بخە بەسەر ئەو کەسەی ستەمی لێ کردوومو دەستدرێژی کردۆتە سەرم. ئەی پەروەردگار، وام لێ بکە سوپاسگوزاری تۆ بم، زیکرو یادی تۆ بکەم، لێت بترسم،

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٣٧ / بە ژمارە: ٣٥٢١.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٤٠ / بە ژمارە: ٣٥٢٥.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ النَّسَائِيِّ / ٤ / ٤٠٩ / بە ژمارە: ٧٧١٦.

(٤) بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٦٧٦ / بە ژمارە: ١٨٣٦.

زۆر گوێڕایەڵت بم، ملکەچی فەرمانەکانت بم، بۆ هەموو کاروبارێکم بگەڕێمەوە بۆ خزمەتی تۆ. تەوبەکەم قبووڵ بکەو، تاوانو هەڵەم بشۆرەوەو، پاڕانەوەم گیرا بکەو، بۆچوونو بەڵگەم بەهێزو ڕاگیراو بکەو، دڵم هیدایەت بدەو، زمانو قسەم ڕێکو ڕاست بکە، تا حەقو ڕاستی بپێکێتو، ڕقو کینە لە دڵم دەرکە".

لە ڕیوایەتەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا بەم جۆرە هاتوە: «أوَّاهاً مُنِيْباً».

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[1]

منیش دەڵێم: (سَخِيْمَةَ) واتە: ڕقو کینە. جەمعەکەشی بریتیە لە (سَخَائِم). جا لەم حەدیسەدا ئەمە مانای (سَخِيْمَةَ)یە. بەڵام لە حەدیسێکی تردا، کە دەفەرموێت: «مَنْ سَلَّ سَخِيْمَتَهُ فِيْ طَرِيقِ الْمُسْلِمِيْنَ، فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ».[2] مەبەست لێی: (پیسیو پاشەڕۆ)یە. واتە: "ئەو کەسەی پیسیو پاشەڕۆی خۆی لەسەر ڕێگەی موسوڵمانان دابکات، لەعنەتی خوای لێبێت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (مُسْنَد)ی ئیمامی (أحْمَد)ی کوڕی (حَنْبَل)دا (ڕەحمەتی خوای لێبێت)و، لە (سُنَن)ی ئیمامی (ابْنُ مَاجَه)دا، لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، پێی فەرموە: بڵێ: «اللَّهُمَّ، إنِّيْ أسْأَلُكَ مِنَ الْخَيْرِ كُلِّهِ، عَاجِلِهِ وَآجِلِهِ، مَا عَلِمْتُ مِنْهُ، وَمَا لَمْ أعْلَمْ، وَأعُوْذُ بِكَ مِنَ الشَّرِّ كُلِّهِ، عَاجِلِهِ وَآجِلِهِ، مَا عَلِمْتُ مِنْهُ، وَمَا لَمْ أعْلَمْ، وَأسْأَلُكَ الْجَنَّةَ، وَمَا قَرَّبَ إلَيْهَا مِنْ قَوْلٍ أوْ عَمَلٍ، وَأعُوْذُ بِكَ مِنَ النَّارِ، وَمَا قَرَّبَ إلَيْهَا مِنْ قَوْلٍ أوْ عَمَلٍ، وَأسْأَلُكَ خَيْرَ مَا سَأَلَكَ بِهِ عَبْدُكَ وَرَسُوْلُكَ مُحَمَّدٌ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَأعُوْذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا اسْتَعاذَكَ مِنْهُ عَبْدُكَ وَرَسُوْلُكَ مُحَمَّدٌ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَأسْأَلُكَ مَا قَضَيْتَ

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٤٧ / بە ژمارە: ١٥١٠، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٥٤ / بە ژمارە: ٣٥٥١، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٢٥٩ / بە ژمارە: ٣٨٣٠.

(٢) بڕوانە: الْمُعْجَمُ الْأوْسَط / ٥ / ٣٢٠ / بە ژمارە: ٥٤٢٦، والْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٢٩٦ / بە ژمارە: ٦٦٥.

لِيْ مِنْ أمْرٍ، أنْ تَجْعَلَ عَاقِبَتَهُ رَشَداً».[1] واتـه: "خوایـه، مـن داوای هـەموو خـەیرو چاکەیەکت لێ دەکەم، ئەوەی ئێستا هەیەو، ئەوەی لە داهاتووشـدا پەیـدا دەبێـت، ئەوەی دەیزانمو ئاگام لـێیەتیو، ئەوەش نایزانمو ئاگام لێی نیە. پەناشت پێ دەگرم لە هەموو شەڕو خراپەیەك، ئەوەی ئێستا هەیەو، ئەوەی لە داهاتووشدا پەیـدا دەبێـت، ئەوەی دەیزانمو ئاگام لـێیەتیو، ئەوەش نایزانمو ئاگام لێی نیە. داوای بەهەشتو ئەو گوفتارو کردارەشت لێ دەکەم، کە لەو نزیکم دەکەنەوە. پەناشت پـێ دەگـرم لـە ئاگری دۆزەخو ئەو گوفتارو کردارەش، کە لەو نزیکم دەکەنەوە. داوای باشـترینی ئەو داواکاریانەت لێ دەکەم، کە (مُحَمَّد)ی بەندەو پێغەمبەرت داوای لێ کردوویت (دروودی خوای لەسـەر بێـت)، پەناشـت پـێ دەگـرم لـە خراپترینـی ئـەو شـتانەی، کـە (مُحَمَّد)ی بەندەو پێغەمبەرت (دروودی خوای لەسـەر بێت) پـەنای بـەتۆ گرتـوە لـێیـان. داواشت لێ دەکەم، کە هەر کارێك بڕیارت داوە بـۆم، وای لێ بکـەیت پاشـەڕۆژو ئاکامی باشی هەبێت".

ئیمامی (حَاكِم) فەرموویەتی: ئەم حەدیسە ڕشتەکەی (صَحِيْح)ـە.[2]

هەروەها بە خزمەتی حەدیسێکیش کەیشتووم لـە کتێبـی (الْمُسْتَدْرَكُ)ی ئیمـامی (حَاكِم)دا، کە لـە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت) ڕیوایەت کراوە، ئەو فەرموویەتی: یەکێك لـە دوعاکانی پێغەمبەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێت)، ئەمە بـوو: «اللَّهُمَّ، إنَّا نَسْأَلُكَ مُوْجبَاتِ رَحْمَتِكَ، وَعَزَائِمَ مَغْفِرَتِكَ، وَالسَّـلامَةَ مِنْ كُلِّ إثْمٍ، وَالْغَنِيْمَةَ مِنْ كُلِّ بِرٍّ، وَالْفَوْزَ بِالْجَنَّةِ، وَالنَّجَاةَ مِنَ النَّارِ». واتە: "خوایە من داوای ئەو شتانەت لێ دەکەم، کە مایەی ڕەحمەتو میهرەبانی تـۆنو، ئەوانـەش کـە هۆکاری لێخۆشـبوونی تـۆنو، داوای سـەلامەتیت لێ دەکـەم لـە هـەموو تـاوانو

(١) بڕوانە: مُسْنَدُ الْإمَامِ أحْمَد / ٤٢ / ٦٧ / بە ژمارە: ٢٥١٣٧، وسُـنَنُ ابْـنِ مَاجَـه / ٢ / ١٢٦٤ / بە ژمارە: ٣٨٤٦.

(٢) بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٧٠٢ / بە ژمارە: ١٩١٤.

خراپەیەكو، داوای بەشو خەلاتیشت لێ دەكەم لە هەموو چاكەیەكو، داوای شادبوون بە بەهەشتو، ڕزگاربوون لە دۆزەخت لێ دەكەم".

ئیمامی (حَاكِم) فەرموویەتی: حەدیسێكی (صَحِيْح)ـە لەسەر مەرجی ئیمامی موسلیم.[1]

بە خزمەتی حەدیسێكی تریش گەیشتووم لە كتێبی (الْمُسْتَدْرَكُ)دا، كە لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ی كوڕی (عَبْدُالله)ەوە (خوا لە هەردووكیان ڕازی بێت) ڕیوایەت كراوە، ئەو فەرموویەتی: پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)و، دوو جار یان سێ جار وتی: (ئای لەو تاوانەی ئەنجامم داوە!!) پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: بڵێ: «اللَّهُمَّ، مَغْفِرَتُكَ أَوْسَعُ مِنْ ذُنُوْبِيْ، وَرَحْمَتُكَ أَرْجَى عِنْدِيْ مِنْ عَمَلِيْ». واتە: "خوایە، لێخۆشبوونی جەنابت لە تاوانەكانی من فراوانترەو، ڕەحمەتو میهریشت لە كردەوەكانم زیاتر جێگەی هیواو ئومێدن". جا كابراش ئەم دوعایە وتەوە. پاشان پێغەمبەر فەرمووی: (جارێكی تر)، كابراش دووبارەی كردەوە. پاشان پێغەمبەر فەرمووی: (جارێكی تر)، كابراش سێبارەی كردەوە. ئەوجا پێغەمبەر فەرمووی: (هەستە، بەڕاستی خوای گەورە لێت خۆشبوو).[1]

---

(١) بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٧٠٦ / بە ژمارە: ١٩٢٥. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ڕشتەی حەدیسەكە بەو جۆرە نیە، كە ئیمامی (حَاكِم) فەرموویەتی. بڕوانە: إتْحَافُ الْمَهَرَة بِالْفَوَائِدِ الْمُبْتَكَرَة مِنْ أطْرَافِ الْعَشَرَة / ١٠ / ٢٧٦ - ٢٧٧ / بە ژمارە: ١٢٧٥١. شێخ (عَبْدُالْقَادِر الْأرْنَؤُوْط) لە تەخریجی (أذْكَار)دا فەرموویەتی: حەدیسێكی (حَسَن)ـە.

(١) بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٧٢٨ / بە ژمارە: ١٩٩٤. شێخی (مُنَاوِيّ) فەرموویەتی: ڕشتەكەی (حَسَن)ـە. بڕوانە: التَّيْسِيْرُ بِشَرْحِ الْجَامِعِ الصَّغِيْر / ٢ / ٣٨٧. بەڵام شێخ (عَبْدُالْقَادِر الْأرْنَؤُوْط) فەرموویەتی: ڕشتەكەی چەند كەسێكی نەناسراوی تێدایە. واتە: لاوازە.

به خزمەتی حەدیسێکی تریش گەیشتووم لـە کتێبـی (الْمُسْـتَدْرَكُ)دا، کـە لـە هاوەڵی خۆشەویسـت (أَبُـو أُمَامَـةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت) ڕیوایـەت کـراوە، ئـەو فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِنَّ لِلَّـهِ تَعَـالَى مَلَكاً مُوَكَّلاً بِمَنْ يَقُولُ: "يَا أَرْحَمَ الرَّاحِمِيْنَ". فَمَنْ قَالَهَا ثَلاثاً، قَالَ لَـهُ الْمَلَـكُ: "إِنَّ أَرْحَمَ الرَّاحِمِيْنَ قَدْ أَقْبَلَ عَلَيْـكَ، فَسَـلْ».[1] واتـە: "خـوای گـەورە فریشـتەیەکی ڕاسپێردراوی هەیە تایبەت بەو کەسانەی، کە دەڵێن: (يَا أَرْحَمَ الرَّاحِمِيْنَ). جا هـەر کەسێك سێ جار وا بڵێت، ئەو فریشتەیە پێی دەڵێـت: (أَرْحَمُ الرَّاحِمِيْنَ) ڕووی لـە تۆ کردوە، دەی تۆش داوای لێ بکەو بپاڕێرەوە".

## ئادابەکانی نزاو پاڕانەوە

بزانە کە ئەو مەزهەبە هەڵبژێردراوەی شـەرعزانانو فەرموودەناسـانو زۆربـەی زانایانی هەموو دەستەو چینەکانی (سَلَف)و (خَلَـف)ی لەسـەرە ئەوەیـە کـە نـزاو پاڕانەوە کارێکی سونەتە.

- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِيْ أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾ [غَـافِر: ٦٠] واتـە: {پـەروەردگارتان فەرموویـەتی: هـاوار بکەنـە مـنو لـێم بپاڕێنـەوە، بەدەنگتانەوە دێمو، پاڕانەوەکەتان گیرا دەکەم}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَـةً﴾ [الْـأَعْرَاف: ٥٥] واتـە: {بەملکەچـیو بـە شـاراوەییو پەنامەکیـەوە لـە پـەروەردگاری خۆتـان بپاڕێنەوە}.

---

(١) بڕوانـە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّـحِيْحَيْن / ١ / ٧٢٨ / بـە ژمـارە: ١٩٩٦. ڕشـتەکەی زۆر لاوازە. چونکە کەسێکی تێدایە، بەناوی (فَضَّال)ی کوڕی (جُبَيْر)ەوە، کە ئیمـامی (ذَهَبِـيّ) لەبارەیەوە فەرموویەتی: هیچ نیە. واتە: زۆر لاوازە. بڕوانە: مُخْتَصَـرُ اسْـتِدْرَاكِ الْحَـافِظِ الذَّهَبِيِّ عَلَى مُسْتَدْرَكِ أَبِيْ عَبْدِاللهِ الْحَاكِم (لابْنِ الْمُلَقِّن) / ١ / ٤٦٣ / بە ژمارە: ١٥٦.

هەروەها زۆرێك ئایەتی تریش لەو بارەوە هاتوون.

سەبارەت بە حەدیسە (صَحِیْح)ـەکانیش، ئەوە لەوە مەشهوورترن کە بخرێنەڕوو، لەوەش ئاشکرا ترن کە باس بکرێن. ئێمەش لەم نزیکانەدا لە باسی نزاو پاڕانەوەکاندا ئەوەندەمان هێنا کە بەس بێت. تەوفیقیش تەنها بەدەستی خوایە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (رِسَالَة)کەی زانای پایەبەرز شێخ (أَبُـو الْقَاسِـم)ی (قُشَیْرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەو فەرموویەتی: "خەڵکی بۆچوونی جیاوازیان هەیە، کە ئایا نزاو پاڕانەوە باشترە، یان بێدەنگیو ڕازیبوون؟:

- هەندێك فەرموویانە: نزاو پاڕانەوە خۆی بۆخۆی عیبادەتە، لەبەر ئەو حەدیسەی پێشوو (الدُّعَاءُ هُوَ الْعِبَادَةُ)و، لەبەرئەوەش کە نزاو پاڕانەوە دەرخستنو دەربڕینی پێویستیو ئیحتیاجیە لە خزمەتی خوای گەورەدا.
- کۆمەڵێکیش فەرموویانە: بێدەنگیو خۆ مات کردن لەژێر حوکمو بڕیاری خوا تەواوترەو، ڕازیبونیش بەوەی لە تەقدیری خوادا نوسراوە باشترە.
- کۆمەڵێکی تریش فەرموویانە: با بە زمان بپاڕێتەوەو، بە دڵیش ڕازی بێت، تا هەردوو کارەکە ئەنجام بدات".

ئیمامی (قُشَیْرِيّ) فەرموویەتی: "باشتر وایە بوترێت: کاتەکان جیاوازن، لە هەندێك کاتدا نزاو پاڕانەوە لە بێدەنگی باشترەو، ئەدەبیش هەر وەهایە. لە هەندێك کاتیشدا بێدەنگی لە نزاو پاڕانەوە باشترەو، ئەدەبیش هەر وەهایە. ئەمەش بەگوێرەی کات دەگۆڕێت. جا ئەگەر کەسێك ئاماژەی نزاو پاڕانەوەی لەدڵی خۆیدا بینی، ئەوە نزاو پاڕانەوە باشترەو، ئەگەر ئاماژەی بێدەنگیشی بینی، ئەوە بێدەنگی تەواوترە"."

هەروەها فەرموویەتی: "دروستیشە بوترێت: هەر شتێك بەشی موسوڵمانانی تێدا بێت، یان مافی خوای گەورەی تێدا بێت، ئەوە نزاو پاڕانەوە باشترە، چونکە ئەو عیبادەتە. بەڵام ئەگەر بەشی نەفسی مرۆڤی تێدابوو، ئەوا بێدەنگی تەواوترە.

هەروەها فەرموویەتی: "یەکێك لە مەرجەکانی گیرابوونی پاڕانەوە ئەوەیە، کە خۆراکی دوعاکەرەکە حەڵاڵ بێت".

خواناسی پایەبەرز (يَحْيَــى)ی کوڕی (مُعَــاذ)ی (رَازِيّ)ش (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: "(خوایە)، چۆن لێت بپاڕێمەوەو، کە من یاخیو تاوانبارم، چۆنیش لێت نەپاڕێمەوە، کە تۆ بەخشندەو میهرەبانی؟!"

یەکێکیش لە ئادابەکانی نزاو پاڕانەوە بریتیە لە ئامادەگیو ئاگایی دڵ لەمەولاش ئەگەر خوای گەورە بیەوێت بەڵگەکەی باس دەکەین.

هەندێکیش لە زانایان فەرموویانە: مەبەست لە نزاو پاڕانەوە دەرخستنو دەربڕینی پێویستیو ئیحتیاجیە، ئەگینا خوای گەورە هەر ئەوە دەکات کە خۆی دەیەوێت.

پێشەوای پایەبەرز (أَبو حَامِد)ی (غَزَالِيّ) لە کتێبی (إحْيَــاء)دا فەرموویەتی: ئادابەکانی نزاو پاڕانەوە دە دانەن:

- یەکەم: کەسەکە بگەڕێت بەشوێن کاتە پیرۆزەکاندا. وەکو: ڕۆژی (عَرَفَة)و، مانگی ڕەمەزانو، ڕۆژی هەینیو، سێیەکی کۆتایی شەوو، کاتی بەرەبەیان.
- دوەم: حاڵەتە پیرۆزەکان بەدەستکەوت بزانێت. وەکو: حاڵەتی سەجدە بردنو، بەیەك گەیشتنو ڕووبەڕوو بوونەوەی سوپای موسوڵمانانو کافرانو، داباریني بارانو، هەستانەوە بۆ نوێژو، دوای نوێژ.

منیش دەڵێم: هەروەها حاڵەتی دڵ نەرمبوون.

- سێیەم: ڕوو بکاتە قیبلـەو، دەسـتەکانی بـەرز بکاتـەوەو، دوای پاڕانەوەکـە بیانهێنێت بە دەموچاویدا.
- چوارەم: بە دەنگێکی مامناوەند بپاڕێتەوە، نە زۆر نزمو نە زۆر بەرز.
- پێنجـەم: نابێـت زۆر لـەخۆی بکـات بـۆ ڕێکخسـتنی کۆتـایی برگـەکانی پاڕانەوەکەی. چونکە وا لێکدراوەتەوە، کە ئەمە جـۆرە دەسـتدرێژیەکە بـۆ سەر پاڕانەوەکە. جا باشتر وەهایە ئەو نزاو پاڕانەوانە بکات کە لـە قورئـانو سونەتدا هاتون. چـونکە هـەموو کەسـێك نازانێـت جـوان بپاڕێتـەوە، بۆیـە مەترسی ئەوەی لێ دەکرێت، کە دەستدرێژی بکاتە سەر پاڕانەوەکە.

هەندێك لـە زانایان فەرموویانە: بە زمانی ملکەچیو موحتاجیەوە بپاڕێرەوە، نەك بە زمانی ڕەوانو پاراو.

دەشوترێت: زانایانو خواناسان لـە نزاو پاڕانـەوەدا حـەوت شـت زیـاتر نـاڵێن. بەڵگەی ئەمەش بریتیە لـەو پاڕانەوانەی، کـە خـوای گـەورە لـە کۆتـایی سـورەتی (الْبَقَرَة)دا باسی کـردون: ﴿رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْراً كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنْتَ مَوْلَانَا فَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾ [البَقَـرَة: ٢٨٦] واتـە: {ئەی پەروەردگارمان، لێمان مەگرە ئەگەر شتێکمان لـەبیرچوو، یـان هەڵـەیـەکمان کرد، ئەی پەروەردگارمان، باری گران مەخەرە سەرشانمان، وەکو خـستبووتە سـەر شانی ئەوانەی پێش ئێمە، ئەی پەروەردگارمان، بارێـك مەخـەرە سـەر شـانمان، کـە توانای جێبەجێ کردنو هەڵگرتنیمان نـەبێتو، لێمـان ببـورەو، لێمـان خۆشـبەو، بەزەییت پێماندا بێتەوە، تۆ گـەورەو سەرپەرشـتیارمانی، دەی سـەرمان بخـە بەسـەر کافرو بێباوەڕەکاندا}.

خوای گەورەش لـە هیچ جێگەیەکی پاڕانەوەی بەندەکانیدا لـەم حەوتـە زیـاتری باس نەکردوە.

منیش دەڵێم: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە لە سورەتی (إِبْرَاهِيْم)دا هەر وەکو ئەو وەهایە: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَذَا الْبَلَدَ آمِنًا وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَنْ نَعْبُدَ الْأَصْنَامَ﴾ [إبْرَاهِيم: ٣٥] واتە: {یادی ئەوە بکە، کە حەزرەتی (إِبْرَاهِيْم) (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: ئەی پەروەردگارم، ئەم شارو وڵاتە سەلامەتو پارێزراو بکەو، منو نەوەکانیشم لەوە دووربخەرەوە، کە بتەکان بپەرستین}.

دیسان دەڵێم: ئەو بۆچوونە هەڵبژێردراوەی کە زۆربەی زانایانی لەسەرە ئەوەیە، کە هیچ ڕێگریەك نیە لەوەی کە موسوڵمان چی نزاو پاڕانەوەیەك بکاتو، ناپەسەندیش نیە زیاتر لەو حەوتە داوا بکرێت. بەڵکو سونەتە بەرِەهایی نزاو پاڕانەوە زۆر بکرێت.

- شەشەم: با بە ملکەچیو کزۆڵیو ترسەوە بپاڕێتەوە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ﴾ [الْأَنبِيَاء: ٩٠] واتە: {بەڕاستی ئەم پێغەمبەرانە دەستوبردو پەلەپەلیان دەکرد بۆ کارو کردەوەی چاکەو، بە هیوای دەستکەوتنی پاداشتی باشو، لە ترسی سزای دوارِۆژ لە ئێمە دەپاڕانەوەو، ملکەچی فەرمانەکانیشمان بووبوون}.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً﴾ [الْأَعْرَاف: ٥٥] واتە: {بەملکەچیو بە پەنامەکی لە پەروەردگاری خۆتان بپاڕێنەوە}.

- حەوتەم: با بە یەقینێکی تەواوەوە بپاڕێتەوەو، دڵنیاشبێت لەوەی کە پاڕانەوەکەی گیرا دەبێتو، ڕاستگۆشبێت لە هیواو ئومێدی بە گیرابوونی دوعاکە.

بەڵگەکانی ئەم خاڵەش گەلێك زۆرو مەشهوورن.

زانای پایەبەرز (سُفْيَان)ی کوڕی (عُيَيْنَــة) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: "ئەوەی یەکێك لە ئێوە لەبارەی خۆیەوە دەیزانێت با ڕێگری لێ نەکات لە نزاو پاڕانەوە، چونکە خوای گەورە وەڵامی داوای خراپترین دروستکراوی خۆی دایەوە، کە ئیبلیسە، وەکو فەرموویەتی: ﴿قَالَ أَنْظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ * قَالَ إِنَّكَ مِنَ الْمُنْظَرِينَ﴾ [الْأَعْرَاف: ١٤ - ١٥]" واتە: {شەیتان وتی: خوایە مۆڵەتم بدەو بمهێڵەرەوە هەتا ئەو ڕۆژەی ئادەمیزادەکان زیندوو دەکرێنەوە. خوای گەورەش فەرمووی: دەی بێگومان تۆ مۆڵەتت هەیەو، تا ئەو کاتە دەهێڵرێیتەوە}.

- هەشتەم: با پێداگری بکات لەسەر پاڕانەوەکەی‌و، سێبارەی بکاتەوەو، پەلەش نەکات لە گیرابوونی‌و، نەڵێت پاڕامەوەو گیرا نەبوو.
- نۆیەم: با پاڕانەوەکەی بە زیکری خوای گەورە دەست پێ بکات.

منیش دەڵێم: هەروەها با سەرەتا سوپاس‌و ستایشی خوای گەورە بکاوت، دواتر صەلاوات لەسەر پێغەمبەری خوا بداتو، هەر بەمانەش کۆتایی بە پاڕانەوەکەی بهێنێت.

- دەیەم: ئەمە گرنگترینی ئادابەکانەو، ئەصڵیشە لە گیرابوونی نزاو پاڕانەوەدا. ئەویش بریتیە لە تەوبە کردن‌و، گەڕاندنەوەی مافەکان بۆ خاوەنەکانیان‌و، ڕووکردنە خوای گەورە.

## باسێك: {سوودەکانی نزاو پاڕانەوە}

ئیمامی (غَزَالِيّ) فەرموویەتی: ئەگەر بوترێت: باشە نزاو پاڕانەوە سوودی چیە، لەگەڵ ئەوەی کە قەزاو قەدەرو بڕیاری خوا ڕەدبوونەوەی نیە؟

جا بزانە کە بەشێك لە قەزاو قەدەرو بڕیاری خوا بریتیە لە ڕەدبوونەوەی نەهامەتی‌و ناڕەحەتی بە نزاو پاڕانەوە. کەواتە نزاو پاڕانەوە هۆکارە بۆ ڕەدبوونەوەی

نەهامەتی‌و، دەستکەوتنی سۆزو ڕەحمی خوای پەروەردگار. هەروەکو چۆن قەڵغان هۆکارە بۆ گەڕاندنەوەی چەك‌و سیلاح‌و، ئاویش هۆکارە بۆ دەرچوونی ڕوەك لە زەوی.

جا هەروەکو چۆن قەڵغان تیر دەگەڕێنێتەوەو، بەیەکدا دەدەن، پاڕانەوەو نەهامەتیش هەر بەو شێوەن. مەعلومیشە کە یەکێك لە مەرجەکانی دانپیانان بە بڕیارو قەزاو قەدەری خوا ئەوە نیە کە کەس چەك هەڵنەگرێت. چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلْيَأْخُذُوا حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ﴾ [النساء: ١٠٢] واتە: {با ئیحتیاتی خۆیان بکەن‌و، چەکەکانیشیان هەڵبگرن}. جا خوای گەورە تەقدیری کارەکەی کردوەو، تەقدیری هۆکارەکەشی کردوە.

هەروەها نزاو پاڕانەوە ئەو سودانەشی تێدایە، کە ئێمە باسمان کردن، ئەوانیش: ئامادەگی دڵ‌و موحتاجی کەسەکەیە، کە ئەم دوانەش ئەوپەڕی بەندایەتی‌و خواناسینن. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## باسی پاڕانەوەو (تَوَسُّل) کردنی کەسێك بە کردەوە چاکەکانی بۆلای خوای گەورە

لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا ئەو حەدیسەی کەسەکانی ئەشکەوتەکەمان بۆ ڕیوایەت کراوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: لە پێغەمبەری خوام بیستوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: سێ کەس لەوانەی پێش ئێوە بەرێگایەکدا دەڕۆیشتن، هەتا شەوێك پەنایان بردە بەر ئەشکەوتێك بۆ مانەوە، جا کە چوونە ئەشکەوتەکەوە، بەردێك لە کەژەکەوە گلبوویەوەو، دەمی ئەشکەوتەکەی لێ داخستن. ئەوانیش بەخۆیان وت: ئەوەی لەم بەردە ڕزگارتان دەکات تەنها ئەوەیە کە لەخوای گەورە

بپاڕێنەوەو، کردەوە چاکەکانتان بکەن بە وەسیلە. جا یەکێکیان وتی: "خوایە، من باوكو دایکێکی پیرو بەتەمەنم هەبوو، بەر لە ئەوان شیرو خواردنەوەم نەدەدا بە ماڵو منداڵەکانم". ئیتر تەواوی حەدیسە درێژەکەی گێڕایەوەو، هەر یەکەیان دەربارەی کردەوە چاکەکەی خۆی وتبوی: "خوایە، ئەگەر من ئەو کارەم لەبەر خاتری تۆ کردوە، لەم تەنگانەیە ڕزگارمان بکەو دەرووبەکمان لێ بکەرەوە". جا بە نزاو پاڕانەوەی هەر یەکێکیان هەندێك لە دەرگای ئەشکەوتەکەیان بۆ کرایەوەو، هەموویشی لەدوای دوعای سێیەم کەسیان کرایەوەو، ئەوانیش هاتنە دەرەوەو ڕۆیشتن.[1]

زانا پایەبەرزی هاوەڵانمان (قَاضِي حُسَيْن)و غەیری ئەویش لە باسی نوێژەبارانەدا شتێکیان فەرموە، کە ئەمە ماناکەیەتی: هەر کەسێك کەوتبێتە ناو ناڕەحەتیو زەحمەتێکەوە سونەتە بپاڕێتەوەو، کردەوە چاکەکانیشی بکات بە وەسیلە. بەڵگەشیان بەم حەدیسە هێناوەتەوە.

جا ڕەنگە بوترێت: ئەم قسەیە شتێکی تێدایە، چونکە وا دەگەیەنێت کەسەکە پێویستی ڕەهای بە خوای گەورە نیەو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی کە پێویستە لە پاڕانەوەدا هەبێت بریتیە لە پیشاندانی پێویستیو موحتاجی کەسەکە. بەڵام پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) ئەم حەدیسەی بۆ وەسفو سەنای ئەو سێ کەسە هێناوەتەوە. ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کارەکەیانی بەدروست داناوە. تەوفیقیش تەنها بەدەستی خوایە.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٧٧١ / بە ژمارە: ٢١٠٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٩٩ / بە ژمارە: ٢٧٤٣.

## باسێك: {ئەوەی لە زانایانی (سَلَف)ـەوە هاتوە سەبارەت بە نزاو پاڕانەوە}

یەکێك لە جوانترین ئەو باسەی کە لە زانایانی (سَلَف)ـەوە هاتوە سەبارەت بە نزاو پاڕانەوە بریتیە لەوەی کە لە ئیمامی (أوْزَاعِيّ)ـەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ڕیوایەت کراوە، کە فەرموویەتی: خەڵکی چوونە دەرەوە بۆ کردنی نوێژەبارانەو، خواناسی پایەبەرز (بِلال)ی کوڕی (سَعْد) هەستاو، سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کردو، پاشان فەرمووی: "ئامادەبوان، ئایا ئێوە دان بە خراپەی خۆتاندا نانێن؟" وتیان: "بەڵێ دانی پێدا دەنێین" ئەویش فەرمووی: "خوایە ئێمە بیستومانە کە تۆ فەرمووتە: ﴿مَا عَلَى الْمُحْسِنِينَ مِنْ سَبِيلٍ﴾ [التّوبَة: ٩١] واتە: {چاکەکاران گلەییان لێ ناکرێت و لێیان ناگیرێت}، وا ئێمەش دانمان بە تاوانباری خۆماندا ناوە، جا ئایا لێخۆشبوونی تۆش هەر بۆ کەسانی وەکو ئێمە نیە؟ خوایە، لێمان خۆشبەو، بەزەییت پێماندا بێتەوەو، بارانمان بۆ بارێنە" ئەوجا دەستەکانی بەرز کردەوەو، خەڵکەکەش دەستەکانیان بەرز کردەوەو، خوای گەورەش بارانی بەسەردا باراندن.

سەبارەت بەم مانایەش کەسانێك ئەم دێڕە هۆنراوەیان نوسیوە:

أَنَا الْمُذْنِبُ الْخَطَّاءُ وَالْعَفْوُ وَاسِعٌ        وَلَوْ لَمْ يَكُنْ ذَنْبٌ لَمَا وَقَعَ الْعَفْوُ

واتە: من تاوانبارمو هەڵەی زۆریشم کردوەو، لێبوردنی تۆش فراوانو زۆرە، خۆ ئەگەر تاوانیش نەبوایە لێبوردنیش نەدەبوو. (١)

---

(١) منیش دەڵێم:

تاوانبارم زۆر هەڵەم عەفوی خوا فراوانە        ئەگەر تاوان نەبوایە لێبوردن نەبوو گیانە

## باسی بەرزکردنەوەی دەستەکان لە کاتی پاڕانەوەداو، پاشان هێنانیان بەدەم و چاودا

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لـە ئیمـامی (عُمَـر)ی کوری (خَطَّاب)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویـەتی: ئەگـەر پێغەمبـەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) لـە کـاتی پاڕانـەوەدا دەسـتەکانی بـەرز بکردایەتـەوە، نەیدەهێنانە خوارەوە هەتا نەیهێنانایە بە دەم و چاویدا.[1]

هەروەها دەقێکی لەم جۆرەشمان لە (سُنَن)ی ئیمـامی (أَبو دَاوُد)دا بـۆ ڕیوایـەت کراوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لـە هـەردووکیان ڕازی بێـت). جـا ڕشتەی هەردووکیشیان لاوازی تێدایە.[2]

سەبارەت بەو فەرمایشتەی زانای پایەبەرز شێخ (عَبْدُالْحَقّ)ی (إشْبِيْلِيّ)یـش، کـە فەرموویەتی: ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: "حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە".[3] ئـەوە لـە نوسخە متمانەدارەکانی کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِـذِيّ)دا نـەهاتوە، کـە فـەرموبێتی: "حەدیسەکە (صَحِيْح)ـە" بەڵکو ئەو فەرموویەتی: حەدیسێکی (غَرِيْب)ـە.[4]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٦٣ / بە ژمارە: ٣٣٨٦.

(٢) بڕوانە: سُـنَنُ أَبِـيْ دَاوُد / ١ / ٤٦٨ / بـە ژمـارە: ١٤٨٥. بـەڵام شـێخی عەسـقەلانی فەرموویەتی: هەردوو ڕیوایەتەکە وا دەخوازن کە حەدیسەکە (حَسَن) بێت. بڕوانـە: بُلُوْغُ الْمَرَام / ٤٦٤.

(٣) بڕوانە: الْأَحْكَامُ الشَّرْعِيَّةُ الْكُبْرَى (الْمُحَقِّق: أَبو عَبْدِ الله حُسَيْنُ بْنُ عَكَاشَة) / ٣ / ٥٥٢.

(٤) منیش دەڵێم: لە نوسخە بەچاپگەیەنراوەکەدا نوسراوە: حەدیسێکی (صَحِيْح)ی (غَرِيْب)ـە.

## سونەتە نزاو پاڕانەوە چەندبارە بکرێتەوە

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) پێی خۆشبوو سێ جار بپاڕێتەوەو، سێ جاریش داوای لێخۆشبوون بکات.[1]

## باسی هاندان لەسەر ئاگایی و ئامادەیی دڵ لە کاتی نزاو پاڕانەوەدا

بزانە کە مەبەست لە پاڕانەوە ئاگایی و ئامادەیی دڵە، وەکو پێشتر باسمان کرد. بەڵگەکانی ئەم باسەش لە زۆریدا نایەنە هەژمارو، زانیاریش سەبارەت بەم باسە لەوە ڕوونترە کە باس بکرێت. بەڵام ئێمە بۆ فەڕو بەرەکەت حەدیسێکی لەبارەوە دەهێنین.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «ادْعُوا اللهَ وَأَنْتُمْ مُوْقِنُونَ بِالْإِجَابَةِ، وَاعْلَمُوا أَنَّ اللهَ تَعَالَى لا يَسْتَجِيْبُ دُعَاءً مِنْ قَلْبٍ غَافِلٍ لاهٍ».[2] واتە: "لەخوا بپاڕێنەوەو، دڵنیاش

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٧٧ / بە ژمارە: ١٥٢٤. هەروەها شێخی (ابْنُ حِبَّان)یش لە صەحیحەکەی خۆیدا ڕیوایەتی کردوەو، شێخ (شُعَيْب الأَرْنَؤُوْط)یش فەرموویەتی: ڕشتەکەی (صَحِيْحَ)ـە لەسەر مەرجی ئیمامی بوخاری و موسلیم. بڕوانە: صَحِيْحُ ابْنِ حِبَّان / ٣ / ٢٠٣ / بە ژمارە: ٩٢٣.

هەروەها ئیمامی موسلیمیش حەدیسێکی هاووێنەی ئەمەی ڕیوایەت کردوە، لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە لەبارەی دوعاکردنی پێغەمبەری خواوە فەرموویەتی: «وَكَانَ إِذَا دَعَا دَعَا ثَلَاثًا، وَإِذَا سَأَلَ سَأَلَ ثَلَاثًا». بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٤١٨ / بە ژمارە: ١٧٩٤.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥١٧ / بە ژمارە: ٣٤٧٩.

بن پاڕانەوەکەتان گیرا دەبێت. بشزانن، کە خوای گەورە پاڕانەوەیەك گیرا ناکـات، کە لـە دڵێکی بێ ئاگای مەشغوڵەوە کرابێت".

ڕشتەکەی لاوازی تێدایە.[1]

## باسی گەورەیی و فەزڵی پاڕانەوەی پەنهانی

- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَـا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ﴾ [الْحَشْر: ١٠]. واتە: {ئەوانەش کـە لـەدوای ئەوانەوە هاتوون دەڵـێن: ئـەی پـەروەردگارمان، لـە ئێمـە خۆشـبەو، لـەو برایانەشمان، کە بە ئیمانەوە پێشی ئێمە کەوتوونو، بە ئیمانەوە ڕۆیشتوون}.
- هەروەها فەرموویـەتی: ﴿وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ﴾ [مُحَمَّد: ١٩] واتـە: {داوای لێخۆشـبوون بـۆ تـاوانی خـۆتو بـۆ بـاوەڕدارانی پیـاوانو ئافرەتانیش بکە}.
- هەروەها خوای گەورە لـەسەر زمانی حـەزرەتی (إِبْرَاهِيم)ـەوە (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: ﴿رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِـدَيَّ وَلِلْمُـؤْمِنِينَ يَـوْمَ يَقُـومُ الْحِسَابُ﴾ [إِبْرَاهِيم: ٤١] واتە: {ئـەی پـەروەردگارمان، لـە خـۆمو بـاوکمو

---

(١) چونکە وەکو ئیمامی (مُنْذِرِيّ)و ئیمامی (ذَهَبِيّ)و حافظـی عێراقـی فەرموویانـە: کەسێکی لاواز لە ڕشتەکەیدایە، بەناوی (صَالِح)ی (مُرِّيّ). بەڵام حەدیسێکی تر بـە هـەمان مانا لای ئیمامی (أَحْمَد) هاتوە، لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالله)ی کوڕی (عَمْرو)ی کـوڕی (عَاص)ـەوە. ئیمامی (مُنْذِرِيّ)و شێخی (هَيْثَمِيّ) فەرموویانە: ڕشتەکەی (حَسَن)ـە. بڕوانـە: التَّرْغِيبُ والتَّرْهِيب / ٢ / ٣٢٢ / بە هەردوو ژمـارە: ٢٥٥٤ و ٢٥٥٥، ومُخْتَصَرُ اسْتِدْرَاكِ الْحَافِظِ الذَّهَبِيِّ عَلَى مُسْتَدْرَكِ أَبِيْ عَبْدِالله الْحَاكِم / ١ / ٣٧١ / بە ژمارە: ١١٨، والْمُغْنِـي عَنْ حَمْلِ الْأَسْفَار / ١ / ٢٦٢ / بـە ژمـارە: ١٠٠٨، ومَجْمَعُ الزَّوَائِـد / ١٠ / ١٤٨ / بـە ژمارە: ١٧٢٠٣.

دایکم‌و له باوەڕدارانیش خۆشبه، ئەو ڕۆژەی که حیساب‌و لێپرسینەوە بەرپا دەبێت}.

- هەروەها لەسەر زمانی حەزرەتی (نُوْح)ـەوە (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: ﴿رَبِّ اغْفِرْ لِيْ وَلِوالِدَيَّ وَلِمَنْ دَخَلَ بَيْتِيَ مُؤْمِناً وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِناتِ﴾ [نوح: ٢٨] واته: {ئەی پەروەردگارم، له خۆم‌و باوکم‌و دایکم‌و ئەو کەسەش به باوەڕداریەوە هاتۆته ماڵەکەم‌و له باوەردارانی پیاوان‌و ئافرەتانیش خۆشبه}.

بۆشمان ڕیوایەت کراوه له صەحیحی موسلیمدا، له هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو الدَّرْدَاء)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، که ئەو گوێی له پێغەمبەری خوا بوە (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَا مِنْ عَبْدٍ مُسْلِمٍ يَدْعُو لِأخِيْهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ، إلاَّ قَالَ الْمَلَكُ: "وَلَكَ بِمِثْلٍ"».[1] واته: "هەر بەندەیەکی موسوڵمان دوعا بۆ برایەکی ئاینی خۆی بکات، بەبێ ئامادەیی‌و ئاگایی ئەو، فریشتەیەکی ڕاسپێردراو پێی دەڵێت: هەمان دوعاش بۆ تۆ".

له ڕیوایەتێکی تری صەحیحی موسلیمدا، له هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو الدَّرْدَاء)ەوە هاتوه (خوای لێ ڕازی بێت)، که پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «دَعْوَةُ الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ لِأخِيْهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ مُسْتَجَابَةٌ، عِنْدَ رَأسِهِ مَلَكٌ مُوَكَّلٌ، كُلَّمَا دَعَا لِأخِيْهِ بِخَيْرٍ، قَالَ الْمَلَكُ الْمُوَكَّلُ بِهِ: "آمِيْنَ، وَلَكَ بِمِثْلٍ"».[2] واته: "نزاو پاڕانەوەی کەسێکی موسوڵمان بۆ برایەکی ئاینی خۆی، بەبێ ئامادەیی‌و ئاگایی ئەو گیرا دەبێت‌و قبووڵ دەکرێت، له ڕاسەریدا فریشتەیەك ڕاسپێردراوە، هەر کاتێك ئەو دوعایەکی خەیری بۆ براکەی کرد، فریشته ڕاسپێردراوەکەش دەڵێت: (آمِيْن)، هەمان دوعاش بۆ تۆ".

---

(١) بڕوانه: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٩٤ / به ژماره: ٢٧٣٢.

(٢) بڕوانه: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٩٤ / به ژماره: ٢٧٣٣.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو کتێبەکەی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِـذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «أَسْرَعُ الـدُّعَاءِ إِجَابَـةً دَعْـوَةُ غَائِـبٍ لِغَائِبٍ».[1] واتە: "خێراترین پاڕانەوە بۆ گیرابوون بریتیە لە پاڕانەوەی کەسێك بۆ کەسێکی نائامادەو بێ ئاگا".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) بەلاوازی داناوە.[2]

## سونەتە مرۆڤی موسوڵمان دوعا بۆ ئەو کەسە بکات کە چاکەی لەگەڵدا کردووە، باسی شێوازی دوعا کردنەکەشی

ئەم باسە شتی زۆری لەبارەوە هاتوە، کە لە چەند جێگەیەکی پێشتردا هەندێکیمان هێنا. یەکێك لە جوانترینیان بریتیە لەو حەدیسەی کە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا بۆمان ڕیوایەت کراوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (أُسَامَة)ی کوڕی (زَيْد)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ صُنِعَ إِلَيْهِ مَعْرُوْفٌ، فَقَالَ لِفَاعِلِهِ: "جَـزَاكَ اللهُ خَيْراً"، فَقَدْ أَبْلَغَ فِي الثَّنَاءِ». واتە: "هەر کەسێك چاکەیەکی لەگەڵدا بکرێت‌و، بە چاکەکارەکە بڵێت: (خوا پاداشتی خەیرت بداتەوە)، ئەوە ئەوپەڕی سوپاس‌و ستایشی بەجێهێناوە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[1]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٨٠ / بە ژمارە: ١٥٣٥، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٣٥٢ / بە ژمارە: ١٩٨٠.

(٢) چونکە وەکو خۆی فەرموویەتی: کەسێکی لاواز لە ڕشتەکەیدایە، بەناوی (عَبْدُالرَّحْمَن)ی کوڕی (زِيَاد)ی کوڕی (أَنْعُم)ی (أَفْرِيقِيّ)ـەوە.

**هەروەها لەم نزیکانەشدا لە ((کتێبی پاراستنی زمان))دا لە حەدیسێکی (صَحِیْح)دا ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوامان هێنا (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرمووبووی: «وَمَنْ صَنَعَ إِلَيْكُمْ مَعْرُوفاً، فَكَافِئُوهُ، فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا مَا تُكَافِئُونَهُ، فَادْعُوا لَهُ، حَتَّى تَرَوْا أَنَّكُمْ قَدْ كَافَأْتُمُوْهُ».**

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٣٨٠ / بە ژمارە: ٢٠٣٥.

## سونەتە داوای دوعای خەیر لە کەسانی گەورەو خاوەن فەزڵ بکرێت، باوەکو داواکارەکە لە داوا لێکراوەکە باشتریش بێت، باسی پاڕانەوە لە جێگە پیرۆزەکاندا

بزانە کە ئەو حەدیسانەی سەبارەت بەم باسە هاتوون لەوە زیاترن کە بژمێردرێن، باسەکەش کۆدەنگی زانایانی لەسەرە.

جا یەکێك لە بەهێزترین ئەو حەدیسانەی کە دەکرێت بە بەڵگە بریتیە لەو حەدیسەی کە لە هەردوو کتێبەکەی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا بۆمان ڕیوایەت کراوە، لە ئیمامی (عُمَر)ی کوڕی (خَطَّاب)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: داوام لە پێغەمبەری خوا کرد (درودی خوای لەسەر بێت)، کە ڕێگەم پێ بدات عومرە بکەم، ئەویش ڕێگەی پێدام، فەرمووی: «براڵە، لە دوعای خەیرت لەبیرمان مەکە». ئیمامی (عُمَر) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا فەرمایشتێکی فەرموو، ئەوەندەم پێ خۆشە، بەهەموو دنیای ناگۆڕمەوە.

لە ڕیوایەتێکیشدا پێغەمبەر فەرموویەتی: «براکەم، لە دوعای خەیرت بەشدارمان بکە».

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[1]

پێشتریش لە (زیکرەکانی کەسی ڕێبوار)دا ئەم حەدیسەمان باسمان کرد.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٧٠ / بە ژمارە: ١٤٩٨، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٥٩ / بە ژمارە: ٣٥٦٢.

## نابێت موسوڵمانی (مُكَلَّف) دوعای شەڕ لە خۆی‌و، لە منداڵ‌و، خزمەتکارو، ماڵ‌و شتی خۆی بکات

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُـنَن)ی ئیمامی (أَبُـو دَاوُد)دا، بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لا تَدْعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ، وَلا تَدْعُوا عَلَى أَوْلادِكُمْ، وَلا تَدْعُوا عَلَى خَدَمِكمْ، وَلا تَدْعُوا عَلَى أَمْوَالِكُمْ، لا تُوَافِقُوا مِنَ اللهِ سَاعَةً نِيْلَ فِيْهَا عَطاءٌ، فَيُسْتَجَابَ لَكُمْ». واتە: "دوعای شەڕو خراپ لە خۆتان‌و، لە منداڵەکانتان‌و، لە خزمەتکارەکانتان‌و، لە ماڵ‌و موڵکتان مەکەن، نەوەکو دوعاکەتان ڕێکەوتی ئەو کاتە بکات، کە تێیدا ئادەمیزاد دەگات بە مەبەست‌و داخوازی خۆی‌و، ئەوکاتە دوعاکەتان گیرا ببێت.[1]

ئیمامی موسلیمیش لە کۆتایی صەحیحەکەیدا ئەم حەدیسەی ڕیوایەت کردوەو، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لە ڕیوایەتەکەی ئەودا فەرموویەتی: «لا تَدْعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ، وَلا تَدْعُوا عَلَى أَوْلادِكُمْ، وَلا تَدْعُوا عَلَى أَمْوَالِكُمْ، لا تُوَافِقُوا مِنَ اللهِ تَعَالَى سَاعَةً يُسْأَلُ فِيْهَا عَطاءٌ، فَيَسْتَجِيْبَ لَكُمْ». واتە: "دوعای شەڕو خراپ لە خۆتان‌و، لە منداڵەکانتان‌و، لە ماڵ‌و موڵکتان مەکەن، نەوەکو دوعاکەتان ڕێکەوتی ئەو کاتە بکات، کە کاتی داواکردنی بەخشش‌و خەڵاتی خوایی بێت‌و، ئەوکاتەش خوای گەورە دوعاکەتان گیرا بکات".[2]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٧٩ / بە ژمارە: ١٥٣٢.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٣٠٤ / بە ژمارە: ٣٠٠٩.

## بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی کە پاڕانەوەی مرۆڤی موسوڵمان گیرا دەبێت، جا بۆ ئەو شتەی داوای کردوە یان بۆ شتێکی تر، بەلام نابێت پەلە بکات لە گیرابوون

- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ﴾ [البَقَـرَة: ١٨٦] واتـە: {ئەگـەر بەنـدەکانم لـەبارەی منـەوە پرسیاریان لێ کردیت، من نزیکم، نـزاو پاڕانـەوەی کەسـی دوعاکـەر گـیرا دەکەم، ئەگەر لێم دەپاڕێتەوە}.
- هەروەها فەرموویـەتی: ﴿ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾ [غَـافِر: ٦٠] واتـە: {هـاوار بکەنە من‌و لێم بپاڕێنەوە، بەدەنگتانەوە دێم‌و، پاڕانەوەکەتان گیرا دەکەم}.

بۆشمـان ڕیوایـەت کـراوە لـە کتێبەکـەی ئیمـامی (تِرْمِـذِيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (عُبَادَة)ی کوڕی (صَامِت)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خـوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَا عَلَى وَجْهِ الْأَرْضِ مُسْلِمٌ يَـدْعُو اللهَ تَعَـالَى بِدَعْوَةٍ، إلاَّ آتَاهُ اللهُ إِيَّاهَا، أوْ صَرَفَ عَنْهُ مِنَ السُّوْءِ مِثْلَهَا، مَا لَمْ يَدْعُ بِإثْمٍ أوْ قَطِيْعَـةِ رَحِمٍ». واتە: "هەر موسوڵمانێك لەسەر ڕووی زەوی نزایەك لـەخوای گـەورە داوا بکات، مسۆگەرە کە خوای گەورە داواکەی دەداتێ‌و نزاکەی گیرا دەکات، یان بە ئەندازەی داواکەی خراپەیەکی لێ لادەدات، بەمەرجێك داوای شتێك نـەکات، کـە خراپەو تاوان بێت، یان داوای بچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی نەکات".

جا یەکێك لەوانەی لەخزمەتیدا بوون عەرزی کرد: دەی کەوابوو ئێمـەش زۆر نزا دەکەین. پێغەمبەری خواش فەرمووی: «اللهُ أكْثَرُ». واتە: خوای گەورە زۆرتـری لەلایە.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[1]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٦٦ / بە ژمارە: ٣٥٧٣.

ئیمامی (حَاكِم)یش لە كتێبی (الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن)دا ئەم حەدیسەی ڕیوایەت كردوە، لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (أَبو سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، جا ئەو ئەمەشی بۆ زیادكردوە: «أَوْ يَدَّخِرَ لَهُ مِنَ الْأَجْرِ مِثْلَهَا». واتە: "یان بە ئەندازەی ئەوەی داوای دەكات خوا پاداشتی بۆ هەڵدەگرێت".[1]

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، كە فەرموویەتی: «يُسْتَجَابُ لِأَحَدِكُمْ مَا لَمْ يَعْجَلْ، فَيَقُولَ: "قَدْ دَعَوْتُ، فَلَمْ يُسْتَجَبْ لِيْ"».[2] واتە: "نزاو پاڕانەوەی هەریەكە لە ئێوە گیرا دەبێت، بەمەرجێك پەلە نەكاتو، نەڵێت: پاڕامەوەو، گیرا نەبوو!!".

* * * * *　　* * * * *　　* * * * *

(١) بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٦٧٠ / بە ژمارە: ١٨١٦. ئیمامی (حَاكِم) فەرموویەتی: ڕشتەكەی (صَحِيْح)ـە.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٣٥ / بە ژمارە: ٥٩٨١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٩٥ / بە ژمارە: ٢٧٣٥.

بزانە کە ئەم کتێبە یەکێکە لە گرنگترین ئەو باسانەی کە بایەخی پێدەدرێت‌و، هەمیشە کاری پێدەکرێت. منیش مەبەستم لە دواخستنی ئەوەیە، کە ئومێدی خەیرم بەخوای گەورەو بەخشندە هەیە، بەڵکو کۆتایی ژیانمان بە لێخۆشبوون بهێنێت. جا داوای لێ دەکەم‌و لێی دەپارێمەوە بۆ خۆم‌و خۆشەویستەکانم‌و تێکڕای موسوڵمانانیش، کە لێخۆشبوون‌و هەرچی کاری خەیری تریش هەیە بکات بە نصیبمان. (آمِيْنَ).

- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ﴾ [غَافِر: ٥٥] واتە: {داوای لێخۆشبوون بۆ تاوانەکانت بکەو، بە ئێواران‌و بە بەیانیاندا تەسبیحات‌و سوپاس‌و ستایشی پەروەردگارت بکە}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ﴾ [مُحَمَّد: ١٩] واتە: {داوای لێخۆشبوون بۆ تاوانی خۆت‌و بۆ باوەڕدارانی پیاوان‌و ئافرەتان بکە}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَاسْتَغْفِرِ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُوراً رَحِيماً﴾ [النِّسَاء: ١٠٦] واتە: {داوای لێخۆشبوون لەخوا بکە، بەڕاستی خوا زاتێکی لێبوردەی میهرەبانە}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿لِلَّذِينَ اتَّقَوْا عِنْدَ رَبِّهِمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ وَرِضْوَانٌ مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ * الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا إِنَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ * الصَّابِرِينَ وَالصَّادِقِينَ وَالْقَانِتِينَ وَالْمُنْفِقِينَ وَالْمُسْتَغْفِرِينَ بِالْأَسْحَارِ﴾ [آل عِمْرَان: ١٥ – ١٧] واتە: {ئەو کەسانەی لەخوا دەترسن‌و، خۆیان لە تاوان دەپارێزن، لای پەروەردگاریان باخ‌و باخاتێکیان بۆ ئامادە کراوە، کە چەندین ڕووبارو جۆگەی ئاو بەژێریاندا دەڕوات‌و، بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە، هەروەها هاوسەرو خێزانی پاك‌و خاوێنیشیان بۆ ئامادە کراوەو، ڕەزامەندی لای خوایشیان دەست دەکەوێت‌و، خوای گەورەش بەندەکانی دەبینێت‌و چاوی لێیانە.

ئەوانەی، کە دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان، ئێمە بەڕاستی باوەڕی تەواومان بە تۆو بە پێغەمبەرەکەت هێناوە، دەی تۆش لە تاوانەکانمان خۆشبەو، لە ئاگری دۆزەخیش بمانپارێزە. جا ئەمانە کەسانی بەئارامو خۆڕاگرو ڕاستگۆو لەخواترس و خەیرکەرو داوای لێخۆشبوونکەرن لە بەرەبەیاندا}.

- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنْتَ فِيهِمْ وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ﴾ [الأنفال: ٣٣] واتە: {خوای گەورە سزایان نادات، کە تۆ لەناویاندا بیتو، سزاشیان نادات، کە خۆیان داوای لێخۆشبوون بکەن}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ وَمَنْ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَى مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ [آل عِمْرَان: ١٣٥] واتە: {ئەوانەی ئەگەر کارێکی خراپو ناشیرینیان ئەنجامدا، یان ستەمێکیان لە خۆیان کرد، خوایان بەبیردێتەوەو، داوای لێخۆشبوونی تاوانەکانیانی لێ دەکەن، جا کێ هەیە بێجگە لە خوا لە تاوان ببورێت، هەروەها بەردەوام نابن لەسەر ئەو خراپەو تاوانەی کردوویانەو، دەشزانن ئەگەر پەشیمان ببنەوە، خوا لێیان خۆش دەبێت، ئەگینا تووشی سزایان دەکات}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ يَعْمَلْ سُوءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ اللَّهَ يَجِدِ اللَّهَ غَفُوراً رَحِيماً﴾ [النِّسَاء: ١١٠] واتە: {هەر کەسێك تاوانو خراپەیەك ئەنجام بدات، یان ستەمێك لە خۆی بکاتو، پاشان داوای لێخۆشبوون لەخوای گەورە بکات، دەبینێت کە خوای گەورە لێبوردەو میهرەبانە}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَأَنِ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ يُمَتِّعْكُمْ مَتَاعًا حَسَنًا إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى وَيُؤْتِ كُلَّ ذِي فَضْلٍ فَضْلَهُ﴾ [هُود: ٣] واتە: {داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگارتان بکەنو، پەشیمان ببنەوەو بگەڕێنەوە بۆلای ئەو، خوای گەورەش تا ماوەیەکی دیاریکراو نازو نیعمەتی پاكو خاوێنو

چاکتان دەداتێو، ئەو کەسەش زیادە چاکەیەکی هەبێت، خوای گەورە ئەو زیادەشی دەداتەوە}.

- هەروەها لەسەر زمانی حەزرەتی (نُـوْح)ـەوە (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: ﴿فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّاراً﴾ [نُوْح: ١٠] واتە: {منیش پێم وتن: داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگارتان بکەن، چونکە بەڕاستی ئەو زاتێکی زۆر گوناهبەخش‌و لێبوردەیە}.
- هەروەها لەسەر زمانی حەزرەتی (هُـوْد)ەوە (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: ﴿وَيَا قَوْمِ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُمْ مِدْرَارًا وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَى قُوَّتِكُمْ﴾ [هُوْد: ٥٢] واتە: {ئەی گەلو هۆزەکەم، داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگارتان بکەن‌و، پاشان بە پەشیمانیەوە بگەڕێنەوە بۆلای، تا ئەویش بارانی بەخوڕتان بۆ بنێرێت‌و، هێزی زیاتریشتان بداتی لەوەی کە خۆتان هەتانە}.

جا ئەو ئایەتانەی سەبارەت بە داوای لێخۆشبوون کردن هاتوون گەلێك زۆرن، بە هەندێکیش لەمانەی ئێمە هێنامان مرۆڤی موسوڵمان هۆشیار دەبێت.

سەبارەت بەو حەدیسانەش کە لەبارەی داوای لێخۆشبوون کردنەوە هاتوون، ئەوە ناکرێت هەمووی باس بکرێت، بەڵام من ئاماژە بە سەرەتای هەندێکیان دەدەم:

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَغَر)ی (مُزَنِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِنَّهُ لَيُغَانُ عَلَى قَلْبِيْ، وَإِنِّيْ لَأَسْتَغْفِرُ اللهَ فِيْ الْيَوْمِ مِائَةَ مَرَّةٍ».[1] واتە: "هەندێك جار منیش پەردەو تارمایی سەردڵم دەگرێت، بۆیە هەموو ڕۆژێك سەد (١٠٠) جار داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەم".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٧٥ / بە ژمارە: ٢٧٠٢.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: لە پێغەمبەری خوام بیستوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «وَاللهِ إِنِّيْ لَأَسْتَغْفِرُ اللهَ، وَأَتُوْبُ إِلَيْهِ فِيْ الْيَوْمِ أَكْثَرَ مِنْ سَبْعِيْنَ مَرَّةً».[1] واتە: "سوێند بەخوا، من لە هەموو ڕۆژێکدا زیاد لە حەفتا (٧٠) جار داوای لێخۆشبوون‌و تەوبەو پەشیمانی لەخوای گەورە دەکەم".

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (شَدَّاد)ی کوڕی (أَوْس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: سەردارو سەروەری ئەو زیکرانەی کە بۆ داوای لێخۆشبوون بەکار دەهێنرێن ئەوەیە کە بەندە بڵێت: «اللَّهُمَّ، أَنْتَ رَبِّيْ، لا إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، خَلَقْتَنِيْ، وَأَنَا عَبْدُكَ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَعُوْذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، أَبُوْءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ، وَأَبُوءُ بِذَنْبِيْ، فَاغْفِرْ لِيْ، فَإِنَّه لا يَغْفِرُ الذُّنُوْبَ إِلاَّ أَنْتَ». واتە: "خوایە، تۆ پەروەردگاری منیت، هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە تۆ، تۆ منت دروست کردوە، منیش بەندەی تۆم‌و، ئەوەندەی بتوانم لەسەر ئەو پەیمان‌و بەڵێنەم کە بە تۆم داوە، پەنات پێ دەگرم لە خراپەی ئەو کارەی ئەنجامم داوە، دان دەنێم بەوەدا کە نازو نیعمەتێکی زۆرت بەسەرمەوە هەیەو، دانیش بە تاوانەکەمدا دەنێم، دەی تۆش لێم ببورەو ببەخشە، چونکە بێجگە لە تۆ کەس لە تاوانەکان نابووڕێت". ئەوجا پێغەمبەری خوا فەرمووی: هەر کەسێك ئەم زیکرە لە ڕۆژدا بکات‌و، باوەڕی تەواوی پێی هەبێت‌و، لەو ڕۆژەدا بەر لەوەی شەوی بەسەردا بێت بمرێت، ئەوە بەهەشتیەو، هەر کەسێکیش لە شەودا بیکات‌و، باوەڕی تەواوی پێی هەبێت‌و، لەو شەوەدا بەر لەوەی ڕۆژی بەسەردا بێت بمرێت، ئەویش بەهەشتیە.[2]

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيِّ / ٥ / ٢٣٢٤ / بە ژمارە: ٥٩٤٨.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيِّ / ٥ / ٢٣٢٣ / بە ژمارە: ٥٩٤٧.

منیش دەڵێم: (أَبوءُ) واتە: دانی پێدا دەنێم‌و پێی لێ دەنێم.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە (سُنَن)ی ئیمـامی (أَبُــو دَاوُد)و (تِرْمِــذِيّ)و (ابْــنُ مَاجَە)دا، لـە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خـوا لـە هـەردووکیان ڕازی بێـت)، کـە فەرموویەتی: ئێمە لـە یەك كۆڕدا دەمانژمارد، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسـەر بێت)، سەد (١٠٠) جار دەیفـەرموو: «رَبِّ اغْفِرْ لِيْ، وَتُبْ عَلَيَّ، إِنَّكَ أَنْتَ التَّــوَّابُ الرَّحِيْمُ». واتە: "ئەی پەروەردگار، لێم خۆشبەو، تەوبەم لێ وەرگـرە، بەڕاسـتی تـۆ زاتێکی زۆر لێبوردەو میهرەبانیت".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە (سُنَن)ی ئیمـامی (أَبُو دَاوُد)و (ابْــنُ مَاجَــە)دا، لــە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ەوە (خوا لـە هەردووکیان ڕازی بێت)، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێـت) فەرموویەتی: «مَنْ لَزِمَ الِاسْتِغْفارَ، جَعَلَ اللهُ لَهُ مِنْ كُلِّ ضِيْقٍ مَخْرَجاً، وَمِنْ كُلِّ هَمٍّ فَرَجاً، وَرَزَقَهُ مِنْ حَيْثُ لا يَحْتَسِــبُ».[2] واتـە: "ئەو کەسەی بەردەوام هۆگر بێت بە داوای لێخۆشبوون کردنەوە، خـوای گـەورە لـە هەموو تەنگانەیەکدا دەروازەیەکی بۆ دەکاتەوەو، لــە هـەموو خـەم‌و خەفـەتێك ڕزگاری دەکات‌و، بەجۆرێك ڕزق‌و ڕۆزی بۆ دەنێرێت، کە خۆیشـی بـە خەیاڵـیدا نایەت".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٧٥ / بە ژمارە: ١٥١٦، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٩٤ / بـە ژمارە: ٣٤٣٤، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَە / ٢ / ١٢٥٣ / بە ژمارە: ٣٨١٤.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٧٥ / بە ژمارە: ١٥١٨، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَــە / ٢ / ١٢٥٤ / بە ژمارە: ٣٨١٩. ئیمامی (حَاكِم)یش ڕیوایەتی کردوەو، پاشان فەرموویـەتی: ڕشـتەکەی (صَحِيْح)ـە. بەڵام ئیمامی (بَغَــوِيّ)و ئیمـامی (ذَهَبِــيّ) فەرموویانـە: کەسـێکی لاواز لــە ڕشتەکەیدایە بەناوی (حَكَم)ی کوڕی (مُصْعَب)ـەوە. بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ٤ / ٢٩١ / بە ژمـارە: ٧٦٧٧، وشَرْحُ السُّنَّة / ٥ / ٧٩، ومُخْتَصَرُ اسْـتِدْرَاكِ الْحَــافِظِ الذَّهَبِيِّ عَلَى مُسْتَدْرَكِ أَبِيْ عَبْدِاللهِ الْحَاكِم / ٦ / ٢٨٧٩ / بە ژمارە: ٩٧١.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُــو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبــەری خــوا (دروودی خــوای لەسەر بێت) فەرموویــەتی: «وَالَّذِيْ نَفْسِيْ بِيَدِهِ، لَوْ لَمْ تُذْنِبُوا، لَذَهَبَ اللهُ بِكُمْ، وَلَجَاءَ بِقَــوْمٍ يُذْنِبُونَ، فَيَسْتَغْفِرُونَ اللهَ تَعَالَى، فَيَغْفِرُ لَهُمْ».[1] واتە: "سوێند بەو کەسەی گیانی منـی بەدەستە، ئەگەر ئێوە تاوان نەکـەن، خـوای گـەورە دەتانباتـەوەو، خـەڵکانێکی تـر دەهێنێت، کە تاوان بکەنو، بەشوێنیدا داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە بکەنو، ئەویش لێیان خۆش ببێت".

بۆشـمان ڕیوایـەت کـراوە لـە (سُــنَن)ی ئیمـامی (أَبُــو دَاوُد)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) پێی خۆشبوو سێ جار نزاو پاڕانەوە بکـاتو، سـێ جـاریش داوای لێخۆشبوون بکات.[2]

جـا ئــەم حەدیســەمان لــەم نزیکانەشــدا هێنــا لــە ((**کتێبـی نـزاو پاڕانـەوە گشتگیرەکان**))دا.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو کتێبەکەی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِــذِيّ)دا، لە یەکێك لە (مَوْلَى)کانی ئیمامی (أَبُو بَكْر)ی (صِدِّيْق)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویـەتی: «مَا أَصَــرَّ مَــنِ اسْتَغْفَرَ، وَإِنْ عادَ فِي الْيَوْمِ سَبْعِينَ مَرَّةً». واتـە: "هـەر کەسـێك داوای لێخۆشـبوون لەخوای گەورە بکات، مانای وایە سوور نیە لەسەر تاوانباری، باوەکو لە ڕۆژێکـدا حەفتا (٧٠) جاریش بگەڕێتەوە سەر تاوان کردن".[3]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢١٠٦ / بە ژمارە: ٢٧٤٩.

(٢) پێشتر تەخریجمان کرد.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٧٥ / بە ژمارە: ١٥١٤، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٥٨ / بـە ژمارە: ٣٥٥٩.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: ڕشتەکەی بەهێز نیە![1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: لە پێغەمبەری خوام بیستوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «خوای گەورە فەرموویەتی: {يَا بْنَ آدَمَ، إِنَّكَ مَا دَعَوْتَنِيْ وَرَجَوْتَنِيْ غَفَرْتُ لَكَ مَا كَانَ مِنْكَ وَلا أُبَالِيْ. يَا بْنَ آدَمَ، لَوْ بَلَغَتْ ذُنُوْبُكَ عَنَانَ السَّمَاءِ، ثُمَّ اسْتَغْفَرْتَنِيْ، غَفَرْتُ لَكَ. يَا بْنَ آدَمَ، لَوْ أَتَيْتَنِيْ بِقُرَابِ الْأَرْضِ خَطَايَا، ثُمَّ أَتَيْتَنِيْ، لا تُشْرِكُ بِيْ شَيْئاً، لَأَتَيْتُكَ بِقُرَابِها مَغْفِرَةً}». واتە: "ئەی ئادەمیزاد، هەتا تۆ لێم بپاڕێیتەوەو هیوات بە لێخۆشبوونی من هەبێت، منیش لەو تاوانانەت خۆش دەبم کە کردووتن، دەربەستیش نایەم. ئەی ئادەمیزاد، ئەگەر تاوانەکانت بگەنە هەوری ئاسمانو، پاشان داوای لێخۆشبوونم لێ بکەیت، لێت خۆش دەبم. ئەی ئادەمیزاد، ئەگەر بە نزیکەی پڕی زەوی هەڵەو تاوانەوە بێیت بۆ لامو، هیچ هاوەڵێو شەریکت بۆ دانەنابم، منیش بە نیزکەی پڕی زەوی لێخۆشبوونەوە دێم بە دەمتەوە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

---

(١) شێخی (ابْنُ عَلاّن) فەرموویەتی: ڕەنگە لەبەر ئەوە بێت، کە نازانرێت (مَوْلَى)کەی ئیمامی (أَبُو بَكْر) کێیە. بەڵام شێخی عەسقەلانیو شێخی (عَيْنِيّ) ڕشتەکەیان بە (حَسَن) داناوە. بڕوانە: فَتْحُ الْبَارِيّ / ١ / ١١٢، وعُمْدَةُ الْقَارِي / ١ / ٢٧٧، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٧ / ٢٨٢.

منیش دەڵێم: خۆ ئەگەر ڕشتەی حەدیسەکە لاوازیش بێت، وەکو ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی، ئەوا وەکو ئیمامی (سَخَاوِيّ)و شێخی (عَجْلُوْنِيّ) فەرموویانە: ڕیوایەتێکی تر پاڵپشتی دەکات، کە ئیمامی (طَبَرَانِيّ) لە کتێبی (الدُّعَاء)دا لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە هێناویەتی. بڕوانە: الدُّعَاء لِلطَّبَرَانِيّ / ١ / ٥٠٧ / بە ژمارە: ١٧٩٧، والْمَقَاصِدُ الْحَسَنَة / ١ / ٥٧٠ / بە ژمارە: ٩٣٠، وكَشْفُ الْخَفَاء / ٢ / ٢٠٨ / بە ژمارە: ٢١٧٠.

منیش دەڵێم: (عَنَانَ السَّمَاءِ) بریتیه لـه هەوری ئاسمان. تاکەکەی بریتیـه (عَنَانَة). وتراویشه: (عَنَان) بریتیه لـەو بەشەی ئاسمـان، کـه ئەگـەر سـەرت بـەرز بکەیتـەوە دەیبینیتو لێتەوە دیارە.

سەبارەت به (قُرَاب الْأَرْضِ)یش، ئەوە به (قُرَاب)و بـه (قِـرَاب)یـش ڕیوایـەت کراوەو، (قُرَاب)ـەکەیان مەشهوورترەو، ماناکەشی واته: (نزیکەی پڕی زەوی).

جا یەکێك لـەو زانایانەی که فەرموویەتی به (قِرَاب)یش دەخوێنرێتەوە، بریتیه لـه خاوەنی کتێبی (مَطَالِعُ الْأَنْوَار).

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـه (سُنَن)ی ئیمامی (ابْنُ مَاجَه)دا، بـه ڕشـتەیەکی جـوان (جَيِّد)، لـه هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّٰه)ی کوڕی (بُسْر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، که فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «طُوْبَى لِمَنْ وَجَدَ فِيْ صَحِيفَتِهِ اسْتِغْفَاراً كَثِيراً».[2] واته: "خۆشبەختی بـۆ ئـەو کەسـەی لـه دەفتـەری کردەوەکانیدا داوای لێخۆشبوونی زۆر دەبینێتەوە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـه (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا، لـه هـاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، که فەرموویەتی: پێغەمبـەری خـوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ قَالَ: "أَسْتَغْفِرُ اللّٰهَ الَّذِيْ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيَّ الْقَيُّوْمَ، وَأَتُوْبُ إِلَيْهِ" غُفِرَتْ ذُنُوْبُهُ، وَإِنْ كَانَ قَدْ فَرَّ مِـنَ الزَّحْـفِ».[3] واتـه: "ئـەو

---

(١) بڕوانه: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٤٨ / به ژمارە: ٢٥٤٠.

(٢) بڕوانه: سُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٢٥٤ / بـه ژمـارە: ٣٨١٨. ئیمـامی (مُنْـذِرِيّ)و ئیمـامی (بُوْصِيْرِيّ) فەرموویانه: ڕشتەکەی (صَحِيْح)ـه. بڕوانـه: التَّرْغِيْبُ والتَّرْهِيْب / ٢ / ٣٠٩ / به ژمارە: ٢٥٠٣، ومِصْبَاحُ الزُّجَاجَة / ٤ / ١٣٤ - ١٣٥.

(٣) بڕوانه: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٧٥ / به ژمارە: ١٥١٧، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٦٨ / بـه ژمارە: ٣٥٧٧. لـه ڕاستیدا ڕیوایەتی حەدیسەکه لـه ڕێگەی (ابْـنُ مَسْـعُوْد)ەوە لەلایـەن ئیمـامی (حَـاكِم)ـەوە هێنـراوەو، فەرموشـێتی حەدیسـێکی صـەحیحه. بـەڵام ڕیوایـەتی

کەسەی بڵێت: (داوای لێخۆشبوون لەو خوایە دەکەم، کە بێجگە لە ئەو هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیەو، زاتێکی زیندوەو، ڕاپەڕێنەرو چاودێری کاروباری بوونەوەرانەو، داوای تەوبەو پەشیمانی لێ دەکەم)، خوای گەورە لە تاوانەکانی دەبووریت، باوەکو لە ڕووبەڕوو بوونەوەی جەنگی کافرانیش هەڵاتبێت‌و ڕای کردبێت".

ئیمامی (حَاكِم) فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە لەسەر مەرجی ئیمامی بوخاری‌و موسلیم.[1]

منیش دەڵێم: ئەم باسە هەر زۆر فراوانەو، مەگەر بە کورت کردنەوە زەبت بکرێت، بۆیە ئێمەش هەر ئەمەندەی لێ باس دەکەین.

## باسێك: {حوکی داوای لێخۆشبوون کردن}

یەکێك لەو باسانەی پەیوەندی بە داوای لێخۆشبوون کردنەوە هەیە، ئەوەیە کە لە پێشەواو خواناسی پایەبەرزی شوێنکەوتوان (رَبِيْع)ی کوڕی (خُثَيْم)ـەوە هاتوە، کە فەرموویەتی: "با کەس لە ئێوە نەڵێت: (داوای لێخۆشبوون‌و تەوبە لە خوای گەورە دەکەم)، جا دواتر ئەگەر وا نەکات، قسەکەی دەبێت بە درۆ. بەڵکو با بڵێت: (خوایە لێم خۆش بەو، تەوبەو پەشیمانیم لێ وەرگرە)".

جا ئەم بەشەی فەرمایشتەکەی (خوایە لێم خۆش بەو، تەوبەو پەشیمانیم لێ وەرگرە) فەرمایشتێکی جوان‌و چاکە.

---

حەدیسەکە لای ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا لە ڕێگەی (بِلال)ی کوڕی (يَسَار)ی کوڕی (زَيْد)ە، لە باوکیەوە، لە باپیرەیەوە.

(١) بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٦٩٢ / بە ژمارە: ١٨٨٤.

سەبارەت بەوەش کە (داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە دەکەم) قسەیەکی ناپەسەندەو، بەدرۆ دادەنرێت، ئەوە ئێمە لەگەڵیدا هاورِا نین. چونکە داوای لێخۆشبوون کردن هیچ درۆیەکی تێدا نیەو، ئەو حەدیسەی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)یش کە لە پێش فەرمایشتەکەی ئەوەوە هێنامان، بەسە بۆ بەرپەرچدانەوەی فەرمایشتەکەی.

هەروەها لە خواناسی پایەبەرز (فُضَیْل)ی کورِی (عِیَاض)ەوە هاتوە (خوای لێ رِازی بێت)، کە فەرموویەتی: "داوای لێخۆشبوون کردن بەبێ وازهێنان لە خراپەو تاوان، تەوبەو پەشیمانی کەسە درۆزنەکانە".

فەرمایشتێکیش لە خواناسی پایەبەرز (رَابِعَة)ی (عَدَوِیّة)وە هاتوە (خوای لێ رِازی بێت)، کە فەرموویەتی: "داوای لێخۆشبوون کردنەکەمان پێویستی بە داوای لێخۆشبوون کردنی زۆر هەیە". جا ئەمەش هەر لە فەرمایشتەکەی (فُضَیْل)ەوە نزیکە.

هەروەها دەگێرِنەوە، کە عەرەبێکی دەشتەکی دەستی گرتبوو بە پەردەی کەعبەی پیرۆزەوەو، دەیفەرموو: "خوایە، بەرِاستی داوای لێخۆشبوون کردنم لەگەڵ مانەوەو سووربوونم لەسەر کردنی تاوان سووکیو رِسواییەو، وازهێنانیشم لە داوای لێخۆشبوون کردن، لەگەڵ ئەوەی کە دەزانم لێبوردنو چاوپۆشی تۆ چەندە فراوانە، نەتوانکاریو بێ دەسەڵاتیە. تۆ بە پێدانی نازو نیعمەتەکان خۆشەویستی خۆتم بۆ دەردەبرِیتو، کەچی پێویستیشت بە من نیەو، بێ نیازیت لێمو، منیش خەریکم تۆ لە خۆم دەرِەنجێنم بە کردنی تاوانەکانو، کەچی پێویستیشم پێتە. ئەی ئەو کەسەی ئەگەر بەڵێنی دا، جێبەجێی دەکاتو، ئەگەر هەرِەشەی کرد، چاوپۆشیو عەفو دەکات، تاوانە گەورەکەم بخەرە ناو لێبوردنو عەفوە گەورەکەتەوە، ئەی بەسۆزترینی بەسۆزەکان".

## نابێت کەس بەیانی هەتا ئێوارە قسە نەکات

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)دا، بە ڕشتەیەکی (حَسَن)، لە ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەم فەرمایشتەم لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) وەرگرتوە: «لا يُتْمَ بَعْدَ احْتِلامٍ، وَلا صُمَاتَ يَوْمٍ إِلَى اللَّيْلِ». واتە: "هەتیوی لەدوای باڵغبوونەوە نامێنێت و، قسە نەکردنیش بەڕۆژ هەتا شەو لە ئیسلامدا نیە".[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبی (مَعَالِمُ السُّنَن)ی پێشەوای پایەبەرز (أَبُو سُلَيْمَان)ی (خَطَّابِيّ)دا، کە ئەو لە تەفسیرو ڕاڤەی ئەم حەدیسەدا فەرموویەتی: "یەکێك لە شێوازی دینداری خەڵکانی سەردەمی نەفامی بریتی بوو لە قسە نەکردن. جا یەکێك لەوان ڕۆژو شەوێکی تەواو دەچوە ژوورەوەو قسەی نەدەکردو بێدەنگ دادەنیشت. موسوڵمانانیش لەم بارەوە نەهیان لێ کراوەو، فەرمانیان پێکراوە کە زیکری خوا بکەن و، قسەی باش بکەن".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە زانای پایەبەرزی شوێنکەوتوان (قَيْس)ی کوڕی (أَبُو حَازِم)ەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، کە فەرموویەتی: ئیمامی (أَبُو بَكْر)ی (صِدِّيق) (خوای لێ ڕازی بێت) تەشریفی برد بۆلای ئافرەتێکی هۆزی (أَحْمَس)، کە پێی دەوترا (زَيْنَب)، جا بینی کە بێدەنگ دانیشتوەو قسە ناکات. بۆیە فەرمووی: "ئەوە بۆچی قسە ناکات؟" عەرزیان کرد: "لەوەتەی هاتۆتە حەج بڕیاری داوە قسە نەکات و بێدەنگ بێت". ئەویش پێی فەرموو: "قسە بکە، چونکە ئەم قسە نەکردنە حەڵاڵ نیەو کاری سەردەمی نەفامیە". ئیتر ئافرەتەکەش دەستی کرد بە قسە کردن.[2]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ١٢٨ / بە ژمارە: ٢٨٧٣.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٣٩٣ / بە ژمارە: ٣٦٢٢.

# باسێك سەبارەت بەو حەدیسانەی كە تەوەرەی سەرەكی ئاینی پیرۆزی ئیسلامیان لەسەرە

ئەمە كۆتایی مەبەستەكەی من بوو لەم كتێبەدا. بەڵام وام بەباش زانی كە چەند حەدیسێكی تریشی پێوە بلكێنم، ئەگەر خوای گەورە بیەوێت، لایەنە جوانەكانی ئەم كتێبەیان پێ تەواو ببێت. ئەوانیش چەند حەدیسێكن كە تەوەرەی سەرەكی ئاینی پیرۆزی ئیسلامیان لەسەرەو، زانایانیش ڕاجیاییەكی زۆریان لەبارەی ژمارەی ئەو حەدیسانەوە هەیە. جا لە دەرەنجامی بەناو یەكدا كردنی بۆچوونەكانی ئەوانو، ئەوەش من بۆم زیاد كردوەو پێمەوە لكاندوە، ژمارەی حەدیسەكان بوون بە سی حەدیس.

## حەدیسی یەكەم:

بریتیە لەو حەدیسەی كە ئیمامی (عُمَر)ی كوڕی (خَطَّاب) (خوای لێ ڕازی بێت) ڕیوایەتی كردوە: «إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ». واتە: "دروستیو پاداشتی كردەوەكان تەنها بەپێی نیەتەكانی خاوەنەكانیانە".

پێشتریش لە سەرەتای ئەم كتێبەوە ئەم حەدیسەمان باس كرد.

## حەدیسی دوەم:

لە (عَائِشَة)ی دایكی ئیماندارانەوە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ». واتە: "هەر كەسێك لەم ئاینەی ئێمەدا شتێك دابهێنێت -كە لەودا جێگەی نەبێتەوە- شتەكە دەدرێتەوە بەسەریداو لێی وەرناگیرێت".

ئەم حەدیسـەمان لـە هـەردوو صـەحیحی بوخـاری‌و موسـلیمدا بـۆ ڕیوایـەت کراوە.[1]

## حەدیسی سێیەم:

لە هاوەڵی خۆشەویست (نُعْمَان)ی کوڕی (بَشِيْر)ەوە هـاتوە (خوا لـە هـەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: لە پێغەمبەری خوام بیستوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کـە فەرموویـەتی: «إِنَّ الْحَلالَ بَيِّنٌ، وَإِنَّ الْحَرَامَ بَيِّنٌ، وَبَيْنَهُمَا أُمُوْرٌ مُشْتَبِهَاتٌ لا يَعْلَمُهُـنَّ كَثِيْرٌ مِنَ النَّاسِ، فَمَنِ اتَّقَى الشُّبُهَاتِ اسْتَبْرَأَ لِدِيْنِهِ وَعِرْضِهِ، وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ وَقَعَ فِي الْحَرَامِ، كَالرَّاعِيْ يَرْعَى حَوْلَ الْحِمَى يُوْشِكُ أَنْ يَرْتَعَ فِيْهِ، أَلَا وَإِنَّ لِكُـلِّ مَلِـكٍ حِمىً، أَلَا وَإِنَّ حِمَى اللَّهِ تَعَالَى مَحَارِمُهُ، أَلَا وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً، إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، أَلَا وَهِـيَ الْقَلْـبُ». واتـە: "بەڕاسـتی هەموو حـەڵاڵکراوەکان ڕوون‌و دیـارن، هـەموو حـەرامکراوەکانیش هـەر ڕوون‌و دیارن، لـە نێوانیشیاندا چەند شتێکی سەرلێدەرنەچوو هەیە، کە زۆرێك لە خـەڵکی نازانن حەڵاڵن یان حەرامن. جا ئـەو کەسـەی خـۆی لـەم شـتە سەرلێدەرنەچـوانە بپارێزێت، ئەوە پاکانەی بۆ ئاین‌و ئابڕوی خـۆی کـردوە‌و، دیـن‌و حورمـەتی خـۆی پاراستوە. ئەو کەسەشی بکەوێتە ناویانەوە، دەکەوێتە ناو حەرامەکانەوە، وەکو ئـەو شوانەی مەڕو ماڵاتەکەی لە دەوری پاوان‌و لـەوەڕێکی قەدەغـەکراو بلـەوەڕێنێت، کە زۆر نزیکە ئاژەڵەکانی بکەونە ناو پاوانەکەوە‌و لێی بخۆن. جا ئاگادار بن، هەموو پاشایەك پـاوانی خـۆی هەیـە‌و، پـاوانی خـوای گـەورەش بریتیـە لـە حـەرامکراو‌و قەدەغەکراوەکانی. ئاگاداریش بن، لە لاشەی مرۆڤدا پارچە گۆشتێك هەیە، ئەگـەر ئەو باش‌و بۆخواصوڵحاو بوو، تەواوی لاشەکەش بـاش دەبێـت‌و، ئەگـەر خـراپ‌و نارێکیش بوو، تەواوی لاشەکەش خراپ دەبێت‌و تێکدەچێت. جـا ئاگـاداریش بـن، کە ئەو پارچە گۆشتە بریتیە لە: دڵ".

---

(1) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيِّ / ٢ / ٩٥٩ / بە ژمارە: ٢٥٥٠، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٣٤٣ / بە ژمارە: ١٧١٨.

ئەم حەدیسەمان لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا بۆ ڕیوایەت کراوە.[1]

## حەدیسی چوارەم:

لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)ەوە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) -کە کەسێکی ڕاستگۆی باوەڕپێکراوە- بە ئێمەی فەرموو: «إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا نُطْفَةً، ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يُرْسَلُ الْمَلَكُ، فَيَنْفُخُ فِيهِ الرُّوحَ وَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ: بِكَتْبِ رِزْقِهِ، وَأَجَلِهِ، وَعَمَلِهِ، وَشَقِيٌّ أَوْ سَعِيدٌ، فَوَالَّذِي لَا إِلَهَ غَيْرُهُ، إِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ، حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلَّا ذِرَاعٌ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ، فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ، فَيَدْخُلُهَا، وَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ، حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلَّا ذِرَاعٌ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ، فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَيَدْخُلُهَا». واتە: "بەڕاستی هەریەك لە ئێوە لە سكی دایكیدا چل ڕۆژ بە تۆوی دەمێنێتەوە، پاشان دەبێتە پارچە خوێنێكی مەییو، ئەوەندەی تر دەمێنێتەوە، پاشان دەبێتە پارچە گۆشتێك‌و، ئەوەندەی تر دەمێنێتەوە، ئەوجا فریشتەیەك دەنێردرێت‌و، گیان دەكات بەبەریداو، فەرمانی پێ دەكرێت بە چوار شت: بە نوسینی ڕزق‌و ڕۆزی‌و، تەمەن‌و ماوەی مانەوەی‌و، كارو كردەوەی‌و، بەدبەخت دەبێت یان بەختەوەر. جا سوێند بەو خوایەی، كە بێجگە لە ئەو هیچ پەرستراوێكی ڕاستەقینە نیە، كەسی وا هەیە لە ئێوە كارو كردەوەی بەهەشتیەكان دەكات، هەتا نێوان ئەوو نێوان بەهەشت تەنها بە ئەندازەی قۆڵێكی دەمێنێت، كەچی نوسراوەكەی سكی دایكی پێشی لێ دەگرێت، ئەویش دەست دەكات بە كردەوەی دۆزەخیەكان‌و، سەرەنجام دەچێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە (خوا پەنامان بدات). كەسی واش هەیە لە ئێوە كارو كردەوەی دۆزەخیەكان دەكات، هەتا نێوان ئەوو نێوان

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٨ / بە ژمارە: ٥٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٢١٩ / بە ژمارە: ١٥٩٩.

ئاگری دۆزەخ تەنها بە ئەندازەی قۆڵێکی دەمێنێت، کەچی نوسراوەکەی سکی دایکی پێشی لێدەگرێتو، دەست دەکات بە کردەوەی بەهەشتیەکان، سەرەنجام دەچێتە ناو بەهەشتەوە (خوا بیکات بە نصیبمان)".

ئەم حەدیسەمان لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا بۆ ڕیوایەت کراوە.[1]

## حەدیسی پێنجەم:

لە کچەزای خۆشەویستی پێغەمبەری خوا حەسەنی کوڕی ئیمامی (عَلِـيّ)ـەوە هاتوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەم فەرمایشتەم لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) وەرگرتوە: «دَعْ مَا يَرِيبُكَ إِلَى مَا لَا يَرِيبُكَ». واتە: "واز لەو شتە بهێنە کە گومانت لەبارەیەوە هەیە، بۆ ئەو شتەی کە گومانت لەبارەیەوە نیە".

ئەم حەدیسەمان لە (سُنَن)ی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ)دا بۆ ڕیوایەت کراوەو، ئیمامی (تِرْمِذِيّ)ش فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[2]

جا فەرمایشتی (يَرِيبُكَ) بە (يُرِيبُكَ)ش دەخوێنرێتەوە، واتە: (گومانت بۆ دروست دەکات). بەڵام ئەوەی یەکەمیان مەشهوورترە.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١١٧٤ / بە ژمارە: ٣٠٣٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٣٦ / بە ژمارە: ٢٦٤٣.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٦٦٨ / بە ژمارە: ٢٥١٨، وسُنَنُ النَّسَائِيِّ / ٨ / ٣٢٧ / بە ژمارە: ٥٧١١.

## حەدیسی شەشەم:

لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (أَبُـو هُرَيْـرَةَ)وە هـاتوە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مِنْ حُسْنِ إِسْلامِ الْمَرْءِ تَرْكُهُ مَا لا يَعْنِيْـهِ». واتـە: "یـەکێك لـە نیشـانەکانی جـوانێتیو ڕێـكوپێکی موسـاڵمانێتی کەسێك، ئەوەیە کە واز لەو شتە بهێنێت پەیوەندی بە خۆیەوە نیە".

ئەم حەدیسەمان لە کتێبەکەی ئیمـامی (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَـه)دا بـۆ ڕیوایـەت کراوەو[1]، حەدیسێکی (حَسَن)یشە.

## حەدیسی حەوتەم:

لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَـس)ـەوە هـاتوە (خـوای لێ ڕازی بێت)، ئـەویش لـە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کـە فەرموویـەتی: «لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيْهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ». واتە: "ئیمانو باوەڕی هیچکام لە ئێوە تـەواو نابێـت، تاوەکو ئەوەی بۆ نەفسی خۆی پێی خۆشە، بۆ براکەشی پێی خۆش نەبێت".

ئەم حەدیسـەمان لـە هـەردوو صـەحیحی بوخـاریو موسـلیمدا بـۆ ڕیوایـەت کراوە.[2]

## حەدیسی هەشتەم:

لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (أَبُـو هُرَيْـرَةَ)وە هـاتوە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویـەتی: «إِنَّ اللَّهَ تَعَـالَى طَيِّبٌ، لَا يَقْبَلُ إِلَّا طَيِّبًا، وَإِنَّ اللَّهَ تَعَالَى أَمَرَ الْمُؤْمِنِينَ بِمَا أَمَرَ بِـهِ الْمُرْسَـلِينَ، فَقَـالَ:

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٥٥٨ / بە ژمارە: ٢٣١٧، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَـه / ٢ / ١٣١٥ / بە ژمارە: ٣٩٧٦.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ١٤ / بە ژمارە: ١٣، وصَـحِيْحُ مُسْـلِم / ١ / ٦٧ / بـە ژمارە: ٤٥.

﴿يَاأَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا﴾ [الْمُؤْمِنُون: ٥١]، وَقَالَ تَعَالَى: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ﴾ [الْبَقَرَة: ١٧٢] ثُمَّ ذَكَرَ الرَّجُلَ يُطِيْلُ السَّفَرَ، أَشْعَثَ أَغْبَرَ، يَمُدُّ يَدَيْهِ إِلَى السَّمَاءِ: يَا رَبِّ يَا رَبِّ، وَمَطْعَمُهُ حَرَامٌ، وَمَشْرَبُهُ حَرَامٌ، وَمَلْبَسُهُ حَرَامٌ، وَغُذِّيَ بِالْحَرَامِ، فَأَنَّى يُسْتَجَابُ لِذَلِكَ؟!». واته: "بەڕاستی خوای گەورە پاكو خاوێنەو، تەنها كارو كردەوەی پاكو خاوێنیش وەردەگرێتو، خوای گەورە هەمان ئەو فەرمانەی كردوە بە ئیمانداران كە كردویەتی بە پێغەمبەران، وەكو فەرموویەتی: ﴿ئەی پێغەمبەران، شتی حەڵاڵو پاكو خاوێن بخۆنو، كردەوەی باشیش بكەن﴾، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە، لەو خواردەمەنیە حەڵاڵو پاكو خاوێنانە بخۆن، كە كردوومانە بە ڕزقو ڕۆزی بۆتان﴾، ئەوجا پێغەمبەری خوا باسی پیاوێكی كرد، كە سەفەری دوورو درێژ دەكاتو، قژی گرزو لول دەبێتو، تۆزو چڵكی لێ دەنیشێتو، دەستەكانیشی بۆ ئاسمان درێژ دەكاتو، دەپاڕێتەوەو دەڵێت: "ئەی پەروەردگار ئەی پەروەرگار"، جا ئەو خواردنی حەرامەو، خواردنەوەشی حەرامەو، پۆشاكو جلوبەرگیشی حەرامەو، بە حەرامیش گۆشكراوە، ئیتر چۆن نزاو پاڕانەوەی لێ وەردەگیرێت؟!".

ئەم حەدیسەمان لە صەحیحی موسلیمدا بۆ ڕیوایەت كراوە.[1]

## حەدیسی نۆیەم:

بریتیە لە حەدیسی: «لَا ضَرَرَ وَلَا ضِرَارَ». واتە:

- (وتراوە: خودی زیان لە شەرعدا نابێت هەبێتو، زیانگەیاندنیش بەبێ حەق هەر نابێت هەبێت).
- (وتراویشە: زیان: ئەوەیە كە كەسێك لەبەر سوودو بەرژەوەندی خۆی زیان بە كەسێكی تر بگەیەنێتو، زیانگەیاندنیش: ئەوەیە كە بەبێ سودو بەرژەوەندی زیانی پێ بگەیەنێت).

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٧٠٣ / بە ژمارە: ١٠١٥.

- (وتراویشە: زیان: ئەوەیە کە کەسێك زیان بە کەسێکی تـر بگەیـەنێت، ئـەو زیانی بەم نەگەیاندوەو، زیانگەیاندنیش: ئەوەیە کە بە شێوەیەکی ناڕەوا زیـان بە کەسێك بگەیەنێت، کە ئەو زیانی بەم گەیاندوە).

ئەم حەدیسەمان لە (مُوَطَّأ)دا بە (مُرْسَل)ی بۆ ڕیوایەت کراوەو، لـە (سُـنَن)ی ئیمامی (دَارَقُطْنِيّ)و لە غەیری ئەویشدا –وەکو ئیمامی (ابْـنُ مَاجَـه)– لـە چـەند ڕێگەیەکـەوە بـە ڕشـتەی پێکەوەبەسـتراو (مُتَّصِـل) بۆمـان ڕیوایـەت کـراوەو، حەدیسەکەش حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

## حەدیسی دەیەم:

لـە هاوەڵی خۆشەویست (تَمِيْم)ی (دَارِيّ)ـەوە هـاتوە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، کـە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «الدِّينُ النَّصِيحَةُ».قُلْنَا: لِمَـنْ؟ قَالَ: «لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ وَلأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَـامَّتِهِمْ». واتـە: "ئـاین بریتیـە لـە دڵسۆزیو ئامۆژگاری". ئێمەش عەرزمان کرد: "بۆ کێ؟" ئـەویش فـەرمووی: "بـۆ خواو، بۆ کتێبەکەی (کە قورئانی پـیرۆزە)و، بـۆ پێغەمبەرەکـەیو، بـۆ پێشـەوایانی موسوڵمانانو، بۆ تەواوی موسوڵمانانیش".

ئەم حەدیسەمان لە صەحیحی موسلیمدا بۆ ڕیوایەت کراوە.[2]

## حەدیسی یازدەیەم:

لـە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)وە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئـەو گـوێی لـە پێغەمبەری خوا بوە (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویـەتی: «مَـا نَهَيْـتُكُمْ عَنْـهُ،

---

(١) بڕوانە: مُوَطَّأُ الْإِمَامِ مَالِك / ٢ / ٧٤٥ / بـە ژمـارە: ١٤٢٩، وسُنَنُ الدَّارَقُطْنِيّ / ٣ / ٧٧ / بە ژمارە: ٢٨٨، وە / ٤ / ٢٧ / بە ژمارە: ٨٣، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ٧٨٤ / بە هەردوو ژمارە: ٢٣٤٠ و ٢٣٤١.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٧٤ / بە ژمارە: ٥٥.

فَاجْتَنِبُوهُ، وَمَا أَمَرْتُكُمْ بِهِ، فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ، فَإِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ كَثْرَةُ مَسَائِلِهِمْ وَاخْتِلَافُهُمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ». واته: "ئەوەی نەهیم لێ کردن و لێم قەدەغە کردن، خۆتانی لێ بپارێزن و لێی دوور بکەونەوە. ئەوەشی فەرمانم پێ کردن، چەندە دەتوانن جێبەجێی بکەن. چونکە ئەوەی نەتەوەکانی پێش ئێوەی لەناوبرد، بریتی بوو لە پرسیارکردنی زۆرو سەرپێچی کردنی پێغەمبەرەکانیان".

ئەم حەدیسەمان لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا بۆ ڕیوایەت کراوە.[1]

## حەدیسی دوازدەیەم:

لە هاوەڵی خۆشەویست (سَهْل)ی کوڕی (سَعْد)ەوە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خواو، عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، کارێکم پیشان بدە، ئەگەر بیکەم، خواو خەڵکیش خۆشیان بوێم. پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: «ازْهَدْ فِي الدُّنْيَا يُحِبَّكَ اللَّهُ، وَازْهَدْ فِيمَا عِنْدَ النَّاسِ يُحِبَّكَ النَّاسُ». واتە: "دنیانەویستبەو، گوێ بە دنیا مەدە، تا خوا خۆشی بوێت و، بێنیازیشبە لەوەی لای خەڵکیە، تا ئەوانیش خۆشیان بوێت".

حەدیسێکی (حَسَن)ـەو، لە کتێبەکەی ئیمامی (ابْنُ مَاجَه)دا بۆمان ڕیوایەت کراوە.[2]

## حەدیسی سیازدەیەم:

لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)ەوە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيِّ / ٦ / ٢٦٥٨ / بە ژمارە: ٦٨٥٨، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٨٣٠ / بە ژمارە: ١٣٣٧.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٣٧٣ / بە ژمارە: ٤١٠٢.

مُسْلِمٍ إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ: الثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالتَّارِكُ لِدِيْنِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ». واته: "ڕشتنی خوێنی مرۆڤی موسوڵمان حەڵاڵ نابێت، مەگەر بە یەکێك لەم سێ هۆکارە: (زینا کردن لەلایەن پیاوێکەوە کە ژنی هێنابێت، یان لەلایەن ژنێکەوە کە شووی کردبێت)و، (کوشتنی کەسی بکوژ لە بەرامبەر کەسی کوژراو)و، (وازهێنان لە ئاینو جیابوونەوە لە کۆمەڵی موسوڵمانان)".

ئەم حەدیسەمان لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا بۆ ڕیوایەت کراوە.[1]

## حەدیسی چواردەیەم:

لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە هاتوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ، عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ، إِلَّا بِحَقِّ الْإِسْلَامِ، وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ تَعَالَى». واته: "فەرمانم پێ کراوە کە دژ بە خەڵکانی بێ باوەڕ بجەنگم، هەتا شایەتی دەدەن کە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لەخواو، (مُحَمَّد)یش پێغەمبەری خوایەو، بە دروستیو بەرێكوپێکیش نوێژەکانیان دەکەنو، زەکاتیش دەدەن. جا کە ئەوانەیان کرد، ئیتر خوێنو ماڵی خۆیان لەمن دەپارێزن، مەگەر بە حەقی شەریعەتی ئیسلامو، حیسابیشیان لەلای خوای گەورەیە".

ئەم حەدیسەمان لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا بۆ ڕیوایەت کراوە.[2]

---

(١) بروانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيِّ / ٦ / ٢٥٢١ / بە ژمارە: ٦٤٨٤، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٣٠٢ / بە ژمارە: ١٦٧٦.

(٢) بروانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيِّ / ١ / ١٧ / بە ژمارە: ٢٥، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥٣ / بە ژمارە: ٢٢.

## حەدیسی پازدەیەم:

لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە هاتوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا وَرَسُولُ الله، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيْتَاءِ الزَّكَاةِ، وَحَجِّ الْبَيْتِ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ». واتە: "ئاینی پیرۆزی ئیسلام لەسەر پێنج پایە بنیات نراوە: شایەتیدان کە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لەخوا، (مُحَمَّد)یش پێغەمبەری خوایەو، نوێژ کردن بەدروستیو بەڕێكوپێکیو، زەکاتدانو، حەج کردنو، گرتنی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان".

ئەم حەدیسەمان لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا بۆ ڕیوایەت کراوە.[1]

## حەدیسی شازدەیەم:

لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە هاتوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لَوْ يُعْطَى النَّاسُ بِدَعْوَاهُمْ، لَادَّعَى رِجَالٌ أَمْوَالَ قَوْمٍ وَدِمَاءَهُمْ، لَكِنَّ الْبَيِّنَةَ عَلَى الْمُدَّعِيْ، وَالْيَمِينَ عَلَى مَنْ أَنْكَرَ». واتە: "ئەگەر خەڵکی بەداواکانیان هەرچیان داوا کرد بیاندرێتی، ئەوا کەسانێکی زۆر داوایماڵو خوێنی خەڵکیان دەکرد. بەڵام دەبێت کەسی داواکار شایەتی هەبێتو، کەسی نکۆڵیکاریش سوێند بخوات".

ئەم حەدیسە بەم دەقە حەدیسێکی (حَسَن)ـەو، بەشێکیشی لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا هاتوە.[1]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ١٢ / بە ژمارە: ٨، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤٥ / بە ژمارە: ١٦.

## حەدیسی حەڤدەیەم:

لە هاوەڵی خۆشەویست (وَابِصَةَ)ی کوڕی (مَعْبَد)ەوە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەو هاتۆتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، پێغەمبەریش پێی فەرموە: "ئایا هاتویت دەربارەی چاکەو خراپە پرسیار بکەیت؟" ئەویش عەرزی کردوە: "بەڵێ". پێغەمبەریش فەرموویەتی: «اسْتَفْتِ قَلْبَكَ، الْبِرُّ مَا اطْمَأَنَّتْ إِلَيْهِ النَّفْسُ، وَاطْمَأَنَّ إِلَيْهِ الْقَلْبُ، وَالْإِثْمُ مَا حَاكَ فِي النَّفْسِ، وَتَرَدَّدَ فِي الصَّدْرِ، وَإِنْ أَفْتَاكَ النَّاسُ وَأَفْتَوْكَ». واتە: "لە دڵی خۆت بپرسە. چاکە ئەوەیە کە دەرون پێی ئاسوودەیەو، دڵیش پێی ئارامە، خراپەش ئەوەیە کە کاریگەری دڵتەنگیو پەشێوىو دڵەڕاوکێیی لە دەرووندا دروست دەکاتو، لە سینەدا دێتو دەچێت، ئیتر باوەکو خەڵکانێکیش فەتوات بۆ بدەن بە ڕەوایەتی کردنی ئەو کارە".

حەدیسێکی (حَسَن)ـەو، لە هەردوو (مُسْنَد)ی ئیمامی (أحْمَد)و (دَارِمِيّ)و، لە غەیری ئەوانیشدا بۆمان ڕیوایەت کراوە.[2]

لە صەحیحی موسلیمیشدا هاتوە لە هاوەڵی خۆشەویست (نَوَّاس)ی کوڕی (سَمْعَان)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «الْبِرُّ حُسْنُ الْخُلُقِ، وَالْإِثْمُ مَا حَاكَ فِي صَدْرِكَ، وَكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ». واتە: "چاکە بریتیە لە ڕەوشتی جوانو، خراپەش ئەوەیە کە کاریگەری دڵتەنگیو دڵەڕاوکێیی لە دەروونتدا دروست دەکاتو، پێشت ناخۆشە خەڵکی پێی بزانن".[3]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٦٥٦ / بە ژمارە: ٤٢٧٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٣٣٦ / بە ژمارە: ١٧١١.

(٢) بڕوانە: مُسْنَدُ الْإِمَامِ أَحْمَد / ٢٩ / ٥٢٧ – ٥٢٨ / بە ژمارە: ١٨٠٠١، وسُنَنُ الدَّارِمِيّ / ٢ / ٣٢٠ / بە ژمارە: ٢٥٣٣.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٩٨٠ / بە ژمارە: ٢٥٥٣.

## حەدیسی هەژدەیەم:

لە هاوەڵی خۆشەویست (شَدَّاد)ی کوڕی (أَوْس)ـەوە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «إِنَّ اللهَ كَتَبَ الْإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ، فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ، وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذِّبْحَـةَ، وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ، وَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ». واتە: "بەڕاستی خوای گەورە چاکەی لەسەر هەموو شتێك نوسیوەو، دەبێت هەموو کارێك بە جوانیو بە ڕێكوپێکی ئەنجام بدرێت. جا ئەگەر کەسێکتان بە حەدی شەرعی کوشت، ئەوا بەشێوەیەکی باش بیکوژنو، ئەگەر ئاژەڵو گیانلەبەرێکیشتان سەر بڕی، ئەوا بەشێوەیەکی باشو بەچاکی سەری ببڕنو، ئەو کەسەشتان حەیوان سەردەبڕێت، با کێردو چەقۆکەی تیژ بکاتو، حەیوانەکەش زوو ئاسوودە بکات".

ئەم حەدیسەمان لە صەحیحی موسلیمدا بۆ ڕیوایەت کراوە.[1]

هەردوو وشەی (قِتْلَة)و (ذِبْحَة)ش سەرەتاکەیان مەکسورە.

## حەدیسی نۆزدەیەم:

لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، فَلْيَقُلْ خَيْراً أَوْ لِيَصْمُتْ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، فَلْيُكْرِمْ جَارَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ». واتە: "ئەو کەسەی باوەڕی بەخواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، با قسەی چاك بکات، یان بێدەنگ بێت. ئەو کەسەش باوەڕی بەخواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، با ڕێزی دراوسێکەی بگرێت. ئەو کەسەش باوەڕی بەخواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، با ڕێزی میوانەکەی بگرێت".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٥٤٨ / بە ژمارە: ١٩٥٥.

ئەم حەدیسەمان لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا بۆ ڕیوایەت کراوە.[1]

## حەدیسی بیستەم:

لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پیاوێك عەرزی پێغەمبەری خوای کرد: "قوربان ئامۆژگاریم بکە". پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: «لَا تَغْضَبْ». واتە: "تووڕە مەبە". جا پیاوەکە چەند جارێك عەرزی کردەوە، ئەویش هەر دەیفەرموو: "تووڕە مەبە".

ئەم حەدیسەمان لە صەحیحی بوخاریدا بۆ ڕیوایەت کراوە.[2]

## حەدیسی بیست‌و یەکەم:

لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو ثَعْلَبَةَ)ی (خُشَنِيّ)ـەوە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «إِنَّ اللهَ -عَزَّ وَجَلَّ- فَرَضَ فَرَائِضَ، فَلَا تُضَيِّعُوهَا، وَحَدَّ حُدُوداً، فَلَا تَعْتَدُوهَا، وَحَرَّمَ أَشْيَاءَ، فَلَا تَنْتَهِكُوهَا، وَسَكَتَ عَنْ أَشْيَاءَ رَحْمَةً لَكُمْ غَيْرَ نِسْيَانٍ، فَلَا تَبْحَثُوا عَنْهَا». واتە: "خوای گەورە چەند شتێکی لەسەرتان فەرزکردوە، ئێوەش لەدەستیان مەدەن‌و مەیان فەوتێنن. چەند سنوورێکیشی بۆ داناون، ئێوەش لێیان مەیانبەزێنن. کۆمەڵە شتێکیشی حەرام کردوە، ئێوەش نزیکیان مەبنەوەو مەیانکەن. لە چەند شتێکیش بێدەنگ بوەو، باسی نەکردون، وەکو میهرەبانی‌و سۆزو بەزەییەك بۆ ئێوە، نەك ئەو شتانەی لەبیر چوو بێت، ئێوەش بەشوێنیاندا مەگەڕێن‌و لێیان مەکۆڵنەوە".

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٤٠ / بە ژمارە: ٥٦٧٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٦٨ / بە ژمارە: ٤٧.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٢٦٧ / بە ژمارە: ٥٧٦٥.

ئەم حەدیسەمان لە (سُنَن)ی ئیمامی (دَارَقُطْنِيّ)دا بە ڕشتەیەکی (حَسَن) بۆ ڕیوایەت کراوە.[1]

## حەدیسی بیست و دووەم:

لە هاوەڵی خۆشەویست (مُعَاذ)ەوە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: عەرزی پێغەمبەری خوام کرد (دروودی خوای لەسەر بێت): ئەی پێغەمبەری خوا، کارو کردەوەیەکم پێ بفەرموو، کە بمخاتە بەهەشتەوەو، لە ئاگر دوورم بخاتەوەوە. ئەویش فەرمووی: «لَقَدْ سَأَلْتَ عَنْ عَظِيمٍ، وَإِنَّهُ لَيَسِيرٌ عَلَى مَنْ يَسَّرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ: تَعْبُدُ اللَّهَ لَا تُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا، وَتُقِيمُ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَتَصُومُ رَمَضَانَ، وَتَحُجُّ الْبَيْتَ». واتە: "بەڕاستی دەربارەی شتێکی زۆر گەورە پرسیارت کردو، ئاسانیشە لەسەر ئەو کەسەی خوای گەورە لەسەری ئاسانی بکات: تەنها خوای گەورە بپەرستەو، هیچ هاوبەشی بۆ دامەنێ، نوێژەکان بەجوانیو بەرێکوپێکی ئەنجام بدەو، زەکات بدەو، مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بەو، حەجی ماڵی خوا بکە". ئەوجا پێغەمبەر فەرمووی: «أَلَا أَدُلُّكَ عَلَى أَبْوَابِ الْخَيْرِ؟ الصَّوْمُ جُنَّةٌ، وَالصَّدَقَةُ تُطْفِئُ الْخَطِيئَةَ كَمَا يُطْفِئُ الْمَاءُ النَّارَ، وَصَلَاةُ الرَّجُلِ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ». واتە: "ئایا ڕێنموویت بکەم بۆلای چەند دەرگایەکی چاکە؟: ڕۆژوو گرتن قەڵغانو پارێزەرە لە ئاگری دۆزەخ، خێرکردنو صەدەقەش تاوان دەکوژێنێتەوە، وەکو چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوەو، نوێژ کردنیش لە ناوجەرگەی شەودا". ئەوجا ئەم ئایەتانەی خوێندەوە: ﴿تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ * فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ [السَّجْدَة: ١٦ – ١٧]. واتە: {لاتەنیشتەکانیان لە جێگەی خەوتنەکەیان دووردەکەوێتەوەو، واز لە خەوتن دەهێنن و، لە ترسی سزای دۆزەخو، بەتەمای خەڵاتی بەهەشت لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوەو، لەو ڕزقو ڕۆزیەی پێمان داون خەیرو صەدەقەی لێ دەکەن * هیچ کەسێك نازانێت ئەو کەسانە چی خەیرو خەڵاتێکیان لە پەنهانەوە بۆ دانراوە، لەو

(١) بڕوانە: سُنَنُ الدَّارَقُطْنِيّ / ٤ / ١٨٣ / بە ژمارە: ٤٢.

خێروبێرانەی کە چاویانی پێ گەش دەبێتەوە، ئەمەش وەکو پاداشتێك بۆ ئەو کردەوە باشانەی لە دنیادا کردوونیان} . ئەوجا پێغەمبەر فەرمووی: «أَلَا أُخْبِرُكَ بِرَأْسِ الْأَمْرِ وَعَمُودِهِ وَذُرْوَةِ سَنَامِهِ؟». واتە: "ئایا خەبەرت پێ بدەم، کە سەری هەموو جۆرە خواپەرستیو دینداریەك چیەو، کۆڵەکەو چڵەپۆپەی ستوونەکەشی کامەیە؟" منیش عەرزم کرد: "بەڵێ بفەرموو، ئەی پێغەمبەری خوا". ئەویش فەرمووی: «رَأْسُ الْأَمْرِ الْإِسْلَامُ، وَعَمُودُهُ الصَّلَاةُ، وَذُرْوَةُ سَنَامِهِ الْجِهَادُ». واتە: "سەری هەموو کارێك بریتیە لە ئیسلامەتیو، کۆڵەکەی ئاینیش بریتیە لە نوێژ کردنو، چڵەپۆپەی ستوونەکەشی بریتیە لە جیهادو تێکۆشان". پاشان فەرمووی: «أَلَا أُخْبِرُكَ بِمِلَاكِ ذَلِكَ كُلِّهِ؟». واتە: "ئایا خەبەرت پێ نەدەم، کە شیرازەو مەبەستی سەرەکی هەموو ئەمانە کامەیە؟" منیش عەرزم کرد: "بەڵێ بفەرموو، ئەی پێغەمبەری خوا". ئەویش زمانی خۆی گرتو، فەرمووی: «كُفَّ عَلَيْكَ هَذَا». واتە: "ئاگات لەمە بێتو، خۆتی لێ بپارێزە". منیش عەرزم کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، بۆچی ئێمە لەسەر ئەو قسانەی دەیانکەین لێپرسینەوەمان لەگەڵدا دەکرێتو سزا دەدرێین؟". ئەویش فەرمووی: «ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ، وَهَلْ يَكُبُّ النَّاسَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ –أَوْ قَالَ عَلَى مَنَاخِرِهِمْ– إِلَّا حَصَائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ». واتە: "دایکت لەدەستت بدات، ئەی ئایا بێجگە لە دروێنەی زمانیان، چی تر هەیە ئەو خەڵکە بە ڕوودا –یان فەرمووی: بە لووتدا– بخاتە ناو ئاگری دۆزەخەوە ".

ئەم حەدیسەمان لە (سُنَن)ی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا بۆ ڕیوایەت کراوەو، ئەویش فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح).[1]

وشەی (ذِرْوَة) بە (ذُرْوَة)ش دەخوێنرێتەوەو، وشەی (مِلاك)یش سەرەتاکەی مەکسورە.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ١١ / بە ژمارە: ٢٦١٦.

## حەدیسی بیستو سێیەم:

لە هەردوو هاوەڵی خۆشەویست (أَبو ذَرّ)و (مُعَاذ)ەوە هاتوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، ئەوانیش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «اتَّقِ اللَّهَ حَيْثُمَا كُنْتَ، وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا، وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ». واتە: "لە هەر شوێنێك بوویت لەخوا بترسەو، بەشوێن خراپەشدا چاکە بکە، تا خراپەکە بیسڕێتەوەو، لەگەڵ خەڵکیشدا بەڕەوشتی جوان هەڵسوکەوت بکە".

ئەم حەدیسەمان لە (سُنَن)ی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا بۆ ڕیوایەت کراوەو، ئەویش فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ەو، لە هەندێك نوسخەی پشت پێ بەستراوی کتێبەکەشیدا فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح).[1]

## حەدیسی بیستو چوارەم:

لە هاوەڵی خۆشەویست (عِرْبَاض)ی کوڕی (سَارِيَة)وە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئامۆژگاریەکی بەهێزی کردین، کە دڵەکان بەهۆیەوە تووشی ترسو لەرز بوونو، چاوەکانیش بەهۆیەوە هاتنە گریانو فرمێسك ڕشتن. ئێمەش عەرزمان کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، ئەم ئامۆژگاریە لە ئامۆژگاری ئەو کەسە دەچێت کە ماڵاوایيو خواحافیزی دەکات. دەی کەوابوو فەرمانمان پێ بکەو، شتێکمان پێ بسپێرە". ئەویش فەرمووی: «أُوصِيكُمْ بِتَقْوَى اللَّهِ، وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ، وَإِنْ تَأَمَّرَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ، فَإِنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ بَعْدِي فَسَيَرَى اخْتِلَافًا كَثِيرًا، فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ، عَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ، وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الْأُمُورِ، فَإِنَّ كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ». واتە: "ئامۆژگاریتان دەکەم کە ترسی خواتان هەبێتو، گوێڕایەڵو فەرمانبەرداری گەورەکانتان بن، باوەکو کۆیلەیەکیش کرابێت بە فەرمانڕەواتان. چونکە هەر کەسێك لە ئێوە دوای من بژیو زیندوو بێت، ناکۆکيو پەرتەوازەییەکی زۆر دەبینێت. بۆیە پێویستە

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٣٥٥ / بە ژمارە: ١٩٨٧.

لەسەرتان دەست بە سونەت‌و ڕێبازی من‌و جێگەنشینە شارەزاو ڕێنموویکراوەکانمەوە بگرن‌و، بە دانەکانتان قەپی پێدا بکەن. زۆریش ئاگاداری خۆتان بن‌و خۆتان لە شتە تازەداهێنراوەکان بپارێزن. چونکە هەموو داهێنراوێکی خراپ‌و پێچەوانەی شەرع گومڕاییە".

ئەم حەدیسەمان لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا بۆ ڕیوایەت کراوەو، ئیمامی (تِرْمِذِيّ)ش فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح).[1]

## حەدیسی بیست‌و پێنجەم:

لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو مَسْعُوْد)ی (بَدْرِيّ)ـەوە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِنَّ مِمَّا أَدْرَكَ النَّاسُ (النَّاسَ) مِنْ كَلَامِ النُّبُوَّةِ الْأُولَى: إِذَا لَمْ تَسْتَحْيِ، فَاصْنَعْ مَا شِئْتَ». واتە: "یەکێك لەو فەرمایشتانەی پێغەمبەرانی پێشوو، کە خەڵکی پێی گەیشتوون‌و چین لەدوای چین لەناو خۆیاندا هێشتوویانەتەوە، ئەمەیە:

- (ئەگەر شەرمت نەکرد، ئەوەی دەتەوێت بیکەو دواتر خۆت دەبینیتەوە)".
- (ئەو کەسەی شەرمی نەکردوە، ئەوەی ویستویەتی کردوویەتی).
- (ئەگەر کردنی کارێك شەرمەزاری لای خواو لای خەڵکی تێدا نەبوو – چونکە کاری باش بوو–، ئەوا بیکە).

ئەم حەدیسەمان لە صەحیحی بوخاریدا بۆ ڕیوایەت کراوە.[2]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦١٠ / بە ژمارە: ٤٦٠٧، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٤ / بە ژمارە: ٢٦٧٦.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٢٨٤ / بە ژمارە: ٣٢٩٦.

## حەدیسی بیست و شەشەم:

لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ەوە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پیاوێک لە پێغەمبەری خوای پرسی و، عەرزی کرد: "ئەگەر نوێژە فەرزەکان بکەم و، ڕۆژووی ڕەمەزانیش بگرم و، حەلاڵ بە حەلاڵ بزانم و، حەرامیش بە حەرام و، لەوە زیاتر هیچی تر نەکەم، پێت وایە بچمە بەهەشتەوە؟" پێغەمبەری خواش (درودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: «بەڵێ».

ئەم حەدیسەمان لە صەحیحی موسلیمدا بۆ ڕیوایەت کراوە.[1]

## حەدیسی بیست و حەوتەم:

لە هاوەڵی خۆشەویست (سُفْيَان)ی کوڕی (عَبْدُاللهِ)ی (ثَقَفِيّ)ـەوە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: عەرزی پێغەمبەری خوام کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمایشتێکم پێ بفەرموو لەم ئاینی پیرۆزی ئیسلامەدا، کە ئەوەندە داگرەوە و ڕوون بێت، پرسیار لە کەسی تر نەکەم لەبارەیەوە". ئەویش (درودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: «قُلْ: آمَنْتُ بِاللَّهِ، ثُمَّ اسْتَقِمْ». واتە: "بڵێ: باوەڕم بەخوا هەیە و، ئەوجا لەسەر ئەو باوەڕەت بمێنەرەوە و بەردەوام بە".

ئەم حەدیسەمان لە صەحیحی موسلیمدا بۆ ڕیوایەت کراوە.[2]

زانایان فەرموویانە: ئەم حەدیسە یەکێکە لە فەرمایشتە گشتگیر و داگرەوەکانی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)و، هاوماناشە لەگەڵ ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەدا: ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ [الأحقاف: ١٣]. واتە:: {بەڕاستی ئەو کەسانەی وتوویانە "پەروەردگاری ئێمە بریتیە لە خوای گەورە"و، پاشان لەسەر ئەو باوەڕە ماونەتەوە و بەردەوام بوون، ئەوە لە

(١) بڕوانە: صَحِيحُ مُسْلِم / ١ / ٤٤ / بە ژمارە: ١٥.

(٢) بڕوانە: صَحِيحُ مُسْلِم / ١ / ٦٥ / بە ژمارە: ٣٨.

قیامەتدا ترس‌و دڵەڕاوکێ ڕوویان تێ ناکات‌و، خەمبارو دڵگرانیش نابن بۆ ئەوەی لەدنیادا بەجێیان هێشتوە}.

زۆربەی زانایانیش (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) فەرموویانە: مانای ئایەتەکەو حەدیسەکەش ئەمەیە: باوەڕیان هێناوەو، بەردەوام گوێڕایەڵی خوای گەورەن.

## حەدیسی بیست‌و هەشتەم:

بریتیە لەو حەدیسەی کە ئیمامی (عُمَر)ی کوڕی (خَطَّاب) (خوای لێ ڕازی بێت) ڕیوایەتی کردوە، سەبارەت بە پرسیارەکەی جوبرەئیل لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، دەربارەی ئیمان‌و ئیسلام‌و ئیحسان‌و ڕۆژی دوایی، کە حەدیسێکی مەشهورەو، لە صەحیحی موسلیم‌و لە غەیری ئەوانیشدا هاتوە.

## حەدیسی بیست‌و نۆیەم:

لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە هاتوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ڕۆژێکیان لە پاشکۆی پێغەمبەری خواوە سوار بووبووم، ئەویش (دروودی خوای لەسەر بێت)، فەرمووی: «يَا غُلَامُ، إِنِّي أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ: احْفَظِ اللَّهَ يَحْفَظْكَ، احْفَظِ اللَّهَ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ، إِذَا سَأَلْتَ فَاسْأَلِ اللَّهَ، وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ، وَاعْلَمْ أَنَّ الْأُمَّةَ لَوِ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ، لَمْ يَنْفَعُوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ لَكَ، وَإِنِ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ، لَمْ يَضُرُّوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيْكَ، رُفِعَتِ الْأَقْلَامُ، وَجَفَّتِ الصُّحُفُ». واتە: "ڕۆڵەکەم، چەند وشەیەکی بەسوودت فێر دەکەم: ئاگات لە سنوورەکانی خوای گەورە بێت‌و، مەیانبەزێنەو بیانپارێزە، تا ئەویش ئاگای لە تۆ بێت‌و، بتپارێزێت‌و، لە کاتی تەنگانەدا بێت بە هاناتەوە. ئەگەر داوای شتێك دەکەیت، هەر لەخوا داوا بکەو، ئەگەر داوای بەهاناوە چوون‌و پشتیوانیش دەکەیت، هەر لەخوای داوا بکە. بشزانە، ئەگەر تەواوی خەڵکی کۆببنەوە، بۆ ئەوەی سودێکت پێ بگەیەنن، ناتوانن سودت پێ بگەیەنن، بەو شتە نەبێت، کە خوا لەچارەی نوسیویت. ئەگەر کۆشببنەوە بۆ ئەوەی

زیانێکت پێ بگەیەنن، ناتوانن زیانت پێ بگەیەنن، بەو شتە نەبێت، کە خوا لەچارەی نوسیویت. پێنووسەکان هەڵگیرانو، نوسراوەکانیش وشکبوونەتەوە".

ئەم حەدیسەمان لە سونەنی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا بۆ ڕیوایەت کراوەو، ئەویش فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح).[1]

لە ڕیوایەتێکی غەیری ئیمامی (تِرْمِذِيّ)شدا ئەم زیادەیەی هەیە[2]: «احْفَظِ اللَّهَ، تَجدْهُ أَمَامَكَ، تَعَرَّفْ إِلَى اللَّهِ فِي الرَّخَاءِ، يَعْرِفْكَ فِي الشِّدَّةِ، وَاعْلَمْ أَنَّ مَا أَخْطَأَكَ، لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَكَ، وَمَا أَصَابَكَ، لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ، وَاعْلَمْ أَنَّ النَّصْرَ مَعَ الصَّبْرِ، وَأَنَّ الْفَرَجَ مَعَ الْكَرْبِ، وَأَنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْراً». واتە: " سنوورەکانی خوا بپارێزە، تا ئەویش بێت بە هاناتەوە، بە جۆرێك، کە وا هەست بکەیت هەمیشە لە بەردەمتایە. لەکاتی خۆشیو هەبووندا خۆت بەخوا بناسێنەو ئاگات لێی بێت، تا ئەویش لەکاتی تەنگانەو نەهاتیدا بتناسێتەوەو بێت بەهاناتەوە. بشزانە، ئەو شتەی کە نایەتە ڕێگەت، مانای وایە لەچارەت نەنوسراوە، ئەو شتەش کە تووشت دەبێتو دێتە ڕێگەت، مانای وایە لەچارەت نوسراوەو، لێت لانادات. بشزانە، پشتیوانیو سەرکەوتن لەگەڵ صەبرو ئارامیدایەو، کرانەوەی دەرووی خەیرو ڕزگاربوونیش لەگەڵ ناخۆشیو نارەحەتیو زەحمەتدایەو، لەگەڵ هەموو تەنگانەو نەهاتیەکیشدا دەرگای ئاسانیو ئاسانکاری دەکرێتەوە".

ئەم حەدیسە پێگەو گرنگیەکی زۆر گەورەی هەیە.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٦٦٧ / بە ژمارە: ٢٥١٦.

(٢) بڕوانە: الْمُعْجَمُ الْكَبِيْر / ٩ / ٣٣٠ - ٣٣١ / بە ژمارە: ١١٠٨٠، والْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ٣ / ٦٢٣ / بە ژمارە: ٦٣٠٣.

## حەدیسی سییەم:

کۆتایی ئـەم حەدیسـانەیەو، کۆتـایی کتێبەکەشـە. بۆیـە بـە ڕشتەیەکی جـوان ڕیوایەتی دەکەین‌و، داوا لـەخوای بەخشندەی میهرەبانیش دەکەین، کە کۆتایی کارو ژیانمان بە خەیر بهێنێت:

پێشەوای پایەبـەرز (أَبو الْبَقَاءِ خَالِدُ بْنُ يُوْسُفَ النَّابُلُسِيُّ الدِّمَشْقِيِّ) (ڕەحمەتی خوای لێبێـت) بۆی گێڕاینەوەو، فەرمووی: (أَبو طَالِب عَبْدُالله)و (أَبو مَنْصُوْر يُونُس)و (أَبـــو الْقَاسِمِ حُسَيْنُ بْنُ هِبَةِ الله بْنِ صَصْرَى)و (أَبو يَعْلَى حَمْزَة)و (أَبو الطَّاهِرِ إِسْـــمَاعِيْل) فەرموویانە: پێشەوای پایەبەرز (أَبو الْقَاسِمِ عَلِيُّ بْنُ الْحُسَيْن) کـە بریتیـە لـە شـێخی (ابْنُ عَسَاكِر) فەرموویەتی: زانـای پایەبـەرز (أَبو الْقَاسِمِ عَلِيُّ بْنُ إِبْرَاهِيْمَ بْنِ الْعَبَّـــاسِ الْحُسَيْنِيّ) وتاریبێژی شاری دیمەشق خەبەری پێ داین‌و، فـەرمووی: زانـای پایەبـەرز (أَبو عَبْدِالله مُحَمَّدُ بْنُ عَلِيِّ بْنِ يَحْيَى بْنِ سُلْوَان) خەبـەری پـێ دایـن‌و، فـەرمووی: زانای پایەبەرز (أَبو الْقَاسِمِ الْفَضْلُ بْنُ جَعْفَر) خەبەری پێ داین‌و، فـەرمووی: زانـای پایەبـەرز (أَبو بَكْرٍ عَبْدُالرَّحْمَنِ بْنُ الْقَاسِمِ بْنِ الْفَرَجِ الْهَاشِمِيّ) خەبـەری پـێ دایـن‌و، فەرمووی: زانای پایەبەرز (أَبو مُسْهِر) خەبەری پێ داین‌و، فەرمووی: زانای پایەبەرز (سَعِيْدُ بْنُ عَبْدِالْعَزِيْز) خەبەری پێ داین لـە: (رَبِيْعَةُ بْنُ يَزِيْد)ەوە، ئـەویش لـە (أَبـــو إِدْرِيْسَ الْخَوْلانِيّ)ـەوە، ئەویش لە هـاوەڵی خۆشەویسـت (أَبو ذَرّ)ەوە (خـوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لـە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەویش لـە جوبرەئیلـەوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەویش لە خوای گەورەوە، کە فەرموویەتی:

«يَا عِبَادِي، إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي، وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّماً، فَلَا تَظَالَمُوا. يَا عِبَادِي، كُلُّكُمْ ضَالٌّ إِلَّا مَنْ هَدَيْتُهُ، فَاسْتَهْدُونِي، أَهْدِكُمْ. يَا عِبَادِي، كُلُّكُمْ جَائِعٌ إِلَّا مَنْ أَطْعَمْتُهُ، فَاسْتَطْعِمُونِي، أُطْعِمْكُمْ. يَا عِبَادِي، كُلُّكُمْ عَارٍ إِلَّا مَنْ كَسَوْتُهُ، فَاسْتَكْسُـــونِي، أَكْسُكُمْ. يَا عِبَادِي، إِنَّكُمْ تُخْطِئُونَ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ، وَأَنَا أَغْفِرُ لَكُمْ ذُنُـــوبَكُمْ جَمِيعـــاً، فَاسْتَغْفِرُونِي، أَغْفِرْ لَكُمْ. يَا عِبَادِي، إِنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغُوا ضَرِّي فَتَضُرُّونِي، وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفْعِي فَتَنْفَعُونِي. يَا عِبَادِي، لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ كَانُوا عَلَى أَتْقَى قَلْـــبِ

رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ، مَا زَادَ ذَلِكَ فِي مُلْكِي شَيْئاً. يَا عِبَادِي، لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ كَانُوا عَلَى أَفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ، مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِي شَيْئاً. يَا عِبَادِي، لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ قَامُوا فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، فَسَأَلُونِي، فَأَعْطَيْتُ كُلَّ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ مَسْأَلَتَهُ، مَا نَقَصَ ذَلِكَ عِنْدِي إِلَّا كَمَا يَنْقُصُ الْبَحْرُ أَنْ يُغْمَسَ الْمِخْيَطُ فِيهِ غَمْسَةً وَاحِدَةً. يَا عِبَادِي، إِنَّمَا هِيَ أَعْمَالُكُمْ، أُحْصِيهَا لَكُمْ، ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إِيَّاهَا، فَمَنْ وَجَدَ خَيْراً، فَلْيَحْمَدِ اللَّهَ -عَزَّ وَجَلَّ-، وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ، فَلَا يَلُومَنَّ إِلَّا نَفْسَهُ».

واته: "ئەی بەندەکانم، من زوڵم و ستەمم لەسەر خۆم حەرام کردوەو نایکەمەو، لەناو ئێوشدا حەرامم کردوە، دەی ئێوش ستەم لەیەکتر مەکەن.

ئەی بەندەکانم، هەمووتان گومڕاو سەرلێشێواون، مەگەر ئەوانەتان کە خۆم خستوومنەتە سەر ڕێگەی ڕاست و هیدایەتم داون. دەی ئێوەش داوای هیدایەت و ڕێنموویی لەمن بکەن، تا ڕێنموویتان بکەمەو، بتانخەمە سەر ڕێگەی ڕاست.

ئەی بەندەکانم، هەمووتان برسین، مەگەر ئەوانەتان کە خۆم خۆراک و خواردنم داونەتێ. دەی ئێوەش داوای خواردن و ڕزق و ڕۆزی لە من بکەن، تا بتاندەمێ.

ئەی بەندەکانم، هەمووتان ڕووت و قووتن، مەگەر ئەوانەتان کە خۆم پۆشتەم کردوونەتەوە. دەی ئێوەش داوای پۆشتەکردنەوە لە من بکەن، تا پۆشتەتان بکەمەوە.

ئەی بەندەکانم، ئێوە بە شەوو بەڕۆژ هەڵەو تاوان ئەنجام دەدەن و، منیش لە هەموو تاوانەکان خۆشدەبم. دەی ئێوەش داوای لێخۆشبوون و لێبوردن لە من بکەن، تا لێتان ببورم.

ئەی بەندەکانم، ئێوە ناگەنە ئەو ئاستەی زیان لە من بدەن و، ناشگەنە ئەو ئاستەی سوودم پێ بگەیەنن.

